سەرنووسەر
هاوڕێ ئەحمەد
سکرتێری نووسین
پشتیوان رحیم
شاهۆ غەفور
چاپ:
چاپخانەی: کوردستان

# ئەنفال

گۆڤارێکی سەربەخۆی تایبەت بە کارەساتی ئەنفال

دیزاین: ئەکرەم فەرەیدون

ژمارە : ( 4 ) ساڵی چوارەم , 2009

# پێرست

## توێژینەوە



## چاوپێکەوتن

## سەروتار

# ئەبێت جەلادانی ئەنفال لە سێدارە بدرێن

لەدوای دەرچونی بریاری دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراق سەبارەت بە کەیسی ئەنفالو لەسێدارەدانی تاوانبارانی ئەنفال، لە گۆرەپانی سیاسی کوردستاندا سیاسیەکانو بەشێك لە رۆشنبیرانی کورد مشتومرێکیٚ زۆر گەرم لەسەر مرۆڤدۆستی کوردیان هێنایە کایەوە سەبارەت بەلێخۆشبوونی تاوانباران، وەك ئەوەی کە ئێمە لە جەلادانی خۆمان خۆشبین بۆ تەواوی جیهانی ئەسەلمێنین کە چەندە مرۆڤدۆستین!، بێخەبەر لەوەی کە دەتوانرا لەسەر مەرگی جەلادانمان پیرۆزیەکانی نەتەوەیمان پیرۆزتر بکەینو هەیبەتی مرۆڤایەتیشمان بسەلمێنین، ئەم مشتومرە هەرچەندە زۆر درێژەی نەکێشاو لە سێدارەدانی تاوانباران بووە کارتێکی یاری سیاسیو سیاسەتمەدارانی عێراق یاریەکەیان پێکرد، بەڵام لە دەرئەنجامدا کورد وەکو نەتەوەیەکی پێنەگەیشتوو هاتە دەر، نەتەوەی کورد دەبوایە بەروحێکی قوڵی نەتەوەییو بەبیرێکی دوربینی ئینسانیەوە پێداگری لەسەر لەسێدارەدانی تاوانباران بکات، وەك ئەوەی کە عەرەبە شیعەکان کردیان، یان وەك ئەوەی کە جووەکان دەیکەن. مرۆڤدۆستیە گەر توانای لێخۆشبونی تاوانبارێکت هەبێت کە بەدەستی ئەو سەرت یان دەستت شکابێت یان بینینت یان بیستن بەهۆی ئەوەوە لەدەست دابێت، بەڵام تاوانبارگەلێك بەشێك لە مرۆڤایەتی پاکتاو کردبێت، بە شێك لەسەروەتی نیشتمانێتی کاول کردبێت، بە درەندەترین شێوەو بە نامرۆڤانەترین عورفی مرۆڤایەتی بەشێك لە هاونەتەوەکەتی کوشتبێت، خوڵقێنەری قەیرانێکی بەئەنقەست بێت بۆ نەتەوەکەت کەتا چەندین سەدەی تر درێژەی دەبێت، قوربانیانی دوای ئەنفال دەیان هێندەی ژمارەی قوربانیانی ئەنفال بێت، نەنگیە نەك تەنها بۆ ئەو کەسانەی کە داوای لێخۆشبوونیان دەکەن بەڵکو نەنگیە بۆ ئەوانەشی کە بیر لەوە دەکەنەوە رۆژێك بڵێن با لە جەلادانی ئەنفالو هەڵەبجە خۆشبین، لێخۆشبوونی تاوانبارانی پاکتاوی رەگەزیو کۆمەڵ کوژ لە دەسەڵاتی مرۆڤ بەدەرە.

لە روی ئینسانیەوە سیاسیەك یان کەسایەتیەك یان رۆشنبیرێك چۆن دەبێت رێگە بەخۆی بدات لە جیاتی پیرەژنێکی رۆڵە ئەنفالکراوی قەرەداخ، منداڵێکی شۆرشی باوك بە ئێسکبوی ناو بیابانەکان، بریاری لێخۆشبوون بدات، لە کاتێکدا وەکو هەمومان بینیمان لە دادگادا هەموو سکاڵاکارەکان داوای بریاری دادگاو جێبەجێکردنی برەیارەکەیان دەکرد.

بۆ دەبێت جەلادانی ئەنفال لە سێدارە بدرێن؟، پرسیارێکی سادە، بەڵام هەڵگری وەڵامێکی قوڵو خاسیەتگەلێکی گرنگ، روحی تۆڵەی نەتەوەیی هاوشانو هاوئاستە لەگەڵ کۆڵەکە گرنگەکانی وەك زمانو مێژوو و خاك بۆ سەلماندنی بوونی نەتەوە، هەروەها کارەساتە گەر نەتەوە تراژیدیاکانی رابردووی لە بیربکاتو بەدوای تۆڵەدا نەکەوێت، کورد لەم قۆناغەیدا کە قۆناغی پێگەیشتنی نەتەوەییەتی پێویستی زۆری بە روحی تۆڵەیە، تۆڵەیەك کە قوربانیەکان وریا بکاتەوە لەوەی شوناسی خۆی لەسەر مەرگی جەلاد دارێژێژێتەوە، تۆڵەیەك کە وانە بێت بۆ ئەوانەی ئەیانەوێت مەرگەساتێکی تر بەسەر ئەم نەتەوەیەدا بهێنن، تۆڵەیەك کە وانە بێت بۆ ئەو جەلادانەشی کەلە هەرکوێی سەر ئەم زەمینەدانو لە بیری ئەودان گروپێك پاکتاو بکەن، ئەوەی کە جێگای ئومێدە ئەوەیە کە هێشتا ئێمە کاتمان بەدەستەوە ماوە بۆ ئەوەی جەلادانی ئەنفال لە سێدارە بدرێنو پرۆسەی کامڵبوونی نەتەوە پەرە پێبدەین.

# هەڵبژاردەیەك لەدۆسیەی دادگاییکردنی تاوانبارانی ئەنفال تایبەت بە تاوانبار ( سوڵتان هاشم ) سەرۆکی فەیلەقی یەك لە ساڵی 1988

کۆکردنەوەو وەرگێڕانی: خالید حەمەلاو، هەوار شەریف
پێداچونەوەی یاسایی: سۆران عومەر
پێداچونەوەی زمانەوانی: فەرەیدون عارف
سەرپەرشتیاری کارگێڕی: گۆران شێخ مستەفا

کورتەی مەلەفەکە بەم شێوەیەیە:

تۆمەتبار (سوڵتان هاشم أحمد)

پێشینەی :

لەدایکبوی / 1945 و ئەم پلەیانەی خوارەوەی هەبووە:

1988–1994 سەرۆکی سلکی دبلۆماسی

1993– 1995 جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپا

1995 سەرۆکی ئەرکانی سوپا

1995– 2003 وەزیری بەرگری

تۆمەتی ڕوبەڕوکراوەی تۆمەتبار (سوڵتان هاشم أحمد) بەپێی پەڕاوی تۆمەتباری :

لەناوبردنی بەکۆمەڵ ( کۆکوژی )

مادەی /11/ یەکەم :

أ – کوشتنی تاکی کۆمەڵەکە.

ب – زیانگەیاندنی جەستەیی یان ئەقڵی بەتاکەکانی کۆمەڵەکە .

ج – بەئەنقەست ملکەچپێکردنی کۆمەڵەکە بۆ بارودۆخی گوزەرانێك کە مەبەست لێی لەناوبردنی کردەیی بەشێك یان هەمویان بێت و بەڕێنوێنی مادەی ( 15/ یەکەم / دووەم / سێهەم / چوارەم لەیاسای دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق ژمارە ( 10 ) ی ساڵی 2005.

**تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی :**

مادەی / 12/ یەکەم:

أ – کوشتنی بەئەنقەست.

ب- لەناوبردن.

ج – بەکۆیلەکردن (الاسترقاق).

و- دورخستنەوەی دانیشتوان یان ڕاگوێزانی زۆرە ملێی دانیشتوان.

ح – چەوساندنەوەی هەر کۆمەڵێك یان کۆمەڵەیەکی دیاریکراو لەدانیشتوان بەهۆکاری سیاسی یان ڕەگەزی یان نەتەوەیی یان ئاتنی یان ئاینی یان پەیوەست بەجۆری ڕەگەز یان یان بەهۆکاری تر کە یاسای نێودەوڵەتی ڕێی پێنەداوەو ئەوەی ئەگات بەکردەوەی ئاماژە پێدراو لە شێوازی توندو تیژی سێکسی کە بگاتە ئاستی ترسناك.

گ – شاردنەوەی بەزۆری تاکەکان.

ی – کردەوەی نامرۆییانەی تری وێکچوو کە بەئەنقەست بێت و ببێتە هۆی مەینەتی توند یان ئازاری ترسناك و قورس کەبەجەستە بگات یان بەتەندروستی یان ئەقڵی و جەستەیی و بەڕێنوێنی مادەی (( 15/ یەکەم / دووەم / سێهەم / چوارەم ) لەیاسای دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق ژمارە ( 10 ) ی ساڵی 2005.

تاوانەکانی جەنگ :

مادەی 13 / چوارەم :

أ – هێرشەکان دژی دانیشتوانی مەدەنی یان دژی تاکە مەدەنییەکان کە ڕاستەوخۆ بەشدارنین لەکردەوە جەنگییەکان.

د – بەئەنقەست هێرش بردن بەئاڕاستەی دژی دامەزراوە تایبەتیەکانی بواری ئاینی، فێرکاری، هونەری، زانستی یان خێرخوازی یان شوێنەواری مێژوویی و نەخۆشخانەکان و جێگاکانی کۆبونەوەی نەخۆش وبریندارا ن بەو مەرجەی کەنەبوبێتنە ئامانجی سەربازی.

هـ – بەتاڵانبردنی هەرشارۆچکەیەك یان دەستبەسەراگرتنی هەر شوێنێك بەزۆر.

ح- دەرکردنی فەرمان بەڕاگوێزانی دانیشتوان کەپەیوەست بێت بەململانێوە ئەگەر لەپێناوی سەلامەتی و ئاسایشی مەدەنییەکانی نەبوو یان لەبەر هۆکاری سەربازی بوو.

ل – کاولکاری یان دەستبەسەراگراتنی موڵك و ماڵی لایەنەکەی تر ئەگەر ئەم هەڕەشە یان دەست بەسەراگرتنە شتێك بوو زەرورەتی جەنگەکان سەپاندبێتی.

وبەڕێنوێنی مادەی (15/ یەکەم /دووەم /سێهەم / چوارەم ) لەیاسای دادگای باڵای تاوانەکانی ژمارە (10)ی ساڵی 2005.

مادەی 15:

یەکەم :

ئەو کەسەی تاوانەکەی ئەنجامداوە لەنێو ولایەتی دادگادا بەپرسیار ئەبێت لەتاونەکەو دووچاری سزادەبێتەوە بەپێی ئەحکامی ئەم یاسایە.

دووەم :

ئەو کەسە بە بەرپرسیار دادەنرێت، بەپێی ئەحکامی ئەم یاسایەو ئەحکامی یاساکانی سزادان، ئەگەر یەکێك لەمانەی ئەنجامدابێت :

ئەگەر ئەو کەسە خۆی تاوانێکی ئەنجامدا یان بەهۆی کەسیترەوە بەچاوپۆشی لەوەی ئەگەر هاتوو ئەو کەسە بەرپرس بێت یان بەر پرس نەبێت لەتاوانەکە.

فەرمانکردن بەئەنجامدانی تاوانێك کەڕێك بەکردەوە ڕویدابێت یان دەستپێکردنی یان هەڵخڕاندن یان هەستکردن بێت بۆ ئەنجامدانی.

ج – پێشکەشکردنی یارمەتی یان هاندان یان یارمەتی بەهەرشێوەیەکیتر بەمەرامی بەرێخستنی ئەنجامدانی تاوانەکە یان دەستپێکردن لەئەنجامدانی ، لەوانەش دابینکردنی هۆکارەکانی ئەنجامدانی.

د– پشکبون بەهەر شێوەیەکی تر لەگەڵ کۆمەڵە کەسێك بەمەرامی تاوانکاری هاوبەش، لە ئەنجامدانی تاوانەکە یان دەسپێکردنی ئەنجامدانی تاوانەکە، کە ئەم هاوبەشیکردنە بەئەنقەستە تاوانەکە بەرەو پێش ببات.

1– یان بەئامانجی گەشەدانی چالاکی تاونکاری یان بەمەرامی تاونکاری لەدژی ئەو کۆمەڵەیە بێت ، ئەگەر هاتوو ئەم چالاکییە یان ئەو مەرامە شاراوەیە بۆ ئەنجامدانی هاتە ناو دەسەڵاتی دادگاوە.

2– لەگەڵ زانینی ئەم کۆمەڵەیە لەمەرامی ئەنجامدانی تاوانەکە.

هـ – هاندانی ڕاستەوخۆ و بەیانکراو بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە لەو شوێنەی پەیوەستە بەتاونی لەناوبردنی بەکۆمەڵ ( کۆکوژی ).

و– دەستپێکردن بەئەنجامدانی تاوانەکە لەڕێی جێبەجێکردنی کردەوەکە بەمەرامی ئەنجامدانی، بەڵام تاوانەکە ڕوینەدا بە هۆیەك کەلە ئیرادەی بکەردا نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا کە عوزرێکی لێبوردنی هەبوو لەسزادان ئەگەر بکەر هەوڵی بەگەڕخست بۆ ئەنجامنەدانی چالاکییەکە یان هەوڵێك کە نەیەوێت تاوانەکە بگاتە ئەنجام تێدا، و سزانادرێت لەسەر دەستپێکردن بەپێی ئەم یاسایە ئەگەر بکەر بەتەواوی دەستی هەڵگرت لەتاونەکە بەویست و ئیرادەی خۆی لە ئەنجامدانی پرۆژەتاوانکاریەکە دورکەوتەوە.

سێهەم : – تۆمەتبار هەر سیفەتێکی فەرمی هەلگرتبێت نابێتە هۆی بەخشینی لەسزادان یان سوککردنی بۆ سزادان، لەگەڵ ئەوەی تۆمەتبار سەرۆکی دەوڵەت بێت یان سەرۆکی وڵات یان ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش یان ئەندامی ئەنجومەنی وەزیران یان ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی بەعس بێت ، ڕێگاش نادرێت بەڕێگرتنی پاراستە(الحصانە) بۆ دەربازبون لە بەرپرسیارێتی ئەو تاوانانەی باسکران لە مادەکانی (11) و (12) و (13) و (14) ی ئەم یاسایە.

چوارەم : – سەرۆکی باڵا نابەخشرێت لە بەرپرسیارێتی تاوانکاری لەو تاوانانەی کەئەو کەسانە ئەنجامیانداوە کەبە فەرمانی ئەوکاریان کردووە، ئەگەر هاتوو سەرۆك زانیاری هەبوو سەبارەت بەوەی کەسەرکردەکانی تاوانێکیان ئەنجامداوە یان لەسەر وەختی ئەنجامدانیدان و هیچ ڕێو شوێنێی زەروری و گونجاوی نەگرتە بەر بۆ قەدەغەکردنی ڕودانی ئەم کردەوانە یان کێشەکەی بەرزنەکردەوە بۆ دەسەلآتە تایبەتمەندەکان بۆ گرتنە بەری ڕێوشوێن بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو دادگاییکردن.

**کورتەی ووتەکانی قوربانیان ( شکاتکەران ) و شایەتەکان :**

سەرەڕای ئەوەی پرۆسەی ئەنفال بەشێوەیەکی کردەیی لەساڵی 1988 دەستیپێکردووە بەلآم نەخشەدانان و پلانەکەی لەساڵی 1987 بۆ کراوە و بەتایبەت پاش دەرچونی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی لابراو (160)ی ساڵی 1987 و نوسراوی ژمارە (4008) لە 1987/6/20. وزۆربەی قوربانیان و شکاتکاران بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ شکاتەکەیان لە دژی تۆممەتبار (سوڵتان هاشم أحمد) نەبووە بەلآم زۆربەیان شکاتەکەیان لەدژی هەموو ئەو کەسانەیە کە ئەم تاوانەیان لەسەر جێگیر دەبێت. لەئەنجامدانی تاونەکەداو لێرەدا ڕیزبەندییەك دەکەین لە نمونەیەك لەشکاتو داوای قوربانیان و شکاتکەران :

لەوتەکانی قوربانی شکاتکەر (غفورحسن عبداللە)دا هاتووە کە لەساڵی 1988 : من لەگوندەکەمان (سیدەر) بوم و خێزانەکەم پێك هاتبوو لە (7) کەس لەوانە دایکم ( فاتمە رسوڵ محمد)و خوشكو براکانم ( عائشە و کەوسەر و سێوە و هەوار و تەیفور)و گوندەکەمان سەربەشارۆچکەی (بنگرد)ەوە لەمانگی دووەمی ساڵی 1988 بۆمبارانکراین. ڕەبایەیەکی سەربازی سەرپەرشتی گوندەکەمانی دەکرد کاتێك ئەنفالی یەك دەستی پێکرد لەدۆڵی (جافایەتی)و شەڕ لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزەکانی دەوڵەت دەستیپێکرد. کاتێك هێزەکانی حکومەت دەسەلآتی ناوچەکەیانگرت. نزیکبونەوە لەگوندەکەمان .. و لەنیوە شەودا گوێم لە هاواری ژن و منالٚ بوو.. ولەگەلٚ بەرەبەیاندا لەگوندەکەمان ڕامکرد.. و هێزەکانی حکومەت شوێنمان کەوتبون و لەدواوە بۆمبارانیان دەکردین.. ویەکێك لەگوندییەکان هەواڵی دامیٚ کە ئەوەی لەناوگوندا ماوەتەوە گیراون و بەئۆتۆمبێلی سەربازی گوێزاویانەتەوە.. وەکاتی گەڕانەوەی ئەوانەی گیرابون لەگەلٚ دایکم لە(نوگرەسەلمان) پرسیاری دایکم و تاکەکانی خێزانەکەم لێکردن.. پێیان وتم کە هێزەکانی عێراق هەستا بەلێك جیاکردنەوەیان لەگرتوخانەی (تۆپزاوا)و (ابراهیم حمید رسید) پێی ووتم کە کە هەستاون بەدابڕینی ژن و پیاو لەیەکتر.. و ئەوانی ئێوە کەوتونەتە ناو گیراوەکانی ( نوگرە سەلمان) و لە گۆڕی بەکۆمەڵی (حەزەر)دا پێناسی خوشك و برایەکم بەناوی (تەیفور و سێوە ) ناسراوناتەوە.. و کاتێك هاتوم بۆ دادگا (6) ناسنامەی خێزانەکەم داوە.. و لەناویاندا پێناسی باوکم لای دایکم بوە.. و پێناسی دایکم و پێناسی خوشکێکم ( عائشە) کە ئێستا لە ژیاندا ماوە.. و پێناسی خوشکم (کەوسەر) کەلەگەلٚ

دایکم گیراوەو پێناسەکانی هەریەك لە(کەوسەرو سێوە و تەیفور ) وە ئەو هەموو مەینەتییەی بەسەرمان هاتووە تەنها لەبەر کوردبونمان بووە.. و شکاتم هەیە لە دژی تۆمەتبار ( صدام حسین ) و (علی حسن المجید) و هەرکەس پشکی هەیە لەم تاوانەدا.

هەروەها شکاتکەر ( حەمەلاو مەجید) ی خەڵکی گوندی ( سەرگەڵو ) لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2006/9/13 وتی : گوندەکەمان پێك هاتبوو لە 500 خێزان و ئێمە ئیش و کارمان کشتوکاڵکردن بوو.. وە بۆمبارانکردن لەسەرمان بەردەوامبوو لەساڵی 1988 بەدورهاوێژ و ڕاجیمەو فڕۆکەو ڕۆژانە لەخەڵکی گوندی دەکوشت.. لەئێوارەدا فڕۆکە هاتە سەر ئاسمانی گوند.. و لەدەرئەنجامی بۆمبارانەکەش (8) کەس کوژران و لەوانە (شێخ قادر)و ژنەکەی (خدیجە و سلمی)و کوڕەکەی (کەمال محمد أمین)و (کمال حاج محمود) و (زبێدە صاڵح و سلام سعید و صاڵح ڕەشید) و ڕۆژی دواتر و پێش دەستپێکردنی پرۆسەی ئەنفال فڕۆکە گوندەکەمانی بۆمباران کردەوەو (3)کەسی کوشت بەناوەکانی (عوسمان محمد)و کوڕەکانی (زانا و دانا)و کەسێکیتر بەناوی ( صالح محمد امین) پاشان هەڵمەتی ئەنفال لەمانگی شوباتی هەمان ساڵ دەستپێکردو هێزەکان لە چوارلاوە هاتنە سەرمان و پاشان بەچەکی کیمیاوی لەڕێی دورهاوێژ و فڕۆکەو ڕاجیمەوە بۆمباران دەکراین ماوەی 20 ڕۆژ بەردەوام بوو، خەڵکی گوندیش ناچار ڕووەو ئێران ڕایانکرد.. و هەوا ئێجگار ساردو باران بەردەوام دەباری و هەستمان بەبرسێتی دەکرد.. و هێزەکان گەیشتنە گوندو وێرانیانکردوو مزگەوتەکەیان ڕوخاندوو گشت مزگەوتەکانی گوندەکانی دەورو پشتیشیان ڕوخاندو هەستان بەسوتاندنی قورئانەکان و پاشان فڕۆکەکان هەستان بەبڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەیەك بۆ خەڵەتاندنی خەڵك لەژێر ناوی لێبوردندا.. و بەمەش خێزانێکی زۆر گەڕایەوەو لەناویاندا (8) خێزان لەنزیەکەکانی من بون.. وپاش خۆ بەدەستەوە دانیان ئۆتۆمبێلی سەربازی باری کردن بۆ چوارقوڕنە پاشان بۆهەولێر.. و خستنیانە زیندانەوەو هەواڵیان نەما.. و (ڕەوف فەرەج) هەواڵی دامیٚ کەخزمەکانی بینیوم لەگرتوخانەی (نوگرەسەلمان) کە ئەوانیش ( حمید صالح ابراهیم ) و ژنەکەی (مریم سعید) و کەکوڕی مامەکەم و مناڵەکەی بووە.. و هەواڵیان داینیٚ کە دوو مناڵی لەبرسان مردون.

(صلاح قادر محمد أمین)ی قوربانی خەڵکی گوندی (مالومە) لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2006/9/13 وتی: خێزانەکەم پێك هاتبوو لە(9) کەس و ئەوانیش باوکم و دایکم و براکانم ( سلام و محمد و بەرزان و داود ) و خوشکەکانم ( ئاواز ) و نەنکم (گوڵزار ) و من و بەرزان و ئاواز و نەنکم ڕۆشتین بۆ سلێمانی بۆ ماڵی مامم.. وپاش چەند ڕۆرژێك بیستمان کەگوندەکەمان تێکدراوە لەلایەن سوپاوە.. لەدەرئەنجامی بۆمبارانی فڕۆکەو دورهاوێژ.. و خەڵکەکەش بەرەو ئێران ڕایانکردووە.. و لەناو خەڵکەکەشدا دایکم و باوکمی تێدا بووە.. پاشان بۆمبارانکراوە بەچەکی کیمیاوی و هەرچی ئاژەڵی تێدا بووە خنکاون.. و بیستمان کە لێبوردنی گشتی دەرچووەو گەڕامەوە بۆ ناوچەکەمان و سوپا هەستا بەگرتنی خەڵکە گەڕاوەکە بۆ گوندو

لەناویاندا باوکم و دایکم و مامێکم بەناوی (ستار ) و نەنکم بەناوی (حلاوە محمدامین ) و براکانم ( سلام و محمد) و پاشان گواستینیانەوە بۆ ( هەولێر) و سەردار چوو بۆ بینینیان لەهەولێرو نەیبینینەوە.. و هیچ هەواڵێکمان نەبیستن تاماوەی (6) مانگ و گەڕانەوەی نەنکم (حەلاوە) کاتێك مەینەتییەکانی دەگێڕایەوە بۆمان کەلەزیندان بوون و ژن و پیاویان جیاکردۆتەوە لەگرتوخانەی (تۆپزاوا ) وکاتێك پیرەکانیان گوێزاوەتەوە بۆ زیندانێکی ترو گەنجەکانیان لەتۆپزاوا هێشتۆتەوەو ژن و منداڵ و پیرەکانیان گواستۆتەوە بۆ شوێنێکیترو باوکم و دایکم هیچیان نەزانیوە سەبارەت بەچارەنوسی براکانم ( سلام و محمد) لەوکاتەوەی گیراون.. و لەساڵی 2004و کاتێك هاتم بۆ سلێمانی و ناسنامەکانم خستنە ڕو بۆم دەرکەوت کەناسنامەی باوکم و برایەکم (محمد) ناسیەوە.. و پێیان وتم کەئەو ناسنامانە لەگۆڕی بەکۆمەڵی موصلْ دۆزراونەتەوە.. و شکاتم لەدژی تۆمەتباران ( صدام حسین ) و (علی حسن المجید) و باقی ئەوانەی لە قەفەسدان.

قوربانی ( عمر عوسمان محمد)ی خەڵکی گوندی (سەرگەڵو) لەوتەکانی لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2006/9/13 وتی: کردەوەکانی پرۆسەی ئەنفالی یەك دەستیپێکرد لە18ی شوباتی 1988 من یەکێك بوم لە هێزەکانی پێشمەرگەو سوپای عێراقی هەموو جۆرە چەکێکی بەکارهێناو لەناویشیاندا چەکی کیمیاوی ئێمە ناچار پاشەکشەمان کرد لەناوچەکە.. و لەگەڕانەوەمان (2000– 3000) سەر ئاژەڵم بینی خنکابون.. و شوانەکەش لەنزیکیانەوە مردبوو.. گۆچانەکەی بەدەستەوەبوو، و کردەوەکانی ئەنفالی یەك بەفەرمانی (صدام) و بەچاودێری (علی حسن المجید).. ڕۆژی 22ی ئازار 1988 فڕۆکەکان هەستان بەبۆمبارانکردنی ناوچەکە بەچەکی کیمیاوی.. و فڕۆکەکان عێراقی بون.. و بەشێك لەو ساروخانەی کە تەقاندبویان فڕۆکەکان تائێستا نەتەقیونەتەوە.. پاشان هەستم بەئازارێکی زۆر توند کرد لەجەستەم بەڵاّم هۆشم مابوو.. ئەوانەی کەلەگەڵمدا بون بەجەستەی بێسەر دەمبینین.. و دەست و قاچی پەڕیوم بینی.. و لەوانە ( شێخ عزیز )و مامۆستا (ڕەوف) دکتۆر ( هادی و شوان و هاجەر عوسمان و لاولاو ) کەئەمانە هەموویان مردبون.. وبریندارەکانم بینی کە( ئەحمەد ناوا)و دکتۆر (کاوە و محمد حسن و بەکر گەلاّڵی ) بون کەئەمانە خەڵکی گوندی ( گەلاّڵی ) بون و (عوسمان و ناصر) کەدووبرای خەڵکی گوندی ( شەدەڵە ) بون و ڕۆشتم بۆ ئێران و چومە نەخۆشخانەو.. و هۆشم لەدەستدا.

شکاتکەر ( ڕوف فەرەج عبداللە)ی دانیشتوی گوندی (بەرانەکی ) ووتی : هێزە سەربازییەکان هێرشیان کردە سەر گوندەکەمان بەچەکی کیمیاوی و گوندەکەمان جێهێشت و بەرەو شاخ ڕامانکردو (3) لاشەم بینی کەمردبون ئەوانیش ( محمد پیرە مستەفا و فاتمە فتاح و زبێدە حسێن) بون و مەبەستمان بوو بڕۆین بۆ گوندی ( گۆمەزەل) و لەوێ خەڵی (8) ئاواییم بینی کۆببونەوە کەگوندەکانی (قەرانمیە)و ( قومرخان )و (جەلوە)و (سەرگەڵو)و (بەرگەڵو)و (قەڵەم

پاشا و سیدەرو سێکانیان و دۆڵەبی) و پاشان ڕۆشتین بەرەو گوندی (شاناخسێ)و هەستان بە بۆمبارانکردنمان بەچەکی کیمیاوی و ئێمەش ترساین و ڕومانکردە شاری (سەردەشتی) ئێران.. پاشان فرۆکەکان هەستان بەبلاو کردنەوەی بلاوکراوەی کەلێبوردنی گشتی لەلایەن (صدام حسێن) ی تێدا بوو و قەرەبوکردنەوە و پێدانی پارچەیەك زەوی نێشتەجێبونی تێدابوو.. و کاتێك گەڕاینەوە بۆ گوندەکەمان سوپامان بینی.. و گرتینیان و بە ئۆتۆمبێلی سەربازی جۆری زیل گوێزایانینەوە پاش ئەوەی هەرچیمان پێبوو لەبەتانی و پێخەف و خواردن لێیان سەندین و گواستینیانەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی هەولێر.. و ڕۆژێك لەوێ بێ خۆراكماینەوە.. پاشان گوێزایانینەوە بۆ سەربازگەیەك لەنێوان موصلّ و هەولێر.. کاتێك ژن وپیاویان جیاکردەوە.. لە هۆڵەکەدا هەندێك یاشماغم بینی کەشوێنەواری خوێنیان پێوە بوو.. و ژنەکەم (مریەم ئیسماعیل) و کچەکەم (هێمن )م لەگەڵ بون و کوڕی مامەکەم (شەمە خدر) هەواڵی ئەوەی دامێ کەژنەکەم لەهۆڵەکەدا منالێکی بووە.. وناومان نا (سابیر ) و پاش لەدایکبون مرد.. شکاتم لەدژی (صدام حسێن) و (علی حسن المجید) وهەموو بەشداربوان هەیە.

**دووەم : بەڵگە نامەکان :**

دادگا زانیاری هەیە لەسەر ڕێژەیەکی زۆر لە بەڵگەنامەو نوسراوی فەرمی و گفتوگۆوی تایبەت بەکێشەی ئەنفال.. و لێرەدا بەشێك لەو نوسراوە فەرمیی و بەڵگەنامەو نێردراوەکان و گفتوگۆکان ڕیزدەکەین:

1- بڕیاری ژمارە 160ی ساڵی 1987 کە بەهۆی ئەمەوە گشت سەرکردە سەربازییەکانی ناوچەی باکور دەکەونە ژێر فەرمانی تۆمەتبار (علی حسن المجید)

2- نوسراوی ژمارە (3650) لە 1987/6/3ی دەرچوو لەنوسینگەی ڕێکخستنی باکور (تۆمەتبار - علی حسن المجید) و ئاڕاستەکراو بۆ سەرکردەی فەیلەقەکانی یەك و دوو و پێنج و سەرکردەکانی لقی حیزبی بەعس و بەڕێوەبەرەکانی ئاسایش لەناوچەی حوکمی زاتی و بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئیستخبارات و هەواڵگری و بەپێی ئەمەش سەپاندنی گەمارۆی ئابورییە بەسەر ناوچەی باکور هەروەك قەدەغەکردنی چونی خواردن و دەرمان بۆ گوندە کوردییەکان و هەورەها قەدەغەکردنی کشتوکاڵ و بەروبوم و سوتەمەنی و قەدەغەکردنی بونی مرۆیی و ئاژەڵی لەناوچەکە.

3 - نوسراوی ژمارە (4008) لە 1987/6/20 ئاڕاستەکراو بۆ سەرکردە سەربازییەکان کەناوەڕۆکەکەی.. قەدەغەکردنی بونی مرۆیی و ئاژەڵییە لەناوچەکەو.. و ئیعاز دانە بە سەرکردەی فەیلەقەکان بە ئامادەکردن و لێدانی تایبەت (چەکی کیمیاوی).

4 - نوسراوی ژمارە ( 1122) لە 1988/8/21ی ئاڕاستەکراو بۆ فەیلەقەکانی یەك و پێنج کە ئاماژە دەدات بۆ دیدارێك کەسەرۆکی ئەرکانی سوپاو یاریدەدەرەکانی لەکەرکوك ئامادەی بون و لەبڕگەی یەکەمیدا هاتووە: (کۆمەڵگەی نیشتەجێبونی دانیشتوان ئامادەکراوە لەیەکەی فەیلەقی

پێنج و چارەسەرکردنی بەچەکی تایبەت و بەچڕی و پێش دەستپێکردن بەجێبەجێکردنی بە( 48) کاتژمێر بۆ خوڵقاندنی باری تۆقاندن لەڕیزەکانیان.. لەگەڵ ووریایی وردو توند لەلێدانی گوندەکانی نیشتەجێ لەکۆتایی سنوری عێراقی تورکی)و دەقی بڕگەی (4)ی نوسراوەکە کەئێستا هەلە بۆسەرکەوتن بەسەر تێکدەران لەناوچەی باکور کەباشترین هەلەو لەداهاتودا باری وا ناڕەخسێت.

5- نوسراوی ژمارە ( 5083) لە 1987/7/22 ی ئاڕاستە بۆ فەیلەقی یەك لەنوسینگەی ڕێکخستنی باکورەوە کە ناوەڕۆکەکەی لێدوانی تۆمەتبار ( علی حسن المجید)ە کەدەڵێت: ( هیچ لاریمان نییە لەپەڕاندنی سەری خیانەتکاران.. بەڵام باشترە پێشتر بیان نێرن بۆ ئاسایش بۆ لێکۆڵینەوە چونکە لەوانەیە شتی بەسودیان لێ بەدەست بهێنین پێش لەسێدارەدانیان).

6- نوسراوی ژمارە ( 349) لە 1988/4/27ی دەرچوو لەسەرۆکایەتی ئەرکانی سوپاو ئاڕاستە بۆ فەیلەقی یەك ( سوڵتان هاشم أحمد) و فەیلەقی پێنج ( ایاد خەلیل ) کەلەبڕگەی (و) و بەندی/ دووەمیدا هاتووە: (بەکارهێنانی تەقەمەنی تایبەت (کیمیاوی ) بۆ جموجوڵی دوژمن جا بەهەر شێوەیەك کەگونجا ئەگەر لە هێزی ئاسمانی یان دورهاوێژ یان ئەنبوبی (هێشویی) یان سەمتییەکان/ پێش ئەوەی دەست بکەن بەکردەوەکانیان دژی یەکەکانمان (بەلێدانی لەباربەر) و ئەتوانن تەقەمەنی تایبەت بەکار بێنن دژی بارەگاکانی تێکدەران).

7- نوسراوی ژمارە ( 1182) لە 28 ی ئابی 1988ی دەرچوو لە سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپاو ئاڕاستەکراو بۆ سەرکردەی فەیلەقی یەك و پێنج.. و بابەتەکەی ( ڕێنماییەکانی جێگری سەرۆکی گشتی هێزە چەکدارەکان/ وەزیری بەرگرییە.. ( بەلابردنی گشت گوندەکان و گشت تاکەماڵێکیش کە لەناو گونددێکدا هەبێت).

8 – نوسراوی (2057) لە 1988/4/5 کەناوەڕۆکەکەی بەخشینی نیشانەی ئازایەتی (نوت الشجاعە) یە بە (سوڵتان هاشم و ئەیاد خلیل زکی) بۆ ڕۆڵبینینی بەرچاویان لەپرۆسەکانی ئەنفالی یەك و دوو.

هەروەها تۆمەتبار (علی حسن المجید) لەوتەکانیدا لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2007/2/7 ووتی: فەریق (سوڵتان هاشم أحمد) بەرپرسی فەیلەقی یەك بووەو بەرپرسی یەکەکانی هەردووپارێزگای (سلێمانی و کەرکوك) بووەو گشت دەزگاکانی دەوڵەت لەسەربازی و مەدەنی لەناوچەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەست بون بەمنەوەو نکوڵی لەمە ناکەم.

هەروەك تۆمەتبار ( فەرحان موتڵەگ) لەوتەکانی لەبەردەکم دادگا باسیکرد کە هێزەکانی پاراستنی نەوت یەکێك بون لەپێکهاتەکانی فەیلەقی یەك کەتۆمەتبار ( سوڵتان هاشم ئەحمەد ) سەرکردایەتی دەکردن و ئەوان ڕێنماییان ڕاستەوخۆ لە سەرۆکی فەیلەقەوە وەردەگرت.

9 – نوسراوی سەرۆکی هێزەکانی پاراستنی نەوت ( زۆرنهێنی ) ژمارە ( 295) لە 1988/4/12 نێردراو بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم و هاوپێچ لەگەڵیدا لیستێك بەناوی (151) کەسی تێدایە کە خۆیان سپاردووە بە یەکە سەربازییەکان.

10 – نوسراوی سەرۆکی هێزەکانی پاراستنی نەوت ( زۆرنهێنی ) ژمارە (323) لە 4/4 /1988 نێردراو بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم کە ئاماژە ئەدات بە ناردنی (39) کەس لەوانەی کە خۆیان سپاردووە بە یەکە سەربازییەکان.

11– نوسراوی سەرۆکی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 287) لە 1988/4/11 کە ناوەڕۆکەکەی ناردنی (139) کەسە بۆ ئاسایشی (چەمچەماڵ).

12– نوسراوی سەرۆکی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 284) لە 1988/4/10 کە ناوەڕۆکەکەی ناردنی (30) کەسە بۆ ئاسایشی ( چەمچەماڵ ) .

13– نوسراوی سەرۆکی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 304) لە 1988/4/12 نێردراو بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم و ناوەڕۆکەکەی لیستێکە بەناوی (155) کەس کە خۆیان تەسلیم بەیەکە سەربازییەکان کردووە.

14– نوسراوی سەرۆکی هێزەکانی پاراستنی نەوت ناوەڕۆکەکەی ناردنی ( 304)کەسە بۆ بەڕێەوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم.

15– نوسراوی سەرۆکی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 338) لە 4/15 /1988 کەناوەڕۆکەکەی ناردنی (69) کەسە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم.

16– نوسراوی سەرۆکایەتی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 261) لە 4/11 /1988 کەناوەڕۆکەکەی ناردنی (47) کەسە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم.

17– نوسراوی سەرۆکایەتی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 302) لە 4/12 /1988 کەناوەڕۆکەکەی ناردنی (56) ژن و (104) منداڵ و (4) پیاوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم.

18– نوسراوی سەرۆکایەتی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 304) لە 4/16 /1988 کەناوەڕۆکەکەی ناردنی (89) کەسە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم.

19– نوسراوی سەرۆکایەتی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 337) لە 4/15 /1988 کەناوەڕۆکەکەی ناردنی (69) ژن و (100) منداڵ و (10) پیاوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم.

20 – نوسراوی سەرۆکایەتی هێزەکانی پاراستنی نەوت ژمارە ( 339) لە 4/15 /1988 کەناوەڕۆکەکەی ناردنی (33) کەسە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم.

21- کۆی هەموو ئەو کەسە ناوبراوانەی لەو نوسراوانەدا ئاماژەی پێدراوە (1397 ) کەسە کەنێردراون بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکانی ئاسایش و گرتوخانەکان و شاردراونەتەوەو تائێستا چارەنوسیان نادیارە.

**دەرخستەکان و ڕاپۆرتەکان**

بۆ زیاتر بڕواهێنان دادگا بڕیاریدا بە گرتنە بەری ڕێوشوێنی پشکنینی شوێنەکان و وردبونەوە بەمەبەستی تۆمارکردنی ڕاستییەکان بۆیە دەستەی دادگا بەتەواوی ئەندامەکانی و بەهاوڕێیەتی دەستەی داواکاری گشتی ڕۆشت بۆ ناوچەی باکورو هەستان بە پشکنینی ناوچەکەو بەم شێوەیە:

1- قەلاّی نزارکێ لەمێژوی 21 / 2006/11

کە پێکهاتووە لە بینایەك کە پێك هاتووە لەدوو نهۆمی داڕێژراو بەخشت و چیمەنتۆ لەسەر شێوەی بازنەیی و ناوەڕاستەکەی گۆڕەپانێکی گەورەیە، هەر نهۆمێك پێکهاتووە لە(26) هۆڵی گەورەو ( 53) ژوور لەنهۆمی خوارەوەو نهۆمی دووەمیش پێکهاتووە لە( 19) هۆڵ و (36) ژور، دادگا تێبینی ( 6) بورجی چاودێری کردن لەسەر بیناکەو ئێستا لەقەلاّکەدا خێزانی هەژاری کوردی تێدا نیشتەجێیە.

2- ناوچەی بەحرکە

هەروەها دادگا لەمێژوی 2006/11/22 ڕێوشوێنی پشکنینی شوێنەکەی لەناوچەی بەحرکە کردو بۆی دەرکەوتووە کەلەڕوکاردا گەڕەکێکی نیشتەجێبونەو ماڵی دروستکراو لەچواردەورێتی بەلاّم تازەدروستکراون و لەناوەندی شاری هەولێرەوە (15) کیلۆمەتر دوورەو کەوتۆتە ناوچەیەکی دەشتی چۆڵ لەسەرچاوەی ئاو و دوورە لە شاخەوەو دەسەلاّتی پێشوو بەکاریهێناوە بۆ شوێنی گرتن و دەستبەسەرکردنی خێزانە کوردییەکانی بەزۆر هێنراو لەگوندە کوردییەکانی کەپرۆسەکانی ئەنفالی تێدا ڕوداوە.

کۆنوسی پشکنینی گوندەکانی ( بەلەکجاڕ، تەکیە، سێو سێنان، کۆمەڵگای شۆڕش) لەبەرواری :2006/11/23

کاتی گەیشتنی دەستەی دادگا بۆ گوندی سێوسێنان تێبینی بونی گۆڕێکی بەکۆمەڵکرا لە لای ڕۆژهەلاّتی شەقامە گشتییە چواردەورگیراوەکە بەسیاجێکی بازنەیی و گۆڕەکان ڕێکخراوبون و دادگا تێبینی ناوی قوربانیانی بەهەڵکۆڵراوی لەسەر کێلی گۆڕەکان کردو دادگا تێبینی ئەوەشی کرد کە ئەو ناوانەی لەسەر گۆڕەکان هەیە هاوجوتن لەگەڵ ئەو ناوانەی لەلایەن شکاتکەرانەوە باسکراون لەدانیشتنەکانی دادگاییکردن و ئەوەش زانراوە کەئەو قوربانیانەی لەناو ئەوگۆڕانەدا نێژراون قوربانیانی چەکی کیمیاوین لەپرۆسەکانی ئەنفال.

پاشان دادگا ڕۆشت بۆ هەردوو گوندی تەکیەو بەلەکجاڕ، دادگا تێبینی کرد کەناوچەکە دیوارکراوە کەزنجیرە شاخی قەرەداخ دەڕوانێت بەسەریداو گوندی تەکیە دەکەوێتە خواروی شاخەکەو ژمارەی ماڵەکانی (20–25) ماڵە و گوندی بەلەکجاڕیش دەکەوێتە ناو دۆڵی قەرەداخ و ژمارەی ماڵەکانی (12–20) خانووە.

دادگا موشەکێکێکی نەتەقیوی بینی کە سەری لەناو زەویدا بوو کە نزیکەی (500) مەترێك لەگوندەکە دوور بوو هەروەها دادگا موشەکێکیتری ڕاجیمەی نەتەقیوی بینی لەسەر زەویەکە درێژییەکەی نزیکەی (2)م و نزیکەی (1000) مەتر لەگوندەکە دوور بوو.

پاشان دادگا ڕۆشت بۆ کۆمەڵگای شۆڕش و کاتی گەیشتنی دەستەی دادگا بۆ کۆمەڵگەکە لەبەرواری 2006/11/23 تێبینیکرد کە کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبونی زۆر گەورەیە و کەوتۆتە لایەکی ئەو شەقامە گشتییەی چەمەچەماڵ دەگەیەنێت بە سلێمانی و هەستاین بە ڕێکخستنی پشکنینەکەو نەخشە سازکردن بۆ ناوچەکە.

پاشان دەستەی دادگا گواستیەوە بۆ گوندی بەرچینی کەماوەی (27) کم لە شاری دهۆکەوە دورەو لەناوچەیەکی شاخاوی سەختو دیوارکراو بەزنجیرە چیا لەهەرچوارلاوەو لەسنوری عێراقی تورکییەوە (50) کم دورە دادگا تێبینی کردووە کەگشت ماڵەکان و مزگەوتەکەش بەتەواوی تێکدراوە هەروەك دادگا پێیدا چۆتەوەو زانیویەتی کەگۆڕێکی بەکۆمەڵی تێدایەو لاشەی قوربانی (حسن صالح)و کوڕەکەی (دژوار)ی تێدایە کە شکاتکەران باسیانکردووەو پسپۆڕی نێودەوڵەتیش ( سنۆ) باسیانکردووە هەورەك دادگا تێبینیکردووە کە پاشماوەی بۆمبەکان پێکهاتووە لە مادەیەکی زەردی ڕەقە دوای پشکنین تاقیگەیی دەرکەوتووە کە پاشماوەی مەوادی کیمیاوییە.

هەروەك دادگا ڕێو شوێنی پشکنینی شوێنی ناوچەی (شێخ وەسانان )و (بالیسان)و گوندی (وەرێ)ی گرتۆتەبەرو دەستەکە تێبینی بونی پاشماوەی بۆمبی تەقیوی کردووە لەجۆری مهدادو قاوغی بۆمبی هێشوویی و پاشماوەی بەرگی بۆمبی کیمیاوی کردوەو لەدیوی ناوەوەی پارچەکانیدا شوێنەواری پاشماوەی جۆرە مادەیەکی نەزانراو لەنێوان گوندەکانی (پێراوو کانی بەرد) هەیەو نمونەیەکی لێوەرگیراوەوەو نێردراوە بۆ پسپۆڕی عەمیدی ئەندازیاری پسپۆڕی چەکی کیمیاوی بۆ مەبەستی ئەنجامدانی پشکنینی تاقیگەیی لەسەری لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بزانرێت کە پسپۆڕ عەمیدی ئەندازیاری هاوڕێی دەستەی دادگا بووە، جۆرەها پاشماوەی چەکی بەکارهاتوو لەلایەن پسپۆڕی ناوبراوەوە دیاریکراوە.

هەروەها دەستەکە ڕۆشتن بۆ گوندی (وەرێ)و گۆڕستانەکەیو لەوێ زانیان کەگوندی (وەرێ) کەوتۆتە بەشی ڕۆژهەلاتی جادە گشتییەکەی ئەچێت بۆ بالیسان و گوندەکە پێکهاتووە لە نزیکەی(40) ماڵێك و گوندەکە نزیکەی (2) کم لە گۆڕستانەکەوە دورەو کەوتۆتە سەر ڕوبارێك ناوی ڕوباری (قاشان)ەو تائێستا گۆڕەکان لەسەر شێوازی گۆڕی خۆڵینن و لەسەر دۆخی

بنـەڕەتی خۆیـانن وەك ئـەو کاتـەی لاشـەی قوربانیـانی تێـدا نێـژراوەو ئـەوەش زانـراوە کەئـەم گۆڕانەی ناو ئەم گۆڕستانە دەگەڕێتەوە بۆ قوربانیانی ئەنفالەکان.

**ڕاپۆرتی پسپۆڕان :**

هەرلەسـەرەتاوە دادگـا سـوور بـوو لەسـەر پـشت بەسـتن بـە پـسپۆڕی بـەتوانایی نێودەوڵـەتیەو ئەوانەی ئەزمونی فراوانیان هەیە لەبوارەکەی خۆیانداو ئەوانیش هەستاون بەکارەکانیان لەژێر چاودێری بەشێکی دادگا هەروەك دادگا بەشێك لەو پسپۆڕانەی بانگکردووەو بۆ بەردەم دادگا بۆ وەرگرتنی بەڵگەو شایەتییەکانیان.

هـەروەك لـە شـایەتییەکانی پـسپۆڕ(سـنۆ) لەبـەرواری 2006/11/28 لەبـەردەم دادگـادا هـاتووە کەهەسـتاون بـە هەڵدانـەوەی گـۆڕێکی بەکۆمـەڵ لەگونـدی (کـورێمی) لـەپارێزگای (دهـۆك) دەرهێنانەوە (27) لاشەی کەسانی ڕەمیکراو لەلایەن هێزەکانی سوپاوەو جەختیکردەوە لەسەر ئەوەی کەگشت قوربانیان لەدۆخی دانیشتندا بون و ئەمەش هاوڕێکە لەگەڵ ووتەی ڕزگاربوان لەم کردەوەی لەسێدارەدانە وەك قوربانی (قەهار خەلیل)ی ڕزگار بوو لەمەرگ باسیکرد( هەروەك جەختیکردەوە لە بونی ( 84) بریندار بەفیشەك و ( 10) بریندرایان لەسەریان و (24) برینداریان لە بەشی سەرەوەی سنگیانی دابون و (65) برینداریان لەبەشی حەوزیانی دابوون و ژمارەیەکی کەمیان بەر ئەملاولایان کەوتبوو، کاتێك فەرمان بەقوربانیانکراوە دابنیشن لەبەردەم تیمەکانی کوشتندا، هەوەها لەوتەکانی پسپۆڕ (سنۆ)دا هاتووە کاتێك لەناوچەکە بوین لەڕێی لاوێکەوە بەناوی ( فاخر تەها ) زانیمان کەدایکی و خوشکەبچوکەکەی (فەرمان تەها) لە(جەژنی کانی) مردوون لە هەولێر کاتێك لەگەڵ هەزاران ژن و منالی تر مردون بەهۆی بارودۆخی سەخت و کەمخۆراکی و توانیمان قەناعەت بەلاوەکە بێنین بۆ ڕێنوێنی کردنمان بۆ گۆڕەکان وە پێشی وتین کە شیری دایکی وشکی کردووە پاش چەند هەفتەیەك لەگیرانیان، پاش پشکنینی منالەکە بۆمان دەرکەوت کە تەمەنی نزیکەی (7) مانگ بووە بەلام گەشەی پەیکەر ئێسکەکەی زۆر جیاواز بووە کە دواکەوتووە لەگەشەکردنی ئێسك بەهۆی کاریگەری بەدخۆراکی سەخت لەسەر ئێسکەکان، وئەمەش بیرۆکەی چۆنێتی وسەختی ژیانی گیراوەکانی داینێ بەتایبەت منالەکان.

پاشان پسپۆڕەکە (سنۆ) دەڕوات بۆ گوندی (بەرجینە) کەگوندێکی بچوکی نزیکی (کورێمی) ییەو توشی بۆمبارانی کیمیاوی هاتوە لەڕۆژی 1988/8/25 کە لەناوقوربانیانیاندا پیاوێکی بەتەمەن هەبوو ناوی (حەسەن سەلاح حەسەن)و کوڕەزاکەی (دژوارحەمید حەسەن )ی تەمەن پانزەساڵ هەبوون کەبەهەڵە لەبری ئەوەی بەرەو سەرەوە ڕاکەن بەرەوناو دۆڵەکە ڕایان کردبوو ڕێنوێنیان کردین بۆگۆڕەکەیان و ئێمەش هەڵماندایەوە وپەیکەرە ئێسکی پیاوە بەتەمەنەکەو کوڕەزاکەیمان بەجلەکانیانەوە دییەوە، هەروەها ئەم پسپۆڕە چەندین شوێنی تەقینەوەی بۆمبی بینیوەو نمونەی خۆڵەکەی وەرگرتوەو ناردویەتی بۆولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەڕێی پشکنینی تاقیگەییەوە دەرکەوتوە کەگازی (خەردەل و سارین ) لەوناوچەیە بەکارهاتوە،

وەلەگوتەی شایەتی دکتۆری پسپۆر(ئەسفندیار ئەحمەد شوکری ) لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2006/11/29 دا هاتووە کەسەردانی سەربازگەی پەنابەرانی لەتورکیا کردوە لەسەربازگەی (دیاربەکر)کە (13) هەزارپەنابەرو (ماردین ) (5) هەزارپەنابەریان تێدا بووەو چاوەپێکەوتنی لەگەڵ ئەوانە کردوە کەخەڵکی (بالیسان، یەکماڵە ، هیبس وبەرجینە) بوون وهەموو ئەوانەی کەچاوپێکەوتنی لەگەڵ کردوون بریندابوون لەکاتی بۆمباران بە:

أ – کزانەوەی چاو.

ب– کێشە لەکۆئەندامی هەناسە.

ج– کێشە لەکۆئەندامی هەرس.

د–سوتانەوەو کزانەوە لە کۆئەندامی هەرس.

ئەمە سەرباری ئەو کاریگەرییانەی کەلەسەرلاشەی برینداڕەکان بینویەتی (کەڕێگ گونجاوە لەگەڵ کاریگەربوون بەوبرینە ڕەنگدارانەی کەلەسەرپێست بەدەرکەوتوە کەبەشی ناوەندڕەنگی تاریك تر بوە، ئەم بەشە برینداریە تەواو گونجاوە لەگەڵ ئەوجۆرە مامەڵە کردنەی کەنازییەکانی (ئەڵمان ) لەجەنگی جیهانی دووەم بەکاریان هێناوە). پزیشکەکە زیاتر دوا کەپشکنینی یەکێك لەکچەکانی کردوە کەدووچاری بەرکەوتنی چەکی کیمیایی بووەو ووتی (کچەکەمان پشکنی بینیمان بلقێك لەسەرسنگێتی و لەنێوان دوومەمەکە بچوکەکەیدا بووە هەروەها شوێنی کۆن بوونی برینێکی کۆن هەیە لەسەرلێوی خوارەوەی و لەوێدا برینێك لەژێر بڕۆی لای چەپیدا هەبووە هەروەها پاشماوەی برینێك لەڕومەتی چەپیدا درێژبۆتەوە بەجۆرێك کەلەناوەندا ڕەنگێکی تۆخترو تاریکتری هەیەو لەدەوری ڕەنگەکە تاریکتر دەبێت کە شێوازی جوگرافی بەدەردەخات بۆ بەکارهێنانی گازی (خەردەل)و پسپۆڕەکە گەیشتە ئەو ڕاستییەی کەگازی (خەردەل و سارین) لەکوردستان بەکارهاتووەو بەکارهێنانی گازی (خەردەل) بەشێوەیەکی زۆر فراوان بەکارهاتووە.

پرۆفیسفۆر (مایکڵ ترێمبڵ) ووتی کەکارەکەی هەوڵێکی دووساڵەیە لەکارکردن لەژێر چاودێری دادگای باڵای تاوانی عێراق وبە یارمەتی پسپۆڕەکانی وڵاتەیەکگرتوەکان و ئوستورالیاو کوستەریکاو کەنەدایە وسەربەرشتی هەڵدانەوەی (3) گۆڕی بەکۆمەڵی کردوە ئەوانەش (نەینەوا /2) (نەینەوا /9) (موسەنا /2) هەروەك پسپۆڕەکە ڕایگەیاند کەهەردوو گۆڕی (نەینەوا /2 و نەینەوا/ 9 ) دەکەوێتە سەرلێوارە دوو دۆڵی بچوك کەلە دۆڵێکی گەورەدا بەیەکدەگەن بەجۆرێك ئەو کەسانەی کەبەلای باشوردا دەڕۆن ئەو کەلوپەل و کەرەستانە نابینن کەلەو گۆڕانەدان لەبەرئەوەی لە لێواری نادیاریدایە، و پسپۆڕەکە زیاتر وتی کە گۆڕی موسەننای /2 مان هەڵداوەتەوە و ( 123) لاشەی قوربانیانی لێدەرهێنراوە کەهەمویان کوژراون وئەم گۆڕە پێکهاتووە لەتەنها ژن و مناڵ و کە لەناویدا (25) ژنی کامڵ و (98) منالی تێدابووە و 90٪ یان

لەژێر تەمەنی 13 ساڵەوە بوون هەروەها ئەم پرۆفیسۆرە ئەوەی ڕاگەیاند کەچەند سیناریۆیەك هەیە بۆ کوشتن و ڕەمیکردنی قوربانیان:

1- کۆمەڵ کۆمەڵی بچوك لەلێواری چاڵەکە بەستراونەتەوە و بەفیشکی دەمانچە لەباری وەستاندا فیشەکیان ناوە بەتەپڵی سەریانەوەو لەدواوە فڕێدراونەتە ناو چاڵەکەوەو دەستتڕێژیان لێکردون.

2- بەهەمان ڕێگای پێشوو قوربانیان لەسەر ئەژنۆ دانراون و لەپشتەوە تەقەیان لێکردون.

3- کۆمەڵ کۆمەڵ قوربانیان لەلێواری گۆڕەکان بەستراونەتەوە و فیشەکیان پێوە ناون و کەوتونەتە ناو گۆڕەکە یان لەناو گۆڕەکەدا نوشتانویاننتەوەو تەقەیان لێکردون.

پسپۆڕەکە زیاتر ئەوەشی ڕاگەیاند کە قوربانیان ژیانیان هەبووەو ترسیان هەبووە ئەوان شادی و هەستیان هەبووە یەکێك لەژنەکان ملوانکەیەك و هەندێك خشڵی پێوە بووە کە ئەڵقەو موستیلەیەك بووە.

بچینە سەر بارێکیتر کە کۆرپەلەیەك بووە لە سکی دایکیدا کە (6-7) مانگ بووە، پاشان پرۆفیسۆرەکە لەمیانەی ماوەی کارکردنی گۆڕێکی بەوقوڵاییە کە( 3,5 ) مەتر کەئەمەش بۆیە ئاوها بەو قوڵاییە دروستکراوە تا نەبینرێت، هەروەها ناوبراو باسی ئەوەشی کرد کە هەندێك پێداویستی تایبەتی و ناسنامەی دۆزیوتەوەو داویەتی بەدادگاو دەستەی دادگا تا ئەوە ڕونبکاتەوە کەگوتەی قوربانیان و ناو دادگا لەگەڵ ئەمەدا هاوڕێك و تەبایە بەشێوەیەك کەهیچ خوێندنەوەیەك هەڵناگرێت و قوربانیان دانیشتوانی گوندە کوردییەکانی ڕاگوێزراون لەپرۆسەکانی ئەنفال.

پسپۆڕەکە زیاتر وتی کەهەستاوین بەدەرهێنانەوەی (64) لاشە لەگۆڕی بەکۆمەڵی (نەینەوای 2) وگشت قوربانیانی ناو ئەم گۆڕە نێرینەی پێگەیشتوو بون و بەچەکی ئۆتۆماتیکی کوژراون، بەڵام گۆڕی بەکۆمەڵی (موسەننای 2) و زیاتر پسپۆڕەکە وتی کە (114) لاشەمان لەوگۆڕە دەرهێناوەتەوە کە (27) ژنی پێگەیشتوو (2) پیاوی پێگەیشتوو (85) منداڵ تێدا بووە و پسپۆڕەکە زیاتر وتی کە گشت قوربانیان ڕەمیکراون و لەباری وەستاندابون پسپۆڕەکە وتیشی کە هەموو قوربانیانی دەرهاتوو لەگۆڕی بەکۆمەڵی (نەینەوای 2، و نەینەوای 9 و موسەننای 2) جلو بەرگی ئاسایی کوردییان لەبەردا بووەو ئەوەشی ڕاگەیان کە گشت گۆڕەکە ئامادەکراوو لەسەر هەمان شێوازی ڕێکخراوبوون.

### گۆڕە بەکۆمەڵەکان :

ئەو گۆڕە گەورانەن کەلاشەی کوردانی ئەنفالکراویان تێدا نێژراوە لەژن و پیاوو منداڵ پاش کردەوە سەربازییەکان و ناونراون بەگرتوخانە گەورەکانی وەك (1) گرتوخانەی (تۆپزاوا)، (2) گرتوخانەی دبس (3) گرتوخانەی قەڵای نزارکێ، وگرتوخانەکانی فەرمانگەکانی ئاسایش لەپارێزگاکانی کوردستان و گرتوخانەی سەلامییە لەپارێزگای موسڵ و هەوڵێك زۆر دراوە بۆ

پشکنینی گۆڕە بەکۆمەڵەکان و بەشداربوان تێیدا. زاناکانی بواری ڕەگەزی مرۆیی و دکتۆرە پسپۆڕەکانی لەپزیشکی داوەری و ڕێکخراوە مرۆییەکان و پسپۆڕە نێو دەوڵەتییەکان و کادرە هونەری و کارگێڕییەکان و تاقیگەکان و هەوڵێکی کۆکراوەی کرێکارانی پشکنین لەژمارەیەک لەگۆڕی بەکۆمەڵی گەورەو دابەشبون لەناوچەی جوگرافی جیاواز لەناو عێراقداو دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق (4) بەرگی ئامادەکردووە کە پێکهاتووە لە وردەکاری ئەو گۆڕانە کە ئەوانیش ئەمانەن:

گۆڕی بەکۆمەڵی پارێزگای موسەنناو ژمارەی (موسەننا/2) ی دراوەتێ، گۆڕی بەکۆمەڵی پارێزگای نەینەوا و ناوو ژمارەی نەینەوا/2 و نەینەوا /9 ی دراوەتێ، گۆڕی بەکۆمەڵ لەگوندی (کورێمی) کە پێک هاتووە لە (27) لاشەو بەڕێز پسپۆڕی نێودەوڵەتی (سنۆ) هەستاوە بەهەڵدانەوەی و لەبەردەم دادگادا شایەتی لەسەر داوە لەدانیشتنی (24) لە 2006/11/28 لەگۆڕی بەکۆمەڵی موسەنناى 2، پسپۆڕی نێودەوڵەتی بەڕێز (مایکڵ تریمبل) (114) تەرمیان دەرهێناوە بە درێژایی (9)ڕۆژ کە هەموویان کوژراون و لەسێدارە دراون بەچەکی کیمیاوی و لەباری وەستاندا بون و لەناویاندا (85) مناڵ و (27) ژن و (2) پیاوی کامڵ و پسپۆڕەکە وتی (95٪) ی مناڵان تەمەنیان لەخوار (13) ساڵییەوە بووە و گشت قوربانیان جل و بەرگی ئاسایی کوردیان لەبەردابووەو پسپۆڕەکە زیاتر وتی هەستاوین بەگێڕانەوەی (50) جۆری جیاواز لەبەڵگەنامە کەلەگەڵ پاشماوەی جەستەی قوربانیان بووە، وزۆربەی بەڵگەنامەکان پارەی عێراقین و هەندێکیان بەڵگەنامەو پێناسی کەسێتی و مەوادی چاپکراووبون هەستاوین بەڕێکخستنی (16) پێناسی کەسێتی و (6)یان زۆر لەبارێکی باش و پاکدان، وهەستاوین بەدەرهێنانەوەی بەڵگەیەکی دەستنوس کەلە چەند لاپەڕیەک پێکهاتووە، و پسپۆڕەکە دەڵێت ئەو جل و بەرگانەی گێڕاومانەتەوە (73) یان ژنانەو (26) یان هی نێرینەیەو لەئاماژەکانی جلو بەرگی ژناندا دەردەکەوێت کە(28) یان پێگەیشتوو (12) یان لەژێر تەمەنی پێگەیشتندابون و(13-70) ساڵ (28) منالی (3-7)ساڵی و (5) منالی شیرەخۆرەو ئاماژەکانی جل و بەرگی پیاوان بۆ ئەوەیە کە(4) یان پێگەیشتوو (13) یان لەژێر تەمەنی پێگەیشتن و( 27)یان مناڵ بون و تەنها یەک شیرە خۆرەشیان تێدابووە پسپۆڕەکە دەڵێت: لەو پێداویستییە کەسییەکانی لەگەڵ لاشەی قوربانیان دۆزراونەتەوە خشڵ و زێڕوزیو و ئارایشت و کەل و پەل و وردەواڵەو شتو مەکی ناومال و کەلو پەلی (93) کەسیان هەڵگیراون و ڕێکخراون لەوانە (7) ملوانکەو (14) قوتوی ئارایشت و (14) قوتوی بۆن و جل و بەرگەکان و مادە ڕۆشنبیرییەکان ئاماژەن بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی لەگۆڕی بەکۆمەڵی موسەننای 2 دا بوون پێک هاتون لەڕەگەزی کوردو پسپۆڕەکە زیاتر وتی گێڕانەوە و دەرهێنانەوەی فیشەک لای نێرینەو مێیەنکانیش لەهەموو تەمەنەکان هەبون، (بەواتایەکی تر لەناو لاشەی هەموویان هەبوون و دەرهێنراونەتەوە) هەروەک دەرهێنانەوەی فیشەک لەلاشەی (71) کەس و جارێکیتر بەستنەوەیان بەپاشماوەی ئێسکەکانی

(37) کـەس و کـە(79) فیـشەك و (4) بـەرگ لـە فیـشەك لـە نێـوان جـل و بـەرگ وپاشمـاوەی ئێسکەکان و (83) فیشەك و (28) بەرگی فیشەکی پێوەبەستراوە بەجل و بەرگی مردووەکان یان کەل و پەلـەکانیان، و کۆکردنـەوەی( 48) فیـشەك و (93) قـاوغی فیـشەك لـە نـاو گۆڕەکانیـان و تێبینـی کـون بـونی جلـی قوربانیـان بـە فیـشەك دەکرێـت و کونـەکان زۆر ڕونـن لەناوجلەکانـدا کەکلێنـچکەی گرتـون، وەکـو کـراس و کراسـی کـچان و چـاکەتەکانیان و دەرهێنانـەوەی ئـەو حەبلانەی دەستیان پێ بەستونەتەوەو هەروەها دەرهێنانەوەی ئەو پارچە قوماشانەی چاویان پێبەسـتونەتەوە لـەکاتی ڕەمیکردنـداو لـە شـیکردنەوەی بەڵگەکانـدا دەرکـەوتووە کـە قوربانیـان چونەتە نـاو گۆڕەکـەو بەیـەکجار ڕەمیکـراون و هەسـتاون بـە شـیکرنەوەی کاریگـەری تاونکـاری پزیـشکی لەسـەر پاشماوەکـانی پەیکـەرە ئێـسکییەکانی کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ (114) کـەس کـە لـەگۆڕی بەکۆمـەڵی موسـەنناى 2 دەرهێنـراون و ئـەم پاشماوانـە نـاوەڕۆکی گـشت گۆڕەکـەن و لەسەرگـشت پەیکـەرەکان هـەر (114) پەیکەرەکـە کـە (109) یـان توشـی برینـداری بـون لـە جومجومـەکان یـان دەروەی جومجومـەکانیان، سـەلماوە کـە (114) پەیکـەرە ئێـسکیەکەی کـە پشکنینی بۆ کراوە برینداربون بـەتێگرتنی ڕێـژەی (6) تێگـرتن بـۆ هـەر یـەکێکیان و زۆربەشیان داویـەتی لەناوشـانیان، نەینـەوای /2 و نەینـەوای 9 دوو نـاون بـۆ گـۆڕە بەکۆمەڵـەکانی ناوچـەی حەزەر کە پشکنینیان بۆ کراوە لەگۆڕی بەکۆمەڵی نەینەوای 9 دا، پسپۆڕی نێودەوڵـەتی (مایکڵ ترێمبڵ) دەڵێت: (123) ڕوفاتمان دەرهێنایەوە کە (25) ژنی پێگەیشتوو و (98) منـاڵ و (90٪) ی لەخوار تەمەنی 13 ساڵیەوە بون کەهەمویان ڕەمیکراون و (145) بەڵگەمان بەدەستهێناوە لای ڕوفاتەکانی گۆڕی بەکۆمەڵی (نەینەوا/2) و (نەینەوا/9) کە پێك هـاتون لـە ناسنامەی کەسێتی و بڕونامـەی تـەواوکردنی سـەربازی (دفتر خدمـە العسکریە) و بڕوانامـەی مووچـە و وێنـەو نامـەو مەوادی کەسیترو لەم بەڵگەنامانەدا (63) ناسنامەی کەسی و (10) یان پەیوەستن بە تاکـەکانی ناوچەی سلێمانی و هەروەها پسپۆڕەکە دەڵێت: لەپشکنینی بەشەکانی جلەکانی کە لەهەردوو گۆڕی بەکۆمەڵی (نەینەوای 2 و نەینەوای 9) دەرهاتون بەئامانجی شیکردنەوەی بنەچەو تەمـەن و جـۆری کۆمەڵایـەتی لەشـیکردنەوەی (123)  بـاردا دەرکـەوتووە کـە لەبنەچـەدا کـوردن بـەپێی تەمەن و وردەکاری جل و بەرگی گەڕاوەو لە ناوچەی گۆڕی (نەینەوای 2 ).

کەدەرئەنجامـەکان ڕێك گونجـاون لەگـەڵ(76) مێینـە (27) نێرینـەو جلـەکان ڕێنـوێنی دەکـەن بـۆ ئەوەی کە (36) ژنی پێگەیشتوو (30) کچی تێدابووەو جلی نێرینەکان ڕێنوینی ئەوە دەکەن کە( 27) لەلاوەکان نەگەیشتەنەتە تەمەنی پێگەیشتن، لە گۆڕی بەکۆمەڵی (نەینەوا/9)دا جلەکان ئەوە دەسەلمێنێت کەهەمویان پێگەیشتوو بون و بەجیاکاری لەبونی مێینە لـەم گۆڕەدا کەسـەکان جـل و بـەرگی تێکەڵـەی کـوردی  و عـەرەبی باویـان لەبـەردابووەو دیارترینیـان لـە جلـەکان شـەرواڵی کوردییـە بونی (9) کـەس کـە پـشتێنی کوردییـان بەسـتووەو گـشت هـەموو ئـەم بەڵگانـەش لـەناو گۆڕی بەکۆمـەڵی نەینـەوای 9 دا بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ڕوفاتـەکان ئەگەڕێتـەوە بـۆ نێرینـەی

لاوانــی بەبنەچــە کــورد، لــە گــۆڕی بەکۆمــەڵی (نەینــەوای 2 ) دا کــە (1161) پارچــەی لــێ گێردراوەتەوە لە (53) لاشە لەکۆی ( 123) لاشەی ڕوفاتــەکان زۆربــەی مادەکان گونجاون لەگەڵ ژنانی پێگەیشتوو وەکو کەلوپەلی ناوماڵ وەکو کەوچك و چەتاڵ و پێداویستی دورینەوە (دەرزی و دەزو) و کەلو پەلی کەسی و دەرمان و پشکنینی (57) پارچە خشڵو زێڕ و زیو لەژمارەیەك باردا بونی هەندێك جل وبەرگی زیادەی پێچراوە لەناوکیسی پلاستیکیدا .. و لە ناوچەی (نەینەوای /9) پیاوەکان چەند چینێك جلو بەرگیان لەبەردا بووە کە (9) کەسیان پێناسی کەسێتیان پێبووەو خشڵەکان کە (11) کاتژمێریان تێدا بووە لەگەڵ ( 5) موستیلەو (50) کەسیان دراویان پێ بووەو هەندێك لەکەسەکان لەناوگۆڕەبەکۆمەڵەکانی نەینەوای 2، 9دا دەرمانیان پێبووەو حەبلی دەست بەستنەوەکانیش لەگەڵ زۆربەی ڕوفاتەکاندابون لەناو گۆڕەکان، یەکێك لە کەسەکان جانتای پێبووە و دوو کەس کلیلیان پێبووە، و پەڕۆی چاو بەستنەکان (8) پارچەیان تێدا بووە لە گۆڕی نەینەوای 2 و نەینەوای 9 و بونی (47) کەلەپچە لەو گۆڕەی کە (64) پیاوی پێگەیشتوی تێدا بووە و لەگەڵ پەڕۆی چاو و دەمبەستن و کۆتەکان بەشێوازی حەبل بون لەسەر مەچەکی (48) کەس.

سێهەم: کورتەی گوتەکانی تۆمەتبار ( علی حسن المجید) دژی تۆمەتبار ( سوڵتان هاشم أحمد ):

تۆمەتبار (علی حسن المجید) لە وتەکانیدا لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2004/12/18و لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوە بیریهێنایەوە کە یەکە سەربازییەکان و فەوجەکانی پارێزگاری نیشتمانی بەرپرسن لە کردەوەکانی ئەنفال و تۆمەتبار (سوڵتان هاشم أحمد ) سەرکردایەتی پرۆسەکانی لەناوچەی سلێمانی کردووەو تۆمەتبار(علی حسن المجید) لە ووتە تۆمارکراوەکانی لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2007/2/7 دەڵێت: فەریق (سوڵتان ) سەرۆکی فەیلەقی یەك بووەو بەرپرس بووە لەهەردوو یەکەی ناوچەی سلێمانی و کەرکوك و تۆمەتبار (علی حسن المجید)کە گشت دەزگاکانی دەوڵەت لەمەدەنی و سەربازی لەناوچەی باکور بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەست بون بەمنەوەو من شتی ئاوام باس نەکردووە.

چوارەم: کورتەی ووتەکانی تۆمەتبار ( حسین رشید) دژی تۆمەتبار ( سوڵتان هاشم أحمد) :

تۆمەتبار (حسین رشید) لەوتە تۆمارکراوەکانی لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەدا لەبەرواری 2005/9/12 دەڵێت: فەرمانم دا بەتۆمەتبار (سوڵتان هاشم ) بە سەرکردایەتی کردنی کردەوەکانی ئەنفالی یەك و کردەوەکە بە ئاراستەی ( سەرگەڵو بەرگەڵو و کانی تو) و شوێنیتر بوو وتۆمەتبار (حسین رشید) زیاتر وتی: بەنیسبەت کردەوەکانی پرۆسەی ئەنفالی دوو و فەرمانگەی پرۆسەکان نوێنەرێکی نارد بۆ فەیلەقی یەك بۆ توێژینەوەی پلانەکە بەشێوەیەکی هەمەلایەنە.

پێنجەم: کورتەی ووتەکانی تۆمەتبار (فەرحان موتڵەگ) دژی تۆمەتبار (سوڵتان هاشم أحمد) :

تۆمەتبار لەوتەکانیدا لەبەردەم دادگا لەبەرواری 2007/2/15 دەڵێت: کە کردەوەکانی ئەنفال کردەوەی سەربازی ڕوت بون کە یەکە سەربازییەکانی فەیلەقی یەك و دوو و پێنج پێی هەستاون لەگەڵ فەوجەکانی پارێزگاری نیشتمان ( جاشەکان)و بەچوار قۆناغی سەرەکی ڕویانداوە کە ئەمانەن:

1- قۆناغی یەکەم قۆناغی بۆمبارانی سەرەتاییە.

2- قۆناغی هێرشی زەمینی.

3- قۆناغی لابردنی گوندەکان.

4- قۆناغی گوێزانەوەی خەڵکەکە بەئۆتۆمبێلی سەربازی بۆ نوسینگەی ڕێکخستنی باکورو بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئاسایش.

کورتەی گوتەی پارێزگاری تۆمەتبار ( سوڵتان هاشم أحمد):

تۆمەتبار لەوتەکانیدا لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەدا لەبەرواری 2005/3/20 باسی ئەوەی کرد کەسەرکردایەتی کردەوەکانی ئەنفالی یەکی کردووە کە ئەرکەکەی داخراوبووە لەچوارچێوەی باکوری ڕۆژهەلأتی سلێمانی لەماوەی ( 10-15) کم و لای چەپەوە تادوکان و بەئاڕاستەی قولأیی ئێران و چەقی کردەوەکەش گوندەکانی ( سەرگەلو بەرگەلو) کەبارەگای یەکێتی نیشتمانی کوردستانی تێدا بووە، تۆمەتبار زیاتر وتی کەفەرمانی لەسەرۆکی ئەرکانی سوپا (نزارعبد الکریم خەزرەجی ) وەرگرتووە یان یاریدەدەری سەرۆکی ئەرکانی سوپا (حسین رشید)و زیاتر وتی تۆمەتبار سەرۆکی ئەرکانی سوپا (نزار عبد الکریم) بەهۆی یاریدەدەرەکەیەوە (حسین رشید)ەوە کردەوەکەو دۆسیەی کردەوەی ئەنفالی یەکی پێ سپاردم.

تۆمەتبار (سوڵتان هاشم) وتی کاتێك سەرۆکی فەیلەقی یەك بوم هەماهەنگی هەبووە لەنێوان من و نوسینگەی ڕێکخستنی باکور کەتۆمەتبار (علی حسن المجید) سەرۆکایەتی دەکرد لەفەرمانی (4008) لە1987/6/20و دەڵێت کردەوەکانی ئەنفال و بەشێکی لەلایەن فەیلەقی یەك بەسەربەخۆیی و بەهاوبەشی لەگەڵ فەیلەقی دوو و پێنج و ئەرکی گرنگمان دەرکردنی تێکدەران بوو بەپاککردنەوەی ناوچەکەو گوێزانەوەی کەسەکان و خێزانەکان لەو گوندە یاساغانە لەڕوی ئاسایشییەوە و سپاردنیان بە نوسینگەی ڕێکخستنی باکور لەڕێی مەنزومەی ئیستخباراتەوە.

تۆمەتبار دەڵێت: لەکاتی پرۆسەکانی ئەنفالدا سنوری جێبەجێکردنی فەرمانە دەرچووەکانی سەرۆکایەتی ئەرکانم تێنەپەڕاندووە کەناسراو بوو بەکردەوە سەربازییەکان بۆ پاککردنەوەی ناوچەی باکور لەدوژمنی ئێرانی و پاسەوانانی خومەینی و پێشمەرگەو چەکدارە هاوکارەکان پشت بەستبوو بەدوژمن.

هەروەك تۆمەتبار لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەدا ئیفادەی داوە کە نەفەرمانی دەرکردووە و نەفەرمانی وەرگرتووە تایبەت بە تەقەمەنی تایبەت (چەکی کیمیاوی) و هیچ زانیارییەکی نییە

بەبونی چەك و تەقەمەنی تایبەت هەروەك لەپارێزگارییەکەی باسی کردووە لە بەردەم دادگا کە مەدەنی نەکوشتووە.

تۆمەتبار لەخۆپارێزییەکەیدا لەبەردەم دادگا هەستاون بەگوێزانەوەی خێزانەکان بەهۆی ئۆتۆمبێلی سەربازییەوە لەناوچەکانی جەنگەوە بۆ نوسینگەی رێکخستنی باکور لەگەڵ ناومالْ و پێداویستییەکانیان و زیاتر دەربارەی گوڕە بەکۆمەڵەکان و بەتایبەت خەڵکانی گوندی (سیدەر) لەناوچەی سلێمانی کە ڕوفاتی تێدا دۆزراوەتەوە کە هیچ زانیارییەکی نییە سەبارەت بەوگۆڕانەو ئەرکی ئەوە بووە کەخێزانەکان گەمارۆ بدات و بیانسپێرێت بەنوسینگەی رێکخستنی باکورو لەبەردەم پرسیارێك لەلایەن دادوەری لێکۆڵینەوە لەسەر شەرعییەت و ناشەرعییەتی گوێزانەوەو لابردنی گوندەکان تۆمەتبار وەڵامی ئەوە بوو کە لەباری جێبەجێ نەکردندا حوکمی لەسێدارە دەدرام بەپێی یاسای سەربازی لەکاتی جەنگدا.

کە بڕیارە لەلایەن وەزارەتی شەهید و ئەنفال پاش وەرگێڕان بەدیکۆمێنت بکرێت لەکتێبێکی دانسقەداو بەهەر سێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بڵاوبکرێتەوە

# کوردستان وەك مەڵبەندی جینوساید

د.ئەمیر حەسەنپوور

من لێرەدا باسی مێژووی کۆکوژی هەڵەبجەو ئەنفال ناکەم، هەڵەبجەو ئەنفال نەبڕاونەتەوەو دەکرێ بڵێین بەشێوەی دی درێژەیان هەیەو لەداهاتووشدا دواییان نایا، ئەگەربمانەوێ باسی ئێستەو داهاتووی ئەنفال بکەین، ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئەو بارودۆخەی جێنۆساید وەرێدەخا کۆتایی هاتوە یا هێشتا بەردەوامە؟

1. **کوردستان وەك "مەڵبەندی جێنۆساید"**

مارك لێڤین، مێژوونووسی جێنۆساید، دەڵێ ئەنەدۆڵی رۆژهەڵات، کەهەرمەنستان و کوردستان و مێزۆپۆتامی دەگرێتەوە، لەساڵی 1878 بەولاوە کرا بە "مەڵبەندی جێنۆساید". لەو ساڵەدا، دەوڵەتی عوسمانی دەستی کرد بەقەڵاچۆی گەلانی هەرمەنی و ئاشۆری و لەساڵانی1915 هەتا 1923 ئەو دوو گەلەیان بەقڕان کرد، لەساڵی 1917 دا، دەوڵەتی عوسمانی، لەجەنگی هاندانی کورد لەدژی گەلانی ئاشۆری و هەرمەنی، دەستی کرد بەراگوێزتنی کوردان بۆ دەرەوەی کوردستان، کەدەوڵەتی عوسمانی هەڵوەشاوە (1918) و دەوڵەتی عێراق لەژێر چاودێری ئینگلستاندا دامەزرا (1918–1932)، لەکۆماری تورکییە جێنوسایدی کوردان درێژەی پێدراو لەکوردستانی عێراق، لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا، لەپێشدا لە1963 و دوای لەساڵانی 1968 هەتا 2003 دا، مەڵبەندی جێنۆساید چالاك بووەو گەلی کوردو ئاشوری بەکوشتار، وێرانکردنی گوندەکان، راگوێزتن، زمانکوژی، و کولتورکوژی وەبەرلێشاوی جێنۆساید کەوتن، لەئێران (بەتایبەتی لەحکوومەتی رەزا شادا)و سووریەش (بەتایبەتی لەساڵانی 1960 بەولاوە) پڕۆژەی جێنۆساید لەئارادا بووە.

مارك لێڤین دەڵێ جینۆساید لەو ناوچەدا قاعیدەیە نەك ئیستیسنا، راستبوونی ئەو بۆچوونە لەتەجرەبەی گەلانی ناوچە (کورد، هەرمەنی و ئاشۆری) دەردەکەوێ، لەو چوار وڵاتانەدا، "جینایەتی شەڕی"، "جینایەتی دژی بەشەرییەت" و جێنۆساید بەشێك لەئامرازی دەکارهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەتیین، دەوڵەت زۆر بەئاسایی سوپای بۆکوشتارو وێرانکردن دەکارهێناوەو پابەندی هیچ قانوونێك، چ ناوخۆیی چ نێونەتەوەیی، نەبووە، کانگای جێنۆساید لەناوچەدا ناسیۆنالیسمە، لە تورکییە، ناسیۆنالیسمی تورك (تورکایەتی "کومیتەی ئیتحادو تەرەقی" پێش 1919 و تورکایەتی مستەفا کەمال دوای 1923)، لەعێراق و سوورییە، ناسیۆنالیسمی عەرەب (بەتایبەتی بەعسێتی)، و لەئێران، ناسیۆنالیسمی فارس (بەتایبەتی چەشنی پەهلەوی) سەرچاوەی جێنۆسایدو جینایەتی شەڕی و جینایەتی دژی بەشەرییەت بوون، لەسیاسەت و

ئیدەئۆلۆژی ناسیۆنالیسمی دەوڵەتی ئەو وڵاتانەدا، داوای بەرابەریکردن وەك بەرنامەی جیابوونەوەو بەشبەشکردنی نەتەوەو وڵاتەکەی چاوی لێدەکرێو سزای ئەو "تاوانانە"ش کۆکوژییە.

**2. گۆڕانی باروودۆخی جێنۆساید**

لەتورکییەو سوورییەو ئێران، بارودۆخی وەرێخستنی جێنۆسایدو جینایەتی شەڕی بەردەوامە، تەنیا لەعێراق، سێ ساڵ دوای هەڵەبجەو ئەنفال، گۆڕانێکی بەرچاو لەدەسەڵاتی دەوڵەتی پێکهات لەپێشدا، دوای شەڕی 1991ی ئەمریکا لەدژی سەدام، بەشێك لەکوردستانی عێراق لەدەستی دەوڵەتی بەغدا هاتەدەرو حکوومەتی هەرێمی کوردستان پێکهات، شەڕی دووەمی ئەمریکا لە2003، ڕیژێمی بەعسی لابردو ڕیژێمێکی دی لەجێگەی دانا، نوێنەرانی قوربانییەکانی ئەنفال (رابەرایەتی کوردو شیعە) جێگەی قوربانیکەریان (ڕیژیمی بەعس گرتەوە)، لەرواڵەتدا، وێدەچێ ئەو بارودۆخەی کەجێنۆساید پێکدێنێ چیدی لەئاردا نەماوە، ئەو ڕیژیمەی ئێستە لەبەغدا دەسەڵاتی هەیە، بەپێچەوانەی ڕیژیمی بەعس یەکدەست نییە" دەسەلآتی دەوڵەتی بەگوێرەی قەومییەت (عەرەب و کورد)، دین (ئیسلام، مەسیحی)، و مەزهەب (شیعەو سونە) دابەشکراوە، ئەوە دابەشکردنی دەسەڵات بەشێوەییێکی بەرابەر یان دیمۆکراتی نییە، راستییەکەی ئەوەیە کەناسیۆنالیسمی عەرەب هێشتا بەسەر دەوڵەتی بەغدادا زاڵە، رابەرایەتی شیعە بەکردەوەو بەقسە ئەوەی سەلماندووە کە لەئاست کێشەی کورد جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ بەعس نییە، یەکدەنگی یان وێکچوونی ئەو دوو بەرەی ناسیۆنالیسمی عەرەب لەسیاسەتی رابەرایەتی شیعە سەبارەت بەکێشەی کەرکووك، فێدرالیسم، نەوت، سنوورەکانی کوردستان، یان محاکەمەی سەدامو دەستەو دەیارەکەی باش روون بۆتەوە، با ئەنجومەنی وەزیران لەبەغدا بەبۆنەی ساڵرۆژی کۆکوژی، شەش ملیۆن دۆلار تەرخانی ئاوەدانکردنەوەی هەڵەبجە بکا، یا لەسەرانسەری عێراق بەیادی کۆکوژی بۆ ماوەی یەك خولەك ماتەمگێری بکرێ – ئە وانەو زۆر کاری وا ڕیژیمی ئێستە لە ڕیژیمی پێشوو تەواو هەڵنابڕن.

تاقیکردنەوەی راستەقینە کاتێك دێ کەحکوومەت دەسەڵاتی تەواو (سیاسی، عەسکەری، ئیداری، و ئابووری) بەسەر بەغداو بەشی عەرەبی عێراقدا پەیدا بکا، وەك حکوومەتێك سەقام بگرێ، و لەسەر پێی خۆی راوەستێ، ئەگەر شتێکی وا پێك بێ، دەستوورو قانوونو پەیمانو بەڵێنی هیچکام ناتوانێ بەر بەبەرژەوەندی بەشی زۆرینەی ڕیژیم بگرێ" تەنانەت بوونی فراکسیۆنێکی کورد لەحکوومەتدا ناتوانێ پێشی زەبرووزەنگی زۆرینە (ناسیۆنالیستی جۆراوجۆری عەرەب هەم ئیسلامیو هەم سکوولار) بگرێ، بیانووی پاراستنی "نیشتمانی عەرەبی" لەگەڵ بیانووی پاراستنی یەکێتی "ئومەتی ئیسلام" تێکدەهاڵێ و مەکینەی جێنۆساید وەکار دەکەوێ.

UNITED NATIONS

GENERAL ASSEMBLY

Distr.
GENERAL

A/5429
2 July 1963
ENGLISH
ORIGINAL: RUSSIAN

Eighteenth session

MONGOLIA: REQUEST FOR THE INCLUSION OF AN ITEM IN THE PROVISIONAL AGENDA OF THE EIGHTEENTH SESSION

THE POLICY OF GENOCIDE CARRIED OUT BY THE GOVERNMENT OF THE REPUBLIC OF IRAQ AGAINST THE KURDISH PEOPLE

Cable dated 29 June 1963 from the Minister for Foreign Affairs of the Mongolian People's Republic, addressed to the Secretary-General

I am instructed by the Government of the Mongolian People's Republic, in accordance with rule 13 of the rules of procedure, to request the inclusion in the provisional agenda of the eighteenth session of the United Nations General Assembly, as an item of an important and urgent character, of the question "The policy of genocide carried out by the Government of the Republic of Iraq against the Kurdish people".

In accordance with rule 20 of the rules of procedure of the General Assembly, an explanatory memorandum is annexed hereto.

63-14751 /...

سەپێندراوەکاندا ناگونجاوە"، هەروەها بە پێی پەرەگرافی 138 و 139ی UN کە لە دەرئەنجامی دانیشتننی جیهانی ساڵی 2005 پەسندکراوە، کە دەڵی: "هەر ستاتێك بەرپرسیارە لە پارێزگاریی دانیشتوانەکەی لە گەلکوژی، تاوانی جەنگ، پاکتاوی ڕەگەزی و تاوان دژ بەمرۆڤایەتی"، ستاتی ئێراق نەك هەر پێشی بە ڕوودانی تاوان نەگرتووە، نەك تەنها ئەرکی سەپێندراوی نێونەتەوەیی خۆی لە تاوانی ئەنفالدا شکاندووە، بەڵکو خۆی ڕاستەخۆ تاوانی ئەنفالی ئەنجامداوە، بەپێی ئەو ئەرتیکلانە دیسان ستاتی ئێراق بەرپرسیاریی ڕاستەوخۆی دەکەوێتەسەر.

بەپێی چاپتەری چوار ئەرتیکلی 16 کە دەنوسێت: "ستاتێك کەیارمەتی یا هاوکاری ستاتێکی دیکە لەکردەیەکی پێشێلکاری نێونەتەوەیی دا دەکات، کە ئەو ستاتە هاوکاریکراوە بەرپرسیاری نێونەتەوەیی دەکەوێتە ئەستۆ، ستاتە هاوکاریکەرەکە بەرپرسیاریی دەکەوێتەسەر" لەبارەی تاوانی ئەنفالدا ستاتی ئێراق خۆی تاوانبارەو بەتاوانکاریەکە هەستاوە، وەکو پێشتر گوترا ئەگەر بسەلمێندرێت ستاتێکی دیکە چ عەرەبی یا هی دیکە پشکیان لە تاوانەکەدا هەبووە، چ وەکو هاوکاری لۆژیستی یا مەتریالی یا بەشێوەیەکی دیکە کە بوونی هاوکاری یا بەشداریان بسەلمێنێت، ئەو ستاتە بەرپرسیاریی لە تاوانەکەدا دەکەوێتەسەر، ئەوجا گرنگ نییە ئەو دەسەڵاتەی کە بە کردەکە هەستاوە لەسەر دەسەڵات ماوە یان نا، لێرەدا ستات وەکو دامەزراو نیشانەی بەرپرسیاری لەبەرامبەردا دادەندرێت.

بەپێی پرەنسیپە بنچینەییەکانی دۆکترینی بەرپرسیاری بۆ پارێزگاریی (R2P) کە دەنوسێت: "بەرپرسیاریی بنچینەیی لەپارێزگاریی خەڵکی ستات دەکەوێتە ئەستۆی ستاتەکە خۆی کاتێ دانیشتوانی ستات لە ژێر ئازاری گەورەدان، لەکاتێکدا ستاتەکە نایەوێ یا ناتوانێ بەر بە ئازاری خەڵکەکە بگرێت، پرەنسیپی دەستێوەرنەدان دەگۆڕێت بە بەرپرسیاری نێونەتەوەیی بۆ پارێزگاری، ئەمانەو بەپێی پرەنسیپەکانی دەستێوەردان بەپێی کانونی نێونەتەوەیی مرۆڤانەIHL هەروەها بەپێی ئەرتیکلەکانی UN کە لەمبارەیەوە نوسراون، ستاتی ئێراق لە ئاستی ئەرکی نێونەتەوەیی خۆیدا نەبووەو خۆی ڕاستەوخۆ ئەکتەری تاوانکار بووە، بەمجۆرە جگە لەبەرپرسیاربوونی ئێراق لە تاوانەکەدا، ئەنجامدانی تاوانەکە مافی سەروەری ئێراق بەتاڵ دەکاتەوە.

لە خوارەوەدا سەبارەت بە تاوانبارکردنی ستاتی ئێراق لە دادگادا سەیرێکی دادگای ئێراقی و ئەو پرسە دەکەین:

**دادگا و پرسیاری بەرپرسیاریی ستات**

سەرەتا گونجاوە سەیرێکی کورتی دادگاجۆراوجۆرەکان کە بۆ تاوانکاری نێونەتەوەیی هەن بەگشتی بکەین و وێنەیەکمان لا دروست بێت، پاشان بێینەسەر دادگای ئێراقی و هەلسوکەوتی لەگەڵ ئەو پرسیارەدا.

ئەو دادگایانەی کەبۆ تاوانە نێونەتەوەییەکانی وەکو تاوانی گەلکوژی، تاوان دژ بەمرۆڤایەتی و تاوانی جەنگ تا ئێستا لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە دامەزراون، زیاتر خۆیان لە سێ جۆری دادگا دەبیننەوە:

1. دادگا نێونەتەوەییەکان کە لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان دامەزراون، ئەوجا چ دادگا تایبەتەکانی وەکو ئەوەی بۆ تاوانکاریەکانی یوگوسلاڤیا (لە 1994 دامەزرا) و رواندا (لە 1995 دامەزرا) دروستکران، یان ئەوانەی کە هەن وەکو ICJ و ICC، ئەو دادگا نێونەتەوەییانە کانونـاس و دادوەری سـەر بەنەتـەوەکانی جیهـان دەگرنـە خۆیـان و بـە پێـی کـانون و ڕێـسای نێونەتەوەیی وەکو کانونەکانی ICJ و ستاتوسی رۆما کە ICC پەیرەوی دەکات، کار دەکەن، لەو دادگایانەدا کەسانی سەر بە نەتەوەکانی تێگڵاوی کێشەکان و پەیوەستدار بە تاوانەکان بەشدار نابن، بۆیە سەبارەت بە پرەنسیپی بێلایەنی دەتوانن تاڕادەیەکی گونجاو لە ئاستی گونجاودا بن.

2. دادگا تێکەڵەکان کە لایەنی نێونەتەوەیی و نەتەوەیی دەگرنەخۆیان وەکو دادگای سیرالیۆن (لە 2000 دامەزرا) و کەمبۆدیا (لە 2007 دامەزرا) کە بۆ تاوانکاریەکانی ئەو وڵاتانە دامەزراون، لە دادگاکاندا کانونناسی نێونەتەوەیی و نەتەوەیی (ئەنتەرناسیونال و ناسیونال) بەشداری لە دادگـادا دەکـەن، کـانونی دادگـا تێکەڵێکـە لـە کـانونی نێونەتـەوەیی و نەتـەوەیی، کـە رادەی تێکەڵیەکە یا سەنگایی لە نێوان ئەو دوو جۆرە کانونەدا بەپێی بەرژەوەندیەکان و وڵاتەکان دەگۆڕێن.

3. دادگای نەتەوەیی کە لە لایەن وڵاتەکە کە تاوانەکانی لێ ئەنجام دراوە دادگاکە دادەمەزرێت، لەم بارەدا دادوەر و کانونناسانی وڵاتەکە خۆیان بە پێی ئەو کانون و ڕیسایەی کە لەلایەن ئەو وڵاتەوە پەسندکراوە کار دەکەن، دەکرێ لە دادگای نەتەوەییدا کانونی نێونەتەوەیی سوودی لێوەربگیرێت، نمونەی ئەو جۆرە دادگایە دادگای کۆمبۆدیا (لە 1979 لە لایەن دەسەڵاتی ڤێتنامیەوە دامەزرا)، دادگای باڵای تاوانەکانی ئێراق (لە 2003 لە لایەن هێزی کاتی هاوپەیمانانی ژێر سەرپەرشتی ئەمەریکاو ئەنجومەنی حوکمی ئێراقی لە کۆتایی 2003 دامەزرا).

دامەزراندنی دادگا بۆ دادگاییکردنی تاوانە نێونەتەوەییەکان کارێکی ئاسان نییەو لە زۆربەی بارەکاندا کۆمەڵێ بەرژەوەندی ڕامیاری لە پرۆسەکە دەئاڵێن، ئەو جۆرە دادگایانەی کە هێمامان بۆ کردن، هەر جۆرەی بەپێی تایبەتمەندی خۆی کێشەی خۆی هەیە، بەڵام جێگەی سەرنجە لەبارەی پرەنسیپەکانی سەربەخۆیی و بێلایەنی و شارەزایی لە پرۆسە کانونیەکاندا و

لەهەڵسوکەوت لەگەڵ کەیسی تاوانکاریەکاندا، دادگا نێونەتەوەییەکان تاڕادەیەکی گونجاو توانیویانە ئەو پرەنسیپانە بپارێزن، بەپێچەوانەوە دادگا نەتەوەییەکان بەپێی ئەزموونەکانی ئەو دادگایانەی کە لەجیهانی نادیموکراسیدا هەن لەئاستی ئەو پرەنسیپانەدا نین و کێشەیان لە چەندین لایەنەوە هەیە.

سەبارەت بەبەرپرسیاریی ستات لەتاوانداو گرنگیدان بەم لایەنە، پەیوەستدارە بە جۆری دادگا و ویستی دادگا بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو پرسیارە، بەمجۆرە بەرپرسیارکردنی ستات لە تاواندا، لەو بابەتەدا بەرژەوەندییە رامیاریەکان رۆڵی زۆر لە ئەگەری بوونی یا نەبوونی گرنگی ئەو پرسیارەدا دەبینن، بەرژەوەندییە رامیاریەکان دەکرێ نێونەتەوەیی یا نەتەوەیی بن، واتە لەگەڵ ئەوەی بەپێی بڕیار و کانونە نێونەتەوەییەکان ئاماژە بەبەرپرسیاری ستات لەتاوان دەکرێت، هەروەها لەگەڵ ئەوەی بەرپرسیارکردنی ستات لەتاوان بە پێویست دەزاندرێت، بۆیە کۆمەڵێ کانون و بڕیاری بۆ دەرکراوە، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کردن، مەرج نییە گرنگی بەم پرسیارە بدرێت، ئەوەش لەزۆربەی بارەکاندا پەیوەندی بە بەرژەوەندییە ڕامیارییەکانەوە هەیە، بۆیە پرەنسیپەکانی سەربەخۆیی و بێلایەنی لە هەر ئاستە بە گوێرەی خۆی دەکەونە بەر پرسیار.

دادگای ناسیونال یا نەتەوەیی لە ئاست پرسیاری بەرپرسیاریی ستاتدا زۆر هەستیارە، ئەگەری گرنگیدان بەم پرسیارە لای ئەو جۆرە دادگایە زۆر لاوازە، دیارە ئەوە بە پێی جۆر و تایبەتمەندی دادگاکە لە وڵاتێکی دیاریکراودا و هەروەها بەرژەوەندیە رامیارییەکانی ئەو وڵاتە دەگۆڕێت، لە ئەگەری بوونی ئەو جۆرە دادگایەدا پرسیار و گومان زۆرن، بۆنمونە دەکرێ پرسیاری رەوایەتی دادگا و چۆنیەتی دروستبوونی دادگا پرسیار دروست بکەن، کە دەکرێ لە ئاستی پرەنسیپەکانی بێلایەنی، سەربەخۆیی و دادوەری دووربن، دەکرێ هۆکار و فاکتەری جیاواز هەبن کە وا دەکەن پرسیار لەسەر نەتەوەیی بوونی (ناسیونالبوونی) دادگاکە دروست دەکەن، بۆنمونە ئایا دادگاکە تاچەند نوێنەری رەوای هەموو گروپە نەتەوەیی و ئەتنییە ناکۆکەکان دەکات، چەندە بە پرس و تەبایی ئەوان دیموکراسیانە و رەوایانە پێکهێندراوە، لە کاتێکدا کە نەتەوەیەك یا دەسەلاتدارانی سەربە نەتەوەیەك ئەوجا چ قوربانی یا بەرپرسیار لە تاوانەکە، بەرژەوەندی خۆی لە بوونی دادگایەکی ئەوهادا نادۆزێتەوە لەبەر ئەوەی دژ بە ویست و خواستەکانی ئەو داندراوە، گومان لەسەر نەتەوەیی بوونی دادگاکە لە چوارچێوەی ستاتەکەدا دروست دەکات.

دادگای ناسیونال کە لەلایەن ئەو ستاتەوە دامەزراوە کە تاوانەکەی ئەنجام داوە، کە ئەوەش لە زۆربەی بارەکاندا لەئەگەری گۆڕانی دەسەڵات دروست دەبێت، بەئەگەری زۆر لەبەرژەوەندیدا نابێت، گرنگی بە پرسیاری بەرپرسیاری خودی ستاتەکە لە تاوانەکەدا بدات، چونکە لەم بارەدا دەسەڵاتدارانی نوێ، نایانەوێ خۆیان بخەنەژێر کۆمەڵێ بەرپرسیاریی کانونی نێونەتەوەیی

کەکۆمەڵێ داوای ئابووری و ڕامیاریی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، هەروەها لە کاتێکدا کە دەسەڵاتدارانی سەربە نەتەوەی باڵادەست کێشەیان لەگەڵ دانپێنان بەتاوانەکە هەیەو ئارەزووی بەرپرسیارکردنی نەتەوەکەیان یا ستاتەکە (کە بە هی خۆیانی دەزانن) ناکەن، گرنگی بەو پرسیارانە نادرێت کە بەرپرسیاری لەسەر نەتەوەی باڵادەست و ستات دروست دەکەن، یا کاتێ نەتەوەی دەسەڵاتدار بەرژەوەندیی ناسیونالیستانەی ئەوە ناخوازێ گرنگی بەو پرسیارە بدرێت، لە باشترین باردا دەسەڵاتدار تاوانەکان بەکەس دەکات و هەندێ لە تاوانباران دادگایی دەکات، بەم کردارە بانگاشەی ڕەوایی پرۆسەی دادگاییەکە دەکات.

دیارە بەهەمان شێوە دەکرێ لە بەرژەوەندی نەتەوەی قوربانی یا دەسەڵاتدارانی سەربە نەتەوەی قوربانی نەبێت ئەو پرسیارە گرنگی پێ بدرێت، لە کاتێکدا دەسەڵاتدارانی سەر بەنەتەوەی قوربانی لە دەسەڵاتدان و بەرژەوەندییە رامیاریەکانیان ئەوە ناخوازن، لەهەردوو باردا زیان بە پرەنسیپی رەوایی دادوەری دەکەوێت.

ستات کە خۆی لە تاوانەکەدا بەرپرسیارە، دادگا بۆ لێپێچانەوەی تاوان دامەزرێنێت، بەئەگەری زۆر ئەو پرۆسەیە بەپێی بەرژەوەندییە رامیارییەکانی ستات پیادە دەکات، ستات خۆی لەپرۆسەکەدا بەرژەوەندی هەیە، کەسانی کانونی دادگاکە کەسانی ناو کۆمەڵگەیەکن کە لەکێشە ناوخۆیەکان بێلایەن و سەربەخۆ نین، دیارە دیسان جۆر و تایبەتمەندی ستات ئاستی لایەنگیری سەبارەت بە پرەسنیپەکانی بێلایەنی و سەربەخۆیی دادگا دیار دەکەن، کەسەکان کەدامەزرێنەرو بەرێوەبەری دادگاکەن بەئەگەری زۆر بەرژەوەندیان لەکەوتنەوەی ئەنجامی دادگا بەجۆرێ هەیە کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا گونجاوە، ئەوەش پرسیار لەسەر رەوایەتی دادگاکە کانونیانە دروست دەکات، بەپێی کانونێکی باوی گەردوونی هەر کەسێك کە بەرژەوەندی لە کەوتنەوەی ئەنجامی دادگا بە جۆرێکی تایبەت هەیە، یا گومانی ئەوەی لێ دەکرێت، نابێ تێکەڵی پرۆسەی دادگایی ببێت، لە لایەکیتر کاتێ دەسەڵات نوێیەو دژی دەسەڵاتی پووخاوی پێشووە، ناتوانێ لە پرۆسەی دادگایی بێلایەن بێت، چونکە بەرژەوەندی لە جۆرێکی تایبەتی بڕیارو سزای دادگا ئاشکرا هەیە، لەبەر ئەو هۆیانە ئەو جۆرە دادگایەو پرۆسەی دادگاییەکە سەختە بتوانێ لەئاست پرەنسیپی بێلایەنی و سەربەخۆییدا بێت و سەختە بتوانێت ئەنجامێکی رەوای کانونی بەرهەم بهێنێت، بۆیە جگە لەپرسیاری بەرپرسیاریی ستات گەلێ دیاردەی دیکە دەردەکەون کە ڕەنگ لە بەرژەوەندییە رامیارییەکان دەدەنەوە، بەمجۆرە ئاماژە بە دادگایەك دەکەن کە لەژێر کاریگەری بەرژەوەندیەکاندایە.

دادگای نەتەوەیی هەمیشە بەرەورووی کۆمەڵێ پرسیاری گرنگ دەبنەوە کە گومان لەسەر رەوایەتی، بێلایەنی و سەربەخۆیی دادگاکە دروست دەکەن، گرنگترینیان:

1. تا چ ڕادەیەك ستات کە خۆی بەرپرسیارە لە تاوانەکاندا گرنگی بە پرسیاری بەرپرسیاری خۆی لە تاواندا دەدات.

2. ئایا ستات نوێنەری راستەقینەی هەموو نەتەوە و گروپە ئەتنیەکانە کە لەچوارچێوەی ئەو وڵاتەدا دەژین، تا بتوانێ دادگای نەتەوەیی دابمەزرێنێت.

3. ئایا هەموو نەتەوە و گروپە ئەتنیەکان ئازادانە لەدامەزراندنی ئەو دادگایە پرسیان پێ کراوە.

4. ئایا نەتەوەی قوربانی زانیاری و هوشیاری لەسەر پرسێکی ئەوها هەیە، تا لەبەرپرسیاریی و گرنگی پرۆسەکە بگات.

5. ئایا هەموو نەتەوەکانی ستات پشتگیری لە دادگایەکی ئەوها دەکەن؟

6. ئایا دەسەڵاتداران ئازادانە لە لایەن خەڵکەوە هەلبژێردراون؟

7. ئایا دەسەڵاتداران گرنگی بە بەرژەوەندی و رۆڵی خەڵك لە پرۆسەی دادگادا دەدەن؟

8. ئایا ئەو ستاتە دەتوانێ بوونی پرۆسەیەکی کانونی بێلایەن مسۆگەر بکات، لە کاتێکدا ئەو ستاتە دیموکراسی نییە یا ئەزموونێکی دیموکراسی نەبووەو نییە؟ 9. ئایا ئەو تواناو کەرستانە کە مسۆگەری پرۆسەیەکی دادوەرانە دەکەن، لەبەردەستدان؟ زۆر سەختە لە جیهانی نادیموکراسیدا وەڵامی ئەو پرسیارانە پۆزەتیڤانە بدرێنەوە، چونکە ئەو بنەما ئازاد و دیموکراسیە، هەروەها توانا پێویستە کە بۆ بوونی دادگایەکی پرۆفیشنال پێویستن لە ئارادا نین.

ئەگەری گرنگیدان بەپرسیاری بەرپرسیاریی ستات لەدادگای نێونەتەوەییدا هەیە، لە کاتێکدا دەکرێ دادگاکە بە بێلایەن دابندرێت، کەسان و کانونی دادگاکە سەربە لایەنی قوربانی یا تاوانبار نین، بەڵام ئەگەر بەرژەوەندیە نێونەتەوەییەکان ئارەزووی پرسیارەکە نەکەن، مەرج نییە ئەو دادگا نێونەتەوەییە گرنگی بەو پرسیارە بدات، بۆیە لێرەشدا دەکرێ کێشەی رەوایی دادوەری یا کێشەی سەربەخۆیی و بێلایەنی دادگا هەبێت، بۆنمونە دادگای نێونەتەوەیی بۆ تاوانکاریەکانی یوگوسلاڤیا لە کەیسی گەلکوژی سرێبرەنیسا گرنگی بە پرسیاری ئەگەری بەرپرسیاری سربیا لەتاوانی گەلکوژیدا نەدا، لەگەڵ ئەوەی بنەمایەکی گونجاو بۆ ئەو بابەتە هەبوو، ئەوە دەکرێ گەلێ لێکدانەوەی بۆ بکرێت.

**دادگای ئێراقی و پرسیاری بەرپرسیاریی ستاتی ئێراق**

دادگای بالای تاوانەکانی ئێراق لەژێر ناوی دادگای تایبەتی ئێراق لەلایەن دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان CPA لەژێر سەرپەرشتی ئەمەریکاو ئەنجومەنی حوکمی کاتی ئێراق کە لەلایەن ئەمەریکاوە پێکهێندرابوو، لە کۆتایی ساڵی 2003 دا دامەزراو پاشان بەکردەوە لەساڵی 2005 دەستی بەکار کرد، دامەزراندنی دادگاگە بەپرس و راسپاردەی ئەنجومونی ئاسایشی UN نەبوو، بەڵکو راستەوخۆ رێکەوتنێك بوو لەنێوان دەسەڵاتی هاوپەیمان (لە ژێر سەرپەرشتی ئەمەریکا)و ئەنجومەنی کاتی، بەرژەوەندییە رامیارییەکانی ئەمەریکاو عەرەبەکانی ئێراق ئەوەی دەخواست کە دادگاکەو رەوتی دادگاکە بەپێی رەوتێك بێت کە لەگەڵ بەرژەوەندییە رامیارییەکانی ئێراقی دوای سەدام گونجاوە، عەرەبەکان دژی دادگای نێونەتەوەیی بوون و

ئارەزوویان نەدەکرد تاوانبارانی عەرەب بدرێنە دادگای نێونەتەوەیی، کوردەکانی ئەنجومەنی کاتی باش یا خراپ هیچ دەنگیان نەبوو، لەم پرۆسەیەدا ناتەباییەکیان لەگەڵ ئەوەدا پیشان نەداو لای ئەوان گلەیی و رەخنە نەبوو لەوەی کە تێرم و بەرژەوەندییە ئێراقی و عەرەبییەکان رەچاوبکرێن، ئەگەرچی بۆ نەتەوەی کورد ئەو دادگایە مەترسی کێشەی لێ دەکرا، ئەو دادگایە لەروانگەی نەتەوەیی کوردییەوە تەواو ناگونجاو بوو، هەروەکو بۆ هەرنەتەوەیەکی دیکەی ئازاد ئەوهایە، بۆنمونە بۆسنیەکان هەرگیز پەسندی دادگایەکیان نەدەکرد لە سربیا بێت، دادوەری سربی سەرپەرشتی بکەن، بە کانونی سربی بەرێوەبچێت و بریار بدات، نوێنەری کوردەکان وەکو بەشێك لە گەلی ئێراق پەسندی رەوتی ئێراقچیانەی عەرەبزاڵی دادگایان کرد، واپێدەچێ سەرکردە ئێراقییە دەسەڵاتدارەکان لەسەر ئەوە تەبابوون، کە دادگاکە بتوانێ بەجۆرێ لە جۆرەکان پیادەی پرۆسەیەکی کانونی بکات و تاوانبارە سەرەکیەکان بداتە دادگا و ناسراوەکانیان زوو لەناو ببردرێن.

کانونی ئێراقی سەردەمی پێش سەدام و کاتی سەدام، لەگەڵ کانونە نێونەتەوەییەکان کە سەبارەت بە تاوانەکانی گەلکوژی، دژ بەمرۆڤایەتی و تاوانی جەنگ دانـدراون خرانە چوارچێوەیەکی دیاریکراو، ستات و کەسانی نەئێراقی لە لێپرسینەوە پارێزران، زوو لەناوبردنی تاوانباران کانونیانە سەپێندرا، زمانی عەرەبی کرایە زمانی دادگا، رێگە لەبەشداری کانونناسانی نێونەتەوەیی گیرا هتد، بەکورتی دامەزراندنی دادگا لەژێر کاریگەری کۆمەڵێ بەرژەوەندی رامیاریی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دابوو و بەپێی ئەو بەرژەوەندیانەش رێکخرا.

دامەزراندنی دادگاکە لە لایەنی هێزی براوەو زاڵی بەرژەوەندییە ئەمەریکی و ئێراقییەکان بەسەریدا، زوو کەوتە بەر رەخنەی شارەزایان و رێکخراوە جیهانیەکان، کە زۆربەیان گومانیان خستەسەر سەربەخۆیی، بێلایەنی، توانا و شارەزایی کانونیانەی دادگا و کەسە کانونیەکانی دادگا، هەروەها رەخنەیان ئاراستەی ئەوە کرد کە ئەو دادگایە ناتوانێ لە ئاست پرەنسیپە کانونییە نێونەتەوەییەکاندا بێت.

دادگای ئێراقی وەکو دادگایەکی نەتەوەیی (ناسیونال) دەناسرێت، دەکرێ بۆ عەرەبەکان کێشەیەك لەو چەمکەدا نەبێت، چونکە ئەوان ئێراق بە هی خۆیان و هی عەرەب دەزانن (هەر لە دامەزراندنییەوە لە ئاستی ناوچەیی و جیهانیدا ئێراق وەکو وڵاتێکی عەرەبی سەیری کراوە و دەکرێت)، بەڵام ئایا کوردی باشوری کوردستان ئێراق بەهی خۆیان دەزانن و ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان لە ناسنامەی ئێراقدا دەبینێتەوە؟ ئایا نەتەوەی کورد ئێراق بە هی خۆی دەزانێ؟ ئایا نەتەوەی کورد خۆی ئارەزوومەندانە سەربەخۆیی کوردستانی ناوێ و ئێراق بە ستاتی سەربەخۆی خۆی تێدەگات؟ لێرەدا ئاماژە بە نەتەوەی کورد دەکرێت نەك دەسەڵاتدارانی کورد، چونکە جیاوازی لەنێوان بەرژەوەندی دەسەڵاتدارانی کوردو ویستی خەڵکی کوردستاندا هەیە، کە خەڵکی کوردستان خۆی ئازادانە لە چارەنوسی رامیاری خۆیاندا پرسیان پێ نەکراوە،

نەگونجاوە ئێراق بەوڵاتی ئارەزووەمەندانەی ئەوان دابندرێت، هەروەها کاتێ خەڵکی کوردستان لەگشتپرسیەکی نافەرمیدا (کەبزوتنەوەی ریفەراندەم لە ژانیوەری 2005 دا ڕێکی خست)، سەدا 97 ی دەنگی بۆ سەربەخۆیی دا، ئاواتی راستەقینەی خەڵکی کوردستانی پیشاندا، بۆیە کەناسنامەی نەتەوەیی ئێراق بەسەر خەڵکدا سەپێندراوە، دەکرێ بڵێین ئەوە ئارەزووی سەرکردەکانی پارتە دەسەڵاتدارەکان بووە نەك خەڵك، لەم دیدەوە دەکرێ بڵێین ئەو دادگایە وەکو دادگای نەتەوەیی بە گەلی کورد نامۆیەو نوێنەریی ئەوان وەکو نەتەوە ناکات، بەکورتی کاتێ ئەو دادگاییە دادگای نەتەوەیی کورد دەبوو ئەگەر خەڵکی کوردستان ئەو دادگایەیان بە هی خۆیان بزانیبایە و ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان لە بۆتەی ئێراقدا بەدی بکردایە، دەکرا دادگای ئێراقی وەکو داگایەکی نەتەوەیی پەسند بێت، لە کاتێکدا پرسی سەربەخۆیی لە ئێراقدا نەبووایە، واتە نەتەوەی ژێردەستە (کورد) کە خەون بە سەربەخۆییەوە دەبینێت لە چوارچێوەی ئێراقدا نەبووایە، نەتەوەی کەمینە کەم و لاواز بوایە یا جودایی نەتەوەیی کێشەیەکی ئەوتۆی مێژوویی و هەنوکەیی نەبوایە، سەربەخۆیی پرسیارێکی نەخوازراو بوایە، کێشە تەنها سیستەم گۆڕین و باشتربوونی باری ئازادی و ژیان بوایە، جێگەی سەرنجە سەرکردە کوردە ئێراقچیەکان هەوڵ دەدەن نمونەیەکی لەو شێوەیە پیشان بدەن، بەڵام ئەوە لەگەڵ باری راستەقینەی نەتەوەی کوردو کێشەکەی لەئێراقدا ناتەبایە.

پرسیاری دیکە سەبارەت بە رەوایەتی ئەو دادگایە بۆ نەتەوەی کورد ئەوەیە، ئایا نوێنەرانی کورد لە لایەن ئەوان ئازادانە هەلبژێردران تاکو رەوایەتی بەخۆیان بدەن لە جیاتی ئەوان بڕیاری چارەنوسساز بدەن؟ لە لای هێروە پێویستە بگوترێت ئەگەر نوێنەر لە پرۆسەیەکی ئازادیشدا هەڵبژێردرێت، واتای ئەوە نییە رەوایە ئەو لە جیاتی گەل بڕیار لەسەر پرسی چارەنوسساز بدات، هەروەکو لەوڵاتانی پێشکەوتوو گشتپرسی بۆ یەکلاکردنەوەی پرسیاری چارەنوسساز بە گونجاوترین و دیموکراسیترین چارەسەر دەزانرێت، نوێنەرانی کورد کە بەشێوەیەکی سەرەکی سەرکردەکانی ی،ن،ك و پ،د،ك ن، (سەرکردەی پارت و رێکخراوەکانی دیکە کاریگەرییان لەسەر بڕیارەکان زۆر لاوازە یا هەر نییە)، ی،ن،ك و پ،د،ك هەردوولایان دوو پارتی پاوانخوازی نادیموکراسین، بوونیان، مانەوەو دەسەڵاتداریان بێبەری نییە لە کۆمەڵێ کردەی دژ بە بەرژەوەندی گەلی کورد، هەردوو پارت پێشی هەڵبژاردن بە میتۆدو ڕێگەی نادیموکراسیانەو دیکتاتۆرانە دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرتبوو و وڵاتیان دابەش کردبوو، لە هەڵبژاردندا بەرژەوەندیەکانیان لەسەرووی هەر بابەتێکی ترەوە داندران و سەپێندران، خەڵك ئازاد نەبوون، دەنگدەری کورد بەکۆمەڵی گەمارۆی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رامیاریی دەسەڵاتداران دەورەدرابوون، بۆنمونە زۆر کەس دەنگیان بە پارتی زاڵی ناوچەکەی دەدا، تاکو لە کار دەرنەکرێت، یا کێشەی بۆ دروست نەکرێت... هتد.

بەپێی ئەو کورتە هێما بۆکردنە نوێنەربوونی نوێنەرانی کورد پرسیار دروست دەکەن و گومان لەسەر رەوایەتی بوونیان دەکەن، بۆیە بریاری ئەوان لەسەر دامەزراندنی دادگاکە و بانگاشەی پشتگیری گەلی کورد لەسەر بنچینەیەکی دروست نەهاتووە، هەروەها بانگاشەکردنی ئەوان بۆ ئەو دادگایە وەکو دادگایەکی نەتەوەیی بۆ گەلی کورد دروست نییە.

دەکرا ئەوان چارسەری ئەو کێشەیە بکەن بەوەی بابەتەکە لە پرۆسەیەکی رەوای کراوەو دیموکراسیانەدا بخەنەبەر هەڵوێستی گشتی و بە پشتگیری ئەوان بڕیار بدەن، دیارە ئەوە بە دەسەڵاتێك دەکرێت کە دیموکراسی بێت و بڕیاری خەڵك بەگرنگ بزانێت، ئەوە نەکرا، دادگاکە دامەزرا پرس یا روونکردنەوە لەبارەیەوە نەدرایە گەلی کورد کە قوربانی تاوانی گەلکوژی بوو، کانون و رێسای دادگاکە بۆ خەڵکی کوردستان نەکرایە کوردی و شتێکی ئەوتۆ بۆ خەڵك روون نەکرایەوە.

پرسیارێکی دیکە کەپەیوەندی بە هوشیاری نەتەوەی قوربانییەوە هەیە، دەتوانیٚ گومان لەسەر رەوایەتی بوونی دادگای نەتەوەیی دروست بکات ئەوەیە، ئایا نەتەوەی قوربانی چەندە هوشیاری سەبارەت بە تاوانی گەلکوژی و دادگا لەم بارەیەوە هەیە؟ خەڵکی کوردستان وەکو هەر گەلێکی رۆژهەڵاتی ناوەراست زانیاری سەبارەت بە گەلیٚ چەمك و پرۆسە زۆر کەمە، کە پێشتر پرۆسەیەکی ئەوها لە ئارادا نەبوو، ئەزموونی لەگەل پرۆسەیەکی ئەوها نییە، بێگومان زانیاری خەڵك لەمبارەیەوە بە هەژاری دەمێنێتەوە و لە گەورەیی تاوانەکە و گرنگی پرۆسەی دادگایی ناتوانیٚ بگات، نەك هەر خەڵکە ئاساییەکە، زۆر لەوانەی دەنوسن و گۆتن لەسەر ئەو بابەتە دەکەن، هەژاریان لە شارەزاییان سەبارەت بەو بابەتە پێوەدیارە، ئەوەش سەیر نییە کە پێشتر لەسەر ئەو بابەتە گۆتن نەکراوە و لێی نەکۆڵدراوەتەوە، دەسەڵاتداران دەبیٚ هەولٚ بدەن ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوەو هەولٚ بدەن زانیاری و زانین لەمبارەوە لە رێگەی شارەزایانەوە یا بەرێگەی گونجاو بە خەڵك بگەیەنن، گوزارشت، روونکردنەوە و شیکار لەسەر تاوانەکە و پرۆسەی دادگایی زانستیانە و بێلایەنانە بە خەڵك بدەن، و هتد، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتدار خۆی کێشەی لە زانین و شارەزایی لەمبارەیەوە هەبێت، هەروەها لەو پرۆسەی گەیاندنە دیموکراسییە نەگات، ئەو کارە بەو دەسەڵاتە ناکرێت، لە لایەکیتر لەکاتێکدا دەسەڵاتەکە بە کۆمەڵیٚ بەرژەوەندی تایبەتی پارت بەستراوەتەوە ئەوە خراپتر، چونکە بەئەگەری زۆر ئەم پرۆسەی روونکردنەوە و هوشیارکردنەوە پێویستە گرنگی نابێت، ئەوە لە باشوری کوردستان وا دەکەوێتە بەرچاو، دەسەڵاتدارانی باشوری کوردستان بەرژەوەندی تایبەتی پارتیان لەسەرووی هەر شتێکی دیکە بووە، خۆیان لەم روانگەیەوە هەژار بوون، وادیاربوو نە بەتەواوی لە تاوانەکە گەیشتبوون، نە بەتەواوی دەیانزانی واتای ئەو پرۆسەیە چییە، هەروەها ئەوان لە پرۆسە دیموکراسیەکان زۆرهەژارن یا ئارەزووی ناکەن، جگەلەوەی بەرژوەندییە ئێراقییەکانیان ئارەزووی هوشیارکردنەوەی نەتەوەیی ناکەن.

بۆیە لەمبارەداو بەپێی ئەو ئامانجانەی سەرەوە سەپاندنی دادگای بەناو نەتەوەیی بەسەر نەتەوەی قوربانی، دەکرێ وەکو بەلاوەنانی بەرژەوەندی نەتەوەی قوربانیی، فێڵکردن لێی و خرابیەکارهێنانی دەسەڵات سەیر بکرێت، چونکە نەتەوەی قوربانی نازانێ: بۆ ئەو پرۆسەیە وا کەوتەوە؟ بۆ ئەو دادگایە؟ ئایا ئەلتەرناتیڤ هەبوو؟ ئەگەر ئا چیبوون؟ خەڵکی دیکەی قوربانی گەلکوژی چۆن ئەو قۆناغەیان بڕیووە؟ بۆ نەتەوەی کورد وەکو ئەوان هەڵسوکەوتی لەگەڵ نەکرا؟ هتد.

جگە لە نەتەوەی قوربانی گەلکوژی کە نەتەوەی کورد بوو لێرەدا، نەتەوەی سەردەستی عەرەب دابەش بوونەتە سەر دوو گرووپی ئەتنی سوننەو شیعە، شیعەکان کە زۆرینەی ئێراق پێك دەهێنن و زۆرترین دەسەڵاتیان لە ئێراقی دوای سەدام هەیە، ئەوان لەگەڵ ئەو دادگایە بوون، لەلایەك لەبەر بەرژەوەندی عەرەبیانەو ئێراقیانەیان، لە لایەکیتر خۆیان زۆرترین دەسەڵاتیان لە پرۆسە جۆراوجۆرەکاندا هەیە، دیارە پرس بە خەڵکی ئاسایی شیعە کە ئەوانیش قوربانی دەستی دەسەڵاتدارانی سوننە بوون، بۆ بوونی پرۆسەیەکی ئەوها نەکرا، ئەوەش بۆ کۆمەڵگەیەك کە ئەزموونی دیموکراسی نییەو دیموکراسی نییە کردەیەکی چاوەروانکراوە.

هەرچی گروپی ئەتنی سوننەیە دەسەڵاتی کەم بوو، دژی پرۆسەی رامیاریی دوای سەدام بوون و بەدژی خۆیان و بەرژەوەندیەکانی خۆیانی تێدەگەیشتن، ئەوانیش لەگەڵ ئەو دادگایە نەبوون و بەرژەوەندیەکانیان لەپرۆسەیەکی ئەوهادا نەدەبینیەوە، سەرکردەکانی سوننە ئەوانەی هەواداری ئەمەریکا بوون پەسندی ئەو پرۆسەیان کرد، بێ پرس و روونکردنەوە بۆ خەڵکی ئاسایی سوننە، دیارە خەڵکی سوننە کە لەسەرەتای پرۆسەی دروستکردنەوەی ئێراق تاڕادەیەکی زۆر پەراوێز بوون، کێشەیەکی لەگەڵ ئەوە نەبوو کە دادگاکە ئێراقییە، ئەوە تەواو لەگەڵ بەرژەوەندی ناسیونالیستانەی عەرەبی ئەواندا گونجاوە، بەڵام ئەوان کە دەسەڵاتی پێشوویان بەهۆی رووخانی رژێمی بەعس لەدەست چووە، رەتی رەوتی رامیاری دوای سەدامیان کردەوە و ئەوەیان لە چەندین بۆنەدا پێشان دا، ئەوان بروایان بە پرۆسەی دادگاییەکە لەژێر سەرپەرشتی ئەمەریکا، هەوادارانی ئەمەریکا و بەرێوەبەرانی دادگایەکە نەبوو، بۆیە ئەوان دژی ئەو دادگایە وەستان و داوای دادگای نێونەتەوەییان دەکرد، دیارە سەرکردە سوننەکان وەکو سەرکردە شیعەکان دژی دادگای نێونەتەوەیی بوون، بوونی دادگایەکی ئەوهایان بە شەرمەزاری بۆ نەتەوەی عەرەب دەبینی، پێیانوابوو ئەوە لەسەروەری نەتەوەی عەرەب کەمدەکاتەوە، بۆیە رەوایەتی بوونی دادگاکە لێرەدا لە لایەن سوننەوە پرسیاری لەسەر هەیە، نەك لەبەر پرسی نەتەوەبوونی دادگاکە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوان لەبەرژەوەندی ئەتنیان درابوو و بوونی ئەو دادگایە بە قازانجی ئەتنی ئەوان نەبوو، بۆیە ئەوان بەهی خۆیانی نازانن، لەم بارەیەوە لاوازی ناسنامەی ستاتی ئێراقی دوای سەدام، بەجۆرێکی دیکە خۆی دەردەخات، کە گومان دەخاتە سەر رەوایەتی ناسنامەکە بەشێوەیەکی دیکە.

بەشداری گروپە ئەتنیەکان لەدادگا و پرۆسەی دادگاییەکە کە گونجاوە لەگەڵ رەوتی رامیاریی دوای سەدام، بەشداری کەسانی ناو گروپە ناکۆك و بەرژەوەند جیاوازەکانە لە دادگا و پرۆسە دادگاییەکەدا، کەسە کانونناسەکان چ دادوەر یا پارێزەر یا کەسانی دیکەی ناو پرۆسەکە، کەسیان لەو کێشانەی کە لە نێوان گروپە نەتەوەیی و ئەتنیەکاندا هەن لەم ناسنامە ئەتنی و نەتەوەییانە بێلایەن نیین، هەموویان بە بەژروەندی نەتەوەیی و ئەتنی بارگاوین و هاتوون لە پرۆسەیەکدا بەشدارن کە دادگایی کەسانێك دەکات، لە تاوانی گەلکوژی و تاوانی دژ بەمرۆڤایەتی بەرامبەر بەگروپی ئەتنی و نەتەوەیی دژیان بەتایبەتی کورد و شیعە کردوویانە، هەموویان بەرژەوەندی تایبەت و گشتیان لە پرۆسەکەدا و کەوتنەوەی جۆری ئەنجامی بڕیاری دادگاکە هەیە، بۆنمونە دادوەری عەرەب کە خۆی سەربە نەتەوەی عەرەبی باڵا دەستە، بەرژەوەندی گەلی عەرەبی لا گرنگە، هاتووە سەرپەرشتی دادگایی کەیسی گەلکوژی دژ بە کورد دەکات، کە کەسانی سەر بە نەتەوەی عەرەب ئەنجامیان داوە، کەسانێك کە نوێنەری فەرمی ستاتی ئێراق و گەلی عەرەب لە ئێراق بوون، گومان لەسەر (inhabilitet ) گونجاویی کانونیانەی بوونی ئەو کەسە لە پرۆسەی دادوەری دروست دەکات، یا کەسێکی شیعە هاتووە دادگایی تاوانبارێکی سوننە دەکات، شیعەبوونی کەسەکە گومان لەسەر گونجاویی کانونیانەی بوونی ئەو دادوەرە دروست دەکات، ناسنامەی ئەتنی و نەتەوەیی کەسەکان گومان لەسەر گونجاویی کانونیانەی بوونیان لە پرۆسە دادگاییەکەدا دروست دەکەن، ئەگەر بزانین لەوەتەی ئێراق هەیە بە کێشەی ناوخۆیی نەتەوەیی و ئەتنی دەناڵێنێت، تاوانی گەلکوژی و پاکتاوکردن سیستەماتیکیانە روویان داوە، بوونی کەسانی سەر بەو نەتەوە و گروپە ئەتنیانە لە پرۆسەی دادگایی بەناو نەتەوەییدا گونجاو نییە، چونکە ئەگەر راستەخۆ لایەنگیر نەبن، گومان لەسەر بێلایەنی و دەستپاکی ئەو کەسانەدا هەیە، سەلماندنی پێچەوانەی ئەوە زۆر سەختە.

سەبارەت بە پێویستبوونی هەبوونی بنەما دیموکراسیەکانو بوونی دڵنیایی دادوەری و دادگای نەتەوەیی، ئێراق کە پێشتر وڵاتێکی دیموکراسی نەبوو، واتە ئەزموونێکی دیموکراسی نەبوو، کێشەی کوشندە و درێژماوەی بێچارەسەری ناوخۆی نەتەوەیی، ئایینی و ئەتنی تێدابووە و تێدایە، ناتوانێ لە ئاستی پرۆسەیەکی دادگایی ئەوهادا بێت، رابردوو و ئێستای پڕلەناکۆکی ئێراق هێمای بۆ ئاراستەیەکی واناکەن، کە گەرەنتی پرۆسەیەکی دادەوەرانەی کانونی لە دادگاییەکاندا بکات، رابردوو و ئێستای رامیاریی ئێراق ئەوە نەبوو خەڵك و شارەزایان چاوەروانی میراکل لە پرۆسەی دادگاییەکەدا بکەن، بۆیە هەر لەسەرەتاوە پێشبینی مەترسی لایەنگیری، دەستێوەردان و دیاردەی دیکەی نەرێنی دەکران، لە ئێراقدا ئەو بنەما و فاکتەرانەی کە بۆ پرۆسەیەکی ئەوها پێویستن نەبوون، هەندێ فاکتەر هەن چارەیان نییە و ئێراق ناتوانێ چارەیان بکات، وەکو فاکتەری لایەنگیری و گونجاوی کەسە کانونیەکان، چونکە کەسەکان سەر بە گروپە ناکۆکەکانن و ناتوانن بێلایەن بن، مەنتالی عەرەبیانە و ئیسلامیانە و لایەنگیریان لەم

روانگانـەوە چارەسـەریان سـەختە، کەسـە کانونیـەکان زۆریـان پـەروەردەی سـەردەمی رژێمـی رووخاون و گومانی کێشەی دەستپاکی و بێلایەنیان لێدەکرا.

ئێراقی دوای سەدام ئێراقێکی تائێستا دیموکراسی نییە، پرۆسەی بەناو "دیموکراتیزەکردنی" ئێـراق کۆسـپی زۆر لەبەردەمدایـە، ئـەو قۆناغانـەی بـۆ سـەرەتای دیمـوکراتیزەکردن گـرنگن بـە ئاراسـتەیەکی گونجـاودا تێنەپـەرین، بـەفرتوفێل، خـۆگێلکردن و رێکـەوتنی ئاشـکرا و شـاراوەی رامیاریی پرۆسەکان تێپەرێندران، کێشە و ناکۆکی کۆن و نوێی رامیاریی وادەکات کاریگـەریی بەرژەوەندییـە رامیارییـەکان لەسـەر دادگـا و دەسـەڵاتی دادوەریـدا هـەبن، هـەروەکو لەسـەرەتاوە کەموزۆر خۆیان لە پرۆسەی دادگاییەکاندا دەرخستووە.

تـا ئێـستا لـە ئێراقـدا دادگـاو دەسـەڵاتی دادوەری بەگـشتی سـەربەخۆ نـین، دادگـا دەسـەڵاتی بەرژەوەندییە رامیارییـەکانی نییـە، سـتات دەسـت لـە دادگـا وەردەدات، هێـزی دەرەکـی ئەمـەریکا دەست لە دادگـا وەردەدات، هێـزە رامیارییـەکان کاریگـەریان لەسـەر دادگـا و رەوتـی دادگـا هەیـە، رەوتی ئێراقچێتی و ئێراقیبوون کاریگەریان تەواو هەیە، ئیسلامیبوون و عەرەبیبوون کـەموزۆر نـاوە نـاوە لـە دادگـا دەرکـەوتوون، جگەلـەوەی کـانون و دەسـتوری ئێراقـی نـوێ هـەموو ئـەو دەردانەی ئیسلامیبوون، عەرەبیبوون و ئێراقیبوونی هەیـە، واتـە کـانون و دەسـتوریش کێشەیان لەگـەڵ پرەنسیپەکانی بێلایـەنی و پرۆفیـشنالیزم لەچـەند لایەنـەوە هەیـە، ئەگـەر ئاگـاداری ئـەو فاکتەرانـە بـین، سـەیر نییـە کـە کـانونی دادگاکـە و پرۆسـەی دادگاییـەکان بـەپێی بەرژەوەندییـە رامیارییە عەرەبی و ئێراقییەکان رێکخران.

لەمیانەی دادگاییەکەی تاوانی گەلکوژی ئەنفال و دوای دادگاییەکە، دادگاکە تووشی کۆمـەڵێ کێـشەو سـکەندال بـوو، دادوەرەکـان کۆنـە بەعـسیان تێدایـە، دادوەر لایـەنگیری بـۆ تاوانبـاری گـەلکوژی سـەدام حوسـێن دەربـڕی، سـەدام حوسـێن لەسـەر تـاوانی کـەمواتای دوجـەیل سـزای مردنی درا، لە سکەنداڵیکی رامیارییدا درایە دەستی گروپـی موقتـەدا سەدر و ئەوان میلیتسانە کوشتیان، سەدام لە تاوانی گەلکوژی ئەنفال رزگاری بوو و تۆمەتەکانی لەسەر لادرا، بڕیارەکـانی کۆتـایی کەوتنـە ژێـر کاریگـەری لایەنـە رامیـارە ناکۆکـەکان، دادگـا هەمیـشە لـەژێر کاریگـەری ئـارەزووی ئەمەریکاییەکانـە، جێبـەجێکردنی سـزای سـێ لـەتاوانبارە سـەرەکیەکانی گـەلکوژی ئـەنفال عـەلی کیمیـاوی، سـوڵتان هاشـم و حوسـێن رەشـید بـەهۆی دەسـتێوەردانی رامیـاریی وەسـتاوە، هتـد، هـەموو ئەوانـە هێمـا بـۆ دادگایـەکی ناسـەربەخۆ، ناپرۆفیـشنال، لایـەنگیر و بارگاوی بە بیروباوەری جیاجیا لەچەند لایەنەوە دەکەن.

بەزانینی بوونی ئەو فاکتەرانەی بەکورتی هێمایان بۆکرا دەکرێ بپرسین، ئایا دادگـای ئێراقـی تـا چەند گرنگی بە بەرپرسیاری ستات لە تـاوانی گـەلکوژی ئەنفالـدا دا؟ ئایـا تاچـەند لـە دادگـای ئێراقیدا ئەو پرسیارە خۆی لێدرا؟ ئایا هیچ لایەنێکی ئێراقی ئارەزووی ئەو پرسیارە دەکەن؟

کانونی دادگای ئێراقی گرنگی بە کانون و ڕێسا کانونیەکانی ئێراق لە کۆنەوە تا بەر لە رووخانی رژێمی بەعس دەدات، لەوێدا گرنگی ئێراقیبوون و بەها ئێراقیەکان خۆیان دەدردەخەن، کەسەکانی ناو پرۆسە دادگاییەکە، دادوەر، داواکاری گشتی و پارێزەرەکان بەشێوەی جۆراوجۆر گرنگیان بە ئێراقیببون، عەرەبیبوون و ئیسلامبوون داوە، دیارە کوردەکان خۆیان لە عەرەببوون پاراستووە، بەڵام وەکو عەرەبەکان گرنگیان بە ئێراقیبوون و ئیسلامبوون داوە، لە لایەن هەمووان ئێراق وەکو ستاتێکی رەوای خاوەن کانون و دەستپاکی سەیری کرا و جەختی لەسەر کرایەوە.

دادگا وەکو تاوانەکانی دیکە کە دژ بەنەتەوەی کورد کراون دۆسیەی گەلکوژی ئەنفالی لەگەڵ دۆسیەکانی دیکە کەبریتین لە تاوانکاریەکانی دژ بە شیعە، تورکمان، بازرگانو هیتر تێکەڵ کرد، بە تاوانی دوجەیل کە تاوانێکی لە چاو تاوانی گەلکوژی ئەنفال زۆر بچوکە دەستی بە کار کرد، سیستەماتیکیانە و پۆلینکردن بەپێی کۆنی، یا نەتەوە و گروپی ئەتنی سەیری تاوانەکان نەکران، هەر لە بەراییدا هەموو کەیسەکان وەکو تاوانکاری دژ بە خەڵکی ئێراق تێکەڵوپێکەڵ کران، بەمجۆرە دادگا جگە لەپێکهاتەکەی و کانونەکەی لە دۆسیەکانیشدا جوداییە نەتەوەیی و ئایینیەکانی خستە خانەیەکی ئەوها کە ئاستی جوداییانی کەمکردەوە و وەکو کەیسی خەڵکی ئێراق پیشان دران، لە دۆسیەکاندا ئاماژە بە تاوانکاریەکان کرا، کە لەلایەن هەندێ بەرپرسی رژێمی بەعس ئەنجام دراون، بەمشێوەیە دوو خاڵ لێرەدا گرنگیان پێدرا: یەکەم، کەیسەکان هەمووی وەکو کێشەی خەڵکی ئێراق و ئێراقیەکان سەیریان کرا و خرانە دادگا، دووەم: کەسە تاوانبارەکان نەك ستات بەرەورووی بەرپرسیاریی لە تاوانکاریەکان کرانەوە.

ئەگەر وردتر سەیری بەتایبەتی دادوەرەکان و داواکاری گشتی بکەین، باشتر ئەو فاکتەرە لایەنگرانەو گرنگیی ئێراقیبونو بەها ئێراقیەکان خۆیان دەردەخەن، دادوەر عەبدوڵلا عامری و محەمەد عورەیبی هەردوولایان سەیری ئێراقیان وەکو وڵاتی دادوەری و رەوایی کرد، جۆرێك لە شانازیان بەرامبەر بە ئێراقیبوون پیشان دا، واتە ئێراق وەکو ستات گرنگی پێدرا و بەرز داندرا، لێرەدا بێگومان ئەگەری پرسیار دروستکردن لەسەر تاوانباریی ستاتی ئێراق لە تاوانی گەلکوژی ئەنفالدا نامۆ دێتە بەرچاو و ناتەبایە لەگەڵ ئەو وێنەیەی کە دادوەرو دادگا هەوڵی پیشاندانی دەدا، عەبدوڵلا عامری نەك هەر بەچاوی بەرز سەیری ساتی ئێراقی دەکرد، بەڵکو زیاتر رۆیشت و هەڵوێستی رامیارانەو ئێراقچیانەی خۆی جار جارە دەردەخست، وەکو بۆنمونە لە دانیشتنێکدا هەڵوێستی دژی پارچەبوونی ئێراق پیشانداو گوتی، "کێ دەڵێ ئێراق پارچە دەبێت!"، ئەو نەك پرسیاری بەرامبەر بەپاکی ستاتی ئێراق دانەدەنا، بەڵکو دژی ئەو گۆتانەش بوو کە زیانیان بۆ سەروەری ئێراق هەبوو.

داواکاری گشتی کە رووی دادوەرییەو هەوڵ دەدات تاوانکاری سزای رەوای خۆی وەرگرێت، زۆر راکشاوانە جەختی لەسەر رەوایەتی ستاتی ئێراق دەکردەوە، لە هەموو پرۆسەکەدا هەوڵیدا

نەتەوەی کورد وەکو ئێراقی و خەڵکی ئێراق پیشان بدات، هەروەها هەوڵیدا تاوانەکە وەکو تاوانکاریی بەرپرسانی بەعس بەرامبەر بە بەشێك لە گەلی ئیراق پیشان بدات، واتە پرسیاری تاوانباریی خستە سەر کەسە تاوانبارەکان و تاوانکاریەکەی بە کەس کرد، بەهیچ جۆرێك خۆی لە پرسیاری بەرپرسیاریی ستات لە تاوانەکەدا نەدا، لەگەڵ ئەوەی تاوانەکە لەلایەن ئۆرگانە ستاتیەکانی ستاتی ئێراق راستەوخۆ ئەنجامدرا.

داواکاری گشتی لە سەرەتای پێشکەشکردنی داواکارییەکەی مۆرکی لایەنگرانەی ئێرایبوون، عەرەبیبوون و ئیسلامبوون بە داواکەی دیاربوو، ناوە ناوە ئاماژەی بۆ ئایەتێکی قورئان دەکرد، بە مەنتالێکی عەرەبیانە بابەتەکەی پێشکەش دەکرد، ئێراق و رەوابوونی ئێراقی بەرز دانا.

سەبارەت بەتاوانی گەلکوژی ئەنفال، داواکاری گشتی یەك جار ناوی هێزەکانی ئێراقی هێناو گوتی هێرشیان کردە سەر گەلی خۆیان، لێرەشدا گرنگی بەئێراقیبوونی نەتەوەی کورد دایەوە، داواکاری گشتی پاکانەی بۆ دادوەریی ئێراق کرد و گوتی ستاتی ئێراق رێگە بەتاوانی ئەوها نادات، دیارە ستاتی ئێراق بوو تاوانەکەی ئەنجامدا، هێزەکانی ئێراق بوون پیادەی بریارەکانی ستاتی ئێراقیان کرد، ئەو تاوانبارانی وەکو بەرپرسانی پێشوو ناو دەبردو خۆی لەناوهێنانی پەرپرسانی ستاتی ئێراق دەپاراست، لە کۆتایی وتاری داواکاریەکەیدا پەنجە دەخاتەسەر بوونی تاوانی گەلکوژی دژی کوردەکانی ئێراق، بەرپرسیارییەکە دەخاتەسەر کەسە تاوانبارەکان، لەهەمان کاتدا ئاماژە بە پێشێلکردنی کانونی ئێراقی و نێونەتەوەیی لە لایەن تاوانبارانەوە دەکات، بە شارستانی و رەوایی ستاتی ئێراقی هەڵدا و دادگاکەشی وەکو نمونەیەکی ئەو رەواییە پیشان دەدات، ڕاستە ئەو تاوانەکە وەکو تاوانی گەلکوژی دەسەڵمێنیت، بەڵام بەکەسی دەکاتو لەملی سەرۆکی ئێراق و ستاتی ئێراقی دەکاتەوە، هەرچەندە لەوەدا زۆر سەرکەوتوو نەبوو چونکە کردەو فاکتەرەکان هەمووی پەنجەیان بۆ ستاتی ئێراق و سەرۆك و سەرکردایەتی ئێراق درێژ دەکرد.

داواکاری گشتی بەهیچ جۆرێك پرسیاری لەسەر بەرپرسیاریی ستاتی ئێراق لەتاوانی گەلکوژیدا دانەنا، پەنجەی تاوانباریی بۆ ستاتی ئێراق نەچوو، بەوەی کەیسەکە کرایە کەیسێکی ناوخۆیی ئێراقی و تاوانەکەی خستە ملی هەندێ بەرپرسی بەعس، هەروەکو هەموو پرۆسەی دادگاییەکە بنچینەی لەسەر داڕشتووە، وادیاربوو هەوڵدەدرا هێماکان و فاکتەرەکانی کە جودایی دروست دەکەن و بوونی ناکۆکی دوو نەتەوە زەق نەکرێنەوە، بەلاوە بنرێن، لە هەمان کاتدا لەسەر ئەو فاکتەر و گۆتانەی کە ئاماژە بە وەکویەکی و تەبایی دەکەن، جیاوازییە نەتەوەییەکان بەلاوە دەنێن جەخت دەکرایەوە.

پرسیاریی بەرپرسیاریی ستات لەتاوانی گەلکوژی ئەنفالدا لەتەواوی پرۆسەی دادگاییەکەدا بوونی نەبوو، لەگەڵ ئەوەی کانونیانەو بەپێی بریارو کانونە نێونەتەوەییەکان دیارکردنی بەرپرسی ستات گرنگە، تاکە لایەنێك لەئێراقدا کە ئارەزووی ئەو پرسیارە بکات، بێگومان دەبێ

کوردەکان بن کە قوربانی دەستی تاوانی گەلکوژیین لەلایەن ستاتی ئێراقەوە، لەم پرۆسەیەدا سەرکردەکانی کوردو لایەنی کوردی نە لەدەرەوەی دادگا نە لەناو هۆڵی دادگا، بەهیچ جۆرێك خۆیان لەپرسیاری بەرپرسیاریی ستاتی ئێراق لە تاوانی گەلکوژی دژی نەتەوەی کورد نەدا، ئەوانیش وەکو عەرەبەکان پیادەی ئەو رەوتەیان کرد کە لە سایەی پۆلیتیکی پرۆسەی رامیاری ئێراقی دوای سەدام هەیە، دیارە ئەو هەڵوێستەی کوردەکان دەکرێ گەلێ لێکدانەوەی بۆ بکرێت، هۆکارێکی دیار ئەوەیە ئەوان خۆیان بەئێراقیی دەزانن، نەخوازیاری ئەو فاکتەرانەن کەجودایی لەنێوان نەتەوەکان دروست دەکەن، نەخوازیاری ئەو فاکتەرانەن کەلێکترازان دەجوڵێنن و هەوڵەکانی دروستکردنەوەی ئێراق لەق دەکەن، ئەوەش لەگەڵ رەوتی ئێراقچیانەیان گونجاوە، وەکو پێشتر ئاماژەی بۆکرا و روونکرایەوە، گومان لەسەر رەوایی نوێنەربوونی ئەوان بۆ نەتەوەی کورد هەیە.

بەکورتی ئەو فاکتەرو بەهایانەی کە لایەنی ئێراقیبوون، عەرەبوون و ئیسلامبوون دەگرن هەموویان بەجۆرێ لە جۆرەکان ئارەزووی پرسیاریی بەرپرسیاریی ستات ناکەن و لەگەڵ ئەو پرسیارە و بەهاکانی ئەو پرسیارە دانوویان ناکوڕێ، چونکە ئەو پرسیارە گومان لە سەر رەوایی و سەنگایی ئەو چەمکانە دروست دەکات، ستاتی ئێراق کە لە دوای رووخانی رژێمی سەدام هەوڵی دروستکردنەوەی رەوایی بوونی خۆی دەدات، هەولی رەوا بوونی یەکگرتوویی و سەروەری خۆی دەدات، هەوڵی پیشاندانی برایەتی و تەبایی نێو گەلانی ناو ستات دەدات، بەئەگەری زۆر ئارەزووی پرسیارێك ناکات کە ئەو هەوڵانە بنکۆڕ دەکات.

لە کۆتاییدا دەکرێ بڵێین کە دادگای نەتەوەیی بۆ ستاتی لە شێوەی ئێراق کە بە کێشەی نەتەوەیی و ئەتنی درێژخایەن دەناڵێنێ، کێشەی لەگەڵ چەمکەکانی بێلایەنی، سەربەخۆیی، دەستپاکی، پرۆفیشنالیزم، توانا و شارەزاییدا هەیە، بارگاوییە بە بەرژەوندی نەتەوەی باڵادەست و ستات، بۆیە ئەگەری گرنگی دان بە پرسیاری بەرپرسیاریی ستات لە تاوانی گەلکوژیدا زۆر لاوازە.

### پوختە

ستات بەرپرسیارە لەو تاوانکاریانەی کە ئۆرگانەکانی ستات راستەخۆی یا ناراستەوخۆ پێی هەڵدەستن، ئەوجا ئەو ئەنجامدانە راستەوخۆ لەلایەن ستاتەوە فەرمانی بۆ دەربکرێت، یا جۆرێك لەبەشداری ئۆرگانێکی سەر بە ستات بێت کە لەلایەن ستاتەوە ئەو دەسەڵاتەی دراوەتێ، هەر تاوانکاریەك کە ئۆرگانەکانی ستات پێی هەڵدەستن، بەرپرسیاریی لەسەر ستاتەکە وەکو دامەزراو دروست دەکات، بۆیە لە ئەگەری گۆڕانی سیستەم یا رژێم و دەسەڵاتدا ئەو بەرپرسیارییە لەسەر ستاتەکە لا ناچێت.

بەپێی ڕێکەوتننامەی پێشگرتن بە تاوانی گەلکوژی نەتەوەیەکگرتووەکان هەر کەسێك یا لایەنێك سەربە ئۆرگانی دەستوری بن یا نا، بە تاوانی گەلکوژی هەڵسێت یا بەجۆرێ لە جۆرەکان بەشداری لە هەوڵ و ئەنجامدانی تاوانەکەدا بکات سزای لەسەرە، لە ئەرتیکلی 4 دا هێما بۆ پێویستی سزادانی تاوانکاران دەکات و دەڵێ دەبێ سزا بدرێن، بەپێی ئەو ڕێکەوتنە دەکرێ ستات وەکو دامەزراو بەرەوڕووی بەرپرسیاریی بکرێتەوە.

بەگوێرەی بڕیارەکانی کۆمیسیۆنی کانونی نێونەتەوەیی هەر کردەیەکی نێونەتەوەیی قەدەغەکراو لەلایەن ستاتەوە، ستاتەکە بەرەورووی بەرپرسیاریی دەکاتەوە، لە بارێکدا کە کردەکە بەستاتەوە بلکێندرێ، یا کردەکە شکاندن و پێشێلکاری یەکێ لە ئەرکە نێونەتەوەییە سەپێندراوەکان بێت.

ئەرتیکلی 4، 5 ، 8 و 9 دا بڕیارەکانی کۆمیسیۆنی کانونی نێونەتەوەیی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەر ئۆرگانێکی ستات لە هەر بوارو ئاستێکدا بێت، کەس بێت یا دامەزراو و دەزگا بێت، کە تاوانێك ئەنجام دەدات، یا ڕاسپاردەی ستاتی لەکردەکە دراوەتێ، یا پشتگیری فەرمی ستاتی لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا هەیە هتد، ئەو تاوانە بە ستاتەوە دەلکێندرێت.

بەپێی دۆکترینی بەرپرسیاری ستات بۆ پارێزگاری سەروەری ستات بەرپرسیاریی لەسەرە، بەمجۆرە بەرپرسیاریی بنچینەیی پارێزگاری خەڵك دەکەوێتە ئەستۆی ستاتەکە، کاتێ ستات لە ئاست ئەو ئەرکەدا نەبێت، یا پێشێلی ئەو ئەرکە بکاتو خۆی تاوانکاری بەرامبەر بە خەڵکی وڵات بکات، ئەرکی سەپێندراوی خۆی دەشکێنێت، بۆیە پرەسیپی ماڤ سەروەری و دەستێوەرنەدان بەتاڵ دەبنەوەو ئەرکی پاراستنی خەڵکی ستاتەکە دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، لەمبارەدا کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی بە کاری دەستێوەردان دەتوانێ هەڵسێت، ئەوە هەموو کات پراکتیزە ناکرێت یا گرنگی خۆی پێنادرێت، لە زۆربەی بارەکاندا دەستێوەردان کاتێك سەردەگرێت ئەگەر بەرژەوەندی ستاتە دەسەڵاتدارەکان بیخوازێ و لە بەرژەوەندی ناسیونالیستانەی ئەواندا بێت.

دادگای نێونەتەوەیی بۆ دادوەری کە دادگای بنچینەیی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانە، ئاماژە بە گرنگی دداگاییکردن لەسەر تاوانەکانی گەلکوژی، تاوان دژ بە مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگ دەکات، هەروەها دادگایی ستات لە ئەگەری ئەو تاوانانەدا بە گرنگ دەزانێت، دادگا تایبەتە نێونەتەوەییەکان دادگای گونجاون بۆ لێپێچانەوە لە بەرپرسیاری ستات لە تاواندا، بەڵام مەرج نییە دادگا گرنگی بەم پرسیارە بدات، لە کاتێکدا بەرژەوەندییە ڕامیارییە نێونەتەوەییەکان ئەوە ناخوازن، دادگای تایبەتی نەتەوەیی کە بۆ لێپێچانەوە و دادگایی تاوانی گەلکوژی و تاوانەکانی دیکە دادەندرێن، هەمیشە کێشەی بێلایەنی، سەربەخۆیی و توانای هەیە، ستات کە خۆی دادگاکەی دامەزراندووە، بە ئەگەری زۆر ئارەزووی پرسیاری بەرپرسیارکردنی ستات ناکات.

بە ئاماژە بە كانونە نێونەتەوەییەكان و بریارەكانی رێككەوتنامەی گەلكوژی، ئێراق وەكو دامەزراوی ستات لە تاوانی گەلكوژی ئەنفالدا تاوانبارە، چونكە ئۆرگانەكانی ستات راستەوخۆ تاوانەكەیان ئەنجام داوە، هەروەها بەهەمان پێوەر ئێراق بەرپرسیاری لە هەموو ئەو تاوانانە دەكەوێتە ئەستۆ كە ئۆرگانەكانی ئەو دژی نەتەوەی كورد ئەنجامیان داوە.

دادگای باڵای تاوانەكانی ئێراق كە بە دادگایەكی ناسیونال (نەتەوەیی) دادەندرێت، لە لایەن دەسەڵاتی هاوپەیمان بەسەرپەرشتی ئەمەریكا و ئەنجومەنی كاتی حوكم كە هەواداری ئەمەریكا بوون دامەزرا، كانون و رەوتی دادگاكە لەگەڵ پرۆسەی رامیاریی دروستكردنەوەی ئێراق گونجێندرا، هەروەكو دادگاكە دەرهاویشتەی ئەو پرۆسەیە بوو.

دادگای باڵای تاوانەكانی ئێراقی ناتوانیٚ ببێتە دادگایەكی نەتەوەیی بۆ نەتەوەی كورد كە ناسنامەی نەتەوەیی خۆی لە ئێراقدا نادۆزێتەوە، لەكاتێكدا بۆ عەرەبەكان دەكریٚ وەكو دادگایەكی نەتەوەیی سەیری بكرێت، لەمبارەدا ئەو دادگایە بۆ نەتەوەی كورد ناگونجاوە و نارەوایە.

ئەگەرچی ئەو دادگایە دانی بە بوونی تاوانی گەلكوژی نا، بەڵام تاوانەكەی بەكەس كرد، تاوانەكەی كردە تاوانی بەرپرسان بەرامبەر بە بەشێك لە خەڵكی ئێراق و سەرۆكی ئێراق و ستاتی ئێراقی لە تاوانەكە بوارد، گرنگی بە پرسیاری بەرپرسیاریی ستاتی ئێراق لە تاوانی گەلكوژی ئەنفال نەدا، دادگا گرنگی بە ئێراقیبوون و رەوایەتی بوونی ستاتی ئیراق دا، دژی ئەم چەمكانە وەستا كە گومان لەسەر رەوابوونی ستات دروست دەكەن.

دادگای نەتەوەیی بۆ ستاتی لە شێوەی ئێراق كە شەقبوونی گەورەی نەتەوەیی و ئەتنی تێدایە، كێشەی دیاری لەگەڵ چەمكەكانی بێلایەنی، سەربەخۆیی، توانا و پرۆفشنالیزمدا هەیە، بۆیە دادگای نەتەوەیی بۆ وڵاتی لەم شێوەیە ناگونجاوە، هەروەكو لە دادگای ئێراقیدا هەموو ئەو كێشانە دەركەوتن، دەستێوەردانی بەردەوام، گەندەڵی، ناپرۆفیشنالی و لایەنگیری لە بوارەكانی ئێراقیبوون، عەرەببوون و ئیسلامبوون لە دادگاكەدا مۆركیان دیار بوو.

# ئەو هێڵکاریانەی جینۆسایدمان بۆ دەسەڵمێنن

لەتیف فاتیح فەرەج

وەزارەتی شەهیدان وئەنفالکراوەکان، لەکۆکردنەوەو خستنەڕووی هێڵکاری زانیاریەکانی جینۆساید کردنی گەلی کوردا، کارێکی باشی کرد، بەوەی لانی کەم کۆمەڵێ داتای خستە بەردەست، هەر نا بۆئەوەی چیتر نەڵێین، حکومەتی کوردی، ئەو حکومەتەی خانی و حاجی قادر بەئاواتیەوە سەریان نایەوە، سەبارەت بە گەورەترین کارەسات کە بەسەر میللەتەکەی هاتووە بێ داتایە، ئاخر ئەو کارە کارێکی ڕاگوزەر نیەو ماندوبوون و هەوڵێکی زۆری ویستووە، ئەوە لەو بڵاوکراوەیەدا دەردەکەوێت کە بەو بۆنەیەوە چاپیان کردووە، ئێمە لە ڕێگای ئەم هێڵکاریانەوە، دەتوانین بەدۆست و دوژمن بڵێین لەکارەساتی ئەنفالدا چیمان بەسەرهاتووە، بەهیوای ئەوەی ئەم بڵاوکراوەیە بکرێتە زمانە زیندوەکانی دنیا بەتایبەت (ئینگلیزی وفەڕەنسی و ئەڵمانی و عەرەبی و چینی)، هەڵبەت بە دەسکاری و پێشەکی بۆ نووسین و وردەکاری دیکەوە، ئەم بڵاوکراوەیە هیچی لە نامیلکەی (( بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە))ی جولەکە سەبارەت بە هۆلەکۆست کەمتر نیە، هەرچەند بڕوام وایە ئێمە لە ژمارەی ئەنفالکراوەکانماندا هەنابێ لەسەر قوربانیەکان بوەستین و پێوسیتە ڕاگوێزراوان، دورخراوەکان بەگشتی لیست بەندبکەین، هەر بەم کارەش بۆمان دەردەکەوێت، کە ژمارەکە زۆر لە (182) هەزار زیاترە وەك چۆن هەڵەبجەش قوربانی و شەهیدەکانی نزیکەی ((8)) هەزارە نەك ((5)) هەزار ئەوهێڵکاریە وردە بۆ خوێنەری بیانی و بۆ سەڵماندنی جینۆساید کارێکی بایەخدارە ئەگەر چی پێشتر دادگای باڵای تاوەنەکانی ڕژێم بە دۆسیەی ئەنفال و پێش ئەویش کتێبی جینۆساید لە ئێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کوردو کتێبو بەڵگەو دۆکۆمێنتەکانی سامانساپاوەر وپیتەر گالبرێس وئی دیکەو هیومان ڕایتس وۆچ و ناوەندەکانی دیکە. تاڕادەیەکی زۆرئەو تاوانەیان بە جینۆساید ناساندووە، ئەوەی بەلای منەوە گرنگە لەم هێڵکاریەدا، دەست بردنە بۆ زەرەر و زیانە نامرۆییەکان. ئەوەیە یەکێك بوو لە کێماسیەکانی ئێمە وەکو کورد، بەلام لەم هێڵکاریەدا زۆربەی ئەو زیانانە ئاماژە نما کراوە، بۆ نموونە ڕێژەی ئەو پارەیەی کە لە پرۆسەی ئەنفالدا لە نێوچووە لای قوربانیەکان و کەسوکاریان:

(سلێمانی ((30593127)) سی ملیۆن و پێنج سەدو نەوەدوسێ هەزارو سەدوبیست وحەوت) دیناری چاپی سویسری، (کەرکوك ((27450585)) بیست و حەوت ملیۆن و چوارسەدو پەنجا هەزارو پێنج سەدو هەشتاو پێنج دینار، پارێزگاکانی دیکە (هەولێر ((14615606)) چواردە

ملیۆن و شەش سەدو پانزە هەزاروشەش سەدوشەش دینار، (دهۆك ((12212954)) دوازدە ملیۆن و دوو سەدو دوانزە هەزارو نۆ سەدو پەنجاو چوار دیناری چاپی سویسری، پارێزگاکانی دیکە، دیالە و سەلاحەدین و شوێنەکانی تر ((13352209)) سیانزە ملیۆن وسێ سەدو پەنجاو دوو هەزار و دوو سەد و نۆ دینار بەگشتی ئەوپارەیەی کە لەپرۆسەی ئەنفالدا بەپێی ئەم هێڵکاریە لەنێوچووە، بریتییە لە: ((98,224,481)) نەوەدوهەشت ملیۆن ودووسەدو بیست و چوار هەزار و چوار سەدو هەشتاو یەك دیناری سویسری، ئێستا ئەگەر بزانین لەو سەردەمەدا هەر دینارێکی سویسری سێ دۆلاری ئەمەریکی بووە ئەوا ئەو برە پارەیەی کە لەنێوچووە ((294,673,443)) دۆلاری ئەمەریکی لە نێوچووە بەپێی پێوەری ئەمرۆش ئەم برە پارەیە، پارەیەکی زۆر زۆرە هەڵبەت دەبێ ئەوە بزانین، ئەم پارەیە تەواوی ئەو پارە لەدەست چووە نیە، چونکە زۆرێك لە قوربانیەکان پارەکەیان لە گیرفانیاندا بووە، جگە لەکاتژمێرو کەلو پەلی گرنبەهای دیکە، جگە لە ئاڵتون و زیو، بەبڕوای من ئەرکی حکومەتی ئێستای ئێراقیە ئەو برە پارەیە بە زیادەوە بۆ وەزارەتی کاروباری شەهیدانو ئەنفالکراوەکان بگێڕێتەوە تا مۆنۆمێنت و پارك و ناوەندی تایبەت بە توێژینەوەو بە دواداچوونی پرسی ئەنفالی پێ دروست بکرێت، بەو برە پارەیە دەتوانرێت باشترین خزمەت بە ناوچە ئەنفالزەدەکان بکرێت. لەو هێڵکاریەدا باسی لە زەرەرو زیانی دیکەی زۆر کراوە لەوانە خانووبەرە، دانەوێڵەو هتد... کە ئەمەش دەکرێت بە پارە لێکبدرێتەوە. بۆ ڕێکخراوەکانی مافی ئاژەڵ و ژینگەش لە دنیادا زۆر گرنگە کە بزانن. کە ڕێژەیەکی زۆر ئاژەڵ تووشی لە ناوچوون و قڕکردن و جینۆساید بونەتەوە. هێڵکاری 13–4ـی ئەو بلاوکراوەیە بەم جۆرە ئەوەمان بۆ دەخاتە بەردەست.

ڕەشەولاخ (71,784) سەر، مەڕ (684,521) سەر، بزن (503,020) سەر، کەروێشك (153,851) سەر، گوێ درێژ (146,66) دانە، ئێستر (5,905) دانە، ئەسپ‌ومایین (6,421) دانە، بەگشتی ئەم ژمارە ئاژەڵە هەمەجۆر و لەناوچووە دەکاتە: (1,440,168) یەك ملیۆن و چوار سەدو چل هەزار و سەدو شەست و هەشت دانە. لەمەشدا کەرکوك زۆرترین زیانی بەرکەوتووەو بەپلەی یەکەم دێت بە (656,909) شەش سەدو پەنجاو شەش هەزار و نۆ سەدو نۆ ئاژەڵی هەمە جۆر. واتە نزیکەی تەواوی ئاژەڵی لە نێوچوو دەکەوێتە سنووری پارێزگای کەرکوکەوە. بە پلەی دووەم سلێمانی دێت بە (431,079) دانە لەو نێوەدا زۆرترین ئاژەڵی لەناوچوو مەڕە کەدەکاتە ((684,512)) سەر بەدووی ئەویشدا بزن دێت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆر ترین هاولاتیانی ناوچەی کوردەواری ئاژەڵداری دەکەن بەتایبەت لە ناوچەی گەرمیان. لە هێڵکاری (14 – 4)ـی ئەو بلاوکراوەیەدا ژمارەی ئاژەڵە لەناوچووەکانی هەر پارێزگایەك ڕوونکراوەتەوە بەم جۆرە:

کەرکوك 656909 ئاژەڵی هەمە جۆر.

سلێمانی 431076 ئاژەڵی هەمە جۆر.
دهۆك 164463 ئاژەڵی هەمە جۆر.
هەولێر 94774 ئاژەڵی هەمە جۆر.
پارێزگاكانی دیكە 92946 ئاژەڵی هەمە جۆر.

ئەم ژمارە زۆرە لە ئاژەڵی لەناوچوو، ڕاوی ترسناكی پەلامارە دڕندانەكە دەسەڵمێنێت، لەلایەكی دیكەشەوە لەگەڵ ئەو بڕیارەی (عەلی حەسەن مەجید) عەلی كیماویدا دێنەوە كە لە شەش خاڵدا ڕایگەیاندو هەڕەشەی سوتاندن و لەناوبردنی هەموو شتێكی كرد.

لە دوای پەلامارەكە جاشەكان خۆیان دەیانگێڕایەوە كە چۆن لە قادركەرەمەوە بەم بەرو بەری جادەكەدا مەڕومالاتی كورد مردار بوو بوونەوە تا دەگاتە نزیك تكریتو شوێنەكانی دیكە. جێی داخە كە لەم بلاوكراوەیەدا بایەخ بە سەگ و پشیلەو تاژی لەناوچوو نەدراوەو لەوە ناچێ لە فۆرمەكەشدا پرسیاری وا بیری لێ كرابێتەوە هەڵبەت سەگو پشیلەو تاژیش لە كۆكردنەوەی ئەم زانیاریانەدا بایەخی خۆیان دەبوو لەكام گوندو كام ماڵ سەگو پشیلە نەبووەو لەناو نەچووە؟! دیارە لەهەموو گوندو ماڵەكان، لەبلاوكراوەكەدا وردەكاری زۆر تر لەوبارەیەوە هەیە. كە مرۆڤ ناتوانێ هەروا بە بێ دەنگی بەلایاندا پێپەڕێت. لە پەلەوەریشدا نزیكەی (600) هەزار پەلەوەر لە نێو چووە كە لەوەدا مریشك لەهەموو زیاتر كە (340) هەزار دانەیە واتە لەنیوە زیاتر، قەلیش بە پلەی دووەم دێت بە (107000) سەدو حەوت هەزار دانە بە دوای ئەوانیشدا قازو مراویو هەنگ دێت. بەم جۆرە لە ڕێگای ئەو بلاوكراوەیەوە زانیاری وردمان لەسەر پرۆسەی جینۆساید كردن لە كوردستان دەستدەكەوێت، زانیاری گەلێك كە نەك هەر بۆ كورد. بگرە بۆ تەواوی دنیا جێی سەرنجو سەرسامین، ئێستا ئیدی ئەو بەرنامەیەم بیردەكەوێتەوە كاتێ لەبەڕێز ئازاد جوندیانیم پرسی ئێوە زانیاریتان چیە لەسەر ئەنفال لەكاتێكدا دەبوایە ژمارەی چۆلەكەی لەناوچووشتان زانیبا.

ئێستا ئیدی وا لەوە نزیك دەبینەوە، ڕەنگە ئەوەی ئەو سەردەمە بەمنی وتبێتم زیاتر لە دڵ پڕیو لەسۆزەوە بووبێ، لێ ئیستا زانیمان كە چ ژمارەیەكی پلەوەرمان لەدەست چووە، هەر لەوبلاكراوەیەدا ژمارەی ئامێرە لەناوچووەكانی هەر پارێزگایەكیش ڕوونكراوەتەوە كەئەویش كەركوك بە (4,418) ئامێری هەمەجۆرو سلێمانی بە (3,201) ئامێرو هەولێر بە (1,237) ئامێرو دهۆك بە (867) ئامێرو پارێزگاكانی دیكە بەگشتی ((776)) ئامێر ئەمەش بەگشتی دەكاتە (10,499) ئامێری هەمە جۆر كە لەوژمارەیە .

تەراكتۆر بە پلەی یەكەم دێت بە ڕێژەی (4,826) دانە.

لە زێڕو زیویشدا سلێمانی (54,824) مسقاڵ زێڕو (19,962) مسقاڵ زیوو.

كەركوك (37,996) مسقاڵ زێڕو ((21,316)) مسقاڵ زیوو.

هەولێر (38,717) مسقاڵ زێڕو (3,695) مسقاڵ زیوو.

دهۆك (26,125) مسقاڵ زێر و (6,610) مسقاڵ زیوو.

پارێزگاکانی دیکە (30,609) مسقاڵ زێڕو (13,920) مسقاڵ زیوویان لە نێوچووە.

کە واتە بەگشتی زێڕ: ((188,271)) مسقاڵ زێڕ.

زیوو: (65,503) مسقاڵ لە نێوچووە. کە بەهەردووکیان دەکاتە: (253,774) مسقاڵ زێڕو زیوو پێکەوە لە ئەنفالدا لە ناوچوونە، لەوردکردنەوەی زیاتردا دەکرا حکومەتی کوردی بەتایبەت ئەو گروپانەی بەو کارە هەستاون دواتر لە ڕووماڵ کردنی داتاکاندا بە پێی هەر قۆناغێکی ئەنفالیش ئەوەیان زیاتر ڕونکردبایەوە کە لە چ قۆناغێکدا زۆرترین زیان لە کورد کەوتووە. هەروەك چۆن ئەمە بۆ پارێزگاکان کراوە، دەکرا بۆ قەزاو ناحیۆ گوندەکانیش کرابا، پێم وایە مادام فۆرمەکان لە بارێت دەکرێت، بەوفۆرمانەدا بچینەوە. لەگەڵ ئەوپەڕی بایەخی ئەم کارەدا کەدەیان کەس کاریان تیاکردووەو وەزارەتیش ئەمەی کردوە ئاماژەی بەتەواوی ناوەکان کردووە، دەشێ بڵێین مەرج نیە توانرابێت تەواوی زەرەرو زیانەکان ئەژمار بکرێن، بۆ نموونە لەپێشتر کاتژمێری دەستم وەکو نموونە هێنایەوە کە کەم کەس لەگوند لە وەیش نەبووە، ئێمە پێشتر لە گۆڕێکی بەکۆمەڵی نزیك کەربەلادا لەدەستی چوار قوربانیدا ئەو کاتژمێرانەمان هێنایەوە. کە تائێستاش ماون، ئەمە جگە لە تفەنگو دەمانچە کە ڕنگە دانەرانی فۆرمی پرسیار نامەکە نەیانویستبێ خۆیان لەومەسەلەیە بدەن. لەکاتێکدا ئەمە زۆر ئاساییە لەهەموو ولاتێکیش هاولاتیان بۆ پاراستنی گیانی خۆیان تفەنگو دەمانچەیان هەیە، ئەمە لە ولاتێك بۆ ولاتێك دەگۆڕێت، ئەوەی کە لە تەواوی بلاوکراوەکەدا ئاماژەی پێنەدراوە بە ژمارە قوربانیەکانە کە پێم وایە خۆبواردنیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ((182)) هەزار کەس دەرنەچووە یان لەو ژمارەیە کەمترە، لەکاتێکدا ڕووپێوی ناوچە ئەنفالزەدەکان زۆر لەو ژمارەیە زیاتر بە ئێمە دەڵێ، ناکرێ تەواوی ڕاگوێزراوەکان لەگوندو ناحیۆ ڕوخاوەکانەوە بۆ ئۆردوگا زۆرە ملێکان وەکی قوربانی جینۆساید، تەماشا نەکرێن کەواتە ژمارەکە زۆر لە (182) هەزار زیاترە.

بۆ خۆی یەکێك لە هەنگاوەکانی جینۆسایدیش کۆکردنەوەو دەستبەسەرکردنی خەڵکە بۆ لە نێودان، ئەگەر تەماشای ئەوەش بکەین کە زۆرترینی گەنج و پیاوەکان بەرشالاوەکە کەوتن و ژن و پیرەمێرد و پیرە ژنەکان بەتەنیا هێڵرانەوە، تێدەگەین کە ئامانجی بەعس لە پرۆسەکە لە ناودانی هەنگاو بەهەنگاو بووە، واتە سەرەتا گەنج و پیاوەکانی بەرەو گۆڕە بە کۆمەڵەکان براون، ئەگەر چی لەگەڵ ئەواندا ژن و منالی زۆریش براون. ئەوی ماویشەتەوە دەستبەسەر کراوە لە ئۆردوگا سەربازیەکاندا کە زیاتر لە ئۆردوگای سایگۆنی دەچێ. بەمەش زیادبوونو گەشە کردنو منالبوونی ڕاگرتووە، ئەوەش یەکێکی دیکەیە لە هەنگاوەکانی جینۆساید، کە واتە بەهەموو شێوازێك ئەوەی بەرانبەر کورد کراوە لە ئەنفالدا جینۆسایدێکی حاشا هەڵنەگرە.

وەك وتم پێشتریش ئەمە هیومان ڕایتس وۆچ و میدڵ ئێست وۆچ و ناوەندەکانی دیکە بە دادگای باڵای تاوانەکانی ڕژێمیشەوە سەلماندبوویان.

ئەم کارەی وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان یەکێکە لەو کارانەی جێگای ستایشەو دەبێ بەهەند وەربگیرێت بەهیوای ئەوەی بکرێتە زمانەکانی دیکەش. لەڕاستیدا ئەم کارە هاندەرێکی باشە بۆ ئەوەی توێژەران بیر لەوە بکەنەوە لە ڕێگەی داتاوە کار لەسەر جینۆسایدکردنی گەلی کورد بکەن. ئەگەر چی ئەوەش بۆ خۆی گرفتی خۆی هەیە ئێستا سەرقاڵی نووسینی ئەم ووتارەم بەر لە (10) ساڵ زیاتر فۆرمێکم بۆ چوار سەد کوڕو کچی ئەنفال نارد کە بریتی بوو لە چەندین پرسیار بەداخەوە تا نووسینی ئەم ووتارە ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانیە چاپ نەکراوەو کوڕو کچەکان ئیدی گەورە بوونە. کەواتە دانانی دەزگایەکی پێویست بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی ئەو کارانە ئەرکێکی هەرە لە پێشی ئەو وەزارەتەیە، بەهیوای بیرکردنەوە لەو پرۆژەیە.

# ئه نجام و کاریگەریەکانی پرۆسەی ئەنفال لەسەر باری ئابووری و کۆمەلاّیەتی و دەرونی ئافرەتی کورد

عەدالەت عومەر

پرۆسەی بەدی ئەنفال وێرای قاتوقڕکردنی گەلی کورد و وێرانکردنی کوردستان و تێکدانی ژێرخانی ئابووری، گەلێك دەردەسەری و نەخۆشی کۆمەلاّیەتی لەدوای خۆی بەجێهێشت کە تاوەکو ئێستاش بەجێماوی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بەدەستیانەوە دەنالێنن، ڕاستە ئەم پرۆسەیە گشت چین و توێژەکانی کۆمەلّگەی کوردەواری بەبێ جیاوازی گرتەوە، بەلاّم ئافرەت بەشی هەرە زۆری ئەو نەهامەتی و دەردەسەریانەی بەرکەوت بەتایبەتی دوای ئەوەی کە رەوانەی ئۆردوگا زۆرەملێکان کران ئەویش بۆ مردنی لەسەرەخۆو تێکدانی ڕەوشی کۆمەلاّیەتی و شکاندنی کەسایەتیان بەهەموو جۆرێك، ([1]) چونکە لەم لێکۆلّینەوەیەدا دەرکەوتووە کە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان لە (89.57٪) ئەو ئافرەتانەن کە پیاوەکانیان ئەنفالکراوە ئەوەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە رێژەی پیاوی خێزاندار زۆر زیاتر لە ئافرەتی خێزاندار ئەنفالکراوەو شونبزرکراون، چونکە سیاسەتی رژێمی عێراق مەبەستی لە ناوبردنی گەنجی کوردە بۆ ئەوەی هێزی بەرهەم هێنی کوردستان لەرەگ و ریشەوە هەلّتەکێنێ، رژێم دەیزانی ئەگەر پیاوەکان ئەنفال بکات ئافرەتە خێزاندارەکان شووناکەنەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ داب و نەریتی کورد کە شەرمە ئافرەتی خاوەن مندالّ شوبکاتەوە، بەتایبەتیش ئەگەر چارەنوسی مێردەکەی بزربێت. لەو بەشەدا – کە دوابەشی لێکۆلّینەوەکەیە – باس لەو دیاردەو گیروگرفتە ئابووری و کۆمەلایەتی و ئەو دیاردە و نەخۆشیە دەروونیانە دەکەین کە بالّیان بەسەر کەس و کاری ئەنفالکراوەکان داکیشاوە بۆ ئەوەی ئاگاداری بارودۆخی ژیان و هەلّس و کەوت وچارەنوسیان بین.

**باسی یەکەم: گیروگرفتی ئابووری**

کەس و کاری قوربانیانی ئەنفال سەرەڕای ئەوەی کەس و کاریان ئەنفال و بێ سەروشوێن کران مالّ و سەروەت و سامانیان لەلایەن رژێمی رووخاوی بەعس بە تالاّن بردرا وەك ئاشکرایە گرنگترین سەرچاوەی بژێوی ژیانی گوندنشینەکانی کوردستان چاندنی بەروبومی کشتوکالّی بووە وەك لەم لێکۆلینەوەیەدا دەرکەوتووە کشتوکالّ بەرێژەی (71,48٪) و بەرێژەی (18,42٪)ئاژەلّداری بووە، کە لە پاش شالاّوەکانی ئەنفال خیزانی کەس و کاری ئەنفالکراو

---

[1]. لەتیف فاتیح فەرەج، گۆڤاری ئەنفال، ژمارە (1)

سەرچاوەی سەرەکی بژێویان لە دەست دا، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم بەشە چالاك و بەرهەمهێنە بوون، بە کۆمەڵێکی بێکار ئەمەش بەخۆی زەرەرو زیانێکی ئابووری بوو کە یەکەم بە کوردستان و دووەم بە کەس و کاری قوربانیانی ئەنفال کەوت. لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە گیروگرفتی ئابووری زیاتر باڵی بەسەر ئافرەتەکان داکێشاوە، ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین کەس و کاری ئەنفال کراوەکان سەرچاوەیەکی بژێوی ژیانیان نییە و لە بێکاری و بێ دەرامەتی رەنج دەبەن.

**خشتەی ژمارە1 پیشەی ئافرەتی کەسوکاری ئەنفال پیش شاڵاوی ئەنفال**

| ژن وکچی ماڵەوە | | جوتیاری و کشتوکاڵ | | دامو دەزگای حکومی | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| 385 | 96.2 | 11 | 2.8 | 4 | 1 | 400 | 100 |



لە نمونەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە خشتەی ژمارە (1) بۆمان دەردەکەویت کە پێش شالاوی ئەنفال پیشەی ئافرەت لە ناو کەسوکاری ئەنفال بە ڕێژەی (96,2٪) ژن و کچی ماڵەوە بوونە و لەدەروەی مال هیچ کارێکی تریان نەکردوە، لەهەمان کاتدا (2.8٪) جوتیارن و کاری کشتوکاڵیان کردوە وەك هاوکاری کردن لە خیزاندا. هەروەها (1٪) ی لە دام و دەزگای حکومی خزمەتگوزار بووینە. بەلام پاش شالاوەکە چونکە زۆربەی پیاوەکانیان ئەنفال کراون وئافرەتەکان خۆیان سەرپەرشتی خێزانەکانیان دەکەن بۆیە دەبینین هەموو ئەرکە ئابووری و کۆمەلایەتیەکان کەوتۆتە سەرشانی ئافرەت و ئافرەت بوەتە سەرپەرشتیاری ماڵ و هەر لە پەروەردەکردنی منداڵ و ئیش و کاری ناوماڵ و کار کردن لەدەرەوە بۆ پەیدا کرنی بژێوی رۆژانە ،چونکە وەك لە خشتەی ژمارە (2) دەرکەوتووە زۆربەیان هاوسەری دووبارەیان هەڵنەبژاردۆتەوە، کە ڕێژەی (96٪) پێك دێنن کە ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ نادیار بوونی چارەنووسی هاوژینیان و دابونەریتی کۆمەڵگا هەروەها پەروەردە کردنی منداڵەکانیان.

**خشتەی ژمارە (2) دووبارە چوونەوە ناو ژیانی هاوسەری**

| شوونەکردنەوە | | شووکردنەوە | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە |
| 384 | 96 | 16 | 4 | 400 | 100 |



ئەو هۆکارانەی لە سەرەوە باسمان کرد بووە هۆی گۆران لە پیشەی ئێستایان رێژەکان وەك لە خشتەی ژمارە (3)دا هاتووە بەم شێوەیە گۆرانیان بەسەردا هاتووە رێژەی (73.53٪) ژن و کچی ماڵەوەن و لەدەروەی ماڵ هیچ کارێك ناکەن رێژەی (6,4٪) قوتابین کە ئەم رێژەیە لە پێش شالاوەکانی ئەنفال بەدی نەدەکرا ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە رژێمی عێراق هەردەم هەوڵی داوە گەلی کورد بەنەخوێندەواری بهێڵێتەوە، تاوەکو لەرووی پێشکەوتن و پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریەکان بەدوا کەوتویی بمێنێتەوەو لە رەوتی کۆمەڵگەکان دابرێ لە هەمان کاتدا رێژەی (6, 8٪ ) کرێکاری و کاری کشتوکاڵی دەکەن کە ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانی رۆژانەی خۆی و منداڵەکانیان هەر وەك پێشتر باسمان کرد هەروەها رێژەی (1, 3٪) کاری پیشەی دەست وەك دۆرمان و گۆڵی دەستکرد و تەنوری نان لە قۆر دروست دەکەن (27, 2٪) لە دام دەزگاکانی حکومەت کاری خزمەتگوزاری دەکەن بە رێژەی (6,1٪ ) لە رێکخراوەکانی ناحکومی کار دەکەن، لێرەدا ئەگەر بمانەوێت بەراوردێك بکەین لە نێوان کار و پیشەی رەگەزی مێینەدا لە پیش ئەنفال و پاش ئەنفال بکەین ئەو گۆرانکاریانە بەدی دەکەین کە لە کار و پیشەی ژنان و کچان بەجێماوەی ئەنفالدا هاتووتە ئاراوا ك ئەویش دەگەریتەوە بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە لەئەنجامی شالاوەکاندا بەسەر خێزانی کورد داهات بۆ نموونە هەژاری، گۆرینی جێ و شوێن، بێ سەرپەرشتیاری خێزان.. هتد، هەروەها دەتوانین بە سلبی بە ایجابیش لە قەڵەمی بدەین.

**خشتەی ژمارە (3) پیشەی ئافرەتی كەسوكاری ئەنفال پاش شاڵاوی ئەنفال**

| ژن و کچی ماڵەوە | | قوتابی | | کرێکاری وکشتوکاڵ | | پیشەی دەست | | دامودەزگای حکومی | | ڕێکخراوی ناحکومی | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| ٢٩٥ | ٧٣,٥٣ | ٢٦ | ٦,٤ | ٣٤ | ٨,٦ | ١٢ | ٣,١ | ٩ | ٢,٢٧ | ٢٤ | ٦,١ | ٤٠٠ | ١٠٠ |



به شێوەیەكی گشتی سەبارەت بە سەرچاوەكانی بژێوی ژیانی كەسوكاری ئەنفال هەر وەك لە لێكۆڵینەوەكەدا دەركەوتووە دەتوانین بڵێین تێك و پێكدانی بنەماو ژێرخانی ئابووری دێهاتی كوردستان وای كرد كەبارودۆخی ئابوری كوردستان بەرەونەهامەتی و ناڕێكی و ناهەمواری بچێت و دووچاری ئیفلیجی ببێت و نەتوانێ خۆی لەسەر پێ ڕابگرێ، بێگومان ئەوەش بوە هۆی بەربڵاوبوونەوەی بێكاری و هەژاری لەنێو كۆمەڵگەی كوردستانداو ئاسەوارە نێگەتیڤە كانیشی تاوەكو ئەمڕۆ دیارو لەبەرچاون، هەر بۆیە كەسوكاری ئەنفالكراوەكان بە ناچاری بۆ دابین كردنی پێداویستیە سەرەكییەكانی ژیانیان پشت بە بە هەندێك سەرچاوەی ئابووری دەبەستن كە كەموكۆرییەكانی ژیانیان پڕ ناكاتەوە، لە نمونەی لێكۆڵینەوەكەدا وەك لە خشتەی ژمارە(4) دەركەوتووە ڕێژەی (25,03٪) ئەو خێزانانەی كە ڕێكخراوە مرۆییە ناوخۆیی و بیانیەكان یارمەتی دراوەن، ڕیژەی (74, 37٪) مووچەیان بۆ بڕاوەتەوە لە لایەن حكومەت وەك (دەزگای شەهیدی پێشوو و وەزارەتی پێشمەرگە و چاودێری خێزان و خانەنشینی و كارگوزاری)، ئەوانەی خزم و كەس و كاریان یارمەتیان دەدەن لە جیاتی قەرەبوو كردنەوەی زەرەر و زیانیان و بژێوی ژیانیان ڕێژەی (3.69٪) پێك دێنن، بەڵام ڕێژەی (33,54٪) هیچ جۆرە یارمەتییەك نەدراون نە لەبڕی زیانەكان و نە بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی ڕۆژانەیان ئەوەی جێگای ئاماژە پێكردنە زۆربەی كەسوكاری ئەنفالكراوەكان بۆ بژێوی ژیانیان پشت بە وەرگرتنی بڕی خوراك كە مانگانە بەستووە كە ئەویش وەك هەموو لایەك ئاگادارن ماوەیكی زۆرە بە كەموكۆریەكی زۆر دابەش دەكرێت هەروەها دەتوانین بڵێین كەسوكاری ئەنفالەكان ئەو بڕە یارمەتییە كەمەی كە لە حكومەت و ڕێكخراوەكان وەریدەگرن لە بەر گرانی بازار و كری نیشتەجێبوون چارەسەری كێشەكانیان ناكات بەلام دەتوانین بڵێین لە هیچ باشترە.

**خشتەی ژمارە(4)سەرچاوەی بژێوی ژیانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان پاش شاڵاوی ئەنفال**

| ڕێکخراوی ناحکومی ناوخۆیی و بیانی | | حکومەت | | خزم و کەسوکار | | هیچ جۆرە یارمەتیەك وەرناگرن | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| ١٠٠ | ٢٥,٠٣ | ١٥١ | ٣٧,٧٤ | ١٥ | ٣,٦٩ | ١٣٤ | ٣٣,٥٤ | ٤٠٠ | ١٠٠ |



هەر بە پێی ئەو لێکۆڵینەوەیە لە خشتەی ژمارە(5)دا بۆمان دەرکەوتووە بە ڕێژەی (74,42 ٪) کەسوکاری ئەنفالکراوەکان کێشەی نیشتەجێ بوون و خانووبەرەیان هەیە و لە هەمانکات بە ڕێژەی (25.53) هیچ جۆرەکێشەیەکیان نیە.

**خشتەی ژمارە(5)کێشەی نیشتەجێ بوونی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان**

| کێشەی نیشتەجێ بوون و خانوو بەرە | | کێشەی نیشتەجێ بوونیان نیە | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| 298 | 74.42 | 102 | 25.53 | 400 | 100 |



**باسی دووەم: دیاردە گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکان**

ئۆپەراسیۆنی ئەنفال هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ شلەژان و پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگەی کوردەواری و تێکدانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە نێوان یەکتریدا، هەروەها بوە هۆی نەهێشتن و تێکدانی داب و نەریتی ڕەسەنی کوردەواری کە بنچینە و بنەمای سەرەکین بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی. نەخۆشی و دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی پاشماوەی ئەنفال گەلێك زۆرن لەوانە:

**ا- سەرپەرشتیاری خێزان:**

بێگومان هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد کە خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵەو کۆمەڵیش لە ڕێگای ئەوەوە دەتوانێت زۆر لە ئەرك و مافەکانی بەجێ بێنێت، وە کاتێك سەرپەرشتیاری ئەو خێزانە بەهەر هۆیەك بێت نەمێنێت ئەوا سیستەمی بنەڕەتی دوچاری بارێکی نا ئارامی و ناجێگری دەبێت لە دواییدا ئاسەوارێکی خراپی بەسەردا دێت، ئەگەر بەراوردێك لە نێوان باری خێزان و سەرپەرشتیاری بکەین لە پێش ڕوودانی شاڵاوەکانی ئەنفال و دوای ڕودانەکەش ئەوا هەندێك ڕاستیمان بۆ بەدیار دەکەوێت کە سەرپەرشتیاری خێزان چ ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی هەیە لە پێشخستن و سەرکەوتنی خێزاندا، لە پێش شاڵاوەکانی ئەنفال وەك لە خشتەی ژمارە(6) دەرکەوتووە سەرپەرشتیاری خێزان بەرێژەی (90,12٪) لە ژێر دەسەڵاتی پیاو بووە بەرامبەر (9,88٪) کە لە ژێر دەسەڵاتی ئافرەت بووە، بەڵام ئەم ڕێژەیە لە دوای شاڵاوەکانی ئەنفال گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە وەك لە خشتەی ژمارە(7) بوومان دەرکەوتووە بە ڕێژەی (34,45٪) لە ژێر دەسەلاتی پیاو و بە ڕێژەی (65,55٪) لە ژێر دەسەڵاتی ئافرەت دایە لە ناو خێزانی کەس وکاری ئەنفالکراوەکان ،ئەوەش ئەوەمان بۆ رون دەکاتەوە کە ڕێژەی پیاوان زۆر بەر شاڵاوەکە کەوتونە بەرامبەر بەرێژەی ئافرەت، لێرەدا پێویستە بڵێین ئافرەت بۆتە قۆچی قوربانی ئەم تاوانە چیٚ وەك ئەوانەی لە شاڵاوەکە ئەوپەری سووکایەتیان دەرهەق کراوە و بێسەروشوێن کران چیٚ وەك ئەوەی هەموو مەینەتیەکانی پاش ئەنفال بۆ ئەوان بە جێماوە بۆیە هەر وەك لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد دەبینین هەموو ئەرکە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان کەوتۆتە سەرشانی ئافرەت کە ئەوەش بوەتە هۆی تێك چوون و شلەژانی خێزان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و گۆڕانی سیستەمی پەروەردەیی لە ناو خێزانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکاندا.

**خشتەی ژمارە( 6 ) سەرپەرشتیاری خێزان پیش شاڵاوی ئەنفال**

| دەسەڵاتی پیاو | | دەسەڵاتی ئافرەت | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| 360 | 90.12 | 40 | 9.88 | 400 | 100 |



**خشتەی ژمارە( 7 ) سەرپەرشتیاری خێزان پاش شاڵاوی ئەنفال**

| دەسەڵاتی پیاو | | دەسەڵاتی ئافرەت | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| 138 | 34.45 | 262 | 65.55 | 400 | 100 |



لە ئەنجامی ئەم گۆڕانە هەروەك لە خشتەی ژمارە(8) دەرکەوتووە  بە پیّ ی پیشەی ئیستای ئافرەتەکان کە پێشتر باسمان لێوە کرد بە ڕێژەی (20٪)  ئافرەت لە خێزانی کەسوکاری ئەنفال لە دەرەوەی ماڵ کار دەکەن ئەمە جگە لە ئەوانەی کە قوتابین.

**خشتەی ژمارە ( 8 ) کارکردنی ئافرەت لەدەرەوەی ماڵ**

| کارکردن لە دەرەوەی ماڵ | | کارکردن لە ناو ماڵ | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| 80 | 20 | 320 | 80 | 400 | 100 |



بۆیە دەبینین وەك لە خشتەی ژمارە(9) دەرکەوتووە ڕێژەی (52,5٪) ئەو ژنانەی لە دەرەوەی ماڵ کاردەکەن لە کاتی کارکردن منداڵەکانیان لە ماڵەوە بە جیّ دەهێڵێن و بە ڕێژەی (47,95٪) منداڵەکانیان لە لای کەسوکار یان لەگەڵ خۆیان دەبن کە لەم ڕێژەیەیش وەك لە خشتەی ژمارە(10)دا دەرکەوتووە ئەو ئافرەتانەی منداڵەکانیان لە ماڵەوە بەجیّ دەهێڵێن منداڵەکانیان تووشی کێشەوگیروگرفت دەبنەوە کە بەرێژەی(31٪) منداڵەکان تووشی کارەساتی جیاجیا بونەتەوە وەك (سووتان , شەر و ئاژاوەنان , کەوتنە خواروە لە سەر بان و بە ژێر سەیارە کەوتن و....) هەروەها بەرێژەی (15٪) تووشی لادانی کۆمەلایەتی بونەتەوە .

**خشنەی ژمارە(9) جێهێشتنی منداڵ لە كاتی كاركردنی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ**

| جێهێشتنی لە ماڵ | | جێهێشتنی لای كەسوكار | | كۆ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە |
| 42 | 52.5 | 38 | 47.95 | 80 | 100 |



**خشنەی ژمارە( 10 ) كێشەوگیروگرفتی منداڵان لە كاتی جێهێشتنیان لە ماڵ**

| كارەساتی جیاجیا | | لادانی كۆمەڵایەتی | | بێ كێشە | | كۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە |
| 13 | 31 | 6 | 15 | 23 | 54 | 42 | 100 |



هەروەها وەك لە خشتەی ژمارە(11) دەركەوتووە خۆدی ئافرەتاكانیش لە كاتی كاركردن لە دەرەوەی ماڵ تووشی كێشە و گیروگرفت بۆنەتەوە وەك دەستدرێژی سێكسی لە لایەن خاوەنكار بە رێژەی (28٪) و بە رێژەی (6٪) تووشی لادانی كۆمەڵایەتی و بە رێژەی (16٪ ) تووشی شەرو ئاژاوە لەسەر كەمی مووچە لەگەڵ خاوەنكار بوونەتەوە.

**خشتەی ژمارە( 11 ) گیروگرفتی ئافرەتی كەسوكاری ئەنفال لەكاتی كاركردن دەرەوەی ماڵ**

| دەستدرێژی سێکسی | | شەروئاژاوە لەگەڵ خاونکار | | لادانی کۆمەڵایەتی | | بێکێشە | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە |
| ٢٢ | ٢٨ | ١٣ | ١٦ | ٥ | ٦ | ٤٠ | ٥٠ | ٨٠ | ١٠٠ |



**ب- دیاردەی نەخوێندەواری:**

ئاشکرایە نەخوێندەواری کوشندەترین نەخۆشییە کەدووچاری کۆمەڵ دێتو بەهۆیەوە ئەم کۆمەڵە دوادەکەوێت ولەرەوتی کۆمەڵگەکانی تر دادەبڕێ. شالاوەکانی ئەنفال زۆر دیاردەو نەخۆشی کۆمەلایەتی لێکەوتەوە، نەخوێندەواریش یەکێکە لەو دیاردانە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە لەئەنجامی شالاوەکاندا بەسەر خێزانی کورد داهات بۆ نموونە هەژاری، گۆڕینی جێو شوێن، بێ سەرپەرشتیاری خێزان.. هتد، هەموویان فاکتەری سەرەکین کەوایان کردووە کەسو کاری ئەنفالکراوەکان بە رێژەیەکی بەرز بەنەخوێندەواری بمێننەوە، هەروەها ئەوەشمان لەبیرنەچێت کەرژێمی عێراق هەردەم هەوڵی داوە گەلی کورد بەنەخوێندەواری بهێڵێتەوە، تاوەکو لەڕووی پێشکەوتنو پەرەپێدانی کۆمەلایەتیو رۆشنبیریەکان بەدوا کەوتویی بمێنێتەوەو لە ڕەوتی کۆمەڵگەکان دابڕێ بۆ نمونە نەبوونی قوتابخانە لە گوندەکان، بەپێی خشتەی ژمارە(12) بۆمان دەرکەوتووە کە رێژەی نەخوێندەواری ئافرەت لەخێزانی ئەنفالکراوەکان لە (77,33٪) ە کە بەرزترین رێژەیە بەرامبەر بە (3,68٪) کەخوێندەوارن (بەمانای ئەوەی دەزانن بخوێننو بنوسن) لەکاتێکدا لە (10,42٪) خاوەن بڕوانامەی سەرەتایین، بەلام ئەوانەی بڕوانامەی ناوەندییان هەیە رێژەکەیان لە (5,23٪) ەو سەبارەت بە ئاستی دواناوەندی و پەیمانگا و زانکوکان رێژەکەیان (3,34٪) کە هۆی کەمی ئەم رێژەیە دەگەرێتەوە بۆ خراپی و ئالۆزی باری ژیانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان و هەروەها پێگەی کۆمەلایەتی ئافرەتی کورد کە رێگا لە خوێندنیان دەگیرێت.

**خشتەی ژمارە( 12 ) خوێندەواری ئافرەت لە ناو خێزانی کەسوکاری ئەنفالکراو**

| نەخوێندەوار | | خوێنـــدن و نووسین | | بروانامــــــەی سەرەتایی | | بروانامــــــەی ناوەندی | | دوا ناوەندی و پــــــەیمانگا و زانکۆ | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| ٣ ٠٩ | ٧٧, ٣٣ | ١ ٥ | ٣, ٦٨ | ٤ ٢ | ١٠,٤ ٢ | ٢ ١ | ٥,٢ ٣ | ١ ٣ | ٣,٣ ٤ | ٤ ٠٠ | ١ ٠٠ |



**ج- گۆڕینی شوێنی نیشتەجێ بوون و لەدەست دانی داب و نەریتی ڕەسەنی کوردەواری**

هەرکۆمەڵگەیەك کە شڵەژا، ئەوا بێگومان زۆر لە بنەما سەرەکییەکانی لە دەست دەدا یان گـۆڕانی بەسـەر دادێـت، شـاڵاوی ئـەنفال کـە بناغـە و پرانـسیپە سـەرەکیەکانی کۆمەڵگـەی کوردەواری‌بە شێوەیەکی گشتی خێزانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بە تایبەتی تێك و پێکدا و کاری کردە سەر داب و نەریتی کلتور و فلکلوری ڕەسەنی کوردەواری بۆ نمونە گۆڕینی (شێوەیە جل و بـەرگ، داب ونـەریتی جـەژن، جـۆری هەڵپـەرکێ و گـورانی ووتـن، حەکایـەت و مەتـەڵی کوردی، سلووکی هاموشۆ کردن، شێوەزاری قسەکردن و...) بە جۆرێك کە وەك لە خشتەی ژمارە(13) بۆمان دەرکەوتووە بە ڕێژەی لە (62,23٪) ئافرەت لە خێزانی ئەنفالکراوەکان دوای گۆڕانی شوێنی دانیشتن و لەبەر دابڕانیان لە خزم و کەس و کاریان بە ناچاری وازیان لە داب و نەریت وکلتوری ڕەسەنی خۆیان هێناوەو پەیڕەوی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی ئەو شوێنە دەکەن کە تێیدا نیشتەجێ کراون لە هەمان کات بە ڕێژەی (37.77) گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە.

هــەروەك لەمــەوپێش ئاماژەمــان پێکــرد ئــافرەت بەشــی هــەرە زۆری ئــەو نەهامــەتی و دەردەســەریانەی بەرکــەوت بەتایبــەتی دوای ئــەوەی کــە ڕەوانــەی ئۆردوگــا زۆرەملێکــان کــران، ئەمەش ئامانجێکی گرنگی ڕژێم بوە لە پلان دانان و پیادەکردنی شاڵاوەکانی ئەنفالدا بەرامبەر بـە خـەڵکی لادێنـشین ناوچـەکانی کوردسـتان کـە خـاوەن داب و نـەریت و کلتـوری ڕەسـەنی کوردەواری ونەتەوەیی بوون.

**خشتەی ژمارە( 13 )کاریگەری شوێنی نیشتەجێبوون لەسەر کلتوروداب ونەریتی ڕەسەنی کوردەواری**

| گۆڕان | | نەگۆڕان | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە | ژمارە | ڕێژە |
| 249 | 62.23 | 151 | 37.77 | 400 | 100 |



**باسی سێیەم: دیاردەو نەخۆشیە دەرونییەکان**

دیاردە و نەخۆشیە دەرونییەکان لە ئەنجامی ئەو زەبرە دەروونیەیە کە مرۆڤ تووشی دەبێت (زەبری دەروونی ئەو کاتە روودەدات کە کەسێك رووبەرووی رووداوێکی ناخۆشی کتوپڕ یان چاوەروان نەکراوی لە ناکاو دەبێت و لە ئاکامدا توانستەکانی تاك بۆ بەرنگاربوونەوەی ئاسایی تێکدەچێت و دەشڵەژێت وەك بە گوللە برینداربوون ئازار و ئەشکنجەدان دەستدرێژی سێکسی، مردنی لە ناکاوی کەسێکی ئازیز و نزیك، کاتێك زەبری دەرونی چارەسەر نەکرێت خاوەنەکەی تووشی چەندین فشاری دەروونی‌تر دەکات و بۆ کەمکردنەوەی کاری ئەو زەبرە رێگاچارەی کاریگەر نادۆزێتەوە، هەروەها ئەگەری تووشبوونی ئەو تاکە بە نەخۆشیە دەروونیەکان زۆر دەبێت وەك: (خەموکی، دڵەراوکێ، نەخۆشی جەستە دەروونیەکان (سایکۆسۆماتی )، تێکچوون و شڵەژانی کەسایەتی و... تاد) (2).

ئەگەر سەرنجێکی ورد بدەینە ڕوخساری کەس و کاری ئەنفالکراوەکان و لە بارودۆخی کۆمەلایەتی و تەندروستیان بکۆڵینەوە ئەوا بە ئاشکرا ئاسەواری ئەو نەخۆشیانە بە دیاردەکەویت. لەم لێکۆڵینەوە مەیدانیدا کە لەگەڵ ئافرەتەکانی کەس و کاری ئەنفالکراوەکان ئەنجامدراوە وەك لە خشتەی ژمارە(14) دەرکەوتووە بە ریژەی (76٪) ئافرەت لە خێزانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان دوچاری کۆمەلێك دیاردە ونەخۆشی دەرونی وەك دڵەراوکێ، خەمۆکی، ترس، لەهۆش چوون وفراموشی...هتد هاتوون) کەوا لە خوارەوە باسیان دەکەین ، هەروەها بە رێژەی (24٪) تووشی هیچ جۆرە دیاردەونەخۆشی دەروونی نەهاتوون.

**خشتەی ژمارە( 14 )رێژەی تووشبووانی ئافرەت بە دیاردە ونەخۆشیە دەروونییەکان**

2. د.کریم شەریف قەرەچەتانی ،سایکۆلۆژیای رێنمایی دەروونی ،زنجیرەی بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی-ژمارە (26)، چاپی یەکەم، هەولێر2005،ل (57-58)

| کۆ | | تووشنەبووان | | توشبووان | |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕێژه | ژماره | ڕێژه | ژماره | ڕێژه | ژماره |
| 100 | 400 | 24 | 96 | 76 | 304 |



**ا- دڵەڕاوكێ:**

**دڵـەراوكێ جۆرێكـە لـە هەڵـچونی دەروونـی و تاڕادەیـەكی زۆر لـەترس دەچـێت لـە كـاتی ترسناكیداو ئەمەش دەم دەم ڕوودەدات یان بەشێوەیەكی هێواش دەست پیێ دەكات ئینجا وردە وردە زیاد دەكات، دڵە ڕاوكێ كەس لێی رزگار نابێت و هەموو كەسێك دوچاری دەبێت بەكەم و زیـادەوە ئـافرەت زیـاتر دوچـاری دەبێـت وەك لـە پیـاو بەرێـژەی 2٪ بـۆ1٪ ، وەك لـە خـشتەی ژمارە(15) دەركەوتووە كە بە رێژەی (26,98 ٪) ئافرەت لە خێزانی كەسوكاری ئەنفالكراوەكان دووچاری دڵەراوكێ هاتوونە كە ئەوەش رێژەیەكی زۆرە بە بەراورد لەگەڵ هەندێك لە نەخۆشیە دەرونییەكانی تر.**

**ب- ترس، تۆقاندن:**

**ترس هەڵچوونێكی دەرونییە كە مرۆڤ توشی دەبێت، یەكێكە لە حاڵـەكانی دڵـەراوكێ یـان پەرچدانەوەی هۆكارێكی دیار، وەك تـرس لـە تـاریكی و شـوێنی داخـراوو سـوار بـوونی هۆكـانی گواستنەوە، فرۆكـە، كەشـتی، شـەمەندەفەر یـان تـرس لـە شـوێنی بـەرز، بـە پیێ لێكـۆڵینـەوەكان (كاتێك لە ژیـانی رۆژانە روبـەروی هەرەشـە و بڤـە ومەترسـی دەبینـەوە یـان سەرچاوەی داهـات و بژێومان روبـەروی نەهامـەتی دەبێتـەوە ئـەو كاتانـە هەڵـچوونی تـرس سـەر هەڵـدەدات) ([3]) كاتێـك تـرس لـە سـنوری ئاسـایی خـۆی دەرچـووە مـرۆڤ تووشـی فۆبیـا (تـۆقین) دەبێـت، هـەر لـەم لێكۆڵینەوەیە لە خشتەی ژمارە(15) بۆمان دەركەوتوە كە بە رێژەی (26٪) ئافرەت لە خێزانی كەسوكاری ئەنفالكراوەكان تووشی ترس هـاتوون كـە ئـەوەش بێگومـان دەرەنجامی ئـەو هـەموو جەوروستەم و زەبرو قینەیە كە رژێم بەرامبەر بە گەلی كوردی ئەنجامداوە، چونكە بێ بەزەیی و دڕندەیی ئەو رژێمـە و تاوانەبێوێنـەكانی بوەتـە هـۆی خولقاندنی حالـەتێك لە تۆقاندن، هـەروەها**

[3] . د.كریم شەریف قەرەچەتانی- سایكۆلۆژیای گشتی- چاپی دووەم، هەولێر/2007-ل(125)

پاش شاڵاوەکانی ئەنفال کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بە تایبەتی ئافرەتەکان ژیانیان بەردەوام لە حالەتێکی هەرەشە و مەترسی دابووە، کە ئەوەش بێگومان لە نەوەیەك بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە.

**ج-- خەمۆکی ( الكابه ):**

خەمۆکی حاڵەتێکی دەروونی گشتیە توشی هەموو چین و توێژێك دەبێت، (زۆر هۆکاری وەك (نەبوونی، شەر ئاژاوەی ناو خێزان، مردنی کەسێکی نزیك، هەستکردن بە زوڵم و ناهەقی سووکایەتی پێکردن ناخۆشی بەردەوام، ئاوەرایی و دەربەدەری) مرۆڤ تووشی خەموکی و دڵتەنگی دەکات) ([4]) (ئەم حاڵەتەش رۆژ بەرۆژ لە زیادبواندایە بە تایبەتی لەو وڵاتانەی کە گۆڕانکاری خێرایان بەسەر دا دێت وەك ناوچەی کوردستان کە لە بارودۆخێکی تایبەت دا دەژی). ([5]) هەر لە خشتەی ژمارە(15)داهاتووە کە (24,39٪) ئافرەت لە خێزانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان دوچاری خەمۆکی هاتوون.

کە بێگومان ئەو رێژەیە بە هۆی ئەو بارە ناهەموار و دژوارەی کە کەس و کاری ئەنفالکراوەکان تیایدا دەژین رۆژ لە دوای رۆژ لە زیاد بوندایە و چاوەڕوانی چارەسەرێکی خێراو کتوپری لێ ناکرێت.

**د- لە بیرکردن ( النسیان ):**

هێندی جار کارەسات و روداوی دڵتەزێنی جەستەیی یان دەرونی بە هێز دەبنە هۆی سرینەوەو لە ناوبردنی ژمارەیەك لە زانیاری و رووداوی عەمبارکراوی ناو کۆئەندامی یادکردنەوە ئینجا هەندیك جار ئەو سرینەوەو لە بیرچوونەوەیە کاتیە هەندێك جار هەتا هەتایە ([6]) لە ئەنجامی زۆر لێکۆلینەوە، وەك مردنی خۆشەویستێك یان یادکردنەوەی روداوێکی دڵتەزێن کە دەبێتە هۆی خورپەیەکی دەروونی کە کاردەکاتە سەر مێشك و دەبێتە هۆی لە بیر چوونەوە ئەمە لە خشتەی ژمارە(15) دەرکەوتووە (15,17٪) ئافرەت لە خێزانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان کە لێکۆڵینەوەکەیان لەسەر ئەنجامدراوە دووچاری لە بیر چونەوە هاتوون).

**ە-لە هۆش چوون پەرکەمی ( الصرع )**

---

[4] . د.کریم شەریف قەرەچەتانی– سایکۆلۆژیای رێنمایی دەروونی ،زنجیرەی بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەییژمارە (26)، چاپی یەکەم، هەولێر2005،–ل(121)

[5] . محەمەد کەریم شەیدا نەخۆشیە دەروونیەکان و دەروون لەشییەکان (سایکۆماتی)یەکان، سلێمانی/2000، ل (68)

[6] ..کریم شەریف قەرەچەتانی– سایکۆلۆژیای گشتی– چاپی دووەم، هەولێر/2007–ل(228)

نەخۆشـیەكی دەمارییـە بریتیـە لـە پەشـۆكی كـاتی لـە فەرمانـەكانی دەماغـدا كەبورانـەوەی لەگەڵدایە ئەم پەشۆكیەش شیاوی دووبارەبوونەوەیە، دیارە ئەم نەخۆشییە دەرونییە وەك هەموو نەخۆشییەكانی تـر لەلایـەن كـەس و كـاری ئەنفالكراوەكانـەوە زیـاتر لـەوانی تـر بـە دیـار كـەوتوە، لێكۆڵینـەوە مەیدانیەكـە ئـەوەی دەرخـستووە وەك لـە خـشتەی ژمـارە(15)دا هـاتووە بەرێـژەی (7,44٪) ئـافرەت لـە خێزانـی كەسـوكاری ئـەنفالكراوەكان دوچـاری ئـەم نەخۆشـییە هـاتوون ئاســەوارێكی خراپییــشی كردۆتــە ســەر بــاری خێزانــی و دەروونــی ئــافرەت و كــەس وكــاری ئەنفالكراوەكان.

**خشتەی ژمارە( 15 )جۆری دیاردە و نەخۆشیە دەروونییەكان**

| دڵەڕاوكێ | | ترس و تۆقاندن | | خەمۆكی | | لە بیركردن | | پەركەمی | | كۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژماره | رێژه | ژماره | رێژه | ژماره | رێژه | ژماره | رێژه | ژماره | رێژه | ژماره | رێژه |
| ١٠٨ | ٢٦,٩٨ | ١٠٤ | ٢٦ | ٩٨ | ٢٤,٣٩ | ٦٠ | ١٥,١٧ | ٣٠ | ٧,٤٤ | ٤٠٠ | ١٠٠ |



ئەمانە و گەلێك دیاردەو گیروگرفتی دەروونـی تـر وەكـو (دڵ تـەنگی، شـێت بـوون، تووڕەبـون، زۆر بیركردنەوە...هتد ) كە كەس و كاری ئەنفالكراوەكان دووچاری هاتوون و تاوەكو ئێستاش بــە دەســتیانەوە دەنــاڵێنن وە ئەگــەر لــە ڕێــژەی تــوش بــوان بــە گرفــت ودیــاردەو نەخۆشــیە دەرونییەكان وردبینـەوە دەبێـنین شـاڵاوەكانی ئـەنفال لـە روی دەرونیـەوە كارێگـەری زۆر خراپـی هەبووە لەسەر خێزانە ئەنفالكراوەكان بەتایبەتی ئافرەت و ئەندامانی كۆمەڵگا بەگشتی.

**دەرئەنجــام**

لـە كۆتـایی ئـەم لێكۆڵینەوەیـە دا دەكـرێ ئەنجامـە سـەرەكییەكانی بـەم شـێوەیەی خـوارەوە لێكبدەینەوە:

**یەكـەم:** پرۆسـەی ئـەنفال یەكێكـە لـە گـەورەترین و دڕندانـەترین تـاوان- وێـرای زنجـیرە تاوانەكانی تر- كە دەرهەق بە نەتەوەی كورد ئەنجامدرا بێت، بێگومـان ئامـانجی سـەرەكی رژێم تیایدا پاكتاو كردنی نەژادی و برانەوەی رەچەڵەكی مرۆڤی كورد بووە، ئەم تاوانە نا مرۆڤانەیـە كاریگەرییەكی ئێجگار گەورەی كردە سەر نەتەوەی كورد بە گشتی و تاكی كورد بە تایبەتی

هەروەها زەرەروزیانێکی زۆریشی بە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواری بەبێ جیاوازی گەیاند.

دووەم: ئافرەت قۆچی قوربانی کارەساتی ئەنفالە، چونکە لە پاش شاڵاوی ئەنفال هەڵگری مەینەتیەکانی بەجێماوەی ئەنفال بوو، هەروەها هەموو ئەرکە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان کەوتووتە سەر شانی چونکە لە پێش شاڵاوەکانی ئەنفال سەرپەرشتیاری خێزان رێژەی (90,12٪) لە ژێر دەسەڵاتی پیاو بووە بەرامبەر کە (9,88٪) لە ژێر دەسەڵاتی ئافرەت بووە، بەلام ئەم رێژەیە لە دوای شاڵاوەکانی ئەنفال گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە کە بوەتە لە (34,45٪) لە ژێر دەسەلاتی پیاو و بە رێژەی (65,55٪) لە ژێر دەسەڵاتی ئافرەت دایە لە ناو خێزانی کەس وکاری ئەنفالکراوەکان ئەوەش ئەوەمان بۆ رون دەکاتەوە کە رێژەی پیاوان زۆر بەر شاڵاوەکە کەوتونە بەرامبەر بەرێژەی ئافرەت، لە ئەنجامی ئەم گۆرانە هەروەك لە لێکۆلینەوەکەدا دەرکەوتووە کە بەرێژەی (52,5٪) ژنان لە کاتی کارکردن مندالەکانیان لە ماڵەوە بە جێ دەهێڵێن کە لەم رێژەیەیش (31٪) مندالەکان تووشی کارەساتی جیاجیا بونەتەوە وەك (سووتان , شەر و ئاژاوەنان , کەوتنە خواروە لە سەر بان و بە ژێر سەیارە کەوتن و....) هەروەها رێژەی (15٪) تووشی لادانی کۆمەلایەتی بونەتەوە هەروەها خۆدی ئافرەتاکانیش لە کاتی کارکردن لە دەرەوەی ماڵ تووشی کێشە و گیروگرفت بۆنەتەوە وەك دەستدرێژی سێکسی لە لایەن خاوەنکار بە رێژەی (28٪) و بە رێژەی (6٪) تووشی لادانی کۆمەڵایەتی و بە رێژەی (16٪ ) تووشی شەرو ئاژاوە لەسەر کەمی مووچە لەگەڵ خاوەنکار بوونەتەوە

سێیەم: وێڕای زەرەرو زیانی گیانی پرۆسەی ئەنفال کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر ژێرخانی ئابووری کوردستان و دوچاری ئیفلیجی و شلەژانی کرد، چونکە ئاشکرایە گوندو دێهاتەکان کە سەرچاوەی بنەڕەتی داهاتی کوردستان بوون بە گشتی وێرانکران و لە ناوبردران بەمەش ئابووری کوردستان روی لە کزی کردو بەرەو هەلدێرچوو لە لێکۆلێنەوەکە بۆمان دەردەکەویت کە پێش شالاوی ئەنفال رێژەی (96,2٪) ژن و کچی ماڵەوە بوون و لەدەروەی مال هیچ کارێکی‌تریان نەکردوە، بەلام پاش شالاوەکانی ئەنفال رێژەکان بەم شێوەیە گۆرانیان بەسەردا هاتووە رێژەی (73,53٪ ) ژن و کچی ماڵەوەن و لەدەروەی مال هیچ کارێك ناکەن رێژەی (6,4٪) قوتابین کە ئەم رێژەیە لە پێش شالاوەکانی ئەنفال بەدی نەدەکرا لە هەمان کاتدا رێژەی (8,6٪) کرێکاری و کاری کشتوکاڵی دەکەن هەروەها رێژەی (3,1٪) کاری پیشەی دەست وەك دۆرمان و گوڵی دەستکرد و تەنوری نان لە قوڕ دروست دەکەن (2,27٪) لە دام دەزگاکانی حکومەت کاری خزمەتگوزاری دەکەن بە رێژەی (6,1٪) لە رێکخراوەکانی ناحکومی کار دەکەن کە ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دابین کردنی بژیوی ژیانی رۆژانەی خۆی و مندالەکانیان هەر وەك پێشتر باسمان کرد،کە دەتوانین ئەم گۆرانە بە سلبی بە ایجابیش لە قەڵەمی بدەین.

**چوارەم:** تاوانی بەدی ئەنفال گەلێك دیاردەی کۆمەڵایەتی لێ کەوتەوە لە وانەش گورینی شوێنی نیشتەجێ بوون و کە ئەمەش بێگومان کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەی کردە سەر کلتور و فلکلور وداب و نەریتی رەسەن و ڕەوشت و خەسلەتە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری و بوە هۆی لە دەستدانی هەندێك لەوینەما سەرەکیو پتەوانەی کە لە کۆمەڵگە دا بەدی دەکران کە بە رێژەی لە (62,23٪) خێزانەکان دوای گۆڕانی شوێنی دانیشتن و لەبەر دابڕانیان لە خزم و کەس و کاریان بە ناچاری وازیان لە داب و نەریتی رەسەنی خۆیان هێناوە.

**پێنجەم:** سەبارەت بە نەخویندەواری کە رێژەی نەخوێندەواری ئافرەت لەخێزانی ئەنفالکراوەکان لە (77,33٪) ە کە بەرزترین رێژەیە بەرامبەر بە (3,68٪) کەخوێندەوارن (بەمانای ئەوەی دەزانن بخوێنن و بنوسن) لەکاتێکدا لە (10,42٪) خاوەن بڕوانامەی سەرەتایین، بەڵام ئەوانەی بڕوانامەی ناوەندییان هەیە رێژەکەیان لە (5,23٪) ەو سەبارەت بە ئاستی دواناوەندی و پەیمانگا و زانکوکان رێژەکەیان (3,43٪) کە هۆی کەمی ئەم رێژەیە دەگەرێتەوە بۆ خراپی و ئالۆزی باری ژیانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان و هەروەها پێگەی کۆمەلایەتی ئافرەتی کورد کە رێگا لە خویندنیان دەگیرێت، دیارە ئەمەش گیروگرفتێکی ئێجگار گەورەیە کەپێویستە لێکۆڵینەوەو چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە، چونکە مانەوەی ئەم رێژە بەرزە لەناو ئەم کەسو کارانە دەبێتە هۆی دروستبوونی نەوەیەك کە (خوو) بەنەخوێندەواری بگرێت.

**شەشەم:**.هەروەها ئاسەواری تاوانی ئەنفال بوە هۆی بلاو بوونەوەی کۆمەلێك گرفت و نەخۆشی دەرونی کە بە رێژەی (76٪) ئافرەت لە خێزانی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان دوچاری نەخۆشی دەرونی وەك دڵەراوکێ، خەمۆکی، ترس، نەخۆشی جەستە دەروونییەکان (سایکۆسۆماتی)، لەهۆش چوون...هتد هاتوون) تاوەکو ئەمڕۆ بە دەستیانەوە دەناڵێنن.

### پێشنیار و راسپاردەکان

ئاشکرایە دوا بە دوای ئەنجامدانی شالاوی بەدی ئەنفال کۆمەڵی کوردەواری هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد- دوچاری گەلێك گیروگرفت و تەگەری ناخۆش بۆوە، کە ئەمەش وای کرد بارودۆخ و ڕەوشێکی تایبەتی بە سەر کەس و کاری ئەنفالکراوەکان دابێت و دوچاری حالەتێکی نالەبار و ناسەقامگیریان بکات، بۆیە لەم روانگەیەوە پێویستە ستراتیژیەتێکی تایبەت بۆ چارەسەرکردن و نەمانی ئەم ڕەوشە نالەبارە بدۆزرێتەوەو نەخشەو پلانی گونجاوو لە باری بۆ دابڕێژرێت و تیایدا هەوڵبدرێت ئاسەوارەکانی ئەم تاوانە بنبڕ بکرێت یاخود هەر نابتوانرێت کەم بکرێتەوە بێگومان ئەم ئەرکەش دەکەوێتە سەرشانی هەموو کەس و لایەنێك بۆ ئەوەی بە ئەرکی نەتەوایەتی خۆیان هەڵبستن و ئەم کارە ئەنجام بدەن.

**یەکەم:**. لە سەرەتا دا پێویستە ئێستا کە تاوانی ئەنفال لە رێگای دادگای ئەنفال خراوەتە خانەی قرکردنی بە کۆمەڵ (جینۆساید) هەوڵبدرێت لە رێگای دیبلۆماسیەتی کورد و نوێنەرانی

حکومەتی هەرێم لە دەرەوە ئەم بابەتە لە کۆڕو کۆبونەوە نێو دەوڵەتییەکان بوروژێنریت و مەزلومیەتی گەلی کورد بۆ جیهان رون بکرێتەوەو ئەوانەش کە دەستیان لە ئەنجامدانی ئەم تاوانە بێ وینەیە هەبووە، بەسزای خۆیان بگەن، بەتایبەتی کە دەبینین ئەمڕۆ چۆن تاوانبارانی جینۆساید کردنی گەلی کوردستان ئەو حوکمەی بەسەریان دراوە دوادەخرێت.

دووەم: پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستان بەتایبەتی کە ئیستا وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوەکان دامەزراوە بە شێوەیەکی گشتی دەبێت مشۆرێکی جدیانە لەم کارەساتە بخورێت ئەمەش لە رێگای بەرهەمهێنانی داهات بۆ کەسوکاری ئەنفالەکان بە تایبەتی ئافرەت کە رێژەی (73,53٪) ژن و کچی ماڵەوەن و لەدەرەوەی مال هیچ کارێك ناکەن بە هاوکاری لەگەڵ رێکخراوە و کۆمپانیاکانی ناوەوە و دەرەوەی ولات و بۆ ئەم مەبەستەش سوود لە پسپۆران وشارەزایانی ئەم بوارە وەربگیرێت.

هەروەها حکومتی هەریمی کوردستان داوا لە حکومتی فیدرالی عێراق بکات وێرای داوای لێبوردن لە گەلی کوردستان بەرامبەر ئەو هەموو کارەسات مەینەتیاتە، بەشێکی تایبەت لە بوودجەی عێراق بۆ دابینکردنی مووچەی مانگانە و ئاوادان کردنەوەی گوندەکان و چارەسەرکردنی کێشەی نیشتەجێبوون و قەربووکردنەوەی زەرەروزیانیان دابنرێت هەروەها لە رێگای رێکخراوە نێودەولەتی و مرۆییەکان هاوکاری ئەو خەڵکە بکەن کە کاتی شاڵاوەکە لە گوندو دێهاتەکانیان وەدەرنراون بۆ زێدی باب و باپیرانیان بگەرێنەوە، هاوکات پێویستە حکومەت هەموو پیداویستی و ئاسانکارییەکیان لە رووی (مادی و مەعنەوی ) بۆ دەستەبەر بکات و کارە خزمەتگوزارییەکانیان بۆ دابین بکات بۆ ئەوەی بتوانن دوبارە کاروباری خۆیان رێك بخەنەوەو سەر لەنوێ خانوو بەرەکانیان بنیاد بنێنەوە. ئەمەش بێگومان سودێکی باش بە ژێرخانی ئابووری کوردستان دەگەیەنێت.

سێیەم: دامەزراندنی دەزگایەکی ئەرشیڤی نەتەوەیی بەمەبەستی پاراستنی هەموو ئەو دێکۆمینت وبەڵگەنامەکانی (بینراوو بیستراوو خوینراو)، هەروەها وەکو دەزگایەکی ستراتیژی لێکۆڵینەوەو دیراساتی لەسەر بکات، تاوەکو بتوانێت مێژووی کارەساتەکانی کە بە سەر گەلی کوردستاندا هاتووە بۆ نەوەی نوێ بپارێزێت ولە هەمان کات بۆ ناساندنی جینۆسایدی گەلی کوردستان بۆ رای گشتی جیهانی زانیاری لەمەڕ ئەم تراژیدیایە کۆبکاتەوەو بە دیکۆمێنتیان بکات.

# ڕەگوڕیشە سایکۆلۆجی یەکانی کۆمەڵکوژی ( جینۆساید )

د. سەلاحی گەرمیان

بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، شەڕو بەگژداچوون‌و هێرشبردن‌و پێکدادان‌و کوشتاری زۆری بەخۆوە بینیوە لەنێوان هێزی دەسەڵاتدارەکان کەهەردەم لەهەوڵی دەستبەسەرداگرتنی خاک‌و ملکەچکردنی گەلان‌و هێزە بەرهەڵستکارو نەیارەکانیاندا، سوپاکانی ئەسکەندەری مەزن تەواوی وڵات‌و دەڤەرەکانی نێوان ماسادونیاو هیندستانیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوەو لەگەڵ پێشەوەچونیان کوشتن‌و بڕین ئەبوە بەشی ئەوانەی کەبەرەو ڕوویان ئەبونەوە یان ڕێیان لێ ئەگرتن، دەست ودایرەی جەنگیزخان‌و تیمورلنگ‌و هۆلاکو، زۆربەی وڵاتانی ئاسیایان داگیرکردو دەستیانکرد بەکوشتن‌و تاڵان‌و سوتاندن‌و وێرانکردن، لە ڕۆژئاوای مەسیحیەت‌و لەژێر سێبەری کەنیسەدا، چەندین ملیۆن لەخەڵکی ڕەسەنی ئەمریکا لەلایەن ئیسپانەکانەوە کەوتنە ژێر شاڵاوی کۆمەڵکوژی لەپاش دۆزینەوەی کیشوەری تازەی ئەمریکا، پاش ئەوانیش ئینگلیزەکان بوونە تەواوکەری پرۆسەی لەناوبردنیان تا کار گەیشتە ئەوەی بکەونە قڕکردنیان بەبڵاوکردنەوەی نەخۆشی ئاوڵە لەنیوانیاندا.

هێزە داگیرکەرەکان هەمان شێوەی نامرۆڤانەیان بەکارهێنا دژ بەخەڵکی ڕەسەنی مەکسیک‌و وڵاتانی دیکەی ئەمریکای لاتین‌و کەنەداو ئوستralیا، گەلانی ئاسیاو ئەفریقاو ئەمریکای لاتین بەوپەڕی توندوتیژی‌و بێبەزەییەوە خرانە ژێر دەسەلآتی هێزە کۆلۆنیالیزمەکانی ئەورپاوە، لەپێشبڕکیاندا بۆ زەوتکردنی سامانی ئەو وڵاتانەی بەر هەڵمەتی داگیرکردنیان ئەکەوتن، چەندین ملیۆن مرۆڤ بونەقوربانی سەرەڕۆیی‌و هەڵەشەیی‌و تەماعکاری ئیمپراتۆرو پادشاو حاکم‌و فەرماندەی هێزە سەربازێکان، بەتایبەت لەشەڕی بەرگریکردنی گەلانی ئەو وڵاتانە دژ بەهێزە داگیرکەرەکان، چەندین تاوانی کۆمەڵکوژی کەم وێنە ئەنجامدران بەمەستی جینۆسایدکردنی گروپە ئەتنیک‌و ئاینی‌و مەزهەبییەکان.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم ملیۆن‌و نیوێك ئەرمەنی بەدەستی تورکە عوسمانێکان لەناوبران، نازێکان لە ئەڵمانیا، لە نیوان ساڵانی 1938– 1945 قەسابخانەی هۆلۆکۆستیان ئەنجامدا دژ بە جولەکەکان، سلاڤێکان، کۆمۆنیستەکان، قەرەجەکان، هۆمۆسیکسوالەکان Homosexuals، و دیلە ڕوسەکان، کە لەئەنجامدا شەش ملیۆن قوربانی لێکەوتەوە، ڕژێمی ستالین لە ساڵانی 1932– 1933 هەڵسا بە لەناوبردنی حەوت ملیۆن لەئۆکرانێکان بەبرسیکردنیان تاگیان لەدەستدان، سەرەڕای دەرچونی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتۆکان لەساڵی 1948 کەبەمەبەستی بەرگرتن لەئەنجامدانی تاوانی لەناوبردنی مرۆڤ بوو، تاوانی زۆر ناڕەوا ئەنجامدرا لەنیوەی

دووەمــی ســەدەی ڕابــوردوودا، لــەلایــەن خــومێرە ســوورەکانــەوە لــەکامبودیــا کۆمــەڵکوژی دژ بەنەیارانیان بەرپاکرا، ڕژێمی دیکتاتۆری لەناوچووی عێراقیش شاڵاوی ئەنفالی لەکوردستان بۆ لەناوبردنی گەلی کورد ئەنجامدا، لەئەفریقا چەکدارەکانی هوتۆ کوشتاری بەکۆمەڵیان ئەنجامدا دژ بەخێڵەکانی توتسی لە ڕواندا، لەدەڤەری دارفور هێزەکانی جەنجەوید بەپاڵپشتی حکومەتی سودان تائەمڕۆش بەردەوامن لەبەرپاکردنی کۆمەڵکوژی دژ بەخەڵکی ئەو دەڤەرە.

لــەژێــر ڕۆشــنایی ئــەو پێــشەکییــەی ســەرەوەو بــەپێــی پێناســەی ڕافائیــل لــیمکین (1900–1959)Raphael Lemkin، جێنۆساید کردەوەیەکی پراکتیزەکراوی کۆنە لەبرەوپێدانی نوێیداو بریتیە لە بەجێهێنانی کردەوەی درێژخایەن بەمەبەستی وێرانکردنی بنەما سەرەکێکانی ژیانی کۆمەڵەو نەتەوەکان، ئەمەش هەوڵدانە بۆ لەناوبردنی سەرتاپای ئەو کۆمەڵانە.

کۆمــەڵکوژیو لــەنــاوبردنی بنــەماکــانی ژیــانی هــەزاران کــەسو وێرانکردنــی شــارو گونــدەکــانو سوتاندنی تەرو وشك، لەتوانای تاکە کەسێك یان گروپێکدا نیە، گەر ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی بەشدار نەبن تیایدا، ئەو خەڵکەی بە ملکەچ بونیان بۆ بڕیاری خاوەن دەسەڵاتەکان، بەبێ هۆشیاریو درککردنیان بەپلانی داڕێژراوی دەسەڵاتدارانەوە، تاوانی کوشتنو قڕکردن ئەنجام ئەدەن، نە "نیرۆن"، نە "حەجاج"، نە "تەیمورلەنگ و هۆلاکۆ، لە سەردەمی کۆندا، نە هیتلەری سەرکردەی نازێکانی ئەڵمانو مۆسۆلینی سەرکردەی فاشێکانی ئیتالیا، نەسەددامی دیکتاتۆر یان نەمیلۆسۆڤیچی سەرۆك پێشووی سیربیا، نەسەرکردەی پۆلپۆت لەکامبۆدیا، یان سەرۆك وەزیرانــی ڕوانــدا "هــابری مانــا"، لــە ســەردەمــی نوێــدا کــەســیان بــەخۆیــان یــان لــەگــەڵ دارودەستەکانیان هەڵنەسان بەو تاوانانەی ئەنجامیان دابوو.

گەر باش بڕوانینە ئەو هۆکارانەی لەپشت ئەنجامدانی ئەو تاوانانەوەن کەهەر یەکێکیان جیاوازە لەوی تریان بە پێی ئەو سەردەمو بارودۆخە سیاسیو کۆمەڵایەتیەی تیایدا ڕوویانداوە، هەروا بە گوێرەی شێوەو چۆنێتی ئەو ڕژێمەو گەورە یاریکەرانەی ئەو تاوانانەیان بەرپاکردوە، دەرئەکەوێت کە لەپاڵ فاکترە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابورێکانەوە، کۆمەڵێك فاکتەرو ڕەهەندی سایکۆلۆجی هاوبەش هەن، ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە لەڕوودانو بەرپابوونی هەموو تاوانەکانی جینۆساید بەدرێژایی سەردەمەکانی مێژوو و لە هەموو کۆمەڵو کولتووره جیاجیاکاندا.

لە تۆی برگەکانی ئەم نوسینەدا، تیشك ئەخەمە سەر ئەو ڕەهەندە سایکۆلۆجیە بنەڕەتیانە کە کاریگەرییان هەبووە لە بەرپاکردنی ئەو جۆرە تاوانانە.

**سایکۆلۆجی دەسەلاتی ستەمکار**

دەسەڵات ڕژێمی تۆتالیتارو دیکتاتۆرەکاندا توندترین ڕێبازی سەرکوتکردنو توندوتیژیو زەبروزەنگ دژ بە نەیارانی ئەگرێتەبەر لەپێناو مانەوەو بەردەوامبوونی، بەهەموو جۆرێك هەوڵئەدات کەبەرهەڵستکارانی ملکەچکات یان بیانکاتە لایەنگری دەسەڵاتەکەی، چونکە تاکەکانی ناو کۆمەڵ لەژێر کاریگەری ئەو بوارەدان کە تێیدا ئەژین تا ئەو ڕادەیەی کەئەبن

بەبەشێك لێی، هەروەکو کیورت لێڤین (1890–1947) Kurt Lewin دامەزرێنەری تیۆری سایکۆلۆجی "بوار" جەخت لەسەر ئەوە ئەکات کەتاکەکانی ناو کۆمەڵ لەنیوان خۆیاندا لەیەکتری جیان بەگوێرەی جیاوازیو گۆڕانی ئەو بوارانەی کە تێیدان، بەمانای ئەوەی هەڵسوکەوتی هەر مرۆڤێك دەرئەنجامی ئەو بوارەیە کەئەو مرۆڤە تێیدایە لەکاتی نواندنی هەڵسوکەوتەکەی، لەو ڕوانگەیەوە، ئەو کەسانەی کە لەگەڵ دەسەلآتی ڕژێمێکی تۆتالیتاردا کارئەکەن، یان ئەوانەی لەبازنە سەرەکیەکانی ئەو دەسەلآتەدان، شێوازێکی تایبەتیان پێوە دەرئەکەوێت، کاردانەوەی بوارەکانی دەسەلآت بە سەریانەوە دیارەو ئەبێتە هۆی گۆڕانکاری لەتایبەتمەندی کەسایەتییان بەتایبەتی لەسەر کاسانێکی لاواز کە تایبەتمەندی ڕاڕایی و هەلپەرستی لەکەسایەتیاندا بەدی ئەکرێت.

سەرەڕای بەکارهێنانی توندوتیژی دژ بەنەیارانی، دەسەلآتی ستەمکار خەسڵەتو تایبەتمەندیەکی سایکۆلۆجی ئەوتۆی هەیە جیای ئەکاتەوە لە شێوەکانی تری دەسەلآت لەوانە: بێ متمانەیی بەجەماوەر، ترس و وریابوون، پەنابردنە بەر فروفێڵو مەکربازی، گوشارخستنەسەر ئەو کەسانەی کەدڵسۆزی نانوێنن تائەگاتە ئەوەی گۆشەگیریانکاتو دوریانخاتەوە لەبازنەی دەسەلآتو کارتێکردن. هەروەها دەسەلآتی ستەمکار خولیای تۆڵەسەندنەوەیە لەهەموو ئەوانەی دژایەتی ئەکەنو بوونی ئەخەنە مەترسییەوە، هەر ئەو دەسەلآتە لەکاتێکدا پەنا ئەباتە بانگەشەکردن بۆ پەیڕەوکردنی دادوەری و هەڵدانی بانگی ئازادی، لەهەمان کاتدا لەهەوڵی شاردنەوەی خۆپەرستی و بەتەنگەوەهاتنی بەرژەوەندی خۆیەتی، هەر ئەو هەڵوێستانەی دەسەلآت خۆی لەخۆیدا ئەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دوفاقی لەناوخودی خۆیدا.

بەپێچەوانەی ڕژێمە دیموکراتێکانەوە، ڕژێمە تۆتالیتارەکان بۆ سەپاندنی دەسەلآتییان پەنا ئەبەنە بەر سەختترین جۆری توندوتیژیو نواندنی دڵڕەقی دژ بە کەسو لایەنەکانی ناو کۆمەڵ، زۆر جار یاساو بڕیاری ناڕەوا دەرئەکەنو بارودۆخی نائاسایی ئەسەپێننو دەسەلآتێکی بەربڵاو ئەسپێرن بە دامودەزگا سەرکوتکارەکانیان کەئەبێتە هۆی دروستبوونی دابڕانیان لەجەماوەرو تا دێت کەلێنی نێوانییان پانتر ئەبێت (کە زۆر جار کەلینێکی دەروونییە) تائەگاتە سەرهەڵدانی حاڵەتی نامۆی لەلای دەسەلآتو جەماوەردا.

دەسەلآتی تۆتالیتار باوەڕی بەجەماوەر نیە، چونکە بە ئاگایە لەوەی کە خۆی سەپاندوەو جەماوەر هەڵینەبژاردوە، بۆیە بەردەوام لەحاڵەتی ترسو هەرەشەدا ئەژێتو لە هەر جوولەو دەستپێشخەرییەکی هەموو کەسو لایەنێك سڵ ئەکاتەوە نەبادا ببیتە هۆی وروژاندنی جەماوەر، بۆیە بەوپەڕی توندوتیژییەوە ڕووبەڕووی ئەو جۆرە جووڵانەوانە ئەبێتەوە بەمەبستی تۆقاندنو چاندنی ترس لەلای خەڵکانی تر، زۆر جاریش پەنا ئەبرێتە بەر شێوازی دەروونی بۆ تۆقاندن یانیش بەشێوەی برەوپێدان بەمەبەستی ڕاکێشانی سۆزو پشتیوانیکردنیان، هەروەها پەنا

ئەباتە بەر فڕوفێڵو مەکربازیو چەواشەکاریو کۆنترۆڵکردنو جاسوسی لەسەر جەماوەر لەبری ڕاستگۆیی نواندنو شەفافییەتو دیالۆگ لەگەڵیاندا، ئەوەش بەهۆی ئەو دۆگما (Dogma)یەی زاڵە بەسەر هزری دەسەڵاتداراندا کەڕێگرە لەسەر دانان بەڕاوبۆچوونی جیاوازو نرخاندنی بەرانبەر، چونکە سڕینەوەی بەرانبەرو دابڕاندن لێیان یەکێکە لەتایبەتمەندێکانی ئەو جۆرە دەسەڵاتانە.

موسکوڤیجی (1984) Moscovici ئەڵێت حیزبی نازی دەنگدانەوەیەکی جەماوەری گەورەی لای ئەڵمانەکان وەدەستەێنا بە هۆی دوپاتکردنی پەیامەکان و دروشمەکانیان بۆ ماوەی نزیک لە بیست ساڵ، کاتێك باری کۆمەڵایەتی گۆڕانی بەسەرهات و زیاتر گونجاو بوو لەگەڵ پەیامە نەگۆڕەکانیاندا، خەڵکی مەیلی قەبووڵکردنی زیاتری هەبوو بۆ بانگەشەکردنەکانیان، نازێکان هیچ درێخییان نەکرد لەم شێوازە تا لای ئەڵمانەکان وەك ڕاستگۆ دەرکەوتن، لاتانی Latane بە پێی تیۆری کاردانەوەی کۆمەلآیەتی داینامیك Dynamic Social Impact Theory پێی وایە کە ئەو کاریگەرییەی کەخەڵکی لەسەر ئاڕاستەو باوەڕو هەڵسوکەوتی تاکەکەس دایئەنێت، لەڕێگای دەسەلآتەوە (پایەو ئەزمون) و دوورونزیکی (ماتریاڵیو کۆمەلآیەتی)یەوە سەرچاوە ئەگرێت، لەگەڵ چەند کاریگەرییەکی تریش، لەگەڵ کات تێپەربووندا تادێت باوەڕهێنان زیاتر ڕوونترو ئاسایی ئەبێت و قەبووڵئەکرێت لەلایەن جەماوەرەوە.

دەسەلآتی ستەمکار زۆر چاك ئاگاداری سایکۆلۆجی جەماوەرەو ئەزانێت کەجەماوەر هەرکاتێك بارودۆخی شیاوی بۆ بڕەخسێت بەڕوویدا ڕائەپەڕێت، ئەوکاتەش زۆر سەختە بۆ دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕووبەڕووی جەماوەر بوەستنەوە، بۆیە دەسەلآتی ستەمکار هەرچەندە خاوەنی دامودەزگای سەرکوتکەرە، پەنا بۆ هەموو شێوە ئامرازێکی تر ئەبات بۆ شێواندنی ڕاستێکانو بە شێوەو ڕوخسارێکی دور لەواقیع خۆی نیشان ئەدات بەمەبستی پاساوکردنی کارە ناڕەواکانیو کەمکردنەوەی ئاستی شکستو دۆڕان کە دووچاری ئەبێتەوە هەروەها کەرستەی میدیاکانی ئەخاتە گڕ لەپێناو مێشك شوشتنەوەی جەماوەرو سڕکردنی بیروهۆشیان.

ڕژێمە تۆتالیتارێکان سوود لەبەکارهێنانی میدیا وەرئەگرن بۆ شێواندنی هۆشی جەماوەرو بۆ ئەوەی بیانهێنێتە پای پاڵپشتیکردنیو ئاگری دوژمنکاری دژ بە نەیارانی دەسەلآت تیایاندا هەڵئەگیرسێنێت، زۆر جار دەسەلآتداران پەنا ئەبەنە بەر قۆرخکردنی فاکتەرە سایکۆلۆجییە کۆمەلآیەتێکان بۆ ئەنجامدانی پلانەکانیان، ئەگەر لەوەدا سەرکەوتووبن ئەوا لەگەڵ بەها کۆمەلآیەتێکان ئەگونجێن، گەر بڕوانینە ڕاگەیاندنو ئەدەبیاتی ئیلیتی دەسەلآتداری ڕژێمە ستەمکارەکان کەتاوانی جینۆسایدیان ئەنجامداوە، بە ڕوونو ئاشکرا قوربانیانی تاوانەکان، بە یاخیبوون ئەخەنەڕوو، نەك هەر بەسووك وڕیسواییەوە ناویان ئەبەن بەڵکو وەك کەسانێکی شەڕەنگێز سەیرییان ئەکەنو ئەیانخەنە خانەی دوژمنانەوە.

میدیای سیربەکان وەك نموونە،هانی خەڵکی ئەدا بەووروژاندنی هەستی ڕقی ڕەگەزپەرستێتی تیایاندا لەڕێگای چەواشەکردنی ڕووداوە مێژوویی و هەنووکەیەکانەوە، لەپێناو چاندنی ترس و گیانی دوژمنایەتی لای سیربەکان، لەهەمان کاتدا خوێندکارانی قووتابخانەکان لەڕێگای وانەوتنەوە ئاگادارئەکرانەوە و فێرئەکران سەبارەت بەو شەڕوکوشتارانەی لەسەدەی چواردەدا لەکۆسۆڤۆدا ڕوویاندابوو، ڕژێمی دیکتاتۆری لەناوچووی عێراقیش، بەبەردەوامی کوردی وەك ئەو کافرانە پێشانئەدا کەئاینی ئیسلام داوای لەناوبردنیان ئەکات و ماڵ و حاڵ و ژنو منالّیان حەلاّل ئەکات وەك تالاّنی جەنگ بەپێی ئەوەی لەسورەتی ئەنفال لەقورئاندا هاتووە، جگە لەناوونا تۆر بەمەبەستی شێواندنی ڕاستێکان و ناوهێنانی کورد بەخیانەتکارو نۆکەرانی بیانی و ئەو سەگانەی پێوستە سەریان پانبکرێنەوە و چەندین ناوونا تۆرەی ناشرین بەمەبەستی ئامادەکردنی بارودۆخەکە و چەواشەکردنی ڕای گشتی و پاساوکردنی سیاسەتی شۆڤێنیزمییانەی ڕژێم.

تێڕوانینی بەکەمزانینی نەیاران و دوژمنان لەسەر بنەمایەکی فیکری و ئایدیۆلۆجی دروست ئەبێت و باڵئەکێشێت بەسەر هزری دەسەلاّتی ستەمکارو تەنیا پەیوەست نیە بەلایەنە سەربازی و ئابووریکانەوە، بەچەسپاندنی تێڕوانینی بەکەمزانین، ویژدان و پالّپێوەنەرە ئەخلاقێکان ئەمرن و هەستی مرۆڤایەتی نامێنێت و ئەبێتە هۆی بتەوکردنی ڕەگەزپەرستێتی لەئەنجامیشدا دورنیە لەناوبردنی بەکۆمەڵی لێ بکەوێتەوە، سەرەڕای ئەوەش سەرکردەکانی دەسەلاّتی ستەمکار پێیانوایە کەکردەوەیەکی شایستە ئەنجام ئەدەن، ئەو تێڕوانینی بەکەمزانینە هەمان تێڕوانینی هیتلەرو سەرکردەکانی حیزبی نازی بوو بەرانبەر جولەکەکان و قەرەجەکان و سلاڤێکان و هۆمەسێکسۆلەکان لەئاگردانی هۆلۆکۆستدا، تێڕوانینی سەددام و سەرکردەکانی بەعس و عروبەچیەکانیش بوو بەرامبەر بەگەلی کورد لەقەسابخانەکانی ئەنفالدا، هەروەها تێڕوانینی میلۆسۆڤچ و ناسیۆنالیستە سربێکان بوو بەرانبەر بە بۆسنێکان و کرواتەکان و تێڕوانینی سەرکردەی خێڵەکانی "هۆتۆ"ش بوو بەرانبەر هاونیشتمانەکانیان لەخێڵەکانی "تووتسی" لە ڕواندادا.

ڕژێمی لەناوچووی سەددام کەپلانی لەناوبردنی کوردو وێرانکردنی ژێرخانی ئابووری و سیستەمی ئیکۆلۆجی Ecosystem کوردستانی داڕشت و ئەنجامیدا، بە یەکێك لەنمونە زەقەکانی دەسەلاّتی دکتاتۆری تۆتالیتاری ئەژمێردرێت، وەك توندوتیژ وخوێناویترین ڕژێمە دکتاتۆرێکان ئەژمێردرێت، چونکە ئەوپەڕی شێوەی سەرکوتکردن و داپلۆسینی دژ بەمرۆڤی ئاسایی بەکار ئەهێنا نەك تەنیا دژ بەنەیارە سیاسێکانی ڕژێم، زۆرجار پەنای ئەبرد بۆ ئەو کردەوانە تەنیا بەمەبەستی تۆقاندن تا کەس هیچ جۆرە بیروبۆچوونیك دژ بەسیاسەتەکانی ڕژێم بە بیریدا نەیەت و دژایەتی بڕیارەکانی ڕژێم نەکات، وەك ئەو بڕیارە ناڕەواو سەیروسەمەرانەی لە

شیوەی گوێبڕینو زمانبڕینو نیشانەکوتانی ناوچەوان کەڕژێمی لەناوچوو دەریئەکرد لەکاتی شەڕ لەگەڵ ئێراندا، ئەو سیاسەتانەی کە ڕژێم پەیڕەوی ئەکرد بریتیبوون لە:

:: پەیڕەوکردنی سیاسەتی تێوەگلان و تووشکردنو خستنەداوی بەرپرسیاریێتی و گرێدا بەڕژێمەوە، بەوپێیە نیشانەو میدالی ئازایەتی ئەدا بەو کەسانەی مەبەست بوونو ناساندنیان بەخەڵك لە ڕێگای میدیاکانەوە، ڕواندنی ئەو جۆرە هەستە لەلای ئەو کەسەی خەڵات ئەکرا، کە چیتر بەشێکە لەو ڕژێمە و هاوکار و هاوبەشە لەئەنجامدانی سیاسەتو کردەوەکانی ئەو دەسەڵاتە، ئەوەش ئەبوە هۆکاری ئەوەی ئەو کەسە ببێتە کەسێکی شێواو وداڕوخاو و گێرۆدەی دەسەڵات، بێجگە لە داکۆکیکردن هیچی تری بۆ نەکرێت، چونکە چارەنوسی بەسترا بە چارەنوسی دەسەڵاتەوە.

:: بەرپاکردنی هەڵمەتی ئیعدامکرنی ئاشکرا بەبەرچاوی خەڵکەوە لەگۆڕەپانە گشتێکانو یاریگا وەرزشێکانو زۆرلێکردن لەخەڵکانی ئامادەبوو بۆ چەپڵەلێدان و دەربڕینی خۆشحاڵی، ڕژێم هەڵئەسا بە هاندانی خەڵك لەڕێگای خەلاتکردنیان بەنیشانەی ئازایەتی کاتێك دەسەلاتیان ئاگادار بکردایەتەوە لە کوڕ و براکانیان لەوانەی دژ بە دەسەلات ولاریبوون لەوەی بین بە سەرباز و ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ بکرێن. ئەو کردەوانەش ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لە تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی بەها کۆمەلایەتێکان و پەیوەندی تاکەکانی ناو خێزان.

:: دامودەزگاکانی میدیای ڕژێم پەیتاپەیتا دیمەنی تۆقێنەری دەرگیرێکانی جەنگ و لاشەی سەربازە ئێرانێکانی پێشان بەبینەرانی تەلەڤزیۆن ئەدا لەساڵانی جەنگ لەگەڵ ئێراندا، بەتایبەت لە کاتی ئێوارانداو زۆرجاریش لە کاتی پیشاندانی بەرنامەی منالاندا، مەبەستیش لەوە بەڕوونی چاندنی گیانی شەرەنگێزی لای خەڵك و بەتایبەتیش لا منالان و هەرزەکاران، تا نەوەیەکی جۆشکراو بە بیروبۆچونی سۆڤینزم و شەرەنگێز بهێنێتە کایەوە.

:: سەرانی ڕژێم هانی بەرپرسەکان و سەربازەکانی سوپایان ئەدا بۆ تالانکردن و ڕوتاندنەوە، ئەوەش دیار و ئاشکرا بوو لە کاتی داگیرکردنی شارە سنورێکانی ئێران و داگیرکردنی کوێت و شاڵاوی ئەنفالدا، ڕەنگدانەوەی ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانەی ڕژێمی دیکتاتۆر لە سەر تەواوی خەڵکدا هەبوو. زۆر بە زەقیش دەرکەوت لە کاتی ڕوخاندنی ڕژێمدا کە دزی و تالانکردن سەرتاپای دامودەزگا دەوڵەتێکانی گرتەوە تا ئەگاتە موزەخانەی نیشتمانی.

**سایکۆلۆجی کەسێتی ستەمکار**

گومان هەڵناگرێت کەسەرکردەو فەرمانڕەوایانی وولاتانی جیهان ڕۆڵێکی گەورەیان بووەو هەیە لەسەرجەم ڕووداوەکانی وولاتەکانیاندا، بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم بوارەدا کراون، دەرکەوتووە کە ئەو سەرکردانەی جەنگیان هەڵگیرساندوەو بوونەتە هۆی نەهامەتی خەڵکی، یان تاوانی جینۆسایدیان ئەنجامداوە چ دژ بە گەلانی ناو وولاتەکانیان یان دژ بەگەلانی وولاتانی تر، دووچاری تێکشکانو پەشێوی لە کەسێتیاندا ئەبن، هەروەها مکوڕن لە هەبوونی چەند

شێوەیەکی کەسێتی دیاریکراو لای ئەو سەرکردانەی کەئارەزووی هەڵسوکەوتی بە زەبروزەنگ ئەکەن، لەم ڕوانگەیەوە کوالیسکی (2001 Kowalski) سەرنجی توێژەرەکان بۆ سێ جۆر لەکەسێتی ڕائەکێشێت بۆ ئەوەی بخرێنە ژێر تاقیکردنەوەوە کە ئەمانەن:

:: نێرگزی Narcissist

:: میکاڤیللی Machiavellian

:: سایکۆپاتی Psychopathic

سەرەڕای بوونی جیاوازی لەڕەجەڵەکی ئەو سێ جۆرە کەسێتیە کە (پاولەوس و ولیامز، Paulhus & Williams,2002) ناوییان ئەبەن بەسێکوچکەی تاریکی کەسێتی The Dark Triad of personality، بەڵام چەند تایبەتمەندییەکی هاوبەش لە نیوانیادا هەیە، هەرسێ جۆرەکە سیفەتی ڕق و کینەی کۆمەڵایەتییان هەیە لەگەڵ ئارەزووی خۆهەڵکشان، ساردوسڕی سۆز، دووفاقی و شەرەنگێزی کۆیان ئەکاتەوە، پێیشکەوتنی بواری پێوانەی سایکۆلۆجی کەلەم ساڵانەی دواییدا لەسەر ئەوسێ گۆڕاوە Variables بەدەستهێنراوە دەریخستووە، کە پەیوەندییەکی پێکەوەگرێدراو لە نێوان (نێرگزیزم – میکاڤیللیزم) و (میکاڤیللیزم– سایکۆپاتی) و (سایکۆپاتی– نێرگزیزم)دا هەیە.

لێرەدا پێویست بە کورتە پێناسەیەك ئەکات لەبارەی هەریەکە لەو سێ جۆرە کەسێتیە:

**کەسێتی نێرگزی**

خاوەن کەسێتیەکی نێرگزی ئەو کەسەیە کە هەستی خۆ خۆشویستن ئێجگار زۆرە لایو زۆر شەیدایە بەخۆی و بە بەهرە و تواناکانی خۆی، وائەزانێت کە خۆی لە هەموو شتێکدا باش و کارامەو داهێنەر و بەسەلیقەترەو هونەرمەندترەو وابۆی ئەچێت کە خەڵك ڕێزی لێئەگرێتو بەشان و باڵیدا هەڵئەدەن و سەرسامن بەو کەسێتییەی هەیەتی، ئەوەی کە خۆی لای خۆیدا دروستی کردوە.

**کەسێتی میکاڤیللی**

کەسێتی میکاڤیللی کەسێکە کە هەمان ئەو سیفەتانەی هەیە کە نووسەری ئیتالیایی نیکولا میکافیللی (1469 – 1527) Machiavelli لە کتێبی (شازادە) The Prince وەك ڕاسپاردە ئەیانخاتە ڕوو و تایبەتمەندی ئەو جۆرە کەسێتیە دەستنیشان ئەکات، ئەو کەسەی ئەم جۆرە کەسێتیەی هەیە لەهەوڵی ئەوەدایە کەئامانجەکانی بێنێتە دی بەهەر شێوەیەك بێت و دروشمی سەرەکی ژیانی ئەوەیە کە (ئامانج پاساوی بەکارهێنانی ئامراز ئەکات The End justifies the Means بەواتایەکی تر کەسی میکاڤیللی گرنگە بەلایەوە بگات بەو ئامانجەی مەبەستێتی بەهەر نرخێك بێتز.

**کەسێتی سایکۆپاتی**

ئەو کەسەی کە کەسێتی سایکۆپاتی هەیە گوێ بەڕێڕەو و یاساکان ناو کۆمەلگا نادات و بەرژەوەندی گشتی بەلاوە گرنگ نیەو چێژو خۆشی ئەبینێت لە لادان لەهەر نەریت و یاسایەك، ئەم جۆرە کەسە لە خۆی و حەز و ئارەزوەکانی خۆی زیاتر شتی تری بەلاوە بایەخدار نیە.

هەر یەکە لە سەرکردە تۆتالیتارەکان وەك: هیتلەر لەئەڵمانیا، مۆسۆلینی لەئیتالیا، فرانکۆ لەئیسپانیا، ستالین لەڕوسیا، پۆلپۆت لەکامبۆدیا، بینۆشێ لەچیللی، سەددام لەعێراق، میلۆسۆڤیچ لەسربیا و چەندین لەسەرکردە تۆتالیتارێکانی ولأتانی تری جیهان، کەسانێك بوون کە ئەو سیفەتانەی لەو سی جۆرە کەسێتیانەی پێشتر ئاماژەیان پێکرا بوو، تیایاندا بەدی ئەکران، سەرەڕای جیاوازی کولتوور و ژینگەی کۆمەلأیەتی و ولأتەکانیان، بەو پێیە، ئەوان نەك تەنیا ئەبوایە خاوەن بالأترین پلەی دەسەلأتی مەدەنیو سەربازیو حیزبیو هەموو کاروبارێکی تری دەوڵەت بن، بەڵکو تەنانەت یاسادانانو سەپاندنی بەسەر خەلکدا ئەبوایە بە گوێرەی حەزو خواستی خۆیان بوایە، هەر تەنیا خۆیان مەزن و خاوەن شکۆمەندیو دروستکەری ڕوداو موعجیزە بنو نوێنەری خوا بن لەسەر زەوی، هەر خۆیان خاوەن بڕیار و فەرمان بوون و جەماوەریش تەنیا بۆی هەبوو گوێڕایەڵ و ملکەچی دەسەلأتیان بێت.

ڕومیڵ (1996) Rummel پێیوانیە ڕوودانی پرۆسەی لەناوبردنی بەکۆمەڵو شەڕو کوشتارەکانی سەدەی بیستەم لەوولأتە نادیموکراتەکاندا بە ڕێکەوت بێت، جیوازی ئەو وولأتانەی کە تیایاندا لەناوبردنی بەکۆمەڵی ڕوویداوە لەگەڵ وولأتانی تردا، دەسەلأتدارێتی سەرکردەو رژێمی تۆتالیتارە، کاریگەری ئەو سەرکردانە لەوەدایە کە ئەو فاکتەرانەی لەناو کۆمەڵدا هەن، ئەگۆڕن بۆ شێوەیەکی تاکە کولتووری بتەو و شکۆدار، هەروەك ستاوب (Staub،1989) ناوی ئەبات بە Monolithic Culture ، ئەو جۆرە کولتوورەش زۆرجار خاوەن میژوویەکە لەملکەچی بۆ دەوڵەتو دەسەلأتدارە تۆتالیتارەکان، سەرباری لاوازبوونی گیانی بووردن Tolerance لەگەڵ فرە کولتووریدا، سەرکردە تۆتالیتارەکان ڕۆڵێکی بەرچاوان هەیە لەجولأندنی کولتوورەکانو بردنیان بەرەو توندوتیژی بەکۆمەڵ، کە زۆرجار بەمەبەستی بەهێزبوونو سنترالیزەکردنی دەسەلأت، لەناوبردنی نەیاران، بتەوکردنی ئابوری لەپێناو بەرژەوەندی تاك و دروستکردنی ژێرخانێكو ئایدیۆلۆجیایەکی ڕووخێنەر، ئەنجامئەدرێت.

**سایکۆلۆجی شەڕەنگێزی**

لێکۆڵینەوە نوێکان وا دەریدەخەن، نائاگایی کە فرۆید باسی لێوەدەکات راڤەکردنێکی قەناعەتپێکراو نادات بەدەستەوە لەمەڕ شێوەکانی توندوتیژی لای مرۆڤ لەسەر ئاستی تاكو کۆمەڵدا، وادیارە ڕەگوڕیشەی دیاردەی توندوتیژی ئەچیتە قولأییەکی زیاتر لەئاستی سەردەمی سەرتای هاتنەژیانەوە کە تیۆری شیکاری دەرونی فرۆید جەختی لەسەر ئەکات، کەچی ئەو توێژینەوانەی تایبەتن بە بواری هۆشیارییەوە، سەچاوە گرنگەکانی تری

تووندوتیـژیو شـەڕەنگێـزی ئـەخـەنـە ڕوو و شـەڕەنگێـزی Aggression وەك ئاماژەیـەك بـۆ نوانـدنی جـۆرە هەڵـسوکەوتێـك بـەمـەبـەسـتی گەیانـدنی ئـازاری جـەسـتەیی یـان دەروونـی ئەنجامئەدرێت، شەڕەنگێزی پەلی بۆ سروشت و ژینگەش هاویشتوە، ئەبینین چۆن هەندێك لە پێکهاتەکانی سروشت لەناو دەبرێنو هەندێکی دیکەشیان پیس ئەکرێنو ئەشێوێنرێن.

چەمکی شەڕەنگێزی تاڕادەیەك چەمکێکی ناڕۆشنە بەهۆی تێکەڵبوونی بە چەند چەمکێکی سایکۆلۆجی ترەوە وەك گیانی دوژمناکریو تووندوتیژیو زەبروزەنگو تیرۆر، لە دیدی باندورا Bandura وە، شـەڕەنگێـزی ئـەو هەڵـسوکەوتەیـە کـە زیـانی کـەسـی یـان زیـان لـەماڵومڵکی لێئەکەوێتەوە، شەڕەنگێزی Aggression جیاوازە لە گیانی دوژمناکری Hostility کەجۆرە ئارەزوویەك ئەگەیەنێت کەئەبێتە هۆی شەڕەنگێزی وەك کینەو ڕق و تـوڕەیی، بەڵام تووندوتیـژی و بەکارهێنانی زەبروزەنگ، دەرئەنجامی هەڵسوکەوتی شەڕەنگێزیین.

دۆلارد ومیللەر (1939) Dollard and Miller لـەو بـاوەڕەدان کـەهەسـتکردن بـەنائومێـدی frustration پەیوەندە بە ڕەفتاری شـەرەنگێزییـەوە، ئـەو ڕەهەندانـەی ئـەبنـە هـۆی ئاڵۆزبوونی ڕەوشـی ژیـان لـەو کۆمـەڵگانـەی ڕانـەهـاتوون لـەگـەڵ ئـەو شـیوە بارودۆخانـەدا، هۆکـارن بـۆ سـەرهەڵـئەدانی هەستی نائومێدی تیایانداو ئەویش گـەورەترین هـەرەشـەیە بۆ بڵاوبوونـەوەی دیاردەی تووندوتیژی و شەرەنگێزی.

زۆربـەی پرۆسـە جینۆسایدێکان کـەلـە سـەدەی بیستەمدا ڕوویانداوە، پـەیوەنـدبوون بـەقـەیرانی نائارامیو هەستی نائومێدی کە بوار ڕەخسێنەرە بۆ دروستبوونی گۆڕانکاری لە بونیـادی ئـەو کۆمـەڵگانـە، بـەهـۆی جـەنگـەوە کۆمـەڵێك قـەیرانی سیاسـیو ئـابوریو دیـاردەی سـایکۆلۆجیو کۆمەڵایەتی سەریانهەڵدا لە ساڵانی بـەر لـە ئـەنجامدانی ئـەو تاوانانـە یـان لـەو دەمانـەی تیایانـدا ئەنجامئەدران.

زۆرێك لە جۆرەکانی شەڕەنگێزی لەلایەن کۆمەڵگاکانەوە رەتئەکرێنەوە، بەڵام شەرەنگێزی کاتێك پەسەندئەکرێت کەلەپێناوی خۆپاراستنو سـەلماندنی بوونو ئازادیو مانـەوەدا بێت، هەربۆیـە زۆربەی خەڵك پەنا ئەبەنە بەر شاردنەوەی هەڵسوکەوتو ڕەفتاری شەڕەنگیزی نێگەتیڤانە لـەژێر دروشمو ئامانجی پۆزەتیڤانەدا، وەك نموونە، لە بەشداربووانی جەنگی خاچپەرستان داوائەکرا کەگیانی خۆیان بکەن بەقوربانی بۆ گەڕانەوەی خاکی پیرۆز لەلایەنگرانی موحەمەد، هیتلـەریش ئەو هاندەرە میتۆدۆلۆجییانـە لـەبارەی پایـەبـەرزی ئارێکانـەوە (وەك نیشانەی خاچی چـەماوە) بەکارئەهێنا وەك هێمایەکی ئاریـایی کـۆن، هـەروەهـا نازێکـان خۆیـانو ئـەوانـەی سـەر بـەڕەگـەزی ئارین پایەبەرز ئەدا لەقەڵەم و ڕەگەزەکـانی تـریش وەك سـلاڤ و جـوو و قـەرەجـەکان بە بۆچوونی نازێکان، ئەوانەن کە ئەڵمانیا پیس ئەکەن، هەربۆیە جووەکانیان بەو مشکانەی نەخۆشی تاعوون بڵاوئەکەنەوە ناوئەبرد، بە هەمان بۆچوون دەسەڵاتـی ئیمپراتۆری عوسمانی ئـەرمـەنـەکانی ژێر دەسـەڵاتییـان بـەمـەترسـی دائـەنـاو تـاوانی سیخوری بۆ هێـزەکـانی ڕوسیاو ئـەرمینیا ئـەدرایـە

پاڵییان، سەرکردەی خێڵەکانی "هۆتۆ"ش لە ڕواندا هۆتۆکانیان بە پایەبەرزتر ئەزانی لەبەرامبەر "تووتسی"یەکان، وەك سوکایەتیش تووتسیکانیان بە سیسارك ناو ئەبرد لە کاتی هەڵمەتی لەناوبردنیان لە ساڵی 1994.

سەددامی دیکتاتۆر، بۆ پاساوکردنی شاڵاوەکانی ئەنفال لە کوردستاندا سورەتی "الانفال" کە سورەتێکە لە سورەتەکانی قورئانی ئیسلام، بەکارهێنا بۆ بەجێهێنانی ئەو تاوانە دژ بەخەڵکی بێ تاوانی کورد کەوەك کافر و یاخیبووان لەئیسلامدا مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرا، سەرانی ڕژیمی بەعس بەچەندین شێوە ناو و ناتۆریان لەکورد ئەناو بەڕاشکاوی دەریانئەبڕی کەئەبێت سەریان پان بکرێتەوە، بەو شێوەیە ئاراستەی ناسیۆنالیستی بونیادنراو لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆجیی ڕەگەزپەرستانە کە جیاوازکاریو لایەنگیری ڕەسەنایەتیو باوەڕ بەپایەبەرزی نەتەوەیی لە ناوەڕۆکیدا بەدی ئەکرا و بەیەکێك لە هۆکارە سەرەکێکانی شەڕەنگێزی و ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید دەژمێردرێت.

زۆربەی زۆری تاوانە جینۆسایدێکانی سەدەی بیستەم لەلایەن ئەو وولاٚتانەوە بەرپاکراون کە مێژوویەکی پڕ لەتووندوتیژیو ئاراستەی شەڕەنگێزییان هەیە، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کەڕەفتاری شەرەنگێزی تەنیا پەیوەند نیە بە تاکە کەسەکانەوە، بەڵکو وولاٚتان و گەلانیش ئەگرێتەوە، لەبەر نەبوونی گیانی لەیەکترگەیشتنو گۆڕینەوەی ڕاوبۆچوونو قەبووڵکردنی بەرامبەر، ئەو وولاٚتانەی ئاراستەی شەڕەنگێزییان هەیە وا دەیهۆننەوە کە لایەنێکی مەترسیدار لە ئارادایە و چاوەڕوانی هەڵوێستی پڕ لە ڕق و دوژمنکارانەی لێئەکرێت، چونکە شەرەنگێزی زاڵە بەسەر ڕەفتاری سەرکردەی ئەو جۆرە وولاٚتانەدا، بۆیە پەنا ئەبەنە بەر لەناوبردنی سەرچاوەی ئەو مەترسییانەی کە ترسیان لێیە ببێتە هەرەشە بۆ سەر چارەنووسییان بەبێ سڵکردنەوە لە دەرئەنجامی ئەو تاوانانەی پێیهەڵدەستن.

**سایکۆلۆجی ملکەچی**

لەگەڵ بیرکردنەوە لەهۆکارەکانی بەرپاکردنی ئەو تاوانانەی بەمەبەستی لەناوبردنی کۆمەلاٚنێکی زۆر لە مرۆڤ ئەنجامئەدرێن، پرسیارگەلێك سەرهەڵئەدەنو خۆیان ئەسەپێنن بەسەر هزرو هۆشماندا: ئەو هۆیانەی ئەبێ چیبن کەوائەکات هەزاران لەو کەسانەی پلەوپایەدار نین، ملبدەنە خواستو ئارەزووی شەڕەنگێزی بەرپرسانی بڕیاربەدەستی ڕیزی پێشەوەی دەسەلاٚت، ئەوانەی کەبوارو بارودۆخە سیاسیو دەروونێکان ئەڕەخسێنن بۆ بەجێهێنانی ئەو تاوانە گەورانە؟ ئایا ترس و تۆقاندنە یان هەلپەرستیو خۆپەرستیو چاوچنۆکییە بۆ وەدەستهێنانی دەسکەوتی جۆراوجۆرە لە بڕیاربەدەستان و دەسەلاٚتداران؟

لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە ئەدەن کەخەڵکی حەزیان بەخۆلادانە لەبیرکردنەوەی قووڵ سەبارەت بەو کاروبارانەی کەکاریگەری ڕاستەوخۆیان نیە بەژیانیانەوە، زیاتر بەدوای ئەو زانیاریانەوەن

کـەڕەنگدانـەوەی بیروبـاوەڕیـانن، نـەك ئـەوانـەی لـەگـەڵ بۆچـوونی واقعیانـەیان بـۆ پرسـە جۆراوجۆرەکان یەکناگرنەوە.

بۆ ڕاڤەکردنی ڕووداني جینۆساید، بەزۆری ئۆباڵی ئەو تاوانە ئەخرێتە سەر ئەو سەرکردانەی کەبڕیاربەدەستن، یان ئەیگەڕێنەوە بۆکینەی چەسپاو لەلای هەردوو بەرەی ناکۆك لەکاتی ململانێی نیوانیاندا.

کورت لیڤین (1989) Kurt Lewin لەمبارەیەوە جەخت ئەکاتە سەر ئەوەی کەنەریتو نۆرمەکان یارمەرتیدەرن بۆ بەردەوامبوونی پابەندبوونو گوێڕایەڵیو ملکەچی، چ لە دامودەزگا پەروەردەییەکان بێت یان ئاینیەکان، هەرەوەزیەکان بێت یان کۆمەڵایەتیەکان، ئەوانەی گوێڕایەڵی ئەو نۆرمە کلاسیکیانە نابن، زۆر جار ڕووبەڕووی سزای قورس ئەبنەوە وەك بەکەم تێڕوانینو سەرکۆنەکردن، تائەگاتە بەکارهێنانی توندوتیژی جەستەیی، بۆیە تاکەکانی ناو کۆمەڵ دووچاری گوشار ئەبن بۆ ئەوەی بەشداربن لە کرداری توندوتیژیو چاك ئەزانن سەرپێچی کردنیان چی ئەنجامێکی لێئەکەوێتەوە.

لێکۆڵینەوەکانی ستانلی میلگرام (1933–1984) Stanley Milgram لەنێوان ساڵانی (1965–1975) لەبارەی ملکەچیەوە، جەخت لەسەر بەهێزی کارتێکردنی جۆرێك لە دەسەڵات ئەکەن لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤ، میلگرام لەمبارەیەوە ئەڵێت:

" گەر بڕیاری کوشتنی خەڵك بە ملیۆنو ئیعدامکردنی ژمارەیەکی زۆر لێیان لەسەر بۆچوونی تاکەکەسێك دەربچێت، وەلێ کاری لەو جۆرە و لە ئاستێکی وادا لەتواندا نیە ئەنجام بدرێت، گەر ملکەچی کەسانێکی زۆری تر نەبێت بۆ ئەم چەشنە بڕیارو فەرمانانە "،

لێرەدا بەپێویستی ئەزانم ئاماژە بدەم بەڕۆڵی کولتوورو ئایین لەچەسپاندنی ملکەچیو گوێڕایەڵی لەکۆمەڵگەدا بەتایبەت کاتێك لەبەرژەوەندی دەسەڵاتی ستەمکاردا سوودی لێوەردەگیرێت، بەگوێرەی تیوری گێڕانەوەی هۆکار"Attribution" لەلایەن (فریتز هایدەر Fritz Heider 1896-1988) لەمەڕ گێڕانەوەی هەڵسوکەوتی تاکی مرۆڤ بۆ ئەو هۆکارە دەرەکیانەی کەکۆنترۆڵی بەسەریاندا نیە، ئەبینین زۆر کەس پەنا ئەبەنە بەر پاساوکردنی خۆبەدەستەوەدانو ملکەچییان بەفەرمانی ڕژێمە ستەمکارەکانو هەڵئەستن بە ئەنجامدانی تاوانی دڕندانە بە بیانووی جۆراوجۆر و بەبێ باوەڕ بە ڕەوابوونی کردەوەکەیان، وەك ئەوەی گوایە ئەوان گوناهی ئەوە هەڵناگرن، چونکە فەرمانیان پێکراوەو تەنیا ئەوەیان لەسەرە کەجێبەجێی بکەن، زۆریش هەن کەهۆی کردەوەو ملکەچییان بۆ بڕیارو فەرمانەکانی دەسەڵات پاساو ئەکەنو ئەگێڕنەوە بۆ ئەم ئایەتەی قورئان " یا أیها الذین ءَمنوا أطیعوا الله وأطیعوا الرسول وأولي الأمر منكم "، بەواتای (ئەی ئەوانەی باوڕییان هێناوە، ملکەچی خوابنو ملکەچی پەیامبەرو سەپەرشتیارەکانتان بن)، بەو پێیەی دەسەڵات ئەو سەرپەشتیارەیە کە ئایەتەکە باسی لێوە ئەکاتو ملکەچبوون بۆی بە ئەرکی سەرشانی خەڵکی پێناسە ئەکات.

**سایکۆلۆجی حەشامات ( جەماوەر )**

لەژێر هەمان ناونیشانی سەرەوەداو لە دوای ئەو هەراو بشێوییەی شۆڕشی فەرەنسا نایەوە، گۆستاف لیبۆن Gustav Le Bon لە پەرتووکێکدا کە لە ساڵی 1895 دا بلاۆبووەتەوە، بەشیکارییەکی بەپێز باس لە سایکۆلۆجی جەماوەر لەژێر سێبەری دەسەلاتدا ئەکات، لیبۆن ڕووی دەمی ئەکاتە خاوەن دەسەلاتەکانو لە تووڕەیی جەماوەر ئاگاداریان ئەکاتەوە و ئەڵێت:

کاتێك جەماوەر ڕائەپەڕێت، گیانی بەکۆمەڵی زاڵە بەسەریانەوەو جەماوەر ئەبێتە بونەوەرێکی سەرەتایی سەرەڕای ئەوەی پێکهاتەیەکی فرە ڕەگەزی لەیەك دابڕاوە لە ڕەچەڵەکدا، بەلاّم یەکریزی ئەنوێننو یەك ئامانج کۆیان دەکاتەوە، کەسێتی تاکی هۆشیار وون ئەبێت کاتێك ئەخزێتە ناو ڕیزەکانی جەماوەرەوە، چونکە بیروڕاو سۆز بەشێوەیەکی هەنوکەیی بەڕێوەی ئەبات‌و ئارەزووی شەڕەنگێزیش بەسەریدا زاڵە..

پەرتووکی سایکۆلۆجی جەماوەر لەبارەی کولتوورو سایکۆلۆجی جەماوەر دەرچووەو بەیەکەمین لێکۆڵینەوە دائەنرێت لە بواری دەروونناسی کۆمەلاّیەتیدا، ئەوەیشی ئەم لایەنەی بەرجەستەکرد، دەرکەوتنی لێکۆڵینەوەیەکی سیگمۆند فرۆید بوو لەساڵی 1921 بەناونیشانی "سایکۆلۆجی کۆمەڵ و شیکرنەوەی من"، هیتلەر وەك جای گۆنین (Jay Gonen(2000 ئاماژەی پێئەکات، ئاگای لەتیورەکەی لیبۆن‌و لیکۆڵینەوەکەی فرۆیدو هاوشیوەکانی هەبووە، گۆنین ئەڵێت: "کۆکردنەوەو ئامادەکرنی جەماوەر لەلایەن نازێکانەوە تەنیا بەهەرەشەو ترس‌و تۆقاندن نەبوو، بەڵکو بەهۆی پەیامی نازێکانەوە بوو کە بەئامانجی تایبەت لایەنە ساکۆلۆجیێکانی لەخۆ گرتبوو"، چونکە هۆشیاری‌و ناهۆشیاری لای گەلی ئەڵمانی ژێر دەسەلاتی نازیزم، لەخۆبەستن بە تاکە پیاو و بیرۆکەی فرۆید لەسەر "باوکی نموونەیی" Ideal father بەولاوە هیچیتر نەبوو.

جەماوەر ئەکرێت وەك قەوارەیەك خاوەن عەقڵێکی بەکۆمەڵ دابنرێت، چۆن بەڕیککەوتن‌و کارلێکردنی ئەندامەکانی کۆ ئەبێتەوە، ئاواش پەرتەوازە ئەبێت کاتێك هەست بەڕووبەڕوو بونەوەی هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ ئەکات، سەرکردەی دەسەلاتی ستەمکار بایەخ ئەدات بەعەقڵی بەکۆمەڵ بەهۆی بەیەخدانی بەسایکۆلۆجی جەماوەر، تاکو سیاسەتە دوژمنکارێکانی بباتەسەرو کۆنترۆڵکردنی جموجۆڵی جەماوەرو پەرتەوازەکردنی بەلاوە ئاسانتر بێت پێش ئەوەی ببێتە هەڕەشەیەکی ڕاست لەسەر دەسەلات.

گەلێك جار ئەنجامدەرانی تاوانی جینۆساید پەنا ئەبەنە بەر بیانوهێنانەوە بۆ پاساوکردنی تاوانەکانیان بەلۆمەکردنی گوناهبارکردنی ئەو گروپانەی کەخۆیان مەبەستیانە، لەم بارەیەوە، زۆریك لەتوێژینەوەکان جەخت ئەکەنە سەر تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان گوناهبارکردن‌و توندووتیژی‌و تیوری جۆراوجۆر داڕێژراوە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو پەیوەندیە، کۆترین هەوڵدانە لەبارەی تەگەیشتنی ئەو پەیوەندیەوە تیوری رینیە گیرارد Rene Girard ناسراو بەتیوری

کۆچی قوربان Scapegoat، کەباس لەوەئەکات لەکاتی هەستکردن بەبێ ئومێدی، وەك لەکاتی تێکچوونی باری ئابوری ڕوی لۆمەکردن ئەکرێتە گروپە پەراوێزکراوەکانی ناو کۆمەڵ، هەر لەسەر ئەو بنەمایە باڵادەستانی ناو دەسەلأت شێوازی سایکۆلۆجی و کۆمەلأیەتی بەکاردێنن لەگەڵ جەماوەردا بەشێوەیەکی بەربلأو بەمەبەستی توندکردنی کۆنترۆڵی دەسەلأت، هەروەها پەنا ئەبەنە بەر دامەزراندنی دامودەزگای نوێ بە بەرنامەی سیاسی تایبەتەوە، یان لەرێگای کۆنترۆلکردنی چەناڵەکانی میدیاوە،

نمونەی ئەو شێوازانەی دەسەلأت پەیڕەوی ئەکات بەمەبەستی ئەنجامدانی جینۆساید، ڕژێمی عێراق پەنای بردە هەموو جۆرە ئامرازێك بەتایەبەتی ڕاگەیاندن بۆ پێشاندانی هێزی پێشمەرگە وەك نۆکەری بێگانەو تاوانی هێنانی هێزەکانی ئێران بۆداگیرکردنی هەڵەبجەی خستەپاڵیان و گوایە هێزەکانی عێراق بۆ بەرپەچدانەوەی هێرشی هێزەکانی داگیرکەرو تۆڵەسەندنەوەو سزادانی نۆکەران هێرشی بردە سەریان بێ ئاماژەکردن بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی قەدەغەکراو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەکاتێکدا فرۆکە جەنگێکانی عێراق بەگازی ژەهراوی بۆردومانی هەڵەبجەیان کرد، بەهامان بیانووەوە هێزە عێراقێکان هەڵسان بەئەنجامدانی تاوانی جینۆساید لەساڵی 1988 لە چواچێوەی شالأوەکانی ئەنفالدا،

بەو شێوازە، لە کاتی بەکارهێنانی توندووتیژی بەکۆمەڵ یان ئەنجامدانی جینۆساید، پرۆسەی هەلأوێردن دێتە کایەوە بەدوورخستنەوەی قوربانیان لە بازنەی ئەخلاق، چیتر وەك مرۆڤ چاو لێناکرێن، بەڵکو وەك ئەو کرمە زەرەرمەندانە چاو لێئەکرێن کەپێویستە لەناوبرێن یان ئەو ئەندامە ڕزیو و بێ کەڵکانەی جەستە کە ئەبێت بڕێننەوەو فرێدرێن.

ڕەهەندی"کاریگەری هاودەنگی نادروست" false consensus effect ڕەهەندێکی گرنگی ترە، کاتێك کۆمەڵێك خەڵك نادروستانە باوەڕییان وایە کەزۆرینە خەڵك کۆکن لەسە بیروڕاو ئاڕاستەکانیان، ئەو چەشنە بەکۆمەڵ باوەڕبوونە وەکو لای "باندورا Bandura " وایە، پاساوێکی کۆمەلأیەتی بەدەستەوە ئەدات بۆ ئازادبوونی ئەخلاق، دواتریش وەك سەرتای دەستپێکردنی توندووتیژی بەکۆمەڵ دێتەکار، باندورا لەسونگی تیورێکەیەوە باس لەڕۆڵی هەموو لایەنەکان ئەکات: قوربانێکان، ئەنجامدەرانی سەرەکی تاوانەکان، بەشداربوانی ناڕاستەوخۆی تاوانەکان و خەڵکانی تەماشاکەر دەرەوەی پرۆسەکە، هەرەوەها جەخت ئاکاتە سەر چارەسەرکردنی قوربانێکان و وەك خاڵێکی بنەڕەتی ئەزانێت لە پێناو کەمکردنەوەی ئەگەری گۆڕانی قوربانیان بۆ شێوەی ئەنجەمدەرانی تاوان، ئەوەی کەزۆرجار بە "تیوری جۆشدانی کۆمەلأیەتی-کولتووری Socio-cultural Motivation Theory " ئاماژەی پێ ئەکرێت چونکە جەخت ئەکاتە سەر ئەو کاریگەرییانەی کار لەسەر یەکتری ئەکەن و ئەبنە هۆی پەرەسەندنی توندوتیژی لای کۆمەڵ، هەرەوەها تیورەکە جەخت ئەکاتە سەر گۆڕانکارێکانی تاك و کۆمەڵ و چۆنێتی کارلێککردنی ڕەهەندە کاریگەرەکان.

**ئایا ئەکرێت جینۆساید ڕوونەدات؟**

مرۆڤایەتی قۆناغێکی گەورەی لەپێشکەوتن و گەشەکردن بڕیوە لەهەموو بوارەکاندا، ئەو پێشکەوتنە مەزنەی جیهان بەخۆیەوە بینیویێتی، بەتایبەتی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی و خێرایی گۆڕینەوەی زانیارییێکان کەهەنگاوی گەورەی ناوەو ڕۆڵی هەبووە لەگەشەکردنی بوارە جیاجیاکانی تردا، کەگرنگییەکی زۆری هەیە بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی پڕ لەئاشتی و ئارامی و خۆشگوزەرانی مرۆڤ، بەتایبەتی لەباشکردنی ئاستی ئابوری و کۆمەلایەتی و تەندروستی و پەروەردە، بەلام لەڕوویەکی ترەوە، ئەم پێشکەوتنە گەلێك لایەنی مەترسیداری تری لێکەوتوەتەوە، دوور نیە کەببێتە مایەی کارەسات بۆ مرۆڤایەتی، ئەگەر لەژێر کۆنترۆلکردنی توندا نەبێت، پەرەسەندنی جۆرەکانی چەك و کەرەستەی جەنگ بە شێوەیەکی سەرسوڕەێنەر، توانای ڕوخێنەری بۆمب و موشەکەکان دەیان جار چووەتە سەرو دروستکردنی چەکی ئەتۆم مەترسییەکی گەورەی خستۆتەوە لەسەر ئاستی جیهان، چونکە چەند وولاتێکی تر بێجگە لەوولاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکان، چوونەتە بواری بەرهەمەێنان و ئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەسەری و دروستکردنی دامەزراوی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە، لەوانە هیندستان، پاکستان، کۆریای باکورو ئێران، لە هەمان کاتدا هێشتا پێکدادان و ململانێی سیاسی و جیاوازی ڕەگەز لە چەندین شوێنی جیهاندا لە ئارادایە، هەروەها کێبڕکێی ئابوری لەنێوان وولاتاندا لە پەرەسەندندایەو چارەنووسی زۆربەی گەلان لەژێر مەرحەمەتی سەرکردەو دەسەلاتداری دیکتاتۆرو ڕژێمە تۆتالیتارەکاندایە، خۆپەرستی و مەیل و ئارەزووی شەڕەنگێزی باڵی کێشاوە بەسەریانداو گوێ بەچارەنووسی سەدان ملێون مرۆڤ نادەن، ئەگەر هاتو ململانێکان تینی سەند، ئەوا مەترسییەکی زۆر لە ئارادایەو مرۆڤایەتی دووچاری کارەساتی ڕاستەقینەی گەورە ئەبێت کە ئەنجامەکانی پێشبینی ناکرێن،

کەواتا چڕکردنەوەی هەوڵ و تواناکان لەسەر ئاستی جیهان لەپێناو ئەنجامدانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستیانەی تایبەت بەبوارە سایکۆلۆجی و کۆمەلایەتییە جۆراوجۆرەکاندا، ڕۆڵێکی گەلێ بەرچاو ئەبینێت بۆ دەستیشانکردن و بەشداربوون لەکەمکردنەوەی توندی ململانێکان و کۆنترۆڵکردنی هەڵچوون و هۆکارە هاندەرەکانی، سەرەڕای پێویستی کارکردن بۆ بلاوکردنەوەی هۆشیاری گشتی لەسەر ئاستی جیهاندا لەڕێگای گشت چەناڵەکانی میدیا و پێویستی داڕشتنی پرۆگرامی تایبەت لەسیستەمی پەروەردە لەهەموو ئاستەکانی خوێندندا بەمەبەستی بەرزبونەوەی ئاستی هۆشیاری و بلاوبوونەوەی گیانی لێبووردن و بەلاوەنانی ڕق و کینە، هەروەها بانگەشەکردن بۆ پەنابردنە بەر عەقڵ و ژیری لەپێناو گوێزانەوەی ڕێڕەوی ململانێ لەکاتی سەرهەڵدانی ناکۆکێکاندا، ئەوانەو، هێنانە کایەی سیستەمێکی جیهانی نوێ و پێدانی دەسەلات بەدەزگا نێودەولەتیە پەیوەندیدارەکانی تایبەت بەناوبژیکردن و کۆتایی هێنان بەململانێ نێودەولەتێکان و دەرهێنانیان لەژێر کۆنترۆڵی وولاتە زلهێزەکان، کارێکی هەرە گرنگە

بۆ ئەوەی گەلانی جیهان چیتر بەرەورووی جەنگوماڵوێرانیو کارەسات نەبنەوەو تواناکان بخرێنەگڕ بۆ بنبڕکردنی ئەو سیاسەتانەی کە جینۆسایدو کوشتنی خەڵکی بێتاوانی لێئەکەوێتەوە لەکاتی سەرهەڵدانی تەنگەژە وململانێدا.

**سەرچاوەکان**


- Stanislav Grof, “Planetary Survival and Consciousness Evolution:
” Primal ،Psychological Roots of Human Violence and Greed
،Renaissance: The Journal of Primal Psychology 2(1): 3-26
The Nazi Doctors: medical killing and the ،- Lifton, JAY, (1986)
،psychology of genocide
NY, Basic Books
New ، Theories of Personality، & Lindsey, Gardner،- Hall, Calvin S
،York: Wiley, 1978

– المەدی، محمد (2004)، سیکولوجیه الاستبداد:
asp?key=168،com/articles/articlesview،maganin،http://www
Available at: ، The Psychology of Genocide،- Crane, John (2007)
html،com/Travel/Bosnia/Genocide_psych،cranepsych،http://www

– المصدر السابق،
Psychosocial roots of ، (2005)،- Woolf, Linda M and Hulsizer, Michael R
Journal of Genocide ،genocide: risk, prevention, and intervention
،Research, 7(1), 101–128

– سالم، أحمد سالم (2007) حتى نفهم قضية دارفور:
html،com/dawri،sudanile،http://www
Behaving badly: Aversive behaviors in ، (2001)،)، (Ed، M،- Kowalski, R
Washington, DC: American Psychological ،interpersonal relationships
،Association
The Dark Triad of personality: ، (2002)،, & Williams, K،- Paulhus, D
Narcissism,
، Journal of Research in Personality،Machiavellianism, and psychopathy
556–563، 36 PP،Elsevier Science (USA)

– عەلی، بەختیار، لە ئارەزووی کوشتنەوە بۆ ئارەزووی فەرامۆشکردن ، سلێمانی، گۆڤاری ڕەهەند، (7)، 252–333،،

(1989) The Roots of Evil: The Origins of Genocide and Other ،- Staub, E
،Group Violence (New York: Cambridge, University Press)
– المەدی، المصدر السابق،
– ابو فوزه، خليل قطب (1996)، سيكولوجيه العدوان، القاهره، الهيئة العامه لقصور الثقافة،
102، P، cit، op،- Woolf, Linda M and Hulsizer, Michael R
103 ،P ،- Ibid
، New York: Harper & Row، Obedience to authority، (1974)،- Milgram, S
org/wiki/Attribution_theory،wikipedia، Attribution theory: http://en -
، The Crowd: A Study of the Popular Mind،- Le Bon, Gustave (1895)
،Retrieved on November 15, 2005
The Roots of Nazi Psychology: Hitler's Utopian ، Gonen،- Jay Y
، 224 pp، Lexington: University of Kentucky Press, 2000،Barbarism
، Scapegoat theology and the Problem of Violence،- Engle, Phillip (2005)
،Greensburg, PA: Laurel Highlands Media
، cit، op،- Crane, John

# ئەنفالی ناوچەی جەباری

## (لێکۆڵینەوەیەکی دیمۆگرافی ـ سیاسیە)

توێژەران: ئارام رەزا و بەهرۆز ساڵەح

### شوێن و ڕووبەری جەباری

ناوچەی جەباری دەکەوێتە بەشی باشوری کوردستانەوە لەپارێزگای کەرکوك، هەروەها ئەم ناوچەیە دەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، وەناحیەی قادرکەرەم دەکەوێتە بەشی باشوری یەوە وە لەباکوریەوە قەزای چەمچەماڵەو لەخۆرهەڵاتیەوە ناحیەی سەنگاوە لەباشوری ڕۆژئاوایەوە ناحیەی لەیلانە، وەسنوری خێڵەکی ئەم ناوچەیە لەباکورەوە خاسەی شوانەو لەباشوری یەوە لەیلانە لەڕۆژهەڵاتی یەوە چەمچەماڵەو لەبەشی ڕۆژئاوایەوە کەرکوکە.

ناوچەی جەباری دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی (35.21 – 35.36) باکوری هێڵی کەمەرەی زەوی یە وە دەکەوێت نێوان هێڵی درێژی (44.67 – 44.88) خۆرهەڵاتی هێڵی گرینچەوە، ناوچەی جەباری دەکەوێتە ناوەندی پارێزگاری کەرکوکەوە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی یەوە زنجیرە چیای سەڵباتووە لەباکوری یەوە چەمی گونجیلی جیای دەکاتەوە لەگوندەکانی ناحیەی لەیلان کەئەم چەمە بەرەو ڕۆژئاوا درێژدەبێتەوە.

ڕووبەری گوندەکانی ناوچەی جەباری (247)کم2، لەکۆی ڕووبەری هەمووپارێزگای کەرکوك کە(20013) کم2، بەم پیێ یە ڕووبەری ناوچەی جەباری دەکاتە (1.23٪) کۆی ڕووبەری پارێزگای کەرکوك.

### بارودۆخی دانیشتوانی ناوچەکە پێش ئەنفال

گەلی کورد زۆر دەردەسەری توش بووە لەسەردەمە جیاجیاکان، هەندێ جار واهەڵکەوتووە کەکورد یەکبگرێ و دەوڵەتێك دروست بکات، بەڵام هەوڵەکانی پوچەڵ کراوەتەوە لەلایەن دوژمنەکانی یەوە وەئەمەیش وای کردووە کەبارودۆخی کوردستان ناجێگیربێت، لێرەوە هەوڵ دەدەین لەم باسەدا نەخشەی دابەش بوونی ناوچەی جەباری بخەینەڕوو.

سەبارەت بە بارودۆخی دانیشتوانی ناوچەی جەباری لەپێش ئەنفال کەدەکەوێتە نێوان چەمچەماڵ و ناحیەی لەیلانەوە، ئەم ناوچانەش لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمدا بوو، بۆیە پرۆسەی ئەنفال ئەم ناوچەیە بارودۆخێکی زۆرلەباری نەبوو، ئەم ناوچەیە لەبەرئەوەی نزیك بوو لەدەسەڵاتی سوپای ڕژێمەوە بۆیە بەردەوام لەژێر هەڕەشەو شەڕوو هێرشەکانی ڕژێمدا بووە.

لەئەنجامی ئەولێکۆڵینەوە مەیدانیانەی کەلەناوچەکە بەئەنجام گەیاندووە لەکۆتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا پاش هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێ بەبەردەوامی هێزەکانی ڕژێم چاودێری و پەلاماری ناوچەکەیانداوە بونە هۆی سەرچاوەی نائارامی و ترس و دڵەڕاوکێ، چەندین کێڵگەی جوتیاران سوتاندووە وچەندین کەسی مەدەنیان لەم ناوچەیە شەهید کردرووەدە.

ئەم ناوچەیە بەردەوام لەژێر مەترسی و هەڕەشەی ڕژێمدا بووە چەندین زیانی گیانی و ماڵیان بەناوچەکە گەیاندووە، بۆیە ژمارەی دانیشتوان لەم ناوچەیە بەشێوەیەکی سروشتی زیدی نەکردووە، وەك دەرئەکەوێت لەبەراوردکرنی دانیشتوانی لەساڵی 1977 لەگەڵ ئەو ژمارە دانیشتوانەی کەلە لێکۆڵینەوەی مەیدانی کەلەناوچەکەدا وەرمان گرتووە.

هەروەها سەرەڕای ئەوەی بەشێکی زۆری دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەکاروباری کشتوکاڵ و ئاژەڵ داریەوە خەریك بوون، لەئەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانیەکەمان گەیشتوینەتە ئەوئەنجامەی کە (80٪) زیاتری دانیشتوانی بەکاروباری کشتوکاڵی و ئاژەڵ داریەوە خەریك بوون، بەڵام دەستکەوتێکی زۆرکەمیان دەست دەکەوت ئەمەش بەهۆی بارودۆخی نائارامی ناوچەکەوە بوو.

ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی جەباری، کەلەڕێگەی لێکۆڵینەوەمەیدانیەکانەوە وەرمان گرتووە هەوڵمانداوە لەهەرگوندێك کەسێکی شارەزاو باوەڕ پێکراو وەربگرین، کە (2481) کەس بووە لەمانگی ئازاری ساڵی 1988 کەئەم ژمارەیەش بەسەر گوندەکانا دابەش بووە،کەهەندێ گوندیان ژمارەیەکی زۆرتر سروشتی ئابوری بەبەراوەرد بەگوندەکانی تر.

لەبەر نالەباری ناوچەکە زۆرجار دانیشتوانی گوندەکانی کۆچیان کردووە بۆشوێنێکی تر، وەلەبارودۆخێکی زۆرخراپدا ژیاون لەبەر ئەوهۆکارانەی کەلەپێشتر ئاماژەمان پێکرد.

سەرەڕای ئەوەی کەلەلێکۆڵینەوە مەیدانیەکەماندا هەوڵمانداوە کە وردترین زانیاری و ژمارەی دانیشتوان وەربگرین لەزاری ئەوانەی کە چاوپێکەوتنمان لەگەڵیاندا کردووە، ئەم ژمارەیە ژمارەیەکی ڕاستەقینەی ناوچەکە نی یە لەبەر دووهۆکار:

1- بەهۆی هەڵهاتنی لاوانی کوردو بەشێکی کەم لەنەتەوەکانی تر لەشارەکانی کەرکوك و چەمچەماڵ لەترسی نەبونیان بەسەرباز ڕویان کردۆتە گوندەکان ئەمەش بوەتە هۆی زیاد بونی دانیشتوانی.

2- بەهۆی بەردەوامی تۆپباران ونەبونی ئاسایش وئارامی ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ناوچەکە ڕویان لەوشوێنە کردووە کە تۆپۆگرافیاکەی سەخت بووە، وەبەشێکی کەمیان ڕویان لەشارەکان کردووە لەژێردەسەڵاتی ڕژێمدا بوو.

## خشتەی ژمارە( 1 )

ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە لەئاماری 1977 وپێش ئەنفال 1988

| | ناوی گوند | سەرژمێری 1977 | | ژمارەی دانیشتوان لە1988 | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارەی خێزان | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی خێزان | ژمارەی دانیشتوان |
| 1 | کوڵەبان | 34 | 203 | 41 | 222 |
| 2 | مۆردانە | 25 | 143 | 22 | 143 |
| 3 | هەنارەمحمدشریف | – | – | – | – |
| 4 | هەنارەمحمدسعید | 19 | 137 | 25 | 128 |
| 5 | هەنارەمحمد أمین | 1 | 9 | 6 | 37 |
| 6 | زنەخۆر | – | – | 6 | 37 |
| 7 | حانی | 38 | 208 | 26 | 139 |
| 8 | تەکیە | 41 | 236 | 59 | 316 |
| 9 | زەوج | 4 | 31 | 4 | 19 |
| 10 | سۆران | 18 | 99 | 32 | 168 |
| 11 | قۆجەلی | 12 | 47 | 26 | 124 |
| 12 | شێخ محمدسەروو | 28 | –15 | 23 | 110 |
| 13 | شێخ محمد خواروو | – | – | 11 | 71 |
| 14 | بانگۆل | 39 | 228 | 43 | 266 |
| 15 | کانی بایز | – | – | 7 | 37 |
| 16 | قەڵاوەیز | – | – | – | – |
| 17 | محمود پەریزە | 21 | 120 | 24 | 203 |
| 18 | پوزەڵ | – | – | 16 | 132 |
| 19 | چیمەن | 24 | 57 | 16 | 118 |
| 20 | تاوێر بەرز | 24 | 155 | 12 | 79 |
| 21 | زەردە | 25 | 150 | 24 | 132 |
| | کۆ | 352 | 2000 | 432 | 2481 |

## هێرش و پەلامارە سەربازی یەکان لەئەنفالی سێ و ناوچەی لێکۆڵینەوە

ئەنفالی سێ هەروەك بەئەنفالی گەرمیان ناسراوە لە 7 نیسانی 1988 دەستی پێکرد کەپێشتر، گەرمیان ناسراوە بەوەی کەناوچەیەکی گەرم و هەردەو دەشتێکی پان و بەرینە لەبەشی هەر باشوری کوردستانی عێراقە، سنوری ئەم ناوچەیە لەرۆژئاواوە شارێی کەرکوکەو وەشارۆچکەی دوزخورماتووە لەباکورەوە ڕێگای کەرکوك چەمچەماڵە لەرۆژهەڵاتەوە چیاکانی قەرەداخە لەباشوری یەو کەلار وکفری پێبازە وەناحییەی قادرکەرەم چەقی جوگرافی ناوچەی گەرمیانە.

بەشێوەیەکی گشتی پەلامارە شەربازی یەکان بۆ ئەنفالی سێ دەکرێت بە سێ قۆڵی سەرەکی یەوە ئەوانیش بریتین لە:

**یەکەم :- قۆڵی دوزخورماتوو:**

لەبەرەبەیانی 7نیسان یەکە سەربازی و جاشەکان لەدووزخورماتوو دەرچون، ئەم هێزە بووبەسێ بەش

1- هێزی یەکەم لەشارۆچکەی نەوجولەوە بەرەو ئاوەسپی بەڕێکەوتن وهێرشیان کردە سەرناوچەکە.
2- هێزێکی گەورەتر بەدەم چەمی ئاوەسپی دا ڕۆشتن، کەپێکهاتبوو لە لیوای (65) هێزی تایبەت و دوو فەوجی جاش پاش شەڕێکی توند (17) گوندیان وێران کرد خەڵکەکەشی ڕاپێچ کران و شوێن بزرکران.
3- ئەوهێزە هاوبەشە پەلاماری تازە شاری دا، کە گوندێکی ستراتیژی گرنگ، ئەوگوندانەی وێران کردوو خەڵکەکەشی شوێن بزرکران.

**دووەم :- قۆڵی قادرکەرەم و باکوری گەرمیان**

شاڵاو و پەلامارەکانی ئەنفال لەم قۆڵەوە ناوچەکانی هەردوو عەشیرەتی جەباری و زەنگنەی گرتەوە، کەبەر کوشندەترین زەبری شاڵاوەکانی سوپای عێراقی کەوتن.

هێرش و پەلامەرەکانی بەم شێوەیەبوون:

1- لە10 نیسانی بەسەرپەرشتی عەمیدی هێزی تایبەت (بارق عبدالله حاجی حنتە) کەفەرماندەی گشتی شاڵاوەکانی ئەنفال بوو، هێزێکی سەربازی لەناوچەکانی نێوان ڕێگا سەرەکیەکانی چەمچەماڵ _کەرکوك بەئاراستەی باشور بڵاوکردەوە، گوندەکانی تێکدران و خەڵکەکەی شوێن بزرکران.
2- لە 11 نیسانیش هێزێك لەناحییەی قادرکەرەمەوە دەرچون بۆ ڕووخانی گوندی برایم غولام، گوندەکەیان ڕوخانو خەڵکەکەیان ناچارکرد خویان بەدەستەوە بدەن.
3- هێزێکە گەورەی سوپا هێرشیان کردە سەر گوندی گۆلباخ بۆتێکشکاندنی بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە، پاش ڕۆژێك بەرگری توانیان گوندەکە بڕوخێنن و خەڵکەکەشی خۆیان بەدەستەوەداو سەروەتوو سامانەکانیان بەتاڵان برا.

4- وەهێزیچکی تر لەناحییەی باوەنورەوە بەئاراستەی باکور پێشڕەویان کرد.

**هێرشی سەربازی بۆسەر ناوچەی ((جەباری))**

ناوچەی جەباری دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای ئەنفالی سێ وە، دانیشتوانی گوندەکانی ئەم ناوچەیە لەگەڵ گەیشتنی هێزەکانی ڕژێمی بەعس گوندەکانی خۆیان چۆڵکرد، کاتێ زانیان هێزەکانی سوپا لەقۆڵی کەرکوك چەمچەماڵەوە پێشڕەویان کرد بەرەوناوچەکە هێزەکانی ڕژێم لە 1988/4/9 بەهێزێکی تۆکمەوە لەسوپای عێراق و جاش لەچەند قۆڵێکەوە پەلاماری ناوچەکەیان دا و پەلامارە کەش لەم قۆڵانەوە بوو.

1- هێزێکی سەربازی ڕژێم لەسەر ڕێگای کەرکوك – چەمچەماڵ لەبانی مەقانەوە پێشڕەویان کرد هێشیان کردە سەر ناوچەکە.

2- هێزێکی تر لەکەرکەوە بەرەوناحییەی لەیلان بەڕێکەوتن پەلاماری گوندەکان باشوری ڕۆژئاواو ڕۆژئاوای ناوچەکەیان دا، کە لەگوندی هەنارەوە دەستی پێکرد تا وەکو گوندی محمود پەریزە درێژەی هەبوو.

3- هێزێکی تری ڕژێم لەدوزخورماتووە وە بەرەو قادرکەرم و دواتر بەرەوناوچەکانی باشوری ناوچەی جەباری هێرشیان کرد.

**شەڕی کوڵەبان**

کوڵەبان یەکێکە لەگوندەکانی ناوچەی جەباری دەکەوێتە باکوری ناوچەی جەباری یەوە، شەڕ لەم گوندەدا ڕوویدا بۆیە ناونرا شەڕی کوڵەبان، پاش ئەوەی رژێم هێرشی کردە سەر ناوچەکە وەك پێشتر باسمان کرد، پێشمەرگەکان کەرتی جەباری کەسەر بە (ی.ن.ك) بون و کۆمەڵێ لەپێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی لەگوندی کوڵەبان کۆبونەوە بۆبەرگری کردن لەناوچەکە لەدژی سوپای ڕژێم بۆسەر ناوچەکە وەشەڕ لەنێوانیاندا ڕوویدا لە1988/4/9 دا، وەپێشمەرگەکان توانیان بۆماوەیەك بەرگری بکەن، بەڵام هێزەکانی ڕژێم بەپاڵپشتی هیلیکۆپتەری جەنگی و چەکی پێشکەوتوو توانیان هێزەکانی پێشمەرگە تێك بشکێنن و سەرجەم گوندەکانی ناوچەی جەباری لەدوای ئەم شەڕەوە وێران کران، وەپێشمەرگەکانیش بەرەو ڕۆژئاوا پاشەکشێان کرد.

وەخەڵکی ناوچەکە پاش هەڵاتنیان لەگوندەکانی خوێان ڕوویان کرد هەردودەشت و دۆڵەکان پاش ماوەیەك هەندێکیان خۆیاندا بەدەستەوە هەندێکی تریان بەرەو شاری کەرکوك و چەمچەماڵ هەڵاتن لەڕێگەی هەندێ لەسەرۆك جاشەکانی ناوچەکەوە.

**کۆکردنەوەی خەڵك و لەناوبردنیان**

چەند ناوچەیەکی سەرەکی هەبوو لە گەرمیاندا مەڵبەندی کۆکردنەوەی خەڵکی مەدەنی بوون، ئەم ناوچانەش ملەسورە و فەقی مستەفا و مەیدان و قورەتوو لەباشوری گەرمیان، ئالیاوەو

لەیلان لەباکور، یەکەم سەنتەری کۆکردنەوە بوون کەخەڵکە مەدەنیە هەڵاتووەکەیان بۆ ڕاپێچ دەکراو دواتر بەرەو بەندیخانە دەیان بردن.

سەبارەت بەکۆکردنەوەوگواستنوەی دانیشتوانی ناوچەی جەباری بەپێی شوێنی جوگرافی ناوچەکە بۆدوو شوێنی کۆکردنەوە ڕاپێچکران.

1- قادرکەرم و ئالیاوە

ئەوخەڵکانەی باشورو خۆرهەڵاتی ناوچەی جەباری کەهەڵهاتبوون لەگوندەکانی خۆیان ڕویان کرد ئالیاوەو قادرکەرەم ئەمەش کاتێك بوو کەجاشەکان هانی خەڵکەکەیان دەدا خۆیان بدەن بەدەستەوە، ئەمەش وای کرد کەبەشێکی زۆری خەڵی ئەوناوچانە بەتایبەتی پیاوەکانیان خۆیان بەدەستەوە بدەن، لەگەڵ گیراوەکانی گوندەکانی ناوچەکە بەرەو ناوچەکانی باشوری عێراق ڕاپێچ کران.

2- لەیلان

ئەوخەڵکانەی ڕۆژئاواو باکوری ڕۆژئاوای ناوچەکە کەهەڵهاتبوون بەشێکی زۆریان دەستگیرکران بەرەو لەیلان بەڕێکران و کۆکرانەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆری لەوخەڵکانە ئازادکران لەلەیلان بەهۆی ئەوەی کەهەندێ لەسەرۆك جاشەکانە توانیان کۆمەڵێ خەڵك ئازاد بکەن، جگە لەوەش هەولی هەڵهاتن لەم کەمپە زیاتر بوو وەك لەقادرکەرم و ئالیاوە.

ئەنفال هێرشێکی هەمە لایەنەبوو بۆسەرکۆی ژیانی کۆمەڵگایەك، بۆکوشتن و بێسەرو شوێنکردن و وێرانکردنی گوندەکان و سوتاننیان بوو، وەتاڵان کردن و لەناوبردنی ئاژەڵ و پەلەوەرو وێرانکردنی هەموو بنەماکانی ژیانبوو.

وەهێرشی سەربازی بۆسەرناوچەی جەباری زەرەو زیانی گیانی ومالی زۆری لێکەوتەوە، وەکو لەنەخشەی ژمارە(2) دا دەرئەکەوێت، کەزیانێکی زۆرە، جگە لەو زەرەرو زیانانە زیانێکی زۆر بەناوچەکە گەیشتووە بەتایبەتی سروشتی ناوچەکەو لەناوبردنی بەروبومی گەنم و جۆو .......هتد. کەبەهۆی ئەم هێرشەوە لەناوچون.

### خشتەی ژمارە (2)

**زیانە گیانی ومالّیەکانی ناوچەی جەباری لەئەنجامی هێرش و پەلاماری ئەنفالدا.**

| ناوی گوند | ژ.ئەنفال | ژ.خانوو | ژ.مزگەوت | قوتابخانە | ژ.مەڕوبزن | ژ.مانگا | ژ.ئۆتۆمبیل | ژ.تراکتۆر | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کۆ | 248 | 471 | 16 | 8 | 31801 | 556 | 7 | 28 | |
| کوڵەبان | 25 | 49 | 1 | – | 2718 | 28 | – | 2 | 1 چێشتخانە |
| مۆردانە | 10 | 26 | 1 | – | 2085 | 17 | – | 1 | |
| هەنارەمحمد شریف | – | – | – | – | – | – | – | – | |
| هەنارەمحمد سعید | 13 | 28 | 1 | – | 2129 | 14 | – | 2 | |
| هەنارە محمد أمين | 5 | 6 | – | – | 859 | 11 | – | 1 | |
| زنە خۆر | 1 | 7 | – | – | 543 | 9 | – | – | |
| جانی | 2 | 31 | 1 | – | 2378 | 39 | – | 1 | |
| تەکیە | 13 | 69 | 1 | 1 | 3126 | 106 | 2 | 4 | 2چێشتخانە |
| زەوج | 2 | 4 | 1 | – | 317 | 18 | 1 | – | |
| سۆران | 26 | 34 | 1 | – | 1891 | 23 | – | 1 | |
| قۆچەلی | 11 | 28 | 1 | 1 | 2314 | 30 | – | 2 | |
| شێخ محمد سەروو | 28 | 25 | 1 | – | 2760 | 42 | – | 2 | |
| شێخ محمد خواروو | 7 | 12 | 1 | – | 915 | 18 | – | 1 | |
| بانگۆل | 31 | 47 | 1 | 1 | 2927 | 68 | – | 2 | |
| کانی بایز | 2 | 7 | – | – | 241 | 10 | – | 1 | |
| قەڵا وەیز | – | – | – | – | – | – | – | – | |
| پوزڵ | 19 | 17 | 1 | 1 | 618 | 21 | 1 | 2 | |
| چیمەن | 10 | 18 | 1 | 1 | 737 | 18 | 1 | 1 | |
| تاوێر بەرز | 11 | 13 | 1 | 1 | 717 | 16 | 1 | 2 | |
| زەردە | 17 | 26 | 1 | 1 | 2015 | 41 | – | 2 | |
| محمود پەرێز | 15 | 24 | 1 | 1 | 2511 | 27 | 1 | 1 | |

سەرچاوە: چاوپێکەوتنی توێژەران

## کاریگەریکانی دیموگرافیەکانی پرۆسەی ئەنفال لەسەر ئەنفال دانیستوانی جەباری

**یەکەم: پێکهاتەی ڕەگەز وتەمەنی دانیشتوان پێش تاوانەکان ئەنفال**

لێکۆڵینەوە لەپێکهاتەی ڕەگەز تەمەنی دانیشتوانی گرنگی یەکی زۆری هەیە، چونکە ڕوخسارە دیموگرافیەکانی کۆمەڵ ڕوندەکاتەوە ئەوگروپە بەرهەم هێنەرانە دیاری دەکات کە لەئەستۆیاندایە گروپەکانی تر بەخێوبکەن.

لەکوردستانیشدا وەك هەموو ولاتەکانی تری رۆژهەلات ڕێژەی (نێر) زیاتر لە ڕێژەی (مێ)، کەمی ڕێژەی (مێ)ش دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆکار وەك و بەرزی ڕێژەی مردن و زووشوکردن و منداڵبوون و هەرووەها کاری سەختی رۆژانە لەناویاندا، ئەم دیاردە دیموگرافیەش بەڕونی لەسەر دانیشتوانی هەرێمی کوردستان دیارە. لەڕوی زانستی یەوە دەرکەوتووە کەڕێژەی لەدایك بوانی (نێر) لەزۆربەی جاردا بۆهەر (100) (مێ) (105) (نێرە)، هەندێ جار بەرزدەبێتەوە بۆ (107) وەهەندێ جاریش بۆ(102) دادەبەزێت بەرامبەر بە (100) (مێ). لەناوچەی لێکۆڵینەوەکە ڕێژەی نێر بەرامبەر بەڕێژەی مێ نزیکەی (104) نێر بۆ هەر (100) مێیەکە، ئەمەش نزیکە لەژمارەی ستانداردەوە ودەگەڕێتەوە بۆ هاتنی گەنجانی کورد بۆ لادێکان لەترس نەبونیان بەسەربار، کەلەنەخشەی (3) دا کەپێکهاتەی دانیشتوانی ناوچەکە بەپێی ڕەگەز و تەمەن لەپێش پرۆسەی ئەنفال دەردەخات بەڕونی دیارە کە ڕێژەی (51.1٪) ی نێرن و ڕێژەی (48.9٪) ی مێن کە ئەمەش نزیکە لەژمارەی سروشتی یەوە، بەڵام ئەگەر سەیری پێکهاتەی تەمەن بکەین دەبینین گروپی تەمەنی (0–4) ساڵ ڕێژەی (14.4٪)ە، گروپی تەمەنی (5–9) ساڵ ڕێژەی (11.6٪)ە، وەگروپی تەمەنی (10–14) ساڵ ڕێژەی (14.4٪)ئەمەش ئەوە دەردەخات کەڕێژەی ئەم سێ گروپی تەمەنانە ڕێژەی (40.4٪) ی دانیشتوان پێك دەهێنێت کە ئەم ڕێژەیە ڕێژەیەکی بەرزە لەچاو گروپەکانی تەمەنی دواتردا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بەرزی ڕێژەی لەدایکبوون لەناوچەکە وەك زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەم کە بنکی هەرەمە دیمۆگرافیە فراوانە هەتا بەرەوتەمەنەکانی گەورەتربروات ئەوە هەرەمە دیمۆگرافیەکە کەم دەکات، لەگروپی تەمەنی (15–19) ساڵ ڕێژەکە دادەبەزێت بۆ(9.3٪) ئەم دادەبەزینەش بەردەوام دەبێت بۆهەموو تەمەنەکانی دواتر تادەگاتە گروپی تەمەنی (45–49) ساڵ کەڕێژەکەی (3.1٪) ە، ئەم دابەزینەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زەرەرو زیانەی کە توشی ئەم تەمەنانە هاتووە.

سەبارەت بەگروپەکانی دیکەی تەمەن لەگروپی تەمەنی (50–54) ساڵ کەمێك بەرزدەبێتەوە دەگاتە (3،6٪) دواتر لەگروپی تەمەنی (55–59) ساڵ دیسان ڕێژەکە دادەبەزێت بۆ(1،9٪) وەلەگروپی تەمەنی (60–64) ساڵ ڕێژەکە دەبێتەوە (1،6٪) وەلەگروپی تەمەنی (70) ساڵ بەرەو ژور ڕێژەکە دەبێتەوە (2،4٪).

**خشتەی ژمارە(3)**

**پێکهاتەی دانیشتوان بەپێی رشەگەزو تەمەن لەپێش ئەنفالدا لەساڵی ((1988))**

| تەمەن | نێر | | مێ | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ |
| 4–0 | 183 | 51،3 | 174 | 48،7 | 357 | 14،4 |
| 9–5 | 141 | 48،8 | 148 | 51،2 | 289 | 11،6 |
| 14–10 | 186 | 52،1 | 171 | 47،9 | 357 | 14،4 |
| 19–15 | 119 | 51،5 | 112 | 48،5 | 231 | 9،3 |
| 24–20 | 118 | 49،4 | 121 | 50،6 | 239 | 9،6 |
| 29–25 | 129 | 55،8 | 108 | 44،2 | 231 | 9،3 |
| 34–30 | 102 | 51،3 | 97 | 48،7 | 199 | 8 |
| 39–35 | 64 | 51،2 | 61 | 48،8 | 125 | 5 |
| 44–40 | 37 | 48،7 | 39 | 51،3 | 76 | 3،2 |
| 49–45 | 35 | 46،7 | 40 | 53،3 | 75 | 3،1 |
| 54–50 | 46 | 52،3 | 42 | 47،7 | 88 | 3،6 |
| 59–55 | 24 | 52،2 | 22 | 47،8 | 46 | 1،9 |
| 64–60 | 33 | 51،6 | 31 | 48،4 | 64 | 2،6 |
| 69–65 | 21 | 53،8 | 18 | 46،2 | 39 | 1،6 |
| +70 | 30 | 50،8 | 29 | 49،2 | 59 | 2،4 |
| کۆ | 1268 | 51،1 | 1213 | 48،9 | 2481 | 100 |

**سەرچاوە: چاوپێکەوتنی توێژەران**

**ڕێژەی ڕەگەزی نێرو مێ ی ئەنفال کراو لەکۆی دانیشتوان**

پەلاماری ئەنفال بۆسەر کورد لەبنەڕەتدا پەلامارێك بوو بۆ لەناوبردنی میللەتێك ووێرانکردنی گوندەکانی کوردستان لەلایەن ڕژێمی بەعسی ڕووخاوەوە.

هەروەها ئەم هێرشانەی ئەنفال تەنها بۆ لەناوبردنی گەلی کورد نەبوو بەڵکو بۆ لەناوبردنی سەرجەم ڕەهەندی ئابوری و کۆمەڵایەتی و دیمۆگرافی ودەروونیەکانی گەلی کورد بوو، لێرەدا هەوڵدەدەین ڕێژەی ئەنفالکراوەکانی ناوچەی جەباری بۆکۆی دانیشتونی ناوچەکە بخەینە ڕوو لەساڵی (1988) دا لەڕووی ڕەگەزی نێروو مێوە.

لەخشتەی ژمارە چواردا دەردەکەوێت کە ڕێژەی (9،9٪) دانیشتوانی ناوچەکە بەرشاڵاوی ئەنفال کەوتونە وبێ سەروشوێن کراون، وەڕێژەیەکی زۆریش لەکەسانەی کەئەنفال کراون گەڕاونەتەوە یان لەئەنفالدا دەربازبوو، ئەوانەی بەر ئەنفال نەکەوتوون گەڕاونەتەوە ڕێژەیان (90.1٪) ئەم ڕێژەیە ژمارەیەکی زۆرە لەچاو ناوچەکانی تر، ئەمەش بەهۆی دەربازبوونی ژمارەیەکی زۆری ناوچەکە لەناوچەی قادرکەرەم ولەیلان، وەدەربازبووەکان زۆربەیان پیرومنداڵ و ئافرەت بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی ئەنفال کراوەکانی ناوچەکە چەندین کێشەی ئابوری و کۆمەڵایەتی و دیموٚگرافی بۆکەس و کارەکانیان دروست کردووە، ئەمەش سەرەڕای کاریگەریە خراپەکانی کەهەتا ئێستاش ماوە.

**خشتەی ژمارە چوار**

**دابەشبوونی دانیشتوانی ناوچەکە بەپێی ڕەگەز بۆئەنفال کراو ئەنفال نەکراوەکان لەساڵی (1988)دا**

| ئەنفال کراوەکان | | | | ئەنفال نەکراوەکان | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نێر | | مێ | | نێر | | مێ | |
| ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ |
| 235 | 94.8 | 13 | 5.2 | 1033 | 45.6 | 1200 | 54.4 |
| کۆ | 248 | | | 2233 | | | 2481 |
| ٪ | 9،9 | | | 90.1 | | | |

**دابەشبوونی ئەنفال کراوەکان بە پێی ڕەگەزوتەمەن لەساڵی (1988)دا**

ڕێژەی ئەنفالکراوەکان کە ڕەگەزی نێرن (94.8٪)ە وەڕێژەی ئەنفالکراوەکان کە ڕەگەزی مێن (5.2٪)ە، پێویستە ئەوە بگوترێ کەڕژێمی بەعس سەرەڕای ئەوەی جیاوازی نەکردوە لەنێوان ڕەگەزی نێرو مێدا لەشاڵاوەکانی ئەنفالدا، بەڵام لەم ناوچەیە ژمارەیەکی زۆری ڕەگەزی مێ ڕزگاریان بوو، یان دواتر لەبەندینخانەکان ئازادکران و گەڕانەوە، بۆیە ڕێژەی مێ کەمترە، وە

بەرزی ڕێژەی نێری ئەنفالکراوەکان لەم ناوچەیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خەڵکی ئەم ناوچەیە ئەوەی پێشمەرگە نەبوو سەربەهێزی پشتگیری بوو بۆیە ئەو ڕێژە بەرزەیان لێ ئەنفال کراوە.

ڕژێمی بەعس لەگەیاندی گەورەترین زیان بەدانیشتوانی کوردستان درێخی نەکردووە، لەلایەکەوە هێزی بەرهەم هێنی مرۆی کەم کردۆتەوە لەلایەکی ترەوە هێزی ئابوری دانیشتوانی گوندەکانی لەناوبردووە، جگە لەوەش لەڕووی سیاسیەوە زەرەرو زیانێکی زۆری بەشۆڕشی کورد گەیاندووە، لەئەنجامی ڕووخانی دێهاتەکانەوە بەتایبەتی دانیشتوانی گوندەکان و ئەوانەی لەشارەکانەوە دەهاتن بۆ گوندەکان کە پشتگیری شۆڕش بوون.

سەبارەت بەتەمەنی ئەنفالکراوە کان وەك لەخشتەی ژمارە (5) دیارە کە گروپی تەمەنی (0–4) ساڵ ڕێژەی (6.1٪) ە ئەمەش منداڵی شیرە خۆرەو منداڵی خوار پێنج ساڵ دەگرێتەوە کەلەسەر زەوی دا هیچ یاسایەك نیە ئەوکەسانە سزابدات بە زیندووی لەناویان بدرێت، کەچی ڕژێمی بەعس ئەو کارەی ئەنجام دا، وەگروپی نێوان (5–19) ساڵ ڕێژەی (19.8٪) کەئەم گروپانە هێزی ئایندەی کۆمەڵگا پێك دەهێنن بەتایبەتی لەڕووی جموجوڵی دیمۆگرافی و ئابوری وکۆمەڵیەتی و سیاسی و سەربازی کەلەئایندەدا لەسەر ئەم گروپانە وەستاوە بۆیە حکومەتی بەعس ئەوڕێژە زۆرەی لەناو برد، بەڵام لەگروپەکانی تەمەنی (20–39) ساڵ ڕێژەی (64.3٪) بووە کەگروپەکانی ئەم تەمەنە بەهێزی ئابوری ومرۆی وبەرهەمهێنان وبەرگری کردن لەنیشتیمان دادەنرێن، ئەم گروپە تەمەنانە لای بەعس زۆر مەبەست بوون بۆیە ئەم ڕێژەی زۆرە لەم تەمەنانە لەناوچون.

وەگروپی تەمەنی (40–54) ساڵ ڕێژەیان (8،8٪) کەڕێژەیەکی نزمە بەبەراورد بە گروپەکانی تەمەنی (20–39) ساڵ، وەگروپەکانی تەمەنی (55–69) ساڵ، ڕێژەیان (0.8٪) وەگروپی تەمەنی سەروی 70ساڵ ڕێژەی (0.4٪)ە، نزمی ئەم ڕێژانەش لەگروپەکانی تەمەنی (55بۆ سەروی 70) ساڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەزیاتر ئەو کەسانە پیربون و کە ژمارەیەکی زۆریان پاش گرتنیان لەزیندان ئازاد کران، چونکە ئەم گروپانە لە ڕووی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی یەوە چینی مەترسی نەبوو لەلای ڕژێمی بەعس، هەروەها ئازادکردنی ئەم بەساڵاچوانە لەپاش لێبوردنەکەی 1988/9/6 بو بۆئەوەی کە حکومەتی بەعس پێشانی ڕای گشتی و ناوخۆیی بدات کە گیراوەکانی ئەنفال ئازاد دەکات، بەڵام لەبنەڕەتدا دەیان هەزاری زیندە بەچاڵ کرد لەوماوەیەدا.

خشتەی ژمارە ﴿5﴾

دابەشبوونی ئەنفالکراوەکان بەپێی ڕەگەزوو تەمەن لەساڵی ((1988)) دا.

| تەمەن | نێر | | مێ | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ |
| 4–0 | 2 | 13.3 | 13 | 86.7 | 15 | 6.1 |
| 9–5 | 1 | 100 | – | – | 1 | 0.5 |
| 14–10 | 2 | 100 | – | – | 2 | 0.8 |
| 19–15 | 46 | 100 | – | – | 46 | 18.6 |
| 24–20 | 61 | 100 | – | – | 61 | 24.6 |
| 29–25 | 32 | 100 | – | – | 32 | 14.9 |
| 34–30 | 35 | 100 | – | – | 35 | 14.1 |
| 39–35 | 31 | 100 | – | – | 31 | 12.5 |
| 44–40 | 13 | 100 | – | – | 13 | 5.2 |
| 49–45 | 5 | 100 | – | – | 5 | 2 |
| 54–50 | 4 | 100 | – | – | 4 | 1.6 |
| 59–55 | 1 | 100 | – | – | 1 | 0.4 |
| 64–60 | 1 | 100 | – | – | 1 | 0.4 |
| 69–65 | – | – | – | – | – | – |
| +70 | 1 | 100 | – | – | 1 | 0.4 |
| کۆ | 235 | 94.8 | 13 | 5.2 | 248 | 100 |

**پێکهاتەی تەمەن و ڕەگەز و دانیشتوان پاش پرۆسەی ئەنفال لەساڵی (( 1988 )) دا**

بارودۆخی دیموگرافی گۆڕانی زۆری بەسەرداهات لەئەنجامی جێ بەجێکردنی پرۆسەی ئەنفال دا بەتایبەتی لەڕوی پێکهاتەی تەمەن و ڕەگەزەوە، دەردەکەوێت کە ڕێژەی (45.6٪) ی ئەوانەی کە ئەنفال نەکراون لەم ناوچەیەدا ڕەگەزی نێرن بەڵام ڕێژەی (54.4٪) ی ئەوانەی کە ئەنفال نەکراون ڕەگەزی مێ یەن وەك لەخشتەی ژمارە (6) دا ڕوونکراوەتەوە، واتا ڕەگەزی نێرە کەمترە لە ڕەگەزی مێ یە،چونکە لەهێرش و شاڵاوەکانی ئەنفال دا ڕەگەزی مێینە زیاتر ڕزگاریان بووە بەڵام ڕەگەزی نێرینە بەشێکی زۆری لێ ئەنفال کرا.

ئەگەر ئەم ڕێژانە بەراورد بکەین بەپێکهاتەی ڕەگەزو تەمەنی پێش ئەنفال کە ڕێژەی نێرینە (51.1٪) بوو، وەك لەخشتەی ژمارە (3) دەردەکەوێت، کەجیاوازی ئەم ڕێژەیەش (5،5٪)

دابەزیوە، وە ڕێژەی ڕەگوزی مێ (48.9٪) وە سەرکەوتووە بۆ (54.4) کە جیاوازی یەکی زۆرە دەگاتە (5،5٪) کەئەم بەرز بونەوەی ڕێژەیەش لەئەنجامی پرۆسەی ئەنفالەوە بووە، کەڕێژەی مێینە کەمتر تیاچووە، ئەم دابەشبوونە سروشتی یەی دانیشتوان گۆڕانی تێکەوت و کێشەو گرفتی ئابوری و کۆمەڵایەتی دروستکرد.

ئەگەر بەراوردی گروپی تەمەنەکانی پێش پرۆسەی ئەنفال و پاش پرۆسەی ئەنفال بکەین دەبینین جیاوازیەکی زۆری تێدەکەوێت وەك لەگروپەکانی تەمەنی (0–14) ساڵ ڕێژەکەیان (1.2٪) بەرزدەبێتەوە بەبەراورد لەگەڵ هەمان گروپی تەمەن پێش پرۆسەی ئەنفالدا، وەگروپەکانی تەمەنی (15–39)ساڵی ڕێژەیان (0.8٪) دا کەم دەبێتەوە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئەنفالکراوەکان زۆرتر لەم تەمەنەدابوون، گروپەکانی تەمەنی (50) ساڵی بۆسەرەوە (70) ساڵ ڕێژەیان جێگیرە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئەم گروپانە کەمتر بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتون.

ئەگەر بەوردی بەراوردی نێوان خشتەی ژمارە (5) و(6) بکەین، دەبینین زۆرترین ڕێژەی ئەنفالکراوەکان لەڕەگەزی نێرن بەتایبەتی لەگروپەکانی تەمەنی (15–19) ساڵ تا(40–44) ساڵ ڕێژەیان دەگاتە (87.8٪) کەسەرجەمیان ڕەگەزی نێرن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە زۆرترین ژمارەی ڕەگەزی نێر لەتەمەنی هێزی ئابوری و کارکردندابوون، بەڵام لەگروپی تەمەنی (0–4) ساڵ ڕێژەی ڕەگەزی مێینەی ئەنفال کراو زیاترە لە ڕێژەی ڕەگەزی نێری ئەنفال کراو، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەو گوندانەی کە بەر پرۆسەی ئەنفال کەوتون جیاوازی لەنێوان منداڵ وپیردا نەکراوە لەئەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانیەکان بۆمان دەرکەوت کەژمارەیەکی زۆر لە ژن و منداڵ لەگوندەکانی ئەم ناوچەیەدا بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون لەگرتوو خانەکاندا گیانیان لەدەست داوە.

خشتەی ژمارە (6)

دابەشبونی ڕەگەز و تەمەنی دانیشتوانی ناوچەکە لەپاش پرۆسەی ئەنفال لەساڵی ((1988)) دا

| تەمەن | نێر | | مێ | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ |
| 4–0 | 181 | 52.9 | 161 | 47.1 | 342 | 15.3 |
| 9–5 | 140 | 45.6 | 148 | 53.4 | 228 | 12.9 |
| 14–10 | 184 | 51.8 | 171 | 48.2 | 355 | 15.9 |
| 19–15 | 73 | 39.6 | 112 | 60.4 | 185 | 8.3 |
| 24–20 | 57 | 32 | 121 | 68 | 178 | 8 |
| 29–25 | 97 | 48.7 | 108 | 51.3 | 199 | 8.9 |
| 34–30 | 67 | 40.9 | 97 | 59.1 | 164 | 7.3 |
| 39–35 | 33 | 35.1 | 61 | 64.9 | 94 | 4.3 |
| 44–40 | 24 | 38.1 | 39 | 61.9 | 63 | 2.8 |
| 49–45 | 30 | 42.9 | 40 | 57.1 | 70 | 3.1 |
| 54–50 | 42 | 50 | 42 | 50 | 84 | 3.8 |
| 59–55 | 23 | 51.1 | 22 | 48.9 | 45 | 2.1 |
| 64–60 | 32 | 51.1 | 31 | 48.9 | 63 | 2.8 |
| 69–65 | 21 | 53.8 | 18 | 46.2 | 39 | 1.8 |
| +70 | 298 | 50 | 29 | 50 | 58 | 2.6 |
| کۆ | 1033 | 45.6 | 1200 | 54.4 | 2233 | 100 |

**پێکهاتەی ڕەگەزو تەمەنی دانیشتوانی ناوچەی جەباری لەساڵی 2007 دا**

لەخشتەی ژمارە (7) دا پێکهاتەی ڕەگەزو تەمەنی دانیشتوانی ناوچەی جەباری لەساڵی 2007 دادەردەخات، دەردەکەوێت کەڕێژەی ڕەگەزی نێر (52.3٪) وەڕێژەی ڕەگەزی مێ ( 47.7٪)ە سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لەڕەگەزی نێر بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن، بەڵام ئەم ڕێژەیە بەرزە لەنێر لەکاتی ئێستادا دەگەڕێتەوە بۆئەوە کەلایەنی ئابووری و کۆمەڵایەت و تەندروستی بوونی ئاشتی لەناوچەکەدا بەباشی گەشەی سەندووە.

بەڵام ئەگەر بەوردی سەیری خشتەی ژمارە (7) بکەیت دەبینین ڕێژەی (11.3٪) دانیشتوان تەمەنیان لە نێوان (0–4) ساڵیدایە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەبارودۆخی ئابووری و

تەندروستی لەکوردستاندا بەباشی گەشەی کردووە، بەڵام بۆ گروپی تەمەنی (5–9) ساڵ ڕێژەی (11.6٪)ە، وەگروپی تەمەنی 10–14) ساڵ ڕێژەکە دادەبەزێت بۆ (9٪) ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خراپی باری ئابووری و شەڕی ناوخۆ لەکوردستاندا، بەڵام گروپی تەمەنی (15–19) ساڵ ڕێژەی (15.3٪) یە، وەگروپی تەمەنی (20–24) ساڵ ڕێژەی (10.8)ە، وەگروپی تەمەنی (25–29) ساڵ ڕێژەی (9٪) یە، وەبەرزی ئەم ڕێژانەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی لەپرۆسەی ئەنفالدا ئەم گروپی تەمەنانە منداڵ بوون کەمتر بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون، بۆزانیاری زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە (5) کەڕێژەی ئەنفالکراوەکان لەم ناوچەیەدا (0.7٪) کەتەمەنیان لەنێوان (0–4) ساڵیدایە، بەڵام سەبارەت بەگروپی تەمەنی (30–34) ساڵ ڕێژەکە (6.7٪)ە، وەگروپی تەمەنی 35–39) ساڵ ڕێژەکە (6٪) ە، وەهەروها گروپی تەمەنی (40–44) ساڵ ڕێژەکە دەگاتە (4.5٪) وەئەم ڕێژانە ڕوو لەنزم بونەوەیە بەشێوەیەك لەتەمەنی (45–49) ساڵ دەگاتە (4.5٪) وەگروپی تەمەنی (50–54) ساڵ ڕێژەکە دادەبەزێت بۆ (3٪) وەهەروها لەگروپی تەمەنی (55–59) ساڵ ڕێژەکە دەبێتە (2.2) وەگروپی تەمەنی(60–64) ساڵ دەبێتە (1.4٪).

بێگومان ئەم دابەزینی ڕێژانە بۆئەم گروپانەی تەمەن دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەکاتی پرۆسەی ئەنفالدا ئەم گروپانەی تەمەن زۆرترین ژمارەیان لیٚ ئەنفالکراوە، بەڵام گروپەکانی تەمەنی (70) ساڵ بۆ سەرەوە ڕێژەکە بەرزدەبێتەوە بۆ (2.9٪) هۆی بەرزی ئەم ڕێژەیە دەگەرێتەوە بۆئەوەی کە ئەم گروپانەی تەمەن کەمتر بەر ساڵاوەکانی ئەنفال کەوتوون لەبەر ئەوەی لەکاتی پرۆسەکەدا تەمەنیان لەسەرووی (50) ساڵەوەبوو.

لەئەنجامی شیکردنەوەی پێکهاتە و ڕەگەزی دانیشتوانی ناوچەکە لەساڵی (2007) دا بۆمان ڕوون بووەوە کە کاریگەری پرۆسەی ئەنفال لەڕووی دیموگرافی یەوە بەتەواوی کاریگەری لەسەر دانیشتوانی ناوچەکە بوو، بەتایبەت لەگروپەکانی تەمەنی ( 35–64) ساڵی.

خشتەی ژمارە (7)

دابەشبوونی دانیشتاونی ناوچەکە بەپێی ڕەگەزو تەمەن لەساڵی (2007)دا

| تەمەن | نێر | | مێ | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ |
| 4–0 | 43 | 48.9 | 45 | 51.1 | 88 | 11.3 |
| 9–5 | 44 | 48.9 | 46 | 51.1 | 90 | 11.6 |
| 14–10 | 37 | 52.9 | 33 | 47.1 | 70 | 9 |
| 19–15 | 62 | 52.1 | 57 | 47.9 | 119 | 15.3 |
| 24–20 | 45 | 53.6 | 29 | 46.4 | 84 | 10.8 |
| 29–25 | 38 | 54.4 | 32 | 45.6 | 70 | 9 |
| 34–30 | 27 | 51.9 | 25 | 46.1 | 52 | 6.7 |
| 39–35 | 26 | 55.3 | 21 | 44.7 | 47 | 6 |
| 44–40 | 23 | 54.8 | 19 | 45.2 | 42 | 5.4 |
| 49–45 | 17 | 48.6 | 18 | 51.4 | 35 | 4.5 |
| 54–50 | 14 | 60.9 | 9 | 39.1 | 23 | 3 |
| 59–55 | 9 | 52.9 | 8 | 47.1 | 17 | 2.2 |
| 64–60 | 5 | 45.5 | 6 | 54.5 | 11 | 1.4 |
| 69–65 | 4 | 57.1 | 3 | 42.9 | 7 | 0.9 |
| +70 | 13 | 59.9 | 9 | 40.1 | 22 | 2.9 |
| کۆ | 403 | 53.2 | 371 | 46.8 | 778 | 100 |

**کاریگەری پرۆسەی ئەنفال لەسەر دانیشتوانی ناوچەکە تا ساڵی (2007)**

هۆکاری زیادبوونی دانیشتوان خۆی لەدووهۆکاری سەرەیەکی دا دەبینێتەوە کەئەوانیش هۆکاری سروشتی کە هۆکاری سروشتی بریتی یە لەدایکبوون و مردن، هۆکاری دووەمیش بریتی یە لەکۆچکردن لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بەمانایەکی تر

زیادبوونی سروشتی =تێکڕای لەدایکبوون – تێکڕای مردن

وەتێکرای لەدایك بوون جیاواز دەبێت بەپێی بارودۆخی کۆمەڵاتی و شارستانی وچاودێری تەندروستی وهۆکارە ئابوریەکان.

زیادەی سروشتی ئەو توخمە بنەڕەتیە کە کار دەکاتە سەر ڕەوتی گەشەی دانیشتوان، کە خۆی لەجیاوازی نێوان لەدایك بون و مردندا دەبینێتەوە، وەکاریگەری بۆ سەر گۆڕانکاری یە دیمۆگرافیەکانی تر دەبێت.

بە بۆچونی جەزا تۆفیق تالب لەکتێبی بایەخی جیوپۆلۆتیکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق دەڵێت ( عێرق ناوچەیەکی تیانیە کە ڕووداوەکانی لەدایك بوون و مردنی بەرێك و پێکی تۆمار بکرێ) ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئامارەکانیان ڕاستی نادرکێنن، لەبەر ئەمە هۆکارەکانی لەدایك بوون و مردن لەهەرێمی کوردستان دا باری ڕاستەقینە نانوێنێ، دەرکەتووە لەهەرێمی کوردستان دا ڕێژەی مێینە لەنێوان تەمەنەکانی (15–45) سالی لەسەر (1000) ژنێك لەتەمەنی سککردندا لە (977) منداڵ کەمتر نابێت.

بەپشت بەستن بەو ڕایەی سەرەوە دەتوانین ژمارەی لەدایك بووان دەربخەین، ئەگەر ئەنفال لە ناوچەکە ڕووی نەدایەو دواتر ڕێژەی مردنی ساڵانەی بۆ دەردەکەین بۆئەوەی گەشەی سروشتی دانیشتوانمان بۆ دەربکەوێت، دانیشتوانی ناوچەکە پێش ئەنفال (2481) کەسەو (578) کەسی مێینەیە لەتەمەنی (15–49) ساڵیدایە واتا ئەوانەی کە توانای منداڵ بونیان هەیە، ئەم ژمارەیەش بەپێی ئەو ڕایەی سەرەوە لە توانایدایە (567) منداڵ بخاتەوە، چونکە هەر (100) مێیەك توانای هەیە (98) منالی هەبێت لەساڵێکدا، واتا لە (19) ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر شاڵاوەکانی ئەنفالدا، واتا لە ساڵی (1988– 2007) دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر ئەنفال ڕووی نەدایە ئەوە نزیکەی (10773) منداڵ لەدایك دەبوو لەماوەی ئەو (19) ساڵە ئەگەر ئەم ژمارەیەش بخرێتە سەر ژمارەی دانیشتوان پێش ئەنفال دەکاتە (11400) کەس.

پێویستە ڕێژەی مردن لەو ژمارەیەی سەرەوە، کە ئەم ڕێژەی گشتی مردنە لەعێراقدا لەساڵی 80 کاندا (0.012٪) بووە واتە ساڵانە لە هەر (1000) کە (12) کەسیان مردوون، بەوپێیەش لەناوچەی لێکۆڵینەوەکەمان ژمارەی دانیشتوان بەشێوەیەکی سروشتی زیادی بکردایە ساڵانە ئەوا بەماوەی ئەو (19) ساڵە (1854) کەس دەمرد، بۆزانیاری زیاتر بڕوانی خشتەی ژمارە (8)، بۆئەوەی بزانیت گەشەی سروشتی دانیشتوان لەماوەی ئەو (19) ساڵەدا چەندبوو، ئەوا یاسای (زیادبوونی سروشتی =تێکڕای لەدایك بوون –تێکڕای مردن)

= 1854–10773

=8919

بەزیادکرنی ژمارەی دانیشتوان پێش ئەنفال بۆسەر ئەم ژمارەیە ئەوا دەکاتە (11400) کەس، کەواتە ژمارەی دانیشتوانی لێکۆڵینەوەکەمان (11400) کەس دەبوو، ئەگەر پرۆسەی ئەنفال لەناوچەکە ڕووی نەدایە. هەرچەندە ئەم ژمارەیە بە خەمڵاندن دەرمانکرد بەو یاسایەی سەرەوە لەوانەیە هەندێ جیاوازی هەبێ لەگەڵ ڕاستی دا.

**خشتەی ژمارە (8)**

**ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە لە ساڵی (1988–2007) ئەگەر پرۆسەی ئەنفال ڕووی نەدایەلەگەڵ ڕێژەی مردنی ساڵانە**

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوانی ساڵ | ژمارەی مردنی ساڵانە |
|---|---|---|
| 1988 | 2481 | – |
| 1989 | 3048 | 36 |
| 1990 | 3615 | 42 |
| 1991 | 4182 | 50 |
| 1992 | 4749 | 56 |
| 1993 | 5316 | 64 |
| 1994 | 5883 | 70 |
| 1995 | 6450 | 78 |
| 1996 | 7017 | 84 |
| 1997 | 7584 | 91 |
| 1998 | 8151 | 98 |
| 1999 | 8718 | 104 |
| 2000 | 9285 | 111 |
| 2001 | 9852 | 118 |
| 2002 | 10419 | 125 |
| 2003 | 10986 | 132 |
| 2004 | 11553 | 139 |
| 2005 | 12120 | 145 |
| 2006 | 12687 | 152 |
| 2007 | 13254 | 159 |
| | | 1854 |

**بە پێویستمان زانی لە کۆتایدا ناوی ئەنفال کراوەکانی ناوچەی جەباری بڵاو بکەینەوە:**

**صاڵح حسن محمد، ڕەزا عزالدین محمد، معتسم جعفر جبار، بیباك جبار محمد، عبدی عزیز، خرامان جبار عزیز، جبار عزیز سید، قارەمان عزیز سید، علی عبدالعزیز، زەکیە علی عبدالعزیز، کوێستان علی عبدالعزیز، نیشتمان علی عبدالعزیز، خالد أسماعیل، چرۆ مجید محمد، زایدە أحمد ستار، صدرالدین أحمد، دارا صدرالدین أحمد، بکر عبدالعزیز، نوری محمد ستار، خالد محمد ستار، شەهاب أحمد خورشید، أحمد محمد، علی محمد، یاسین محمد، ڕزگار محمد ستار، فریاد محمد ستار، صاڵح خورشید، کریم خورشید، جلال خورشید، علی عسمان، سیدگوڵ أحمد، مەهدی أحمد، باهر تاهیر عبداللە، أحمد أمین علی، محمد أحمد محمد، علی نوری أحمد، سعید أحمد محمد، خلیل جلیل محمد، زایر حسین**

نجم، أنور حسين نجم، شكور قادر شريف، محمد حسن محمد، مصطفى لەتيف أحمد، فتاح عزيز أحمد، أحمد محمد، فرهاد أحمد، جهاد أحمد، بەهجەت حسن، نورى حسن، عبدالله محمد، سەروەر محمد، صالّح عزيز بابا، على عزيز بابا، غازى عزيز بابا، على حسين، عمر حسين، هيلال محمد بابا، نجات محمد، كريم محمد، نوزاد خدر، حوێز جميل، كريم جميل، أحيا جميل، رزگار نجم الدين، محمد نجم الدين، ڕێبوار نجم الدين، شێرزاد نجم الدين، محمد أحمد حسن، أحمد حسن، أحمد حسن، بورهان أحمد، مارف، مردان صالّح، فواد محمد أمين، نەجات محمد أمين، جهاد محمد أمين، نجم عبدالكريم، قادر أسماعيل، عمر أسماعيل، عسكر لەتيف بابا، أزغر لەتيف بابا، أحمد أسماعيل بابا، نصرالدين أسماعيل باب، محمود صابر صالّح، شريف صالح شريف، صالح رشيد محمد، رزگار رشيد محمد، عارف سيد حميد، حميد سيد حميد، على محمد على، ديمن على محمد، سروه على محمد، فاتح جبار، تەها تيب على، رمزان مراد أحمد، فرهاد مراد أحمد، جەلال رووف أحمد، جمال رووف أحمد، كمال رووف أحمد، نوزاد قادر أنجه، سەركەوت محمد نامق، كمال عزيز عول، بێخال كمال عزيز، سەمەر كمال عزيز، سەرباخ كمال عزيز، نورى أنجه صمد، مصطفى نامق، حسين مصطفى نامق، ئازاد مصطفى أنجه، سەيد احمد انجه، صلاح نصرالدين، رزگار رشيد نجم، محمد رشيد نجم، كاكه ڕەش نامق، عبدالكريم عبدالله، باب عزيز نورى، وەزيره عزيز، ئاسكه محى الدين بابا، بێخاڵ بابا، أحمد محمد محمد على، شكور أحمد محمد، ستار عبدالرحمن، عبدالله محمد، اسماعيل حسن محمد، جلال اسعد محمد، احمد صالح عبدالله، حسن مجيد، حسن عبدالله عبدل، أحمد عبدالله عبدل، اسماعيل حسين محمد، عبدالله حسن، صابر كاكه حمه، غازى صابر كاكه حمه، ئازاد صابر كاكه حمه، شێرزاد صابر كاكه حمه، لقمان فازل حسن، حسين حسن امين، عمر حسن امين، لگيف محمد امين، جمال جعفر جوهر ، حسن مجيد احمد، كريم جوهر احمد، مهدى نامق محمد، نوزاد محمد صالح، بهرۆز حسين عبدالكريم، محمد على حسن، مجيد امين خورشيد، حسن والى صالح، جوامێر محمد نجم، لقمان محمد عزيز، جعفر عزيز، سەردار تاهر، محمود كاكلان، ستار محمد، خالد عزيز، عبدالله عزيز، امين ستار، ستار عبدالرحمن، صلاح غريب، محمد غريب، عزالدين امين، عزالدين احمد، نجم الدين احمد، فخرالدين احمد، جلال جبار، ابراهيم عبدالرحمن، محمد احمد، خليل محمد، اكرم تاهر عبدالله، سعيد عمر سعيد، عاصى عمر سعيد، على عمر سعيد، صمد محمد خدر، جوهر صابر محمد، غالب نورى، محمد بابا على، تيب بابا على، فازل احمد عزيز، رحيم شكور، محمد شمس الدين، كريم صدرالدين، احمد صدرالدين، حسن عبدالله، لتيف حسن، كريم محمد، امين محمد، محمد على مجيد، رحيم على، سەردار انور، جبار انور سعيد، سەروەت انور، كريم محمد، امين محمد، رحيم على، محمد عمر احمد، حسين على محمد، مصطفى حسن محمد، ابراهيم احمد محمد، ئايار عبدالله جلال،

جمال جلال مصتفى، مدحت احمد امينن فامى صالح شريف، احمد عبدالله احمد، ابراهيم عبدالله صالح، على احمد صالح، لقمان مجيد محمد،حسن فتاح، ئەرەسو رشيد عبدالله، جمال عبدالقادر رشيد، نورى عبدالقادر شريف، نوزاد محمد حسن، رەمزان محمد حسن، فتح الله محمد حسن، عبدالله محمد حسن، نورى محمد على، نجم محمد على، حبيب محمد على، خورشيد محمد على، اكرام احمد جبار، نجم حسيب رشيد، اكرم كامل تاهر، كريم كامل تاهر، سعيد شكور عبدالله، حسن شكور عبدالله، شريف حسن عبدالله، عبدالله حسن عبدالله، على مجيد احمد، عبدالرحمن على عبدالرحمن، حسن بكر، غريب امين رسول، نورى حسين فتاح ، احمد محمد احمد، اسماعيل محمد احمد، عارف فرج عبدالرحمن، خورشيد مجيد، محمد نورى عزيز، سيد جبار محمد، على عسمان عبدالله، على مجيد احمد، احمد محمد بابا، حسين محمد، جمعه عبدالله، انور عبدالله، عمر عبدالرحمن، عسمان محمد، جانى باهر.

بۆ نوسینی ئەم بابەتە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


1. أحمد رشيد أحمد بيبانى ,كركوك الجريحه ,مطبعة وزارة الثقافة ,الطبعة الاولى ,سليمانية 2004,
2. هاشم ياسين حەمە أمين و سردار محمد عبدالرحمن و عدنان كركوكى ,أتلس كركوك , الطبعة الثانية ,أربيل ,2006
3. مێجەر ئی .بی سۆن ,چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو,وەرگێرانی نجاە عبدالله ,چاپخانەی شڤان ,سلێمانی ,2007
4. بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی تەکیەی جەباری ,2007/12/6
5. د.خلیل أسماعیل محمود ,جوگرافیای دانیشتوان ,جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق ,چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ,چاپی دووەم ,هەولێر ,1999
6. میدلٚ ئێست وۆچ ,جینۆساید لەعێراقدا پەلاری ئەنفال بۆ سەر کورد ,وەرگێرانی محمد صالح توفیق ,چاپخانەی تیشك ,سلیمانی ,2004
7.یوسف دزەیی,ئەنفال کارەسات ,دەرئەنجام و ڕەهەندەکانی
8. جاسم محمد محمد علی ,ئەنفالی گەرمیان ,چاپخانەی زانست ,چاپی یەکەم ,سلێمانی ,2002
9. بەختیار محمد و مزفر صالح ,ئەنفالی بناری گل ,گۆڤاری عەرعەر , ژمارە 3 ,2008
10. على نبى صالح دوسكى ,عمليات النفال فى كردستان عراق ,مطبعة حجى هاشم , طبعة الأولى ,أربيل ,2006

11. مەریوان وریاقانع ,ئەنفال ومۆدێرنە_ڕوداوێك لەدوامانەوە یان ئەگەرێك لەپێشمانەوە ,گۆڤاری ڕەهەند ,ژمارە7, 1999

12. جەزاتۆفیق تالب ,بایەخی جیوپۆلەتیکی دامیشتوانی هەرێم کوردستانی عێراق ,چاپخانەی دلێر ,چاپی یەکەم ,سلێمانی ,1999 13. عبدالله غفور , جوگرافیای دانیشتوانی کوردستان , ستۆکهۆڵم ,1994,لا13

14. لەتیف فاتح فرج , جینوسایدو کاڵبونەوە, چاپخانەی کارۆ,سلێمانی 2004

15. د.عبدالله غفور, پێکهاتەی نەتەوەی دانیشتوان لەباشوری کوردستاندا, چاپخانەی شڤان , سلێمانی , 2005

16. عدنان السید حسین, جوگرافیای (ئابووری _ دانیشتوان) جیهانی هاوچەرخ , وەرگێرانی فەرمان عبدالرحمن , محمد فاتح, دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم , سلێمانی , 2002

17. د.عبدالله غفور ,ئەتنۆ_دیمۆگرافیای باشوری کوردستان , سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی , چاپی دووەم , سلێمانی , 2000

# قەیران و شوناسی خێزان لە پەراوێزی ئەنفالدا

پشتیوان رەحیم

سەرەتایەكی پێویست

قوربانی بونەوەرێكی بیٚ شوناسە، قوربانیانی كوردیش بونەوەرێكی نەناسراون، بونەوەرێكە نە كەسایەتی خۆی دەناسیٚو نە كەسیش داوای خۆ ناساندنی لیٚدەكات، بەڵام دەبیٚت خۆی بناسیٚنیٚت، خۆی بناسیٚنیٚت وەك نە تەوەو وەك قوربانی، خۆناساندنیش واتای داننانە بەبونیٚكو بە تاكیٚك خاوەنی كەسایەتی بیٚت، بەڵام ئەم داوەریانە بۆ كەسی قوربانی كورد بیٚمانایە، بیٚمانایە نەك لەبەر ئەوەی قوربانیانی كورد پێویستی پیٚ نییە، بەڵكو لە بەر ئەوەی بۆ قوربانیانی كورد بە پێویست نازانریٚت.

بانگكردنی كەسیٚك واتای دان پیانانە بە بونیٚك، بە خشینی مانایە بە كەسیٚك، بڕوا پیٚكردنە بە شوناسیٚك، بە پیٚچەوانەشەوە بانگكردنی كەسیٚك بۆ مردن لیٚسەندنەوەی بوونە مرۆڤایەتییەكەیەتیو نەفی كردنیٚتی لە ژیان ئەودیوو كردنیٚتی بۆ سنوری نائامادەی.

كوشتنی بە كۆمەڵ ئەوەیە كەتاك تیایدا ونبدەبیٚتو (كۆ)ش دەبیٚتەسەروەر، ناو، ڕەنگ، روخسار، گەورەیی، بچوكی، ڕەگەز، پیرو منداڵ، ئەمانە هەموو پەیمانیان لەگەڵ ژیان كۆتا پیٚدەهیٚنریٚتو تیٚكرا یەك كەرنەڤاڵ دروست دەكەن، ئەویش رووبەروبونەوەی مردنیٚكی پیٚكەوەییە. ئالیٚرەدا مردن جۆرە مەراسیمیٚكی پیٚكەوەییە، كەكەس بوونی نییەو بۆی نییە لەو دوتوێیدا چارەنوسیٚكی باشتر یان خراپتری لەوی دی هەبیٚت، كەس نییە شوناسیٚكی تر وەربگریٚت، درەنگتر یاخود زوو تر بمریٚت، هەموو پیٚكەوە لەیەك كاتو لە یەك شویٚنو بەیەك فرمان دەكوژریٚن.

ئەنفالكراو ئەوكەسەیە لە زەمەنیٚكی دیاری كراو لە شویٚنیٚكی دیاری كراودا ئەژیا، ئەو كەسەیە ئەبوایە لە جیٚگەیەكدابیٚت كە سنوری مردنی بۆ كیٚشرا بوو، لیٚرەدا تۆتالیتارییەت زەمەنو شویٚن وشوناسی وئەو كەسانە دیاردەیەكات كە دەبیٚت ئەنفال بكریٚتو ئەو كەسانەشی كە (ئیٚستا) پێویست ناكات ئەنفال بكریٚن.

ئەنفال واقعیٚكی لەدوای خۆی بەجیٚهیٚشت كە دەبوایە كورد وەكو نەتەوە پیٚیدا تیٚپەڕیایەو دوچاری گەلیٚك كیٚشەی وەك كیٚشەی كۆمەڵایەتیو ئابوریو سایكۆلۆجیو ئەخلاقیو سیاسیو كلتووری بوایە، دەرئەنجامەكەشی لەدوای ڕاپەڕیندا ئەشیٚت زیاد لە مانایەكمان بداتیٚ.

بەعس ئەو ڕاستیەیی باش دەزانی كە ئەنفال كردەیەكی ماف داماڵینی مرۆڤەو هیچ یاسایەكی ئاسمانیو مرۆیی ئەم وەحشییەتە لە ناو دەستورییەكانیدا بیٚ سزای ئەنجامدەرانی جیٚناهیٚڵیٚت مەگەر یاساكانی بەعس نەبیٚت.

ئەنفال فرسەتی ئەوەمان بۆ دەڕەخسیٚنیٚت لە كاراكتەرو پیٚكهاتەی ئەو كیانە سەیرە بگەین كە ناوی دەوڵەتی عیٚراقەو ئەو دەسلاٚتەشی كە بەریٚوەبەرو حكومرانی بوو لەكاتی پرۆسەی شالاٚوەكانی ئەنفالدا. ئەنفال نیشانی ئەدات دەوڵەتی عیٚراق دەوڵەتیٚك نییە كە حكومی نەتەوەكانی بە یەكسانی بكات، دەوڵەتیٚكە تا سەر ئیٚسقان بیٚ توانایە لە دروستكردنی گەلیٚك

بەناوی گەلی عێراقییەوە یان لانی کەم لە دروستکردنی ئەو چوارچێوە گشتییەیی کە گروپە جیاجیاکان لە عێراقدا شوناسی خۆیانی تیا بپارێزن‌و وەك هاولاتی‌و وەکو نەتەوە ئەو فۆرمەی ئەیانەوێت لە ژیانی کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌و کەلتوری خۆیان ئەزموونی بکەن.

ناساندنی تاوانێکی وا گەورە بە ڕای گشتی جیهانی‌و پێشتر بە گەلی کوردستان‌و عێراق‌و باسکردنی ئاسەوارەکانی‌و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان‌و سود وەرگرتن لە تاوانەکە بۆ زیاتر بە نێودەوڵەتی کردنی دۆزی کوردو بەرەو پێشبردنی پرسە ڕەواکەی‌و پەردە هەڵماڵین لەسەر تاوانەکەو ڕیسوا کردنی تاوانباران، ئەرکی سەرشانی هەموانە، هەریەك بە پێی پێگەو پسپۆری خۆی. دیارە ئەم کارەش پێویستی بە چەندین کۆنفرانس‌و کۆنگرەی زانستی‌و توێژینەوەی پراکتیی‌و بەپێز هەیە.

بۆ وەرگرتنی زانیاری دروست‌و گەیشتن بە ئەنجامی راست لەم توێژینەوە مەیدانی یەدا، وەك نمونەی توێژینەوە (100)کەس وەرگیراوەو کۆمەڵگەی توێژینەوەکەش سنوری شاری سلێمانی‌و قەزای چەمچەماڵ‌و ناحییەی شۆڕش دەگرێتەوە، هەر کەسێکیش کە وەك نمونە وەرگیراوە هەوڵدراوە بەبێ ناوهێنان، ڕەگەزو تەمەن‌و باری خێزان‌و پلەی خوێندن‌و شوێنی نیشتەجێبونی بخرێتە روو. هەوڵیشدراوە ئەو کەسانەی کە وەك نمونە وەردەگرێن ڕەچاوی ئاستی خوێندنیان بکرێت لە پێناوی گەیشتنی راست‌و دروستی زانیارییەکان.

**خستنە ڕووی خشتەو داتاکان‌و شیکردنەوەیان**

**یەکەم: زانیاری گشتی توێژینەوەکە**

1-ڕەگەز:

**خشتەی ژمارە(1)**

**ڕەگەزی ئەو کەسانە دیاری ئەکات کەلە نمونەی لێکۆڵینەوەکەدا وەرمانگرتوە**

| ڕەگەز | ژمارە | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| مێ | 36 | ٪36 |
| نێر | 64 | ٪64 |
| کۆ | 100 | ٪100 |

لەم خشتەیەدا دەرئەکەوێت ژمارەی ئەو کەسانەی کە مێینەن و ئێمە لە نمونەی توێژینەوەکەدا وەرمانگرتووە ژمارەیان(36) مێینەیە، هەروەها ژمارەی ڕەگەزی نێر تیایدا (64)نێرینەیە.

2- تەمەن:

**خشتەی ژمارە (2)**

تەمەنی کەسەکانی ناو نمونەی توێژینوەکەمان بۆ روندەکاتەوە.

| تەمەن | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| 20–29 | 74 | ٪74 |
| 30–39 | 17 | ٪17 |
| 40–49 | 9 | ٪9 |
| کۆ | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیەدا تەمەنی کەسانی توێژینەوەکە ڕوون دەکاتەوە، دەرکەوتووە کە ژمارەی زۆری ئەو کەسانەی کەلە نمونەی توێژینەوەکەدا وەرمانگرتووە لە تەمەنی لاوێتیو پێگەیشتنی تەواودان، وە دەتوانن هەموو دیاردەکان بەشێوەیەکی ڕاستی لێکبدەنەوە.

3- باری خێزانی:

خشتەی ژمارە(3)

باری خێزانی کەسانی توێژینەوەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە

| باری خێزانی | ژمارە | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| خێزاندار | 21 | ٪21 |
| سەڵت | 78 | ٪78 |
| تاك مردوو | 1 | ٪1 |
| کۆ | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە دەر ئەکەوێت نمونەی توێژینەوەکە، زۆربەیان خێزانیان پێك نەهێناوەو نەچونەتە ژیانی هاوسەریەتییەوە، هەروەها ژمارەی تاك مردووتیایدا زۆر کەمە، هەروەها لەم خشتەیەدا بۆمان دەرئەکەوێت ژمارەی نمونەی توێژینەوەکەمان لە سەد کەس پێك هاتووە، ڕێژەی (78٪) سەڵتن‌و ڕێژەی (21٪) خێزاندارن‌و (1٪) تاك مردوون.

4- پلەی خوێندن:

خشتەی ژمارە (4)

پلەی خوێندنی نمونەی توێژینەوەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

| پلەی خوێندن | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| خوێندکاری زانکۆ | 62 | ٪62 |
| بەکالۆریۆس | 25 | ٪25 |
| ماستەر | 6 | ٪6 |
| دکتۆرا | 7 | ٪7 |
| کۆ | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە پلەکانی خوێندنی کەسەکانی نمونەی توێژینەوەکە پیشان دەدات، کە خۆمان بە شێوەیەکی مەبەستدارو ناهەرەمەکی ئەم پلانەمان دەست نیشان کردووە تاوەکو نمونەی توێژینەوەکە بە شێوەیەکی ڕاستو گونجاو دەربچێت، بۆیە بە گرنگمان زانی کەسەکانی نمونەی توێژینەوەکە هەڵبسەنگێنێن.

5–شوێنی نیشتەجێبوون.

خشتەی (5)

شوێنی نیشتەجێبونی نمونەی توێژینەوەکە ڕون دەکاتەوە

| شوێنی نیشتەجێوون | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| شار | 35 | ٪35 |
| قەزا | 44 | ٪44 |
| ناحیە | 15 | ٪15 |
| گوند | 6 | ٪6 |
| کۆ | 100 | ٪100 |

لەم خشتەیەی سەرەوە شوێنی نیشتەجێبونی نمونەی توێژینەوەکە ڕوون دەکاتەوە کە بەشێکی زۆری توێژینەوەکە دەکەوێتە قەزاکانەوەو پاشان شارو پاشان ناحیەو گوند. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەنفال کاریگەری لەسەر زیادبونی ژمارەی دانیشتوان لە شارەکانو قەزاکاندا دروستکردووە، بەهۆی وێرانکردنی گوندەکانەوە لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا.

دووەم: زانیاری تایبەت بەتوێژینەوەکە:

خشتەی ژمارە(6)

ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە ئایا پرۆسەی شالأوی ئەنفال،دەرهاویشتەی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعسە.یان دەرهاویشتەی بیری نەتەوەی عەرەبە بەرامبەر بەكورد؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدەی٪ |
|---|---|---|
| دەرهاویشتەی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعسە | 55 | ٪55 |
| دەرهاویشتەی بیری نەتەوەی عەرەبە | 15 | ٪15 |
| دەرهاویشتەی ئایدۆلۆژی حیزبی بەعەس‌و بیری نەتەوەی عەرەبە | 28 | ٪28 |
| هیچ كامیان | 2 | ٪2 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەكاتەوە كە ٪55 نموونەی توێژینەوەكە واتە لە نیوە زیاتر بڕوایان وایە كە پرۆسەی شالأوەكانی ئەنفال دەرهاویشتەی ئایدۆلۆژی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستن واتە ئەو ئایدۆلۆژیایەی حیزبی بەعس كاریگەری لەسەر تاكی عێراقی دروست كردووە بۆ ئەنجام دانی قركردنی نەتەوەی كورد و بێسەرو شوێنكردنیان، ٪15 نموونەی توێژینەوەكە بڕوایان وایە دەرهاویشتەی بیری نەتەوەی عەرەبە، واتە ئەگەر حیزبی بەعس لە عێراقدا نەبوایەو هەر حیزبێكی عەرەبی توندڕەو لە عێراقدا بوایە ئەوا پرۆسەكانی ئەنفال بەرانبەر كورد هەر دەكرا، ٪28 نموونەی توێژینەوەكە بڕوایان وایە پرۆسەی شالأوەكانی ئەنفال دەرهاویشتەی ئاوێتەبوونی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس‌و بیری نەتەوە پەرستی عەرەبە، ٪2 بڕوایان وایە كە هیچ كام لە ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس‌و بیری نەتەوەی عەرەب گاریگەری لەسەر پرۆسەی شالأوەكانی ئەنفال نییە، ئەمەش ڕێژەیەكی زۆر كەمە لەچاو ڕێژەكانی تری سەرەوە.

**خشتەی ژمارە(7)**

**ئەوە روون دەكاتەوە ئایا ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس  كاریگەری هەبووە لەسەر بزوتنەوە عەربییەكان بۆ دژو لەناوبردنی نەتەوەی كورد؟**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | 57 | ٪57 |
| تاڕادەیەك | 39 | ٪39 |

| | | |
|---|---|---|
| نەخێر | 4 | ٪4 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە ٪57 نموونەی توێژینەوەکە بڕوایان وایە کە ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس کاریگەری لەسەر تەواوی بزووتنەوە عەرەبییەکانی تر دروستکردووە دژو بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کورد، چ بزووتنەوە توندڕەوە شۆڤینییەکان‌و چ بزووتنەوە میانڕەوە عەرەبییەکان، ئەم بڕوایە ئەوە روون دەکاتەوە کە ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس وێنەیەکی ناشیرینی بۆ کورد بەرانبەر هەر بزووتنەوەیەکی عەرەبی درووستکردووە، ٪39 نموونەی توێژینەوەکەمان ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە تاڕادەیەك ئەم ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعسە کاریگەری لەسەر بزووتنەوە عەرەبییەکانی تر درووستکردووە دژو بۆ لەناوبردنی نەوەی کورد، واتە ٪96 نموونەی توێژینەوەکەمان کۆکن لەسەر کاریگەریە خراپەکانی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس لەسەر بزووتنەوە عەرەبییەکانی تر، ٪4 نموونەکەش بڕوایان وایە کە ئەم ئایدۆلۆژیایەی حیزبی بەعس هیچ کاریگەریەکی لەسەر هیچ بزووتنەوەیەکی عەرەبی درووست نەکردووە دژو بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کورد، ئەمەش لەچاو نموونەکانی پێشوو ڕێژەیەکی زۆر کەمە.

خشتەی ژمارە(8)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا هەڵبژاردنی ناوی سورەتێك لە قورئانی پیرۆز بۆ پەلاماری ئەنفال لەلایەن حیزبی بەعسەوە بەرامبەر بەکورد چ ئەگەیەنیٚ؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| حیزبی بەعس خۆی وەك‌و حێزبێکی ئیسلامی نیشان بدات | 17 | ٪17 |
| نەتەوەی کورد وەك نەتەوەیەکی لە دین دەرچوو نیشان بدات | 11 | ٪11 |
| شەرعییەتی ئیسلامی بدات بە پەلامارەکە | 23 | ٪23 |
| هەر سیٚ ئەگەرەکەی سەرەوە | 49 | ٪49 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ٪49 نموونەی توێژینەوەکەمان واتە زۆرینەیان بڕوایان وایە کە ناونانی شالاْوەکانی قڕکردن‌و لەناوبردنی نەتەوەی کورد بە سورەتێك لە لەسورەتەکانی قورئانی پیرۆز لە لایەن حیزبی بەعس‌و دەسلاْتدارانی ئەوکاتەی عێراقەوە بۆ ئەوەبووە کە

حیزبی بەعس خۆی وەك حیزبێکی ئیسلامی و نەتەوەی کورد وەك نەتەوەیەکی لەدین دەرچوو و پێدانی شەرعیەتیەکی ئیسلامی بە پەلامارەکانی ئەنفال بدات ئەمەش لەبەر ئەوەی جینۆسایدو قڕکردنەکانی نەتەوەی کورد کەمترین دەنگدانەوەی لەسەر ئاستی ئیسلامی و جیهانی لێ بکەوێتەوە، 23٪ نموونەکەش بڕوایان وایە کە ئەم ناونانە بۆ ئەوەبووە کە شەرعیەتێکی ئیسلامی بە پەلامارەکە بدات لە پێناو بێدەنگکردنی ولاّتە ئیسلامیەکاندا، 17٪ نموونەکەش بڕوایان وایە کە ئەم حیزبە خۆی وەك حیزبێکی ئیسلامی و درێژەدەری سوونەتە ئیسلامیەکان پیشان بدات، 11٪ نموونەکەش بڕوایان وایە کە ئەم ناونانە بۆ ئەوە بووە نەتەوەی کورد وەك نەتەوەیەکی لە دین دەرچوو و بێزراو بەرانبەر نەتەوەو ولاّتە ئیسلامیەکان پیشانبدات.

**خشتەی ژمارە (9)**

**ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا شالاّوی ئەنفال گۆڕانی لە شوناسی خێزاندا دروستکردووە؟**

| وەلاّم | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | 78 | ٪78 |
| تاڕادەیەك | 18 | ٪18 |
| نەخێر | 4 | ٪4 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیەی سەرەوە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە زۆربەی نموونەی توێژینەوەکە باوەڕیان وایە کە شالاّوی ئەنفال گۆڕانێکی زۆری لە شوناسی خێزاندا دروست کردوە، حیزبی بەعس لە کاتی پیادەکردنی شالاّوی ئەنفالدا ژمارەیەکی زۆری لە خێزانی کوردی لە شوێنی خۆیان ڕاگواستو دواتر سیاسەتی بە بەعەسکردنوبەعەرەب کردنی بەسەریاندا سەپاند، بەمەش گۆڕانی لە شوناسی خێزان دروستکرد.

**خشتەی ژمارە (10)**

**ئەوە دەخاتە ڕوو ئایا ئەنفال تا چ ڕادەیەك کاریگەری لە سەر ئابوری خێزانی خانەوادەی ئەنفالکراوەکان جێهێشتووە؟**

| وەلام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| زۆر | 91 | ٪91 |
| تاڕادەیەك | 7 | ٪7 |
| کەم | 2 | ٪2 |
| هیچ | 0 | ٪0 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە ڕووون دەکاتەوە،کە بەڕێژەی ٪91 بە زۆرو ٪7 بە تارادەیەك لە نمونەی توێژینەوەکە باوەڕیان وایە ئەنفال کاریگەرییەکی زۆری لە سەر ئابوری خێزانی خانەوادەیی ئەنفال کراوەکان جێهێشتووە ئەمەش لە چاو ٪2نموونەکە کە بڕوایان وایە ئەنفال کاریگەری لەسەر ئابوری خانەوادەی ئەنفالکراوەکان کەم جێهێشتووە ڕێژەیەکی زۆر زۆرە، کارەساتی ئەنفال جگە لەوەی هۆکارێك بوو بۆ قرکردنی نەتەوەیەك کە کوردە، کاریگەری زۆری هەبوولەسەر ئابوری وڵاتو خێزانی خانەوادەی ئەنفالکراوەکان، لە کاتێکدا خێزانی کورد لە گوندو لادێکانی خۆیان دەژیانو کشتوکاڵو ئاژەڵداریان دەکرد، بەردەوام بەرهەمیان هەبوو، حیزبی بەعس هات لادێکانی وێران کردو ئەو سەرچاوە ئابورییانەی کوێرکردەوە، ژمارەیەکی بەرچاوی لە پیاو ژنی کوردی کوشت، بەمەش دەستی کاری کەمکردەوە، وە خێزانی بەجێماوانی ئەنفالی بێسەر پەرشتی کردو ئیستاش لە بارێکی ئابوری نالەباردا دەژین .

خشتەی ژمارە(11)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا ئەنفال تا چ ڕادەیەك کێشەی کۆمەڵایەتی بۆ خێزانی خانەوادەی ئەنفال کراوەکان دروستکردووە؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| زۆر | 84 | ٪84 |
| تاڕادەیەك | 14 | ٪14 |
| کەم | 2 | ٪2 |
| هیچ | 0 | ٪0 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە ،کە 84٪ نمونەی توێژینەوەکە باوەڕیان وایە ئەنفال کێشەی کۆمەڵایەتی بۆ خێزانی خانەوادەی ئەنفالکراوەکان دروستکردوە، 14٪ی نمونەی توێژینەوەکە باوەڕیان وایە ئەنفال تا رادەیەك کێشەی کۆمەڵایەتی بۆ خانەوادەی ئەنفالکراوەکان دروست کردووە، 2٪ نموونەی توێژینەوەکەمان بڕوایان وایە ئەنفال کاریگەریەکی کەمی هەبووە لە درووستکردنی کێشەی کۆمەڵایەتی بۆ خانەوادەی ئەنفالکراوەکان، 0٪ نموونەکە بڕوایان وایە ئەنفال هیچ کاریگەریەکی لەسەر درووستکردنی کێشەی کۆمەڵایەتی نییە، کەواتە تێکرا بڕوایان وایە ئەنفال کاریگەری لەسەر درووستکردنی کێشەی کۆمەڵایەتی درووستکردووە، وەکو کێشەکانی قەیرەیی و زۆری ژمارەی بێوەژنی و هەڵوەشانەوەی خێزان و میرات.

**خشتەی ژمارە (12)**

**ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا پرۆسەی شاڵاوی ئەنفال تا چ ڕادەیەك نەخۆشی دەرونی لای خانەوادەی ئەنفالکراوەکان دروستکردووە؟**

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| زۆر | 73 | ٪73 |
| تاڕادەیەك | 25 | ٪25 |
| کەم | 2 | ٪2 |
| هیچ | 0 | ٪0 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە تێکرای نموونەکەمان بە ڕێژەی 73٪ بە زۆرو 25٪ بە تارادەیەكو 2٪ بە کەم بڕوایان وایە پرۆسەی شاڵاوەکانی ئەنفال بووەتە هۆی دروستبوونی نەخۆشی دەروونی لای خانەوادەی خێزانی ئەنفالکراوەکان، درووستبوونی ئەم نەخۆشیانە لەبەرئەنجامی چاوەڕوانی کەس‌وکارو باوكو دایكو ژنو مێردو کورو کچی ئەنفالکراوەکانو، هەروەها ئەو ئازاردانو ئیهانانەی کە بەسەر ئەوکەسانەدا هات کە لە نوگرەسەلمانو دبسدا لە بەندینخانەکاندا بۆ زیاتر چەند مانگێك بەندکران.

خشتەی ژمارە (13)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا شاڵاوی ئەنفال تا چەند کاریگەری لەسەر هەڵوەشاندنەوەی خێزان هەبووە؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| زۆر | 62 | ٪62 |
| تاڕادەیەك | 35 | ٪35 |
| کەم | 3 | ٪3 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە تێکرا بە 62٪ بە زۆرو 35٪ بە تارادەیەكو 3٪ بەکەم نموونەی توێژینەوەکە بڕوایان وایە ئەنفال کاریگەری لەسەر هەڵوەشاندنەوەی خێزان درووستکردووە، ئەمەش بە هۆی چارەسەر نەبوونی ئەو کێشە خێزانیانەی کە ئەنفال لە دوای

خۆی بە جێیهێشتوون، هەروەها لەبەر ئەنجامی ئەنفالکردنی کەسی یەکەمی خێزان کە پیاو بوو و پاشان نەتوانینی بە خێوکردنی خێزان لە لایەن هەندی لەو ئافرەتانەی کە لەدوای ئەنفالکردنی مێردەکانیان بەخێوکردنی خێزانیان کەوتبووە ئەستۆ.

خشتەی ژمارە (14)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا کارەساتی ئەنفال پرۆسەیەك بوو بۆ لە ناوبردنی نەتەوەی کورد بەمانا سیاسییەکەی و نەهێشتنی گشت سەرچاوە بژێوییەکانی؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
| --- | --- | --- |
| زۆر | 74 | ٪74 |
| تاڕادەیەك | 24 | ٪24 |
| کەم | 2 | ٪2 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تێکرا بە ڕێژەی 74٪ بە زۆرو 24٪ بە تارادەیەك‌و 2٪ بە کەم، بڕوایان وایە کارەساتی ئەنفال پرۆسەیەك بوو لە لایەن حیزبی بەعسی عەرەبییەوە دارێژرابوو بۆ لەناو بردنی نەتەوەی کوردو کەم کردنەوەی نفوزی کورد لە عێراقدا، هەروەها بڕواشیان وایە کە پرۆسەکە ئامانجی وێرانکردنی ژێرخانی ئابووری تێکدانی گشت سەرچاوە بژێویەکانی کوردستان بووە، ئەم ئامانجانەش دەکەوێتە چوار چێوەی یاسای گشتی جینۆسایدەوە, واتە ئەوەی لە پرۆسەی شاڵاوەکانی ئەنفالدا بەسەر نەتەوەی کوردا هات جینۆساید بوو.

خشتەی ژمارە (15)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا کورد توانیویێتی سوود لە دۆزی جینۆساید وەربگرێت بۆ ڕەوایەتی دان بە داوا نەتەوایەتییەکان؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | 14 | ٪14 |
| تاڕادەیەك | 50 | ٪50 |
| نەخێر | 36 | ٪36 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە نیوەی نموونەی توێژینەوەکە بڕوایان وایە کە کورد تا ڕادەیەك توانیویەتی سوود لە دۆزی جینۆسایدەکەی وەربگرێت بۆ ڕەوایەتی دان بە داوا نەتەوایەتیەکانی، ٪14 نموونەکەش بڕوایان وایە کورد بەڵێ توانیویەتی سوود لەو دۆزە وەربگرێت، ٪36 نموونەکەش بڕوایان وایە کە نەخێر کورد نەیتوانیوە سوود لەو دۆزە وەربگرێت، بە پێی ئەم خشتەیە بێت ٪86 نموونەکە بە نەخێر یان بەگومانەوە دەڵێن کورد سوودی لە دۆزەکەی وەرگرتووە، لە کاتێکدا زۆربەی گەلانی دنیا جینۆسایدی گەلەکەی دەکەن بە شوناسی ناساندنی خۆیان لەسەر ئاستی جیهان، هەروەها بەشێك لەو گەلانەی کە جینۆسایدکروان حەسانەیەکی نێودەوڵەتیان هەیە یان کیانێکی سەربەخۆیان لەبەرئەنجامی جینۆسایدەکەیان درووستکردووە، بەڵام کورد تا ئێستا نەیتوانیوە کاریکی لەو شێوە کارانە بکات.

خشتەی ژمارە (16)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا کورد هێندەی قورسایی ئەنفال گرنگی بە ئەنفال داوەو ناسویەتی؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | 7 | ٪7 |
| تاڕادەیەك | 30 | ٪30 |
| نەخێر | 63 | ٪63 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە ٪7 نموونەی توێژینەوەکە بڕوایان وایە کە کورد هێندەی قورسایی کارەساتەکە ئەنفالی ناسیوەو گرنگیشی پێداوە ئەم ڕێژەیە ڕێژەیەکی زۆر کەمە لەچاو ڕێژەی نموونەی توێژینەوەکەمان، ٪63 بە ڕەهایی بەنەخێرو ٪30 بەگومانەوە بڕوایان وایە کە کورد هێندەی قورسایی کارەساتەکە ئەنفالی ناسیبێت، ئەم ڕێژە زۆرە واتە ٪93 ئەوە دەگەیەنێت

کە هێشتا کورد نەگەشتووەتە ئەو تێگەیشتنە سیاسی و مەعریفیەی کە پێویستە بەرامبەر بە ئەنفال بگات، کورد لەدوای بیست ساڵ لە پرۆسەی شاڵاوەکانی ئەنفال هێشتا خوێندنەوەی گشتگیرو هەمەلایەنی بۆ تەواوی ڕەهەندەکان نیە کە ئەنفال کۆی کردووەتەوە، تا هێندەی قورسایی کارەساتی ئەنفال کورد لە ئەنفال نەگات مەحاڵە بتوانێت بیکاتە دۆزێك بۆ ناسنامەی نەتەوەکەی.

خشتەی ژمارە (17)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا حکومەتی کوردی وەك و پێویست گرنگی بە خانەوادەی ئەنفالکراوەکان داوە؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | 1 | ٪1 |
| تاڕادەیەك | 43 | ٪43 |
| نەخێر | 56 | ٪56 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە نیوەی زیاتری نموونەکەم بڕوایان وایە کە حکومەتی کوردی لە دوای حەڤدەساڵ ئەزموونی حکومرانی نەیتوانیوە وەکو پێویست خزمەتی خانەوادەی ئەنفالکراوەکان بکات، ٪43 نموونەکەش بە گومانەوە بڕوایان وایە کە حکوومەتی کوردی خزمەتی پێویستی خانەوادەی ئەنفالکراوەکانی کردووە، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ڕێژەیەکی زۆر زۆری نموونەی توێژینەوەکە واتە ٪99 بڕوایان وایە کە ئەو خزمەتەی کە حکووتی کوردی کردوویەتی لەو ماوەیەدا بە پێی پێویستی خانەوادەی ئەنفالکراوەکان نییە، ٪1 نمونەکەشمان بڕوایان وایە کە خزمەتەکانی حکوومەتی کوردی بە پێی پێویستی خانەوادەکانن، دەبوایە لەدوای ڕاپەڕین و خۆماڵی کردنی دەزگاکان و ئابووری کوردستان حکومەت خزمەتێکی بەرچاوی وەکو قەرەبوویەکی ماددی و مەعنەوی بۆ خانەوادەکان بکردبایە، هەروەها دەبوایە بەشێك لەو بودجەیەی کە حکومەت هەیەتی لە پێناو خزمەت و قەرەبووی کەس وکاری ئەنفالکراوەکان تەرخان بکرایە.

خشتەی ژمارە (18)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا دەسەڵاتی کوردی توانیوێتی لە سەر ئاستی تیوری و پراکتیکی مامەڵەیەکی زانستی لەگەڵ ئەنفالدا بکات؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | 2 | ٪2 |
| تاڕادەیەك | 39 | ٪39 |
| نەخێر | 59 | ٪59 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە ٪2 نموونەکە بڕوایان وایە کە کورد توانیویەتی لەسەر هەردوو ئاستی تیۆری و پراکتیکی مامەڵەیەکی زانستی لەگەڵ ئەنفالدا بکات ئەمەش بەرانبەر ڕێژەی ٪59 بە نەخێرو ٪39 بە تاڕادەیەك بڕوایان وایە کورد ئەو مامەڵە زانستییەی کردووە، لەکۆی نموونەی توێژینەوەکە ٪98 بە رەهای بە نەخێرو بە گومانەوە بڕوایان وایە کورد ئەو مامەڵە زانستییەی کردبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کورد هێشتا بە شێوەیەکی زانستیو ئەکادیمیو بە دەزگایکردن ئەو مامەڵەیەی لەگەڵ مێژووی ئەنفالو ژمارەی ئەنفالکراوەکانو سنووری جوگرافی شاڵاوەکانی ئەنفالو هۆکارو دەرئەنجامە زۆرخراپەکانی ئەنفالدا نەکردووە، هەروەها کورد تا ئێستا لە دوای بیست ساڵ بەسەر مێژووی شاڵاوەکانی ئەنفالو حەڤدەساڵ لە حکومرانی خۆیی نەیتوانیوە ببێتە خاوەنی دەزگایەکی گەورەی توێژینەوەو خاوەنی دەزگایەکی زانستی گەورەی ئەرشیفکردن نییە.

خشتەی ژمارە (19)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا ئەنفال ئەوەندە ناسنامەیەك (شوناس)ێکی حیزبی وەرگرتووە، ئەوەندە شوناسێکی نەتەوایەتی وەرنەگرتووە؟

| وەڵام | ژمارە | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|

| | | |
|---|---|---|
| بەڵێ | 37 | ٪37 |
| تارادەیەک | 44 | ٪44 |
| نەخێر | 19 | ٪19 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە رێژەی 37٪ نموونەی توێژینەوەکە بە رەهایی بڕوایان وایە ئەنفال ناسنامەیەکی حیزبی وەرگرتووە هەروەها 44٪ نموونەکەش بە گومانەوە بڕوایان وایە کە ئەنفال ناسنامەیەکی نەتەوەیی وەرگرتووە تا ناسنامەیەکی حیزبی، ئەمەش بەرامبەر 19٪ نموونەکە کە بروایان وایە ئەنفال بە رەهایی بەڵێ ناسنامەیەکی نەتەوەیی وەرگرتووە، لەم خشتەیەدا رێژەیەکی زۆر واتە 81٪ چ بە رەهایو چ بە گومانەوە بڕوایان وایە ئەنفال سوناسێکی حیزبی وەرگرتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کورد لەسەر ئاستی نەتەوەیی ئەنفال بە تراژیدیای خۆی نابینێت، بەڵکو وێنەیەکی وا دروست بووە کە ئەنفال وەکو تراژیدیای حیزب ببینرێت، ئەم شێوە لێکدانەوەیە لای خەڵک قەیرانەکانی ئەنفال لە قەیرانێکی نەتەوەیی گەورەوە لەسەر ئاستی نەتەوەی کورد لە هەر چوار پارچەکەدا بچووک کردووەتەوە بۆ قەیرانێکی حیزبی لەسەر ئاستی چەند حیزبێکی باشووری کوردستان.

خشتەی ژمارە (20)

ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئایا لە سایکۆلۆژیای تاکی کوردی دا ترسی دوبارە بونەوەی ئەنفالێکی تر ئامادەیە؟

| وەڵام | ژمارە | رێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | 23 | ٪23 |
| تارادەیەک | 37 | ٪37 |
| نەخێر | 40 | ٪40 |
| سەرجەم | 100 | ٪100 |

ئەم خشتەیە ئەوەم ڕوون دەکاتەوە کە 23٪ نموونەکە بروایان وایە لە سایکۆلۆژیای تاکی کورددا ئەگەری دووبارەبوونەوەی ئەنفالێکی تر ئامادەیە، 37٪ نموونەکەش تارادەیەکو بە گومانەوە بروایان بە دووبارەبوونەوەی ئەنفالێکی تر هەیە، ئەمەش بەرامبەر بە 40٪ نموونەکەمانە کە بروایان وایە ئەنفالێکی تر بە رێگاوە نییەو ترسی دووبارە بوونەوەی ئەنفال لە

گۆڕێ نییە، لەم خشتەیەدا بە رێژەی 60٪ نموونەکە چ بە رەهایی و چ بە گوومانەوە ترسی دووبارەبوونەوەی ئەنفالێکی تر لە سایکۆلۆژیاندا ئامادەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کورد تاکو ئێستا هیچ گەرەنتیەکی وا شك نابات کە رێگر بێت لە دووبارەبوونەوەی ئەنفال و هەر قرکردنێکی تر بەهەر ناوێکەوە بێت، بڕوای کەسەکانی نێو ئەم خشتەیە لەکاتێکدا وەرگیراوە کە کورد بەشدارە لە دەسەلاتی مەرکەزی عێراقدا سەرەرای ئەم بەشداریەش هێشتا ترسی ئەنفال سایکۆلۆژیایانی داگیرکردووە.

## دەرئە نجامە گشتیەکانی توێژینەوەکە

1- لەوەتەی حیزبی بەعس رکێفی دەسەلاتی لە عێراق وەرگرتووە، بەکردەوە هەوڵی قرکردنی کوردی داوەو لە پێناوەشدا نەخشەو پلانی کاریگەری دارشتووەو لە شارەگی گەشەکردنی هێزی مرۆیی داوە.

2- ئۆپراسیۆنەکانی ئەنفال و ئەو تاوانانەی تیایدا ئەنجامدرا تائێستا وەك پێویست بایەخیان پێنەدراوەو نەبووەتە بابەتێکی سەرەکی و لێکۆڵینەوە زانستییەکان و پرۆگرامەکانی خوێندن.

3- بیری ناسۆنالیزمی رەگەزپەرستی بالادەست رۆلێکی زۆری بینیوە بۆ زەمینە خۆشکردن بۆ کارەساتی ئەنفال، بۆیە دەبێت بزاڤی سیاسی و رۆشنبیرانی کوردوهەموو هێزە دیموکراتییەکان خەباتێکی سەخت لەدژی ئەو ئایدۆلۆژیایە بگرنە بەرو رێگە نەدەن لە عێراقدا هیچ پێگەوجێگەیان هەبێت.

4- لە ئەنجامی ئەم توێژنەوەی ئێمەدا گەشتینە ئەوەی پرۆسەی شالاوی ئەنفال دەرهاویشتەی ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس وبیری نەتەوەی عەرەبە.

5- ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعس، کاریگەری لەسەر بزوتنەوە عەرەبیەکانی تر دروستکردوە دژو بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کورد.

6-هەڵبژاردنی ناوی سورەتێك لە قورئانی پیرۆز بۆ پەلاماری ئەنفال لە لایەن حیزبی بەعسەوە بۆ ئەوە بوو کە حیزبی بەعس خۆی وەك و حیزبێکی ئیسلامی نیشان بدات و وە نەتەوەی کورد وەك و نەتەوەیەکی لە دین دەرچوو نیشان بدات و وە شەرعیەتی ئیسلامی بداتە پاڵ پەلامارەکە.

7- 91٪ نمونەی توێژینەوەکە باوەڕیان وایە، کارەساتی ئەنفال بە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئابوری نەتەوەی کوردو خانەوادەی ئەنفالکراوەکان جێهێشتووە، کە زۆربەی سەرچاوە ئابورییەکانی ئەو ناوچانەی بەر پەلامارەکە کەوتن لە ناوی بردو سامانی کشتوکاڵی ئاژەڵداری لادێکانی کوێر کردەوەو، کە تا ئێستاش ئەو کاریگەرییە لەسەر خێزانی خانەوادەی ئەنفال کراوەکان ماوە.

8- لە ئەنجامی توێژینەوەکەدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە کارەساتی ئەنفال کێشەی کۆمەڵایەتی زۆری بۆ خانەوادەی ئەنفالکراوەکان دروست کردووەو 84٪ نمونەی توێژینەوەکە

ئەو باوەڕەیان هەیە، کەواتە بەجێماوانی ئەنفال بەردەوام لە کێشەو قەیرانی کۆمەڵایەتیدان بەبێ ئەوەی دەزگایەکی کۆمەڵایەتی یا خود لایەنێکی بەر پرس هەڵبدات بۆ کەمکردنەوەی ئەو کێشە کۆمەڵایەتیان.

9 – تێکرا بە ڕێژەی 74٪ بە زۆرو 24٪ بە تارادەیەك بڕوایان وایە کارەساتی کارەساتی ئەنفال پرۆسەیەك بوو لە لایەن حیزبی بەعسی عەرەبییەوە داڕێژرابوو بۆ لەناو بردنی نەتەوەی کوردو کەم کردنەوەی نفوزی کورد لە عێراقدا، هەروەها بڕواشیان وایە کە پرۆسەکە ئامانجی وێرانکردنی ژێرخانی ئابووری تێکدانی گشت سەرچاوە بژێویەکانی کوردستان بووە، ئەم ئامانجانەش دەکەوێتە چوار چێوەی یاسای گشتی جینۆسایدەوە, واتە ئەوەی لە پرۆسەی شالأوەکانی ئەنفالدا بەسەر نەتەوەی کوردا هات جینۆساید بوو.

10– 93٪ نمونەی توێژینەوەکە ئەوە دەگەیەنێت کە هێشتا کورد نەگەشتووەتە ئەو تێگەیشتنە سیاسیو مەعریفیەی کە پێویستە بەرامبەر بە ئەنفال بگات، لێرەدا گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی کە کورد لەدوای بیست ساڵ لە پرۆسەی شالأوەکانی ئەنفال هێشتا خوێندنەوەی گشتگیرو هەمەلایەنی بۆ تەواوی ڕەهەندەکان نیە کە ئەنفال کۆی کردووەتەوە، تا هێندەی قورسایی کارەساتی ئەنفال کورد لە ئەنفال نەگات مەحاڵە بتوانێت بیکاتە دۆزێك بۆ ناسنامەی نەتەوەکەی.

# گاریگەری شالأوەکانی ئەنفال لەسەر چۆڵبوونی لادێکانی سەنگاو

توێژەران: فەرهاد عبدالرحمن و كرمانج شێرزاد

**كورتەيەكی مێژووی و جوگرافی لەسەر ناوچەی سەنگاو**

ناحيەی سەنگاو لە (92) گوندێك هاتووە، كە سەر بە قەزای چەمچەماڵەو سەر بە پارێزگای كەركوكە دەكەوێتە باشووری ڕۆژئاوای هەرێمی كوردستانەوە، لەساڵی (1882)ز كوڕانی شێخ حەمە صالح شێخ قادری قازان قايە لەگەڵ چەند ماڵێكی كەم دروستيان كردووە، لەسەردەمی دەسەلأتی گەشەكردنی بابانەكاندا سەنگاو لەگەڵ شارەكانی (كفری وخورماتو و زەنگابات) لە ژێر فەرمانڕەوای بابان بووە، سەنگاو لە ساڵانی(929–930)سەر بەقەزای گل بووە ئەمە لە كاتی فراوان بوونی دەسەلأتی عوسمانيداو لە پێش هاتنی سوپای ئينگليزدا بووە لەو زەمەنەدا شارۆچكەی چەمچەماڵ سيفەتێكی ئيداری نەبووە سەر بە قەزای بازيان بووە هەر ئەو سەردەمە قەزای (گل) ناوەندەكەی لە قادركەرەم پاشان گوازراوەتەوە بۆ (داقوق) كە سەر بەكەركوك بووە پاشان لەساڵی (1955)دا گوندی گۆپتەپە ناوەندی ناحيە بووە لەوكاتەوە سەر بە پارێزگای كەركوك بووە، بەم شێوەيە سەنگاو يەكێك بووە لە ناحيەكانی ليوای كەركوك، بەلأم ڕژێم بەپێی فەرمانی ژمارە (608) لە (1975/11/6)دا قەزای چەمچەماڵ بە هەردوو ناحيەی (ئاغجەلەروسەنگاو)ـەوە خرايە سەر پارێزگای سلێمانیو لەشاری كەركوك دابڕا هەتاوەكو ئەنفال سنووری ناوچەكە(3)كم$^2$ بووە بەلأم دوای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی شارەوانييەكان سنوورەكەی فراوان بووە بۆ (5)كم$^2$ ناوچەی سەنگاو چەندين شوێنەواری ئەشكەوتی كۆنی مێژووی تێدايە كە ئەوەش بەڵگەيە بۆ ئەوەی كە ئەم ناوچەيە لەكۆندا دانيشتووانی هەبووەو مرۆڤی تێدا ژياوە ئەمەش بەبوونی بەڵگەی شوێنەواری لەناوچەكەدا كە هەرچەندە مێژووەكەيان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێكی كۆن بەلأم هەموو بەڵگەكان ئەوە ڕون دەكەنەوە كە ژيان هەبووە لە سەردەمانی كۆندا لەناوچەی سەنگاو كە هەندێ لە دانيشتوانەكەی دەڵێن تاوەكو ئێستا هەندێ شتی وەك (لەتە سوڵە + پارچە گۆزە + دراو + كانزا + سەرە نێزە) لەو شوێنانەدا دۆزراوەتەوە، بەگشتی ناوچەی سەنگاو چەند ئاسەوارێكی مێژووی تێدايە لەوانە (قەلأی) كەگرويێكی تورەكە ڕێژە چەندين پاشماوەی تێدا دۆزراوەتەوە كە ئەكەوێتە بەشی باشووری خۆرهەلأتی گوندی (ڕێ ڕەشە)ـەوە، هەروەها چەندين شوێنەواری تری وەك (ئەشكەوتی بێژنگ بەسەر و سەرچاوەی ئاوە سپی، ئەشكەوتی سمايلە، قەبرسانی گردە قەلأ، قەلأ بەردينە، گاوری وكيلەشين ....هتد

شوێن و ڕووبەر

سەنگاو يەكێكە لە ناحيەكانی ليوای كەركوك كە سنووری لە ڕۆژهەلأتەوە بە ناحيەی قەرەداخی ليوای سلێمانی و لە ڕۆژ ئاواشەوە بە ناحيەی قادركەرەمی قەزای دوزەوەيە، لەباكورو باكوری ڕۆژهەلأتيشەوە ليوای سلێمانیو ناوەندی قەزای چەمچەماڵە، لە باشورو باشووری ڕۆژئاواشەوە سنووری ناحيەی بێبازی (قەزای كفری)يەوەيە.

هەروەها لەباکورەوە چەمی باسەرە سەنگاولەناوچەی هەمەوەند جیادەکاتەوە. سەبارەت بەشوێنی ئەسترۆنۆمی سەنگاودەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی(54.4–35.99)ی باکوری هێڵی یەکسانیەوە دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی درێژی (35.44–44.08)ی هێڵی گرینیشەوە لەخۆرهەلآتەوە، درێژبوونەوەی سەنگاو لە باکورەوە گوندی(تەپەسوورە)و ئەوپەڕی باشووری




گوندی(مەسۆی بەرگەچ)ە، لەڕۆژهەلآتەوە گوندی (تیلە بەرزە)یەو لە ڕۆژئاواوە گوندی (مەملەحە)ـیە هەروەها سنوورەکەی کەوتۆتە دوری 49کم، لەباشووری شاری چەمچەماڵەوە، ڕووبەری شارۆچکەکە بەسەرجەم سنورەکەیەوە (833)کم$^2$ یە، لە کۆی ڕوبەری قەزای چەمچەماڵ کە (2376) کم2 یە، بەلآم ڕوبەری پارێزگای کەرکوک (20013)کم$^2$ یە، بەم پێیە ڕێژەی ڕوبەری پارێزگای کەرکوکو ڕێژەی (11.5٪)ی قەزای چەمچەماڵ بەم شێوەیە ڕوبەری سەنگاو دەگاتە (4.1٪) لە کۆی گشتی ڕوبەری پارێزگای کەرکوک.

### ئەنفال لای کورد

قسە کردن لەسەر ئەنفال قسە کردنە لەسەر کاری گەورەترین برینی جەستەیی کورد، هەروەها ئەنفال گەورەترین پرۆسەی سەربازیو سیاسی یە بەلایەنی کەمەوە لەسەدەی بیستەمدا بۆ لەناوبردنو سەرکوتکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو سڕینەوەی شوێنەواری کەلەپوریو کەلتوریو ئەنتۆگرافیو دیموگرافی گەلی کورد ئەنجامدرا ئەم پەلامارەش سەرجەم ناوچە گوندنشینەکانی گرتەوە کە بووە هۆی ڕووخانی هەموو گوندەکانی کوردستان و بێ سەرو شوێنکردنی زیاتر لە (182) هەزار مرۆڤی بێتاوانی کورد، ئەنفال کارەساتێکی سروشتی نەبوو، بوومە لەرزەو بورکانو نەخۆشی تاعونو لافاو و ئاگر نەبوو، بەڵکو بەری سیاسەتی قڕکردنی دەیان هەزار مرۆڤی کورد بوو لەسەر خاکی خۆی، ئەنفال ناشرینترین پرۆژەی دژ

بەمرۆڤایەتی بوو کە لە فیکرو سیاسەتی بەعسدا گەیشتۆتە لوتکەو بەسەر گەلی کورد لە کوردستانی عێراقدا بەرجەستە کراوە.

**ئەنفالی سێ و هێرش بۆ سەر گەرمیان**

گەرمیان دەشتێکی فراوانەو هاوسنوورە لەگەڵ ناوچە عەرەب نشینەکانی عێراق لە ڕۆژئاوای ڕێگای دوزخورماتوو کەرکوك لە باکورەوە ڕێگای کەرکوك چەمچەماڵەو لە ڕۆژهەلاٚتیشەوە چیاکانی قەرەداغەو لەباشوریشەوە هەر سێ شارۆچکەی (کەلار–کفری–پێبان)ـە کەناحیەی قادرکەرەم چەقی جوگرافیەکەیەتی، لە (4/7)دا پەلاماری ناوچەکانی گەرمیان دراو لەم قۆناغەدا زۆرترین ژمارەی هاولاٚتی لە ژن و منداڵ دەسگیرکران، شالاٚوەکان بۆ سەرناوچەی گەرمیان بەسێ پلان ئەنجام درا:

1- پلانی پەلاماری دوزخورماتوو: بەرەبەیانی ڕۆژی (7)ـی نیسان هێزەکانی سوپاو جاش کەوتنە جموجۆڵ لەبنکەکانیانەوە کە لەدوزخورماتووی باشووری ڕۆژئاوای گەرمیان بوو بە سێ بەش.

یەکەمیان: بۆ باشووری ڕۆژهەلاٚت لە شارۆچکەی نەوجولەوە بەرەو چەمی ئاوە سپی.

دووەمیان: هێزێکی هاوبەشی گەورەتر بوو کە بەرەو ڕۆژهەلاٚت پێشڕەوی دەکرد.

سێ یەمیان: ئەو هێزە هاوبەشەی کە پەلاماری تازە شاری دا کە گوندێکی ستراتیجی گرنگ بوو لەبەر ئەوەی نزیکی ڕێگای نێوان دوزخورماتوو قادرکەرەم بوو.

2- پلانی پەلاماری قادرکەرەم: ئەم پەلامارە لەبەرواری(1988/4/10)هێزی تایبەتی ڕژێم گەیشتە قادرکەرەم ئەم هێرشە بەسەرپەرشتی عەمیدی هێزی تایبەت (بارق عبداللە حاج حنتە)بوو کە فەرماندەی گشتی ئەنفالی سێ بوو.

**پلانی پەلاماری سەنگاو باشووری گەرمیان**

**ئەم پەلامارە بە چوار هێرش دەستی پێکرد**

**هێرشی یەکەم**

لەسەنگاوەوە دەستی پێدەکات بە ئاراستەی ڕۆژئاوا بەرەو شارۆژکەی دەربەندیخان

**هێرشی دووەم**

ئەم پەلامارە لە شارۆچکەی کفری یەوە لە (9)ـی نیسان کەوتە ڕێ بەسەر کردایەتی لیوا (سامی) سەر بەفەیلەقی یەك سەرجەم گوندەکانی ئەو ناوچەیان ڕوخاند و خەڵکەکەشیان دەسگیر کرد .

**هێرشی سێ یەم**

لە (1988/4/9) لەشارۆچکەی کەلارەوە کە بەهێزێکی دیکە بە ئاراستەی باکور هێرشی کردە سەر ناوچەکانی ناحیەی تیلەکۆ.

**هێرشی چوارەم**

لە ناحیەی پێبازەوە بە ئاراستەی باکور هێزەکە پێشڕەوی کرد و گوندی (شێخ تەویل) وێران کرد

**چۆنێتی هێرش کردنە سەر سەنگاو گوندەکانی سنووری سەنگاو**

سەنگاو کەوتۆتە ڕۆژئاوای ناحیەی قەرەداخو ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی قادرکەرەمو باشووری شارۆچکەی چەمچەماڵ و لە باکوریشەوە شارۆچکەی پێبازە، لە (4/9)دا کاتێك هێرش دەستی پێکرد بەرەو سەنگاو لە چەمەچماڵەوە کە ئەمە سەرەتای پلانی نەخشە بۆ کێشراوی ئەنفالکردنی ئاوچەی سەنگاو و گوندەکانی ئەو سنوورە دەردەخات هەرچەندە کە ڕژێم پێشتر هەوڵی دروست کردنی ئۆردوگاکانی دابوو بۆ نیشتەجێ کردنو خستنە ژێر چاودێری گوندنشینەکان و ڕێگرتن لە هەرکارێك کە خۆی مەبەستی نەبێت و لەگەڵ بەرژەوەندی ڕژێمەکەیدا نەگونجێت، وەك ئاشکرایە ڕژێم لەچەند قۆڵێکەوە پەلامارەکانی خۆی بۆ سەر گەرمیان دەست پێکرد کە پێشتر ئاماژەمان پێکردووە بەڵام لێرەدا ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە لە چەند قۆڵێکەوە هێرش کرایە سەر سەنگاو گوندەکانی سنوورەکە کە لە پێنج قۆڵەوەیە وا لێرەدا ئاراستەو قۆڵەکان دەخەینەڕوو . ئەمەش بە هۆی گرنگی شوێنی سەنگاوەوە بۆ لەسەر ناوچەکە سەنگاو بوو بووە بارگای جولانەوەی هێزەکانی دوژمن بۆ سەر خۆر ئاوای گەرمیانو لەوێوە کشان بەرەو قەرەداخو دێهاتەکانی تری بناری سەنگاوئاشداخ.

**هێرش بۆ سەر سەنگاو**

قۆڵی یەکەم:- لەسەنگاوەوە بۆ قەیتول.

قۆڵی دووەم:- لەسەنگاوەوە بۆ گەڕاوی.

قۆڵی سێ یەم:- لەسەنگاوەوە بۆ سەر شاخی بەندەق.

قۆڵی چوارەم:- لەسەنگاوەوە بەرەو شاخی باجگە بە ڕێگای گوندی هەنارەدا.

قۆڵی پێنجەم:- لە سەنگاوەوە بەرەو کلکەی شاخی ئاشداخ کە ئەم قۆڵەیان ڕژێم بە تەواوی هێز و پاڵپشتی فڕۆکەو جۆرەکانی تۆپەوە پەلاماری دا پێشمەرگەو هێزی پشتگیری سنوورەکە ماوەی سێ ڕۆژو شەو بەردەوام بە هێزی داگیرکەرو چەندین مەردانەیان نواند بەرامبەر بە هێزی داگیر کەرو چەندین هێزی دوژمنیان تێك شکاندو کوژراو بریندارى زۆریان لەمەیدانی شەڕدا پێ بەجێ هێشتن بەڵام دواجار پاش کۆکردنەوەی هێزی زۆرترو ئابلۆقە دانی سنورەکە لە هەموو لایەکەوە توانی بەسەر نەخشە گلاۆەکەیدا زاڵ بێت بە کۆنترۆڵ کردنی ئەو شاخەش ڕژێم بە تەواوی بەشێکی زۆری سنووری سەنگاودا زاڵ بوو چونکە بە هەردوو دیوی شاخەکەدا گوند بوو، بۆ ڕونکردنەوەی باسەکەمان بڕوانە نەخشەی ژمارە.

**بارودۆی گوندەکانی سەنگاو لە پێش ئەنفالدا**

سەنگاو لە پێش پەلاماوەکانی ئەنفالدا بۆ سەر گوندەکانی گوندە ئاوادانەکانی ژمارەیان (99) گوند بوو کە هەموویان ئاوەدانبوون وژیانی لادێ نشینی خۆیان کە کشتوکاڵ و ئاژەڵ داری بوو بەسەر دەکرد، کە کۆی دانیشتوانی ناوچەکە لە پێش ئەنفالدا (29360) کەس بووە کە لەو

ڕێژەیە (14921) کەسیان لە ڕەگەزی نێر بوو ژمارەکەی تریشیان کە دەگاتە (14439) کەس لە ڕەگەزی مێ بووە، کە ئەم ژمارەیەی دانیشتووان لەو سەردەمەدا دابەش بوو بوون بەسەر (2000) خێزاندا، بەشێوەیەکی گشتی دانیشتووانی گەرمیان بە کاری کشتووکاڵ و مەڕومالاَت و ڕەشە ولاَخ بەخێوکردنەوە خەریکن، ئەم ناوچەیە بە بڕبڕەی پشتی ئابووری هەرێمی کوردستان دادەنرێت چونکە زۆربەی چاڵە نەوتەکانی هەرێم دەکەونە چوار چێوەی ئەم ناوچەیەوە هەر لەبەر ئەم هۆیەش حکومەتی بەغدا زۆرترین زیانی لە تەعریب و ئەنفال و ڕاگواستن بەم ناوچەیە گەیاندوەو بەشێکی زۆری باشووری ئەم هەرێمە هەر لەسەردەمانێکی زوەوە تەعریب کراوە و دانیشتووانە ڕەسەنەکەی ڕیشە کێش کراون، لادێکانی سەنگاو زیاتر لەسەر بنەمای خزمایەتی دروست بووە کە بەشێوەیەکی زۆر نزیك لەیەکتر خانوەکانیان دروست کردووە کە ئەمەش زیاتر خانوەکان هی براو مام و خزمە نزیکەکانی ترە ئەمەش زۆر جار لەگەڵ زۆربونی دانیشتووان یان لەبەر ناکۆکی گوندێ کی تر لە نزیك گوندە کۆنەکە دروست دەکەن کە هەمان ناو یان ناوی ئەو کەسەی کە گوندەکەی دروست کردووە لێ دەنێ، لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە کراوە لەسەر بارودۆخی گوندەکان پێش ئەنفال کە کوردستان زۆر جوانو ئارام بووە ئەمە ئەوە دەردەخات کە کوردستان زۆر خۆش و ئارام بووە لە پێش ئەنفالدا، هەرچەند بارودۆخی لادێکان پێش ئەنفال بەتەواوی جێگیر نەبوو کەحکومەتی عێراق لەپێش ئەنفالدا چەندجار لادێکانی سوتاندووەو روخاندویەتی، بەلاَم هیچ کام لەمانە نەبوونە هۆی چۆڵ بوونی لادێکانی کوردستان، بە جۆرێك کەدوای سووتاندنو ڕوخاندنی خەڵکی لادێکان دەگەڕانەوە سەر زێدی خۆیانو دووبارە لادێکانیان ئاوەدان دەکردەوە و ژیانی ئاسای خۆیان دەست پێدەکردەوە لادێ نشینەکان بەکاری کشتوکاڵ و ئاژەڵ داری یەوە خەریك بوون بە شێوەیەك کە سەرچاوەی بژێوی گوندەکان بوو، ئەو بەروبوومانەی کە لە لادێ کاندا بەرهەم دەهاتن بەشی خۆیان لێ هەڵدەگرتو زیادەکەشیان دەنارده بازاڕەکان بۆ فرۆشتنو بەمەش خەڵکی شارەکان سوود مەند دەبوون لەوبەرو بوومە خۆماڵیەی کە لە لادێ کانەوە دەگەیشتنە بازاڕی شارەکان، لادێ کان ژمارەیەکی زۆر خانووی تێدا بوو کە خەڵکی لەگەڵ کەش و هەوای لادێ نشینی خۆیان ڕاهاتبوون بە شێوەیەك کە ژیانی لادێ ی یان زۆر لە ژیانی شارنشینی لا خۆشتر بوو چونکە لادێ کان ژینگەیەکی پاك و دور لە جەنجاڵی و بێ کێشەیە کە زۆربەی جار دانیشتوانەکەی خزمی نزیکی یەکترن بۆیە ژیان لەو جۆرە ژینگەیەدا لەگەڵ خزم و کەسدا خۆشترە، لادێ کانی سنووری سەنگاویش لەو سیفەتە بەدەر نەبوون ئەمەش سەرەڕای ئەوەی کە کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو بۆ شارەکان چونکە ژمارەیەکی زۆر لە گوندی ئاوەدانی لە خۆی گرتبوو کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە لەمەدا دەردەکەوێت کە ژمارەی دانیشتووانی لادێکان لە پێش ئەنفالدا زۆر زیاتر بووە بە بەراورد لەگەڵ ئێستادا چونکە پێش ئەنفال بارودۆخی ژیانی لادێ باشتر بوو خەڵکی بەژیانی گوندنشنی خۆیان سوودمەندبوون بەپێ ی لێکۆڵینەوە مەیدانیەکان لەناوچەکەدا بۆمان

دەرکەوت کەوا دانیشتووانی ناوچەکە پێش ئەنفال توانای بەرهەم هێنان و چالاکیان زیاتر بووە بە بەراورد لەگەڵ پاش ئەنفالدا.

بارودۆخی گوندەکانی سەر بەناحیەی سەنگاو لەکاتی ئەنفال تاکو ساڵی 2007

**دەرکردنی یاسای قەدەغە کردن و ڕوخاندنی گوندەکان.**

گەر بەقوڵای مێژووی دروست بوونی دەوڵەتی عێراقدا ڕۆچینە خوارەوە (63) ساڵی دوو نێوانی لکاندنی کوردستان بە عێراقەوە تا ئەنفال بخوێنەوە دەبینین لەسەردەمی هەر یەك لەدەسەلأت و فەرمان ڕەوای یەکاندا بەجۆرێك لە جۆرەکان کار بۆ سڕینەوەی کورد کراوە تاکو لە سەردەمی بەعسدا کە لەهەموویان دڕندە تر بوو پرۆسەی (ئەنفال)ـی خولقاند، بەعس دەوڵەتێکی بەدەوی بوو کە خۆی فێری فڕۆکە لێخوڕین کردبوو دەوڵەتێك بە ئەخلاقیاتی خێڵەکی سەرەتاییەوە بەڵام خاوەنی دواهەمین و نوێ ترین شێوەی چەك بوو کە ئەو توانایەی لە دژی کورد بەکارهێنا کە بەچەند شێوەیەکە لەوانە:

1. دروستکردنی پشتێنەی ئاسایش لە دەوروپشتی هەرێم بەبەکارهێنانی شێوازەکانی داپڵۆسین لەماوەی ساڵانی (1961 – 1991).
2. بڕیاری ڕاگواستنی گوندنشینەکان و کۆکردنەوەیان لە کۆمەڵگە زۆرە ملێ کاندا.
3. بڕیاری بۆردومانکردنی ناوچەکە بە تۆپ و فڕۆکە و هەلی کۆپتەر.
4. بڕیاری قەدەغەکردنی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لە ناوچە شاخاوی و دەشتایی یەکاندا.
5. بڕیاری تالأن کردنی ماڵ و سامانی گوێزراوە و نەگوێزراوەی خەڵکی ناوچەکە.

سەرجەم ئەم بڕیارانەو گەلێکی تر بەشێوەی پیادەکردن لە پێش شاڵاوەکانی ئەنفالدا جێ بەجێ کراون لە(1987/3/29)دا صدام بڕیاری(160)ی دەرکرد کەهەموو دەسەلأتی ڕەهای خۆی بە خشیە (عەلی حەسەن مەجید) ئەویش لە (1987/3/30)دا بڕیاری جیمۆسایدکردنی مرۆڤی کوردی بۆ سوپاو جاش و سەرجەم داموو دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و مخابرات و جەیش شەعبی و فەوجەکانی بەرگری نیشتیمانی و فەوجی تایبەتی جاشەکان پەلاماری ناوچەکەیانداو خەڵکەکەیان دەسگیر کردو بێ سەرو شوێن کران و گوندەکانیان ڕوخاند، کە (عەلی حەسەن مەجید) بڕیاری دا کە یەك ماڵی کوردی لەناوچەکەدا نەمێتەوە تەنها گوندە عەرەبیەکان نەبێت کە دەڵێت خۆم چاودێری ئەو کارە دەکەم ئەگەر خانوویەك بەپێوە بمێنێت خۆم ئەزانم چی بەو سەرکردەیە ئەکەم کە بەر پرسیارە لەوناوچەیەدا، ئەو قەدەغەکردنە بە جۆرێك بوو کە قەدەغەی هاتووچۆو ژیانی دەکرد لەناوچە قەدەغە کراوەکان هەروەها فەرمان کرابوو بەسەر بازەکان کە هەر مرۆڤێك یان ئاژەڵێکیان بە دی کرد لەو ناوچەیەدا بیکوژن کەناوچەی (سەنگاو)یش کەوتە بەر ئەم بڕیارە، ناوچەی سەنگاو بەسەرجەم گوندەکانیەوە بە درێژای مێژوو لە بارودۆخێکی دوا کەوتوودا ژیاون تا چەند ساڵ بەر لە هاتنی شاڵاوی ئەنفال، کە بەڵگەش بۆ ئەمانە زۆربەی لادێکانی سەنگاو بەر ئەو هەڕەشەیە کەوتوون کە تا ساڵی (1988) سێ جار سووتاوەو

ڕوخاوەو خەڵکەکەی دەربەدەر کراوە لە ساڵانی شەستەکاندا جارێك سەنگاو ڕوخاوەو سوتێنراوە دواجاریش ساڵی (1987) کە ساڵێك پێش پڕۆسەی ئەنفالە سوتێنراوە کە ساڵێك دوای ئەوە لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا سەرجەم گوندەکانیشی روخێنرا کە ئەم جارەیان بەشێکی زۆر لە دانیشتوانەکەشی بەرەو چاڵەکانی مەرگ بران، تاوانی ئەنفال وەکو ئاشکرایە تاقە گوندێکی بەجیٚ نەهێشت کەخاپوری نەکات کە گوندەکان سەرچاوەی ئابووریان لەسەر کشتوکاڵو ئاژەڵ داری یە کە پڕۆسەی ئەنفال کاول کاریەکی گەورەی لەسەر شوێنی بەرهەم هێنانو لەوەڕگاو مەڕو ماڵاتی گوندەکان دروست کرد زۆرترین زەوی کشتوکاڵی لەکار خست و هەرچی مەڕوماڵات هەیە بەجیٚ هێڵراو تالان کرا چونکە گەر بگەڕیتەوە و سەرنجی پێش شاڵاوەکانی ئەنفال بدەین ئەبینین کە ئەم خەڵکانە لە گوندەکانی خۆیاندا خاوەنی موڵكو ماڵ مەڕو ماڵات کشتوکاڵی خۆیان بوونە، بەڵام پاش شاڵاوەکە ئەمانە هەموو سەروەتو سامانیان لە دەست چوو ئەوەی کە لەماوەی دەیان ساڵدا پێکیان هێنابوو.

**بارودۆخی دانیشتووانی گوندەکان لە کاتی ئەنفال و کۆکردنەوەیان لە ناوچەی سەنگاودا**

هەرچەند بارودۆخی ناوچەی سەنگاولەساڵی (1978)ەوە شێوابوو بە چوڵ کردنی گوندەکانو تۆپو باران، بەڵام لەسەرەتای پڕۆسەی ئەنفالەوە بە تەواوی بارودۆخی ناوچەکە شێواو کاتێك کە ئەنفالی (سێ) ناوچەکەی گرتەوە سوپا ڕووی کردە سنگاو پەلاماریان دەست پیٚ کرد بە کاول کردنو دەست گیر کردنی خەڵكو کۆکردنەوەیان بۆ ئەنفالو سەرنگوم کردنیان، لەکاتی پڕۆسەی ئەنفالدا لە سنووری گەرمیاندا چەند گوندو شارۆچکەیەك هەبوو کە کرابوون بە شوێنی کۆکردنەوەی خەڵکی سنوورەکە لەوانەش (ملەسوورە، فەقیٚ مستەفا، مەیدان لە باشووری گەرمیان، ئالیاوا لە لەیلان لە باکور ئەمانە یەکەم سەنتەری کۆکردنەوە بوون کە خەڵکە مەدەنیە هەلا لۆکەیان بۆ ڕاپێچ دەکرا، سەبارەت بە بارودۆخی دانیشتووانی سەنگاو لە کاتی پڕۆسەی ئەنفالدا بە پێی شوێن و ناوچەی نیشتەجیٚ بوونیان سەنتەرەکانی کۆبوونەوەیان دەگۆڕێت بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هاولاَتیە مەدەنیەکان بۆ سیٚ ناوچەی جیاواز کۆکرانەوە کە ئەمانەن:

**سەرقەڵا**: دانیشتووانی گوندەکانی سەر بەسنووری ناحیەی سەنگاو لەوزەمەنەدا ڕوویان لە هەرلایەك دەکرد هەر دەکەوتنە بەر شاڵاوی هێرشی فرۆکەو تۆپ باران بە ناچاری لە هەموو لایەکەوە ڕوویان دەکردە گوندی سەرقەڵا کە یەکێکە لە گوندەکانی ناحیەکەو نزیکە لە شارۆچکەی سەنگاوەوە، ئەوانەی ڕویان کردە سەرقەڵا زۆربەی خەڵکی گوندەکانی نزیك سەنگاو بوو بە بازنەیەکی گەورە لەویٚ دا کۆکرابوونەوە بەبیٚ ڕەچاوکردنی منداڵو پیرو گەنجو یەك کەوتوو سەرەڕای ئازاری دەرونیو ئازاری جەستەیی کە بەبیٚ نانو ئاو لەوێدا گیرابوون، سەرقەڵای سەنگاو لە چوارچێوەیەدا وێڕای خاپورکردنی گوندەکەو بەتالان بردنی و ڕاگواستنی خەڵکەکەی لە زێدی خۆیان کە خەڵکەکە بە شورایەکی خۆڵین لەلایەن سوپای ڕژێمەوە ئابلوقە درابوو.

**فەقێ مستەفا:** کەوتۆتە باشووری ناحیەی سەنگاوەوە و یەکێك بوو لە سەنتەرەکانی کۆکردنەوەی خەڵکی لە کاتی پرۆسەی ئەنفالدا، ئەوەی لەوێدا کۆکرابوونەوە ژمارەیەکی زۆربوون‌و کە زیاتر خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شاخی (ئاشداخ) بوون کە ڕژێم نەی دەهێشت کەس دەربازبێت تاکو خەڵکیان سواری ئیڤای عەسکەری کرد بەرەو چەمچەماڵیان ڕاپێچ کردن لەوێشەوە بۆ قەلا سپیکەی چەمچەماڵ بران.

**قەرەتامۆر:** کەوتۆتە باکوری سەنگاو باشووری شاری چەمچەماڵەوە کە سەر بە ناوەندی قەزای (چەمچەماڵ)ە و لەکاتی هێرشەکانی ئەنفالدا بۆ سەر سەنگاو بە تایبەتی گوندەکانی نزیك سنووری چەمچەماڵ باسەرە وەك (دێ ڕەشەو مەملەحەو خوێڵێن) چەندین گوندی نزیك بەوان دانیشتووانەکەی بەرەو قەرەتامۆر چوون‌و لەوێدا کۆکرانەوەو پاشان بە ئۆتۆمبێلی سەربازی لەجۆری (ئیڤا) بەرێ کران بۆچەمچەماڵ‌و لەوێشەوە بۆ (نوگرە سەلمان– تۆپزاوە–دوبز) بران کە لاوەکانیان لێ جیاکرایەوەو بەرەو چاڵەکانی مەرگ ڕاپێچ کران، لێرەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە دانیشتووانی سنووری ناحیەی سەنگاو لە چەند شوێنێکەوە بەرەو ناوچەکانی تۆپزاواو نوگرە سەلمان‌و دوبزو دواتریش بەشێکیان بەرەو یاڵەکانی مەرگ‌و نەگەڕانەوە براون ئەوەمان بۆ ڕون دەبێتەوە کە سەرەڕای ئەوەی کە سەروەت‌و سامان‌و ماڵیان لە دەستدا بوو فێری ژیانی زیندان نەبوون هەربۆیە چۆن لاوەکانیان جیاکرانەوەو بەرەو مەرگ بران ئاوهاش بەشێکی زۆری تریان کە بەرگەی ئەو ئەشکەنجەو ناڕەحەتی زیندانیان نەگرت‌و لە ژێر برسێتی‌و تونێتی‌و بلاوبوونەوەی نەخۆشی لەناویاندا گیانیان لە دەست داو بونە خۆراکی سەگی بیابان تەنها لەبەر ئەوەی کە کورد بوون، هەرچەندە کە بەشێکیان دوای ئەوەی کە لە زیندانەکان ڕزگاریان بوو گەڕانەوە ئۆردوگامان بەوشێوە چالاکەی جاران نەیان توانی لە ژیان بەردەوام بن بەهۆی لەدەست دانی بەشێکی زۆر لەکەس و کارەکانیان و نەگەڕانەوەیان بۆ گوندەکانیان چالاکیەکانیان سنووردار کرابوو

**بارودۆخی گوندەکان و بەجێماوی ئەنفال**

ژمارەی دانیشتووانی سنووری ناحیەی سەنگاو دەگاتە سنوری (5738) کەس بەناحیەکەو سەرجەم گوندەکانی سەر بەسنووری ناحیەکە لەو ژمارەیەی سەرەوە (2885) کەسیان لە ڕەگەزی نێرەو (2853) کەسیان لە ڕەگەزی (مێ)یە کە ئەم ژمارەیەش بەسەر (1126) خێزاندا دابەش بوون.

سەبارەت بە ژمارەی گوندە ئاوەدان نەکراوەکان کە دەرئەنجامی پرۆسەی ئەنفال وێران بوون لە سنووری ناحیەکەدا دەگاتە (7) گوند لە کۆی ژمارەی (92) گوند پێشتر ئاماژەمان پێکردووە کە زۆربەی ئەو گوندانەی کە ئاوەدان نەکراونەتەوە هەموو دانیشتووانەکەی بەر ئەنفال کەوتوون یاخود ئەوانەی کە ماون ناتوانن گوندەکانیان ئاوەدان بکەونە، ئەوەی جێ ی ئاماژەیە ئەوەیە کە ئەو گوندانەی کە ئێستا ئاوەدان کراونەتەوەو ژیانی گوندنشینی تێدا بە دی دەکرێ ئەگەر

بەوردی لە فایلی ڕاگواستن و وێرانکردنی گوندەکانی هەرێمی کوردستان سەرنج بدەین دەبینین جگە لە مەڵبەندی پارێزگاو چەند قەزایەك و ناحیەیەك لە پێش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (1991) بە دەگمەن پێش گوندێکی ئاوەدان نە دەبینرا لە کوردستاندا کە وەکو سروشت دیاری ئاسای خۆی مابێتەوە ئەگینا خەڵکەکەیان تەعریب کراوەو یان ڕاگوێزراوە بۆ ئۆردووگا زۆرە ملێکان، سەرەتای بنیات نانەوەی گوندەکان بەگران دەستی پێکرد چونکە شاڵاوەکانی ئەنفال گوندەکانی سنووری سەنگاوی بەتەواوی وێران کردبوو جگە لەوەی ئەوەی هێزی کاربوو بەدەگمەن لەو شاڵاوە ڕزگاری بوو هەروەها خاکی ناوچەکە سوتێنرابوو کە ئەمە بە ئەستەم چارەسەر دەکرا هەروەها ئەو کەسانەی کە لەپرۆسەکەدا دەربازبووبوون زۆربەیان یان پەك کەوتەبوون یان هیچ زانیاریەکیان نەبوو لە سەر ژیانی لادێ بەهۆی کەمی تەمەنیان کە ئەمەش بووە هۆی کەم بوون و سستبوونی ئاوەدان بونەوەکە، پاشماوەی ئەنفال گەورەترین پاشای مەینەتیان لەناو تراژیدیاکاندا بەرکەوتووە ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی لەم چەمکە بڕوانین کێشەی هاوبەشن بۆ سەر هەموویان توزیف دەبێت کە چەندین خاڵی مەترسی داری تێدا بەدی دەکرێت. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسەر یەحێماوەکانی ئەنفالەکانی پارێزگای کەرکوك کراوە دەرکەتووە کە (45.4)٪ی لە نارەحەتی و نائارامی داژیان دەگوزەرێنن، کەمترین ڕێژەش (3.2)٪ خۆیان بە بەختەوەر دەزانن ئەمە ئەوە دەردەخات کە بیرکردنەوەی دوای ئەنفال بیرکردنەوەیەکی نا ئارامەو ناجێگیرەو هەمیشە بیر لە ڕۆژێکی خۆش گوزەرانی دەکەنەوە بۆیە ئەم حاڵەتە باری دەرونی تووشی دڵە ڕاوکێ و خەمۆکی کردون، لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە کاری بۆ کراوەو بەکاری ئاژەڵ داری و کشتوکاڵیەوە خەریکن کە لەسنوری ناحیەکەدا (12783)ـدا دۆنم زەوی دەیم هەیەو (9568) دۆنم زەوی بەراو هەیە کەدانیشتووانی چالاکی کشتوکاڵی خۆیان لەسەر ئەنجام ئەدەن داهاتی گوندنشینەکانی سنوری سەنگاو لەسەرئاژەڵ داری و کشتوکاڵکردنە بەتایبەتی گەنموجۆ ونۆك و هەندێ لە گوندنشینەکانیش باخی خۆیان هەیە کە بەشێوەیەکی سەرەکی کشتوکاڵی ناوچەکە پشت بەئاوی باران دەبەستێت، بەڵام ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان کار و چالاکی گوندەکان لەگەڵ ساڵانی پێش ئەنفال ئەوا جیاوازیەکی زۆر دەبینرێ چونکە بەشێکە زۆری باخی میوەکان کە لە سەرەوە باسکراوە سوتێنراون و تاکو ئێستا نەژیاونەتەوە ئەمە سەرەڕای کەم بوونەوەی دانیشتووانی گوندەکان و نیشتەجێ بوونیان لە شارەکان و ئەو کارەساتەی کە ئەنفال بەسەر ناوچەکەیدا هێنا، ئەگەر بەراوردێکی ژمارەی دانیشتووانی سنووری ناحیەی سەنگاو بکەین لەگەڵ سەردەمەکانی پێش دەست پێکردنی شاڵاوەکانی ئەنفالدا ئەوا بۆمان دەردەکەوێت ئەو ژمارەیەی کە لەپێش ئەنفالدا لە سنوورەکەدا ژیاون زۆر زیاتر بووە لەو ژمارەیەی کە ئێستا لە سنورەکەدا دەژێت وەك لە درێژەی باسەکەدا پێشتر ئاماژەمان پێکردوە ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری شاڵاوەکانی ئەنفال و توندی ئەو زەبرەی کە شاڵاوەکە بە دانیشتوانی ناوچەکەی گەیاندوە لە زیندە بەچاڵ کردنی نزیکەی (182)

هەزار مرۆڤی بێتاوان و وێران کردنی گوندەکانو نیشتەجێ کردنی کەس و کارو ئەوانەی کە لە شاڵاوەکانی ئەنفال گەڕاونەتەوە لە ئۆردوگا زۆرە ملێ کاندا و نەگەڕانەوەیان بۆ دێهاتەکانی خۆیان کە پێش ئەنفال ژیانیان تیایدا دەگوزەراند هۆکاری ڕاستەوخۆی ئەو جیاوازیە زۆرەی نێوان ژمارەی دانیشتووانی لە پێش ئەنفال و لە دوای ئەنفال لەناوچەکەدا.

**بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم توێژینەوەیە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**

1. ئەژی (سمکۆ بەهرۆز) مێژووی سەردەمە کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتی پارێزگای کەرکوک، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، چاپی یەکەم، کەرکوک، 2005
2. محمد أمین زکی ، تأریخ سلیمانیة وأنحائها، ترجمة جمیل بندری الرۆذبیانی، مطبعة وزارة الثقافة، طبعة الثانیة، 2002
3. ئەژی(سمکۆبەهرۆز)مێژووی سەردەمەکارگێڕی وبەڕێوەبەرایەتی پارێزگای کەرکوک، هەمان سەرچاوەی پێشوو
4. ئەکرەم حەمە ئەحمەد، سێبەری ئاشداخ، چاپخانەی بینایی، چاپی یەکەم، سلێمانی، 2007
5. محمد هادی دفتری و عبداللە حسن، عێراقی باکور لیوای کەرکوک لە ساڵی 1955، وەرگێڕانی موعتەسەم محمد، چاپخانەی ژیار، سلێمانی، 2005
6. سەروەر ئەحمەد کەریم، چەمچەماڵ بەرلەمەملەکەتی ئاشوور، چاپی یەکەم، 2003، سلێمانی
7. محمد هادی دفتری و عبداللە حسن، عێراقی باکور لیوای کەرکوک لە ساڵی 1955، هەمان سەرچاوەی پێشوو
8. سایتی . www.fallingrain.com/worldiraq/muhafazaySelaymany
9. فاتح عبداللە شوانی، پارێزگای کەرکوک لەساڵی 1957– 1977،چاپخانەی ڕامان، چاپی یەکەم سلێمانی،2005
10. لەتیف فاتیح فەرەج، جینۆسایدو کاڵبوونەوە، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، 2004
11. سالار حەمە سور باسیرە، تراژیدیای ئەنفال، گۆڤاری چواردەی چوار، ژمارە (2)ـی نیسانی، 2004
12. عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئاسا، چاپی یەکەم، سلێمانی، 2002، لا26 .
13. منظمة حقوق الإنسان شرق الأوسط، جریمة العراق في الإبادة الجماعیة حملة الأنفال ضد الكرد، ترجمة جمال میرزا عزیز، المطبعة وزارة الزراعة والری، الطبعة الأولی، سلیمانیة، 2003
14. محمود سەنگاوی، بیرەوەریەکانی سەنگاوی، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، 2004
15. بەڕێوەبەرایەتی ڕەگەزنامەو باری شارستانی سەنگاو 2007/12/25 .
16. شێخ صدیق، کاریگەری ئەنفال لەسەر لایەنی دەرونی و کۆمەڵایەتی ناو پاشماوەی ئەنفالەکان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ژمارە سەنتەری برایەتی هەولێر، 2002
17. خالد سلێمان، الأنفال حکایات من زمن مستقطع، الطبعة الأ ولی، کردستان سلیمانیة، ص27 .

# پانوراما جینوسایدی ددیروکا مروڤایەتیێ دا

علی بەندی

دەمێ لاپەرێن دیروکامروڤایەتیێ لادەین دێ خویابیت کو مروڤایەتی ددیروکا خویا درێژدا توشی چەندین تاوانێن کومکوژییێ بویە وچەندین مللەت هاتینە بنبرکرن.
ململانا مروڤایەتیێ بناڤێ ئایین یان نەتەوە هەر ژکەڤندا ب ملیونان مروڤ ژناڤبرینە .
عێراق ددیروکا خویا درێژا پرخوینا وی دا بهزاران سالانە بویە گورەپانا تاوانێن کومکوژییێ د چوارچوڤێ شەرێن بسەر داهاتین، هەر ل چاخێ ئیمپراتورێن ئێك لدویف ئێك حوکم کرین تا ژناڤبرنا خیلافەتا عەباسی و خیلافەتا بەغدا لسەر دەستێ هولاکوی دسەدێ سێزدێ دا، تاوان لدویف تاوانێ هاتینە ئەنجام دان وەکی قرکرنا ئەرمەن وئاشوریا وجینوسایدکرنا مللەتێ کورد بناڤێ ئەنفال لسالا (1988) کو بویە ئەگەرێ بێ سەروشوینکرنا (182) هزار خەلکێ کورد ژلایێ رژێما ژناڤژوی ووێرانکرنا بسەدان هزار گوندێن کوردستانێ ، ئەڤە هەمی سەدێ بیستێ دا.
لێ بو جارا ئێکێ زاراڤێ کومکوژییێ یان (Genocide ) پشتی شەرێ جیهانییێ دوویێ ل سالا 1943 دیاربو ژلایێ پارێزەرێ هەلەندییێ رەگەز چوهی (رفاییل لمکین ) راوێژکارێ وەزەرەتا بەرگر یا وەلاتیێن ئێکگرتی یێن ئەمریکی ، کوهەمی ئەندامێن خێزانا وی بدەستێ نازیان هاتبون کوشتن وقرکرن .
( Genocide ) پەیڤەکا لێکدایا یونانی یە ژدوو برگا پێك دهێت (Genos ) ئانکو رەگەز ، (Cide ) ئەڤەر مروڤ وانە کوشتن ونەهێلان ،ئەگەر مروڤ هەردوو برگا لێك ددەت دبیتە کوشتنا رەڤەزێ مروڤی وب شێوەکێ رادگەهوینیت ، رێکخراوێن سەبارەت کو کومکوژی تاوانەکە بنەماییێن یاسا نێڤ دەولەتی وبەزینین ودژی هە می ئارمانجێن ڤێ رێخکخراوێ یە و ژبەر هندێ لهەمی جیهانێ ئەف کریارە دهێتە رسوا کرن و دپەیماننناما سالا 1948 دا ئەف تاوانا یا هاتیە قەدەغەکرن و سزایێ ئێخستیە سەر تاوانبارێن بڤێ تاوانێ رادبن.
قرکرن یان (جینوساید) بەرێ بکەڤیتە دڤەرهەنگا یاسا نێڤ دەولەتی دا وسزا بهێنە دەستنیشانکرن دیاردەکا زیقە کەڤتیە دناڤ گروپ ومللەتان دا هەر ژدایك بونا عیسای سلاڤێن خودێ لێ بن وددیروکا جینوسایدییێ چەندن دیارەدە هەنە.
ل سالا 612 پ .ز دا بابلیان قەسابخانەکا کومکوژییێ دژی ئاشوریان ئەنجام دان زوبەری ئاشوریان بکوم کوشتن وبازێرێ ( نەینەوا) وێران کر، دەمێ سەرکردێ لەشکەری یونانێ زەینەفونی ل سالا 335 پ .ز دگەل دەه هزار سەربازێن خو دناڤ پاشمایی وشینوارێن نەینەوا دا بوری هزرنەدکر روژەکێ ژ روژان ئەف بازێرە بهێنە ئاڤەدانکرن ل سالا (596) پ .ز دا

نەبوخوزنەسر پاشایێ کلدانیان باژێرێ یەهودی یێ ئیسرائیلیان وێرانکری و ئاگری وئاسنی کەڤتینە گیانێ خەلکێ ڤی وەلاتی، دیسان لسالا 1258 مەغول وتەتەر بسەرکردایەتیا هولاکوی هێرش کرینە سەر باژێرێ بەغدا شیان دماویێ (40 ) روژان دا کوشتارێن بکوم ئەنجام دان و دڤەرهەنگا هولاکوی دا چ جوداهی دناڤبەرا مروڤێ شەرکەر و نەشەرکەر دا نەبو و دئەنجامێ ڤێ هێرشێ دا نێزیکی (80) هزار کەس ل شارێ بەغدا ئیبادەکرن ، دیسان دوو ملیون ونیڤ خەلکێ کەمپبودی لسەر دەستێ خەمیرێن سور یێن ئەمریکی دسالێن حەفتیان داو (800) هزار توتسییێن رەواندی ل سالا 1994 لسەر دەستێ گروپا هوتو، دەستهەلاتدارێن روندا حکومەتا فەرەنسا تاوانبارکریە کو وی دەمی چەك دایە گروپا هوتو ، ژلایەك دیڤە وێ خولبوخەلا ئێکەتیا سوڤیەتی لسەر دەمێ ستالینی لئوکرانیا دناڤبەرا سالێن (1932 و 1933 ) ئەنجام دایە و تێدا شەش هەتا حەفت ملیون مروڤ بوینە قوربانی مەرەم ژێ زالبون و ژناڤبرنا بەنهەنگاران.

شەرێ ئەندونیسیا لتەیمورا روژهەلات سالا (1975 ) ، کریارێن تاوانێن کوکوژییێ ژلایێ سەروکێ یوگزلافیا بەرێ ( سولوبودان میلو سوفیتش ) لبوسنە دناڤبەرا سالێن (1992 و 1995) .

ژلایەك دیڤە وەلاتێن روژئاڤا گەهشتینە وێ باوەرییێ کو کومەلکوژی لهەرێما دارفور ژلایێ دەستهەلاتدارێن سودان ڤە هاتینە ئەنجام دان و ملیشیاتێن جەنجەوید ژڤێ کریارێ بەرپرسیارن ئانکو نێزیکی (260) ملیون مروڤ راستەوخو بوینە قوربانی تاوانا جینوسایدیێ.

ل سالا 1914 دشەرێ جیهانی دا کومەکا کارێن جینوسایدی دەرهەق چەندین گروپێن جودا جودا ئەنجام دان ب ملیونان کەس بوینە قوربانی .

ل 1915/4/22 دشەرێ جیهانییێ ئێکێ دا دەمێ ئەلمانیا گازا ژەهراوی دژی فرەنسیان بکارئینای و دویڤ دا ئینگلیزان ل 1915/9/25 ئێکەم هێرشا گازا ژەهراوی ئەنجام دای .

دیسان ل 1915/4/24 سولتان عەبدولحەمیدێ عوسمانی کوشتارا ئەرمەنیان ل روژهەلاتێ تورکیا ئەنجامداری ونێزیکی ملیون ونیڤ کەس ژئەرمەنیان بوینە قوربانی و ب سەدان هزار مروڤ ئاوارەبون ، لسەر دەستێ سولتان عەبدولحەمیدی ببهەنا کو ئەرمەن هەڤپەیمانێن روسیا بون کو ژنوی ئەڤێ کوشتارێ سەرهلدایە ودەسهەلاتا تورکیا پێ هاتیە تومەتبارکرن.

لسالا 1933 لسەردەمێ حوکمرانیا عیراقێ یا وی دەمی دا ل دەڤەرا سێمێلێ بسەر پارێزگەها دهوك ڤە نێزیکی چوار هزار کەس ژ ئاشوریان ئیبادەکرن.

دشەرێ ناڤخوییێ ئیسپانیان دا (1936 – 1939 ) دکتاتورێ وەلاتی ( فرانکوس ) ب سەدان هزار کەس کوشتن ، ل سالێن (1939 – 1945 ) دچوارچوڤێ شەرێ جیهانییێ doوویێ دا (18) ملیون مروڤ هاتنە کوشتن ژ ئیسرائیلیان ، پولوینان ، فەرەنسا و هولەندا یوگوسلاڤیا.

ل سالا 1948 دا ئیسرائیلیان ل دێریاسین تاوانەك ئەنجام دا (252) کەس کوشتن

ل سالا 1969 رژێما بەعس ل شکەفتا خورت ودەکان ل پارێزگەها دهوك پتر ژ (70) مروڤ بساخی کوشتن ، دیسان دهەمان سال دا تاوانەکا جینوسایدی دژی خەلکێ مەسیحی ل گوندێ سوریا ل دەشتا سێمێلێ ل دهوکێ ئەنجام دان و بدەهان وەلاتی بکوم کوشتن. زێدەباری کوشتارا بازێرێ سلێمانی تا دگەهتە تاوانا کومکوژیا بازێرێ هەلەبجا شەهید یا کو دئەنجام دا (5) هزار وەلاتی گیانێ خو ژدەست دا ژئەگەرێ گازا ژەهراوی و قرکرنا کوردێن فەیلی ل دەسپێکا سالێن هەشتیان کو نێزیکی (10) هزار کەس بوینە قوربانی، دیسان قرکرنا (8) هزار بارزانیان وجینوسایدکرنا (182) هزار خەلکێ کورد دزنجیرە قوناغێن بناڤێ ئەنفال، لێ بشێوەی گشتی سەدێ بیستێ ئێك ژسەدێن هەرە تارییێن مروڤایەتیێ بو چونکو جینوساید یان قرکرنا مروڤان بشیوەك بەرفرەه هاتینە ئەنجام دان وەکو قرکرنا ئەرمەنیان ، ئوکرانیا ، هولوکوستا ئیسرائیلیان ، قرکرنا کەمبودیان، رەواندا، بوسنە ، جینوسایدکرنا کوردان ل عێراقێ ل سەر دەستێ رژێما بەعسا ژناڤچوی ، هەرێما دافور ل سودان .

لێ جهێ خوشحالیێ یە دادگەها بلندا تاوانان ل عێراقێ بریار دەرێخستیە کریارێن ئەنفالان دژی خەلکێ کورد ل عێراقێ ژلایێ رژێما بەعس ڤە هاتینە ئەنجام دان ب جینوساید دانە نیاسین ، ژلایەك دیڤە چڤاتا سەروکردایەتیا عێراقێ ژی ل 2008/9/10 ئەف کریارە جینوساید دایە نیاسین.

ئەڤە هەمی تاوانن دژی مروڤایەتیێ لسەر دەستێ دکتاتورێن جیهانی هاتینە ئەنجام دان ئەف نمونێن مە بەرچاڤکرین چەند نمونەکن ژهزاران نمونێن دیتر.

**مفا ژڤان ژێدەران هاتیە وەرگرتن:**

حقوق انسان – استخدام تخزین الاسحله الکیمیاویه انتهائ صارخ لحقوق انسان ژمارە 1989/9/

الجریمه الدولیه ( د . حسنسن ابراهیم )

کنعان مکیه ( القسوه والصمت )

علی بندی ( انفال بادینان )

کوردو جینوساید هژار عزیزسورچی

# ئەنفالی ناوچەی چەمچەماڵ

یوسف ناصح

ئەم قەزایە سەر بەپارێزگای کەرکوکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی پارێزگاکەوە، خاڵێکی گرنگە بۆ بەستنەوەی پارێزگای کەرکوك بە پارێزگای سلێمانیەوە، ئەویش لەڕێگای چەند دەربەندێکەوە کەدەکەونە زنجیرە چیاکانی قەراخ و سەگرمەو بازیانەوە، ئەم قەزایە لەمەرکەزی پارێزگای سلێمانی یەوە 45کم دوورە.

ئەم قەزایە لەباشووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانی عێراقدایە هەروەها ئەم ناوچەیە گرنگی یەکی زۆری هەیە بۆهەرێمی کوردستانی عێراق چ لە ڕووی ئابوری و سیاسیەوە بێ، هەروەها بەشێك لەهەردوو ناوچەی شاخاوی بەرزو نیمچە شاخاوی بەیەك دەگەیێنێ، هەروەها چەمچەماڵ دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی عێراقەوە یەکێکە لەقەزا گەورەکانی کوردستان سەربە پارێزگای کەرکوکە، دەکەوێتە سەر ڕێگای سەرەکی کەرکوك سلێمانی، کەواتا لێرەوە دەردەکەوێت چەمچەماڵ بەپێی دابەشکردنی ئیداری دەبێت سەر بەپارێزگای کەرکوك بێت نەك سلێمانی، لەبەر ئەوەی چەمچەماڵ زیاتر پەیوەندی بەشاری کەرکوکەوە هەیە تا شاری سلێمانی، چونکە ئەگەر بێت و هەر قەزایەك یان هەر ناحی یەیەك پەیوەندی لەگەل چ پارێزگایەك دا بێت زیاتر پێویستە سەر بەو پارێزگایەبێت، هەروەها قەزای چەمچەماڵ سێ ناحی یەی بەسەرەوە بووە لەوسەردەمەدا وات پێش ئەوەی کۆمەڵگا زۆرە ملێکانی شۆرش تەکیە بکرێت بەناحیە، ئەو ناحیانەش ناحیەی سەنگاو کە 70 گوندی بەسەرەوە بوو هەروەها ناحیەی قادر کەرەم کە 78گوندی بەسەرەوەبوو هەروەها ناحیەی ئاغجەلەریش کە 75گوندی بەسەرەوە بوو.

**بەراییەك لەمێژووی گەشەسەندی دانیشتوانی سنوری قەزای چەمچەماڵ**

هەروەك و لەکورتەیەکی مێژووی دروستبوونی ئەم قەزایەدا بۆمان دەرکەوت کە ئەم ناوچەیە هەر لەکۆنەوە دانیشتوانی تێدا نیشتەجێ بووە وەدەستیان کردووە بەگەشەکردن و ئەویش ئەویش بەهۆی ئەوەی کەناوچەیەکی باش بووە بۆ ئاژەڵ بەخێوکردن و کشتوکاڵ کردن، لەگەڵ ئەوەشدا ناوچەیەك بوو کە کەوتۆتە نێوان هەردوو پارێزگای سلێمانی و کەرکوکەوە، بەپێی ئەو ئامارانەی کەهەن دانیشتوانی ئەم ناوچەیە هەر لەگەشە کردندا بووە بۆنمونە 1934 ز تەنها ناوەندی مەرکەزی قەزاکە 1284کەسی تێدابووە، ئەم ڕێژەیەش زیادی کرد 1947 ز ناوەندی مەرکەزی قەزاکە گەیشتە 2015کەس، سەرجەمی دانیشتوانی هەموو ناوچەکە گەیشتە29811 کەس ئەم ژمارەیە لەساڵی 1957 گەشەی زیاتری بەخۆیەوە بینی کەگەیشتە 34299 کەس، بەڵام ئەم ژمارەیە تەنها 3031 کەس لەناوەندی مەرکەزی قەزاکەدا دەژیان، هەروەها لەساڵی

1965ز ئەم ژمارەیە گەیشتە 37016 کەس وەژمارەی دانیشتوانی مەرکەزی قەزاکە گەیشتە 7533کەس.

بەڵام لەسەر ژمێری ساڵی 1977ز ئەم ژمارەیە گەیشتە 52773 کەس کەسەرجەمی دانیشتوانی قەزاکەیە، ئەمەش ڕێژەیەکی زۆرە بەهۆی باش بوونی باری سیاسی یەوە بوو.

هەروەها لەسەر ژمێری ساڵی 1987سەرجەمی دانیشتوانی قەزاکە گەیشتە 70552 کەس.

هەروەها ژمارەی دانیشتوان بەپێی خەمڵاندنی ڕێکخراوی W.F.Pلەساڵی 2000 دا بەمەبەستی دابەشکردنی خۆراك کردویەتی زۆر زیادی کردووە کە گەیشتۆتە (153626) کەس ئەمەش گەشەکردنێکی باشە ئەوهەموو کارەساتەی کەبەسەر خەڵکی ئەم ناوچەیەدا هاتووە.

**کورتەیەك لەمێژووی دەڤەری چەمچەماڵ**

شاری چەمچەماڵ لەیەکێکە لەشارە دێرینەکانی کوردستان دەوری زۆریشی هەبووە لەمێژودا، چەندین کەسایەتی ناودار بەم ناوچەیەدا گوزەریان کردووە بۆنمونە (بەپێی یەکی سەرچاوەکان ئەسکەندەری مەقدۆنی لەم دەڤەرەدا شەڕێکی بەهەمان ناونیشان کردووە واتا شەڕی چەمچەماڵ ئەسکەندەری مەقدۆنی لەشەڕی قەڵای چەمچەماڵدا دەڵێت (پێویستە هێزەکانی ئێمە غیرەتی خەڵکی چەمچەماڵیان هەبێ لێرە دەردەکەوێت کە خەڵکی چەمچەماڵ مێژوویەکی سەروەری و سوراچاکیان هەیە تا وەکو شۆڕشی نوێ و تاوەکو ئێستاش درێژەی کێشاوە.

هەروەها چەمچەماڵ مەڵبەندی شارستانی بووە لەپێش 9006 ساڵ لەمەوبەرەوە کەیەکەم گوندی نیشتەجێ ی مرۆڤ لەم ناوچەیەدا بووە کەناوچەیەکی گرنگ بووە بۆکشتوکاڵ کردن، گوندی کشتوکاڵی چەرموو کەدانیشتوانەکەی گەنم وجۆو عەلی بابە و نیسك و .........هتد یان دەچاند، هەروها ئاژەڵی مەڕو بزن و بەرازیان بەخێو دەکرد نیشتە جێبوونی مرۆڤ لەم گوندەدا گۆڕانێکی گرنگ بوو چونکە مرۆڤ دەستی کرد بەدروستکردنی خانووبەرە مانەوەی بەدیار بەروبومی کشتوکاڵیانەوە ئەم گوندەیەش دەکەوێتە سەر بەرزاییەك کە 11کم لەشاری چەمچەماڵەوە دوورە.

هەروەها کاتێك لەسەردەمی بابانییەکان لەساڵی 1787ز هەمەوەندی یەکان پشتی حاکمی قڵاچوالانیان گرتو هێرشیان کردە سەرئەم ناوچەیەو ڕزگاریان کردوە، تاکو گوندێکی نزیك کەرکوك ئەویش گوندی چیمەنە، بەڵام لەشکری هەمەوەند نەگەڕاونەتەوە، چونە گوندەکانی قورەتوو پیریادی و مەوفەر ئەمەش لەساڵی 1829دا بوو هەرلەوکاتەوە دەستیان کرد بەئاوەدان کردنەوەی ئەو شارە.

کەواتە ئەم شارە لەزۆرکۆنەوە سەرەڕێگەی زۆر هێز بووە کەبەم ناوچەیەدا تێپەڕیون، هەر لەبەر گرنگی جێگەی ئەم ناوچەیەبوو گرنگیان بەم شوێنەداوە هێزی خۆیان ناردۆتە ئەم ناوچەیە دەستیان بەسەردا گرتووە، هەروەها لەساڵی 1851ز کاتێك ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ناوچەی سلێمانیان داگیرکرد شاری چەمچەماڵ ئەودەمە تەنها 74 ماڵ بوو لەگەڵ 6 دووکان

عوسمانیەکان هاتن (میرزا فەقێ قادری هەمەوەندیان) کرد بەقایمقامی چەمچەماڵ کەواتە یەکەم قایمقامی قەزاکە بەپێی سەرچاوەکانی بەردەست (فەقێ قادری هەمەوەندی ) بووە کە شاعیرێکی دیاری کورد بووە.

کەواتا ئەم شارە لەژێردەستی عوسمانیەکاندا مایەوە وەك هەموو شارەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی مەبەستمان شارە کوردیەکانە لەژێر دەستی عوسمانیەکاندا بوو نەیان هێشتووە بەئازادی بژین، بەڵام لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم کاتێك هەرێمی کوردستان وەك زۆربەی ناوچەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەوتنەتە ژێر دەسەڵاتی أستعماری نوێ وە کەبەریتانیا و فەرەنسا و ایتالیاوچەند وولاتێکی تری زل هێز بوون، عێراقیش کەوتە ژێر دەسلاتی بریتانیاوە لەساڵی 1926 ئینگلیزەکان شاری چەمچەماڵیان کرد سەر کەرکوك.

ئەم شارە هەروا مایەوە لەسەر کەرکوك گرنگی یەکی زۆری هەبوو بۆشاری کەرکوك چونکە دەوری هەبوو بۆزیادکردنی ژمارەی دانیشتوانی کەرکوك کە شارێکی کوردی یە.

حوکومەتەکانی عێراق بەردەوام هەوڵیان داوە  بۆکەم کردنەوەی ژمارەی کوردەکانی کەرکوك هەربۆیە حوکومەتی عێراق لە 1970/11/6 ز بەفەرمانێکی میری کە ژمارەی (258) بوو چەمچەماڵی لەسەر پارێزگای کەرکوکی دابڕی و خستیّیە سەر پارێزگای سلێمانی، بەڵام جارێکی تر دوای ڕاپەڕینە مەزنەکە ئەم شارە خرایەوە سەر کەرکوك.

**قۆناغی یەکەمی ئەنفال بۆسەر چەمچەماڵ و دەوروبەری**

میکانیزمی ئەنفالی چەمچەماڵ جیاوازە لەناوچەکانی تر بە دوو قۆناغ ئەنجامدرا قۆناغی لەدەست پێکی قۆناغی سێیەمی ئەنفالەوە دەستی پێکرد کەلە 7–20 نیسانی 1988دا.

گەرمیان دەشتی فراوانە هاوسنورە لەگەڵ ناوچەی عەرەب نشنەکانی عێراق، لەڕۆژئاوای ڕێگای دووزخورماتوو کەرکوك، لەباکورەوە ڕێگای کەرکوك چەمچەماڵ، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە چیاکانی قەرەداخ و لەباشوریشە هەرسێ شارۆچکەی کەلار و کفری و پێبازە، هەروەها ناحییەی قادر کەرەم چەقی جوگرافی یەکەیەتی.

ئەم قۆناغە لە 7 نیسان بەبۆنەی جەژنی شومی دامەزراندنی حیزبی بەعسەوە دەستی پێکردوە ئەم هێرشە بەکاریگەرترین و کوشندەترین هەڵمەت دادەنرێت.

ئەمەش بۆ سەر ناوچەکانی ( چەمچەماڵ، سەنگاو، قادرکەرەم، دووز، کفری، کەلار، پێباز و تیلەکۆ) ئەم ناوچانە سەر بە هەرسێ پارێزگای (کەرکوك و سلێمانی و دیالە)ن کە 500 گوندی گرتۆتەوە سەرەڕای تەخت کردنی (4) ناحی یە.

چەمچەماڵ سنوری جوگرافیای ناوەندی چەمچەماڵ ناحیەی ئاغجەلەرو قادرکەرەم و سەنگاوە چەقی جوگرافیای گەرمیان ناحیەی قادرکەرەمە کەسەردەمێك سەنتەرێکی قەرەباڵغی (10) هەزار کەسی بوو لەکۆتایی یەکەم حەفتەی مانگی نیسان پاشماوەی پەرتو بڵاوبوونی ئەو پێشمەرگانەی لەناوچەی سەرگەڵو بەرگەڵو شکابوون، بەرەو خواربوونەوە بۆ سەنگەرەکانی

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەگەرمیان، هەروەها ئەو گوند نشینانەی کە لەئەنفالی دوودا هەڵهاتبوون سەری خۆیان بەرەو باشوورو ڕۆژئاوا هەڵگرتبوو بۆ ئێرە، هەندێك لەجەنگوەرانی مەڵبەندی دوو سەنگەری خۆیان لە شێخ تەویلە لێ دابوو، کەجمەی دەهات لەئاوارەی قەرەداخ، هەندێك چوون بۆ گوندی باش تەپە.

یەکێك لەهۆکارەکانی زۆربەرکەوتنی خەڵکی بریتی بوون لەو ڕێنماییانەی پارێزگای سلێمانی، بۆقائمقامی چەمچەماڵ و خۆ فرۆشەکان بۆئەوەی پڕوپاگەندە بڵاوبکەنەوە کەحکومەت بۆ هەر ماڵێك (300)م2 زەوی پارەی عقار دەداتە خێزانەکان تا خانووبەرە بۆ خۆیان دروست بکەن لەکۆمەڵگانە ئەم پڕووپاگەندەیە وای کردبوو کەخەڵکی زۆر بە پیری ڕاپەڕینە جەماوەریەکەی چەمچەماڵەوە نەیەن .

هەروەها یەکێك لەهۆکارەکانی تری ئەنفال بەو ووتەیەی کاکەی جوتیار کەخەڵکی ناحییەی ئاغجەلەرە ڕێگرتنی هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بووە.

یەکێ لەهۆیەکانی تر ئەوەبوو ناوچەی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوو ڕۆڵە گوندنشینەکانی ئەم ناوچەیە زۆربەی هێزی شەڕکەری ڕێکخراوەکانی پێکدەهێنا، هەروەها گوندەکان پڕبوون لەسەربازی هەڵهاتوو پێشمەرگە تۆڕێکی فراوانی دروستکردبوو ئەوان هەموو جار دەهاتن و نانیان لە ماڵەکان دەخوارد کۆڕو کۆبونەوەیان بەدانیشتوانی گوندەکان دەکرد، پیاوێك لەگوندەکانی قادرکەرەم دەیووت پێشمەرگە فەرمانێکی دەرکردبوو کەدەبێ هەر ماڵێك چەك وەرگرێ ئەمانیش وەك یاسایەك قوبوڵیان کرد ئەمە وەك هێزی بەرگری باس دەکران هەموو گوندێ یەکەیەکی بەرگری خۆی هەبوو.

**1. قادرکەرەم باکوری گەرمیان**

لەو ماوەیەدا یەکەکانی سوپا بەردەوام خەریکی هەمان پەلاماری تۆقێنەر بوون بۆسەر ناوچەکانی باکوری قادرکەرەم بەسەرپەرشتی عەمیدی هێزی تایبەت (بارق عبدالله حاج حنتە) کەوادیار بوو فەرماندەی گشتی عەمەلیاتی ئەنفالی سێیەم بوو لەگەرمیان ئەو ڕەتڵانە کە لەڕۆژئاواوە پێشڕەویان دەکرد هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکیان نەهاتە ڕێ بەناوچەکەدا گوزەریان کرد کەوا لەپەلاماری بەهاری 1987 بەشێوەیەکی بەربڵاو وێرانکرابوون خەڵکەکەی ڕاگوێزرابوون ئەوان خێرا لە دوا نیوەڕۆیەکی درەنگ (10) نیساندا گەیشتنە قادر کەرەم.

لە11ی مانگدا هێزێکی زۆر سەیدجەبار فەرماندەی بوو لەقادرکەرەمەوە دەرچوون بۆ تێکدانی گوندی برایم غولامی عەشیرەتی زەنگەنە. ئەگەر چی خەڵکی گوندەکە پێش شاڵاوەکە گوندەکەیان چۆڵ کردبوو بەڵام لەئەنجامدا ناچار بوون خۆیان بەدەستەوە بدەن (51) کەسیان لێ بێ سەرو شوێنکرا.

لەم قۆڵەی پەلاماری گەرمیانەدا ناوچەکانی جەباری و زەنگەنە کەدوو هۆزی گورەی کوردن بەر کوشندەترین زیان کەوتن، جەباری یەکێکە لەهۆزە گەورەکانی ناوچەکە گوندەکانیان دەکەونە باکوری تەپۆڵکەکانی ناوچەکانی زەنگنەوە.

هەرچی زەنگەنەیە دانیشتوانی کۆمەڵەگوندێکی ڕۆژهەڵاتی قادرکەرەمن، ڕەتلێکی گەورەی سوپا بەهاوکاری دەیان تانك لەناحییەی سەنگاوەوە ڕووەو ڕۆژئاوا چوون بەنیازی شکاندی هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەدۆڵی گۆلباخدا کە بریتی بوون لەتیپی 59و ئەوانەی لەتیپی 55ی قەرەداخەوە هاتبوون سوپا بەڕۆژ هەتا وەکو ئێوارە ئینجا توانی هێزەکانی پێشمەرگە بشکێنێت، ئەویش دوای ئەوەی 7 پێشمەرگە لەگەڕاو و 3پێشمەرگە لە قەیتول شەهیدکران، بۆیە بەناچاری بەرەو باشور پاشە کشێیان کرد.

دوای ئەوەی سوپا بەسەر گوندەکانی قایتەوەن و باسەڕەدا تێپەڕی گەیشتە قەیتول، بەڵام خەڵکی گوندی قەیتول بەدوو حەفتە پێش ئەوەی ئەنفالیان پێگات چووبونە هەڵەتەکانی پشتی گوندەکەو لەوێدا خۆیان شاردبۆوە لەدوای ڕاوێژکردن لەگەڵ یەکتری گەیشتنە ئەو ڕادەیەی کەڕوەو چەمچەماڵ بڕۆن کەچەند سەعاتێك لێانەوە دوربوو بەڵام هێزەکانی بارق گرتاینیان و ناونوسیان کردن و بە دوو کاروانی ئیڤا ڕەوانەیان کرد یەکێکیان ڕووەو سلێمانی ئەوەی تریان ڕووەو کەرکوك، بەشێکی زۆری ئەوانە هەرگیز نەگەڕاونەوە، هەروەها سوپا توانی لەناخافڵدا خەڵکی گوندی قیرچەی سەد ماڵی داگیر بکات کە گوندێکی چەپی دوورە دەست بوو، پەلاماردانی ئەم گوندە لەبەرەبەیانێکدابوو کەهێشتا خەڵکی ئەم گوندە لەخەو هەڵنەسابوون، تەنها ژمارەیەکی کەم دەربازیان بوو، بارق خۆی سەرپەرشتی ئەو هێزانەی کرد کەپەلاماری ئەو گوندەیان داو دوای ئەوەی دایان بەسەر گوزەرەکەدا تەواوی پیاوەکانیان لەشوێنێك کۆکردەوە کەلەپچەیان کردن، یەکەم جار پیاوەکانیان بە ئیڤا ڕەوانە کرد، دوای ژن و منداڵ و پەککەوتەکان ڕاپێچکران، پاش ئەوە سەربازەکان ماڵەکانیان تاڵانکردو بەبەرچاویانەوە خانوەکانیان سوتاندو بە بولدۆزەر تەختی زەویان کرد بەم شێوەیە لەم گوندە 60کەس بێ سەروشوێنکران.

لەئامارێکدا کە لە14 گوندی ناوچەی زەنگنەدا کراوە دەرکەوتووە لەکۆی 339 ماڵ پێش شاڵاوەکە 795کەسیان ئەنفال کراوە لەم ژمارەیەدا 25 ماڵ بەتەواوی بن بڕوونە ژمارەی ئەنفالکراوەکانی ناحییەی قادرکەرەم زۆرن لەبەر زۆری ژمارەی گوندەکان و توندی هێرشی ڕژێم، ناکرێت ناوی گوندەکان یەك بەیەك بهێنین بەڵان ئەمە پوختەیەکە لەسەر ئەنفال ناحییەی قادر کەرەم.

### 2. پەلاماری باشوری گەرمیان و سەنگاو

سەنگاو یەکێکە لەوشوێنانەی کەبەر سەخترین و تراژیدیاترین وبەئازارترین وێنەکانی ئەنفال لەهەرێمی کوردستاندا کەوتووە، بەڕادەیەك کەچەندین خێزان و بنەماڵە ڕیشەکێش کراون کە هیچ نەوەکیان نەماوە، بەبێ گوێدان بەڕەگەزو تەمەن و پێشمەرگەو مەدەنی و منداڵ و گەورە

وەسوپا زۆربەی خەڵکی گوندەکانی ئەم ناوچەیە ڕاپێچ کرد، لەباشوری گەرمیانەوە ڕەتڵی یەکەمی هێزەکان لەشلرۆچکەی کفری یەوە سەعات 6:30 بەیانی 9ی نیسانی 1988 کەوتە ڕێ هەرلەهەمان ڕۆژدا ڕەتڵەکانی تر لەکەلار و پیبازو پۆنگەڵەوە کەوتنە ڕێ، بەمەبەستی ئابوڵقەدانی ناوچەکەو بەکۆمەڵکردنی خەڵکی ناوچەکە دەوریاندا و گوندەکانیان ڕووخان وکۆکردنەوەی خەڵکەکەی بۆسەر ڕێگاو بانە سەرەکی یەکان.

ڕەتڵەکەی کفری بەسەرپەرشتی لیوا سامی سەربە فەیلەقی یەك بوو سەرجەم گوندەکانیان ڕووخاندو خەڵکەکشیان دەستگیر کرد.

هەربۆیە سوپا ئابلۆقەی سەرجەم گوندەکانی داو یەك لەدوای یەك وێران کران، سەرجەم دانیشتوانەکەی جگە لەخۆبەدەستەوە دان هیچ ڕێگە چارەیەکی تریان نەبوو.

له1988/4/14 لوتکەی هێرشی ئەنفال بوو. لەم ڕۆژەدا بەپێی خەملاندی (کۆمیتەی بەرگری لەمافی قوربانیانی ئەنفال) زۆرترین ژمارەی ئەنفال لەم ڕۆژەدا ئەنجام دراوە لەناوچەی گوندەکانی سەنگاو باشوری گەرمیان کۆکرانەوە بە ئیڤای سەربازی و تراکتۆری گوندەکان ڕەوانەی قەڵا سپی یەکەی قورەتوو کران هەر لەوێشەوە بەرەو چارەنوسێکی نادیار ڕەوانەکران، هەربۆیە ئەم ڕۆژە کرابەڕۆژی ئەنفال، ئەم هێرشە لەڕۆژی 1988/4/20ز کۆتای هات یەك گوندی گەرمیان بەپێوە نەما هەموو ڕوخێنران بەپێی خەملاندی (کۆمیتەی بەرگری لەمافی قوربانیانی ئەنفال) ڕێژەی بێ سەرو شوێنکردنی ئەم ناوچەیە بەم شێوەیە بوو سنوری ناوچەی چەمچەماڵ (5645) کەس بوو قادرکەرەم (14863) کەس سەنگاو(4922) کەس بوو.

**قۆناغی دووەمی ئەنفالی چەمچەماڵ و دەوروبەری:**

لەپاش پەلامارە کوتوپڕەکەی گەرمیان هیچ هەواڵێکی تر نییە کە چی ڕووی دابوو، ئەوهێزانەی پێشمەرگە کەلەوێ مابوونەوە بەرەو باکورڕۆشتن لەهەمان کاتیشدا سوپا خۆی ئامادەکربوو بۆ بەرەنگاربونەوەیان لەوێ و دەزگای أستخبارات و ئەمن کەوتنە گەڕان بەشوێن ئەوانەدا کە دزەیان کردبووە شارۆچکەو کۆمەڵگاکانەوە بۆ دەستگیرکردنیان لە (4)مایسدا بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی فەرمانێکی دەرکرد هەموو ئەوکەسانەی کە لەناوچەی عەمەلیاتی ئەنفالی سێدا لەلایەن سوپاوە گیراون بەدەست بەسەری دەمێننەوە.

بۆباسکردنی قۆناغی دووەمی ئەنفالی چەمچەماڵ پێویستە باسی ئەنفالی چوار بکەین کەبەئەنفالی دۆڵی زێی بچووك بەناوبانگە کەواتە ناحییە ئاغجەلەرو گوندەکانی دەوروبەری گەوتنە بەرشاڵلوی ئەنفالی چوارەوە.

لەپێش شارۆچکەی چەمچەمالەوە زەویەکی بەتیژی شۆڕش دەبێتەوە یەکسەر لەلای باکورەوە دۆڵی پان و بەرینی زێی بچووك دێت. کەهێڵی سنوری هەردوو پارێزگای کەرکوك و هەولێرە، لێرە ئەوناچەیە بووە پەناگەی کاتی ئەوهێزانەی (ی.ن.ك) کەلە ئەنفالی سێدا هەڵهاتبوون. دوای

ئەوەی کە هێزی پێشمەرگە گەیشتنە ئەو بڕوایەی کەبەرگری کردن هیچ سودێکی نی یە بۆیە کشانەوە بۆئەم ناوچەیە.

ئەم قۆناغە واتا ئەنفالی چوار لەڕۆژی 3 ی مایسی 1988 دەستی پێکرد لە 15ی 5 هەمان ساڵدا کۆتایی هات.

**کیمیا باران کردنی گۆپتەوپە و عەسکەر**

هێرش و پەلاماری ئەنفالی چوار بە کیمیاباران کردنی گۆپتەپەو عەسکەر دەستی پێکرد لەپاش نیوەڕۆی 1988/5/3 کاربەدەستانی عێراق تاوانێکی تریان خستە پاڵ تاوانەکانی تریان کەئەویش بریتی بوو لەکیمیابارانکردی گوندەکانی گۆپتەپەو عەسکەری سەربەناحییەی ئاغجەلەری قەزای چەمچەماڵە ئەم کردە دڕندەیە بووە بازنەیەك لەزنجیرەی دەیان تاوانی تر کە پرۆسەی جینوسایدی کورد دەژمێرێت.

گۆپتەپە بەمانیای گردی سەوزدێت لەتورکی دا، تەواوی ماڵەکانی بەقەدپاڵی گوندەکەوەبوون، بەڵام هەندێ ماڵ لەکاتی کشتوکاڵکردندا دەچوونە خوارەوە واتە سەر زێی بچووکی ئەم گوندە لەساڵی 1963 لەسەردەمی یەکەم حکومەتی بەعس سووتاوە گۆپتەپە هەرچەندە گوند بوو بەڵام زیاتر لە شارۆچکەیەك دەچوو لەلایەنی کەمەوە (300) ماڵ و هەندێکیش دەڵێشن (500) ماڵ بووە. دانیشتوانەکەی گەنم و جۆو لۆکەو بەرهەمی زەوی و زارەو خەریك بوون.

گۆپتەپە لەناحییەی ئاغجەلەرەوە نیو سەعات دوورە ئەم گوندە لەڕۆژگاری مەلا مستەفای بارزانیەوە پێشمەرگەی زۆری تێدا بووە لەساڵی 1982 گوندەکە بنکەیەکی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) گرتۆتە خۆ. لە ڕۆژی 1988/5/3 ڕۆژێکی دڵگیری بەهاربوو ڕەمەزان بوو ژنان نانیان دەکرد ژیان گوزەری دەکرد، پێشمەرگەکان پۆل پۆل دەهاتن و لە گۆپتەپە لایان دەدا و هەواڵی شکستەکانی گەرمیان و قەرەداخیان دەبیست، کاتژمێر 5:40 کاتی ئێوارەی 1988/5/3 نیو کاتژمێر پێش ئەوەی خەڵك ڕۆژوو بشکێنێ شەش فرۆکەی جۆری مێك گۆپتەپەیان بۆردوومان کرد.

عبدالقادرعبدالله عەسکەری لەتەمەنی 60 ساڵیدا بوو گوێی لەهاژەی فرۆکە بوو کە بۆردوومان کەرەکان بوو کەبرای عەلی عەسکەری یە عبدالقادر ڕایگەیاند پۆلێك فرۆکەی جۆری مێك هەڵیان کوتایە سەر گوندەکەیان کە گوندەکە هێزی پێشمەرگەی تێدابوو لەناکاو 8تەقینەوە پەیدا بوو لەدوایدا ستوك و دووکەڵی سپی پەیدا بوو بۆنێکی خۆشی لێ دەهات لەو کاتەدا بەهەمان شێوە گوندی عەسکەریشی بۆردوومان کرد لە ئەنجامدا 69کەس لەخەڵکی گوندی عەسکەر شەهید بوون، بەڵام دوای ئەوە بەرەو گوندەکە گەڕاینەوە چونکە لەگەڵ بۆردوومان کردن ڕاهاتبووین وامانزانی وەك جارانی ترە، بەڵام دوای لەهۆش خۆم چووم و ئاگام لە خۆم نەما.

هەروەك نەسرینی مامۆستالالەتیف بۆمان دوا، نەسرین تەواوی ڕووداوەکەی بەبیردەهاتەوە کاتێك فڕۆکەکان هاتن گوندەکەیان بۆردومان کرد بەتەواوەتی خەڵك شڵەژا نەیاندەزانی چی

بکەن نەسرین لەو کاتە ئامۆژگاری هێزەکانی پێشمەرگەی بەبیرهاتەوە کەلەکاتی کیمابارانکردندا واچاکە بەرەو رووی رووبارەکە برۆن پەرۆی تەڕ بەدەم و چاویانەوە هەڵبستن، نەسرین خۆیو 7منداڵەکەی بەرەو رووبارەکە رایان کرد بەلام کچە گەورەکەی بەرەوجادەکە رایکرد دوای دەستی هێزەکانی رژێم کەوتوو نەیان بینیەوە بەم شێوە نەسرین و 7منداڵەکەی بە هۆی پەرۆی تەڕەوە رزگاریان بوو.

محمد کانیبی کە دەرچووی زانستە رامیارییەکانی زانکۆی صلاحدینە وتی کە دایکم خەریکی نان کردن بوو فرۆکەکان هێرشیان کردە سەر گۆپتەپە بارودۆخەکە تەواو شێوا باوکم لەسەر رووبارەکە بوو دایکم لەکاتی بۆنکردندا بۆنەکەی ناسیەوە یەکسەر بەتانیەکی تەڕکردوو لەمن و خوشکەکەمی ئاڵاند بەرەو رووبارەکەی بردین بەم شێوەیە بەخت یاورمان بوو لەهێرشی کیمابارانکردنی گۆپتەپە رزگارمان بوو محمد بەهەناسەیەکی قوڵەوە ووتی کەس و کاری زۆرم لەم هێرشەدا تیا چوو.

دەربازبوان دەڵێن کە نزیکەی 300 لاشەیان ناشتووە بەڵام دواتر (ی.ن.ک) لیستێکی 154 ناوی بڵوکردەوە کەلەپەلامارەدا کوژران، هەندێ لە کوژراوەکان لەزەویەکەی خۆیاندا نێژران هەندێتریان لە ئاوەکەدا کوژران، هەندێکیان لەبەردەم مزگەوتەکەدا چاڵێکی گەورەیان بۆیان هەڵکەندوو بەکۆمەڵ نێژران، یەکێ لەسەربازەکان رایگەیاند کەخۆیان پاش چەند رۆژێ هەندێ لەکوژراوەکانیان داپۆشی چونکە دنیا گەرم بوو لاشەکان تێك چووبوو کێشەی تەندروستی بۆسەربازەکان دروستکردبوو لەدوای پەلامارەکە ئەو خەڵکانەی کەرزگاریان بوو هەوڵیاندا خۆیان بگەیەننە شوێنە سەلامەتەکان رژێم ئاوەکەی دووکانی زیادبەردابووەوە بۆئەوەی کەس توانای پەڕینەوەی نەبێ لەبەر ئەوەی رزگار بوان بەرەو گۆمەڵگای زۆرە ملێی تەکییەو باینجان رۆشتن.

گوندی گۆپتەپە بەتەنها بەژمارەی قوربانیانی کیمیاباران و ئەنفالەوە دەگاتە (364) کەس ئەگەر چی هەندێ سەرچاوە دەڵێ دەگاتە نزیکەی (500) کەس، بەیانی رۆژی 4ی مایسی 1988 هێرشی پیادەی رژێم لەهەموو لایەکەوە دەستی پێکرد ئەم هێرشە بەفەرماندەیی لیوا روکن (سوڵتان هاشم )بوو بەشێك لەم هێزە لە چەمچەماڵ و تەکییەوە کەوتنەڕێ بەرەو ناحیەی ئاغجەلەر ئەم ناحییە ساڵێك لەوەبەر رووخابوو، پاشان هێرشێکی تر لە سوسێوە بەرەو سورقاوشان کەوتە رێ و هێرشێکی تر لەناوچەی تەق تەقەوە بەرەو گوندەکانی لێواری زێی بچووك وشێخ بزێنی و گۆپتەپە کەوتەرێ، هێزێکی تر بەرەو گوندەکانی نزیك قەزای کۆیە کەوتنە رێ، هەندێك خەڵکی ئەم ناوچەیە بەرەوجادەی چەمچەماڵ سلێمانی و هەندێکی تریان بەرەو تەق تەق بەرێ کەوتن لەوێ دەستگیرکران هەروەك لە راپۆرتی دەست نووسی رۆژانەی ژمارە (8280) لە 1988/5/6 لەفەرماندەی فەیلەق یەکەوە بۆبارەگای عەمەلیاتی سوپا نێردراوە

تا ئەو ڕۆژە لەنزیك شارۆچکەی تەقتەق ئەوانەی خۆیان بەدەستەوە داوە (60) پیاو (129) ژن و (396) منداڵبوون.

سوپا لەڕۆژی 1988/5/15 سەرجەم گوندەکانی ئەم ناوچەیەی ڕووخاند تەنها لەناحییەی ئاغجەر 67گوندی تێدابوو (2813) خانووی تێدا بوو (14864) کەس تێدا دەژیان کە (7201) کەس ئەنفالکراوە.

**ڕاپەڕینە جەماوەری یەکەی شاری چەمچەماڵ**

ڕاپەڕینە جەماوەریەکەی شاری چەمچەماڵ لە ڕۆژی 1988/4/11 دەستی پێکرد جێگای داخە مێژوونوسان و ئەدیبان بایەخی ئەوتۆیان پێنەداوە، کەلەدژی ئەنفالچیەکان ڕووی دا هەوڵی مەردانەی باشیان داو بۆڕزگارکردنی ئەنفال کراوەکان.

کەواتە ئەو ڕاپەڕینە یەکەم بەرهەڵستکردنە دژی ڕژێمی بەغداو ڕووبەڕووبونەوەی ئەنفالچیەکانە کەدژی خەڵکی بێتاوانی کورد ئەوتاوانەیان ئەنجامدا بەگوێرەی سەرچاوە مێژوویەکان خەڵکی چەمچەماڵ و گوندەکانی دەوروبەری دەسەڵاتی بێگانەیان قبوڵنەکردووە.

م.عبدالرحمن صدیق سەرپەرشتیاری پەروەردەیی لەپەروەردەی چەمچەماڵ دەڵێ ئەم ڕاپەڕینە لەبارودۆخێکدا ڕوویدا خەڵکی لە معاناتێکی زۆردا بوون ئەگەری ئەوە نەبوو کەهیچ کات دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس تووشی لاوازی بێت، هێشتا مانگێك بەسەر کیمیابارانکردنی هەڵەبجەدا تێ نەپەڕیبوو خەڵکی بەتەواوی چاوترسێن کرابوون، تروسکەی هیوا بەخش لەهیچ شوێنێك نەبوو ئەم ڕاپەڕینە ڕێکخستنی حیزبی لەپشتەوە نەبوو بەڵکو ڕۆڵی هەڵسوڕێنەری ئەم ڕاپەڕینە (م. لەتیف فاتح فەرەج) بوو کەجەماوەری چەمچەماڵ بە منداڵ و گەنج و ئافرەتەوە بەشداریان تێدا کرد، هەروەها قالە شێت ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەو ڕاپەڕینەدا هەروەها فەتاح حەسەن کە ئامرمەفرەزە خاصە بوو ڕۆڵێکی بەرچاوی لەو ڕاپەڕینە جەماوەری یەی شاری چەمچەماڵدا هەبوو لەماڵی ئەوانە تەقە لە کۆپتەرەکانی ڕژێمی بەعسی ڕووخێنراو کرا لەئەنجامی بۆردومان کرنی کۆپتەرەکان بوە هۆی شەهید کرنی کچەکەی فەتاح حەسەن بەناوی (فەیم فەتاح حەسەن) ئێمە توانیمان نزیکەی (800) کەس ڕزگار بکەین کاتێك هێزەکانی ڕژێمی بەعس گیراوەکانیان هێنا بەرەو ناوشاری چەمچەماڵ زۆربەیان خەڵکی قەرەحەسەن و قادرکەرەم بوون خەڵکە گیراوەکان لەبەردەم سەنتەری ڕۆشنبیری ئێستا ڕاگرت کەدەکەوێتە ناوەندی شاری چەمچەماڵەوە وەعدیان پێدابوون کە بۆ هەر خێزانێك (200)م2 زەوی و عەقاریان دەدەنێ و یارمەتیان دەدەن، لەکۆمەڵگاکاندا نیشتەجێیان دەکەن بۆیە ئێمە کاتێك کە کۆبوینەوە هێرشمان کردە سەر ئۆتۆمۆبیلەکان خەڵکە گیراوەکە دژایەتی دەکردین دانابەزین هەندێکیانمان بەزۆری لەجامی سەیارەکانەوە دەردەهێنان، هەندێکیشیان لەکاتی ئاگادارکردنەوەیان بەگوێیان کردین وەهەڵهاتن هێزەکانی ڕژێم بەربوونە گیان ڕاپەڕیوەکان تەقەیان کرد بۆبڵاوکرنەوەی خەڵکەکە.

محمد تاهیر لاله برازای فەتاح حەسەنیش دەڵێ کاتێك خەڵکە گیراوەکان لەناوچەی دەرەوەی چەمچەماڵەوە بەرەو چەمچەماڵیان هێنا ئەمەش کاردانەوە لەسەر خەڵکی چەمچەماڵ دروستکرد بوە هۆی وروژاندنی ویژدانی خەڵکەکە کە ژن و منداڵ بەرەو مەیدانی مەرگ ڕاپێچ دەکران. یەکێك لەو کەسانەی کەڕۆڵی کاریگرەی هەبوو لەو ڕاپەڕینەدا فەتاح حەسەن بوو کە ئامر مەفرەزیەکی چەکداری بوو ویژدانی ئەوەی قبوڵ نەکرد کەخەڵکەکە ئەنفال دەکەن بۆیە کەوتە هاندانی خەڵك کە ئەو ڕێگایە بگرن و خەڵکی ئەنفال کراو ئازاد بکەن ئەوخەڵکانەی کەبەشداری ئەو ڕاپەڕینەیان کرد چەکدارەکانی ئەویشی تێدا بوو، کەدوای ئازاد کردنی ئەو خەڵکە یەکێك لەو ماڵانەی کەدەرگای واڵابوو بۆئەوەی خەڵکی ئازادکراو بگرێتە خۆی ماڵی فەتاح حەسەن بوو لەم کاتەدا (بارق محمد عبدالله) خۆی سەرپەرشتی ئەو بارودۆخەی دەکرد کەلە چەمچەماڵ ڕووی دا (حوکمی عورف) یان دەرکرد ئەوەی بهاتایە دەرەوە بۆیان هەبوو بیکوژن واتا لەم ڕۆژەدا بارودۆخێکی نائاسایی چەمچەماڵی گرتەوە .

ئەوەبوو (11-12) کۆپتەری ڕژێم لەئاسمانی چەمچەماڵدا دەسوڕانەوە لەماڵی فەتاح حەسەنەوە تەقەیان لە کۆپتەرە سەربازیەکان کرد ئەوانیش ماڵی ناوبراویان بۆردومان کرد لەئەنجامدا کچەکەی بەناوی (فەیمە فەتاح حەسەن) شەهید کراکە قوتابی شەشەمی سەرەتایی بوو هەروەها کچەکەی تری بریندار بوو وە ڕەعنەی خوشکی و أسعدی برای برینداربوون وە عەدنان و شەهید خالید و منیش بریندار بوین لەم ڕاپەڕینەدا چەند کەسایەتیەك ڕۆڵی کارایان هەبوو ئوانیش عبدالحمن صدیق و نازم چاوشینو زۆربەی ئەوکەسانەی لەم ڕاپەڕینەدا بەشداریان کرد قوتابی بوون وەخەڵکی تریش بەشداریان تێدا کرد وە زۆربەی ئەو کەسانەی کە شانسی ڕزگاربونیان هەبوو ژن و منداڵ بوون.

لەتیف فاتح فەرەجیش لەسەر ڕاپەرینەکەی چەمچەماڵ دەڵێ لەوکاتەی لەپۆلی شەشەمی ئامادەیی بووم کۆمەڵێك قوتابی لەو قوتابیانە یاسین محی الدین کەخەڵکی سەنگاو بوو، قیس محمد عزیز،عبدالرحمن صدیق، نازم چاوشین و هی دیکەش بووین هانی قوتابیانماندا کەبەرگری لەو خەڵکە بکەین کە ڕاپەرینی شاری چەمچەماڵ دەستی پێکرد سەرەتا لەسەر شەقامی سلێمانی کەرکوك بوو جامی ئۆتۆمۆبیلمان شکاند هاتینە سەر شەقامی سەنگاو داوامان لەهەندێ چەکداری سیدمجید کرد چەکمان بدەنێ بەڵام ئەوان ووتیان ئێمە خۆمان دەست بەکار دەبین وە پارێزگاری لەو خەڵکە دەکەین لەهەمان کاتدا سیدمجید هەڵوێستی باشی نواند خەڵکی بەسەیارە بۆماڵی خۆی دەبرد کاتێك کۆپتەرەکان بینیان کە خەڵکی بۆئەم ماڵە دەڕوات تەقەیان کرد لەئەنجامدا چەند ئۆتۆمۆبێلێك لەبەر ماڵیان سوتا.

ئەوە بوو خەڵکمان بەزۆر ئازاد دەکرد خەڵك هەبوو خۆی لێ تورە ئەکردین کاکە بۆ لێمان ناگەڕێن زەوی و تەعویزمان ئەدەنێ ئاوا سیخورەکانی بەعس ئەو هەژارانەیان تێگەیاندبوو هەروەها تەقەیان لەهەڵهاتوەکان دەکرد من خۆم گەنجێکم بینی هەڵهات بارق خۆی بە دەمانچە

تەقەی لێکرد، لەدوای بەکلاشینکۆف تەقەی لێکرد لەخواوە بەرنەکەوت لەوکاتە بەمووکەبیرە هاواریان دەکرد کەس ئەو هەلاتوانە نەگرێت خۆی ئەگینا لە سێدارە دەدرێ هەروەها کاغەزیشیان بەمەبەستی هەڕەشەکردن هەڵدایە خوارەوە زۆربەی گیراوەکان خەڵکی قادر کەرەم بوون خەڵکی زۆر ڕزگارکران بەتایبەتی لە کۆمەڵگای شۆرش. لەتیف فاتح لە قسەکانی بەردەوام بوو ووتی قالە شێتێك هەبوو لەچەمچەماڵ خەڵکی گوندی گورگەیی بوو لەناوبازار دەست گێڕی دەکر هەروەها قەبری بەبێبەرامبەر هەڵدەکەنی لەدوایدا لەبارودۆخێکی نادیاردا شەهیدکرا قالە شێت ڕۆلی کاریگەری هەبوو لەناوبازاردا هاواری دەکرد خەڵکینە ڕاپەڕینە جیهاد جیهادە .. بۆئەم ژینە سەر شۆڕمەکەن، ئەم ڕاپەڕینە تاوەکو مەغریب بەردەوام بوو یەك کچ بەناوی فەیمە فەتاح شەهید بوو بەڵام ڕۆژانی 12-1988/4/13 بارودۆخەکە نائارام بوو ڕژێم خەڵکی دەگرت.

هەروەها ئازاد کە خەڵکی گوندی قاسم بەگی سەربەناحییەی سەنگاوە دەلێ دانیشتوانی گوندەکەمان 14 ماڵ بوو بەرشاڵاوی ئەنفال کەوتوە لەلایەن بارق دانیشتوانی گوندەکەمان لەقادرکەرەم گیران لەدوای دوو ڕۆژ بەرەو چەمچەماڵیان هێنان ئەو کاتە خۆم بەرپرسی هێزی (ی.ن.ك) بووم لەناوشاری چەمچەماڵ لەگەڵ سالار ئەحمەد بەگ و هاشمی کوڕی بۆبەردانی خزم و کەس و کارەکەم هاتین، کۆمەڵێك بەعس لای موکافەحە وەستابوون نزیك هۆڵی ڕۆشنبیری پڕبوو لەخەڵك گەڕام هیچ کەس لە خزم و کەس و کارەکەی خۆمی تێانەبوو لەگەڵ کاك سەرکەوت أحمد بەگ کەباوکی ئامر مەفرەزە خاصەبوو بەڵام کوردپەروەربوو هەرلەسەر کوردایەتی عیدام کرا لەبەر ئەوەی کۆمەلێ پێشمەرگەی گرتە خۆیی.

کاتێك خزم و کەس و کارەکەی ئێمەی تێدا نەبوو من ووتم خۆ ئەمانەش هەر خزم و کەس وکاری ئێمەن و شەرەفمانن وە ئەمانەش کوردن و هەموومان یەکین، بەکۆستەری دواترمان ووت دابەزن ئێوە تیادەچن بەرەو مردنتان دەبەن بێ سەرو شوێنتان دەکەن بەهەرحاڵ (9) ئافرەتمان داگرت کردمان بەناو لاندکرۆزێکی پیکابی کەهی کاك سەرکەوت بوو پۆلیسی أجام و أستخبارات چاوویان لێبوو تەقەیان لێکردین شۆفێرەکە بەبەگدا ئۆتۆمۆبیلەکەی دەرکرد بەرەوکۆڵانەکان ڕۆیشتین بەر فیشەکیان داین خۆمان کرد بەماڵی سابیر ئاغا لەگەرەکی بێ کەس ئافرەتەکانمان شاردەوە و دواتر ئازادمان کردن.

قالە شێت ڕۆڵێکی کاریگەری لەو ڕاپەڕینەدا گێڕا شیعرەکەی م. لەتیف فاتیحی دەووتەوە هەروەها م.لەتیف پشکۆی ئەو ڕاپڕینە بوو وەڕۆڵێکی جوامێرانە لەلایەن فەتاح حەسەنەوە گێڕدرا کچەکەی کردە قوربانی هاونیشتیمانەکانی لەئەنجامدا توانیان (500-600) کەس ڕزگار بکەن بەم شێوەیە چەمچەماڵیەکان مێژوویەکی پڕشکۆیان تۆمارکرد.

بۆ نوسینی ئەم توێژینەوەیە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


1. هاشم سید أحمد , چەمچەماڵ لەیادەوەریەکانمدا 1960–1981, سلێمانی 2000
2. عبدالله محمد و مستەفا کریم , گۆڤاری سەنتەری برایەتی , هەولێر, 2002, ژ24
3. لەتیف فاتیح , چەمچەماڵ لەدوێنیٚ وە بۆئەم ڕۆ, ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی ,2001, ژ436
4. فوزی رشید و جمال بابان , تاریخ الکرد القدیم , هەولێر ,1991
5. کەریم زەند , جوگرافیای کوردستان , سلێمانی ,2001
6. یوسف معروف دزەی, ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەکانی تاوانی ئەنفال لەکوردستان نامیەیکی ماستەرە پێشکەشی کۆلێژی ئادابی زانکۆی صەلاحدینکراوە ,2001
7. محمد ڕەووف , ئەنفال و ڕوهەندە سوسیولۆجیەکان ,سلێمان ,2005
8. میدل ئێست ووچ , جینۆساید لەعێراقدا ....پەلاماری ئەنفال بۆسەر کورد , و.محمد حمە صالح , سلێمانی , 2004
9. تاڵەبانی و محمد , ناهیدەو جاسم ,ئەنفالی گەرمیان ڕەهەندە دیوگر کۆمەڵایەتیەکان , سلێمانی ,2002
10. هێمن باقر و بەرهەم عمر ,ئەنفالی سێ و کاریگەریە کۆمەڵایەتیەکانی لەسەر پاشماوەی ژنی ئەنفال , سلێمانی ,2004
11. مەلاشاخی , ئەنفالی خاڵخاڵان , سلێمانی ,2001
12. یوسف ناصح أحمد , منیش لە چەمچەماڵ بووم , ڕۆژنامەی یەکگرتوو , ژ603,لا4

# کاریگەری ئەنفال وکیمیا باران لەسەربزوتنەوەی چەکداری کوردی

هۆشمەند عەتا

پەسەندکردنی بڕیاری(598)ی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە(8\8\1988)لەنێوان عێراق وئێراندا، هەروەها هێرشی نوێی عێراق بۆ سەرناوچە کوردییەکان وگەڕانەوەی هێزەکانی ئێران بۆناوخاکی خۆیان، کەهیچ ئاگادارییەکی پێشینەیان بەپارتەکوردییەکان نەدابوو، یارمەتی هێزەکانی عێراقی دابەشێوەیەکی چاوەڕووان نەکراوهەلومەرجی ستراتیژی بەقازانجی خۆیان بگۆڕن، کوردجارێکی تر واهەستی کردکەهەلومەرجی ساڵی (1975)دوبارەبۆتەوە، شوێنەواری شکستی ساڵی (1988) لەڕوی دەرونییەوە، زۆرترسناکتر بوو لەشکستی ساڵی(1975)، فراوانی جینۆساید کەهەڵەبجە ڕەمزەکەی بوو، کەم کەم دەرکەوت، ڕانەوەی جەنگی (عێراق-ئێران) زیانێکی زۆری بەبزوتنەوەی چەکداری کووردی گەیاند، پێموایە لە نسکۆی(1975) خراپتر بوود، چونکەکوردستان بەتەواوەتی چۆڵکرابوو، نزیکەی(4000) گوند خاپورکرابوون، تەنها لەپارێزگای هەولێر (25) ئۆردوگای زۆرەملییێ دروستکرابوون، ەپارێزگای سولەیمانی چەندانی تر دروستکرا بوون، لەوانە (حاجیئاوا، شکارتە، تەکییە، ئەلایی، نەسیر، هەڵەبجەی حدای،0000 هتد)، ئەمە بێجگە لەوەی کە ژمارەیکی زۆر شارو شارۆچکە چۆڵکرابوون وە بەهەمان شێوە دانیشتوانەکەشی ئاوارەی ئۆردوگاکان کرابوون، لەنومنەی شارەکانی (هەڵبجە، پێنجوێن، چۆمان، چوارتا، قەلادزە، ماوەت، دێگەڵە، سورداش، خورماڵ، قەرە داغ، سەنگاو، بارزان، هیران، ئامنجەلەر،00000هتد)، سەرەڕای ئەوەی بەفارمانی حکومەت هاتوچۆ لەهەموو ناوچەقەدەغەکراوەکان یاساغکرا لەهەمو شارو شارۆ چکەو گوندەکان.

جگە لەمەش ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی گوندو شارەکان ئاوارەی سنورەکان بوون بەهۆی پرۆسەی ئەنفال و ڕووداوەکانی ساڵی (1988)، جەنگی کوردو عێراق وای لەخەڵکەکەکرد کەخاکەکەیان بەجێ بهێڵن، بەنزیکەی (400000) کەس دەخەملێنرێن، کەدەکاتە(1\10)ی هەموودانیشتووانی کوردستانی عێراق، بڕی (370000) لەئێران، (28000) لەتورکیا، (3000)کەس لەپاکستان, بڕی (2500)کەسیش لەڕۆژئاوای ئەوروپا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە (1970)وە بەهۆی دەرکردنی فەیلیەکان لەعێراق ژمارەیان لەئێران گەیشتبووە(50000)کەس .

پەنابەرانی کورد لەئێران ژمارەیان زیادی کرد لە1988, هەموو ئەوانە بەسەر چادرگەکاندا دابەشکرابوون لەکوردستانی ئێراندا، ئەوانە لەمافی پەنابەری بێ بەهرەبوون،

ڕێکخراوەنێودەوڵەتیەکان چاودێرییان نەدەکردن، بارودۆخی تەندروستییان باش نەبوو، بەهۆی نالەباری کەش وهەواو خراپی ئاستی گوزەران وبژێوی ڕۆژانەوە.

هەلومەرجی پەنابەران لە تورکییادا لەئێران باشتر نە بوو، تورکییا هەر لەسەرەتاوە پەنابەری قەبووڵ نەدەکردو ڕای گەیاند هەرکەس سنور ببەزێنێ دەی گەڕێنێتەوە، چونکە لەبەر وروژاندنی هەستی نەتەوەی کوردەکانی خۆی دەترسا، بەڵام بەکار هێنانی چەکی کیمییاوی لەلایەن عێراقەوە بووەهۆی زیاتر ترسی ئاوارەکان بەڕادەیەك دەسەڵاتدارانی تورك نەیانتووانی لەسەرسنورەکان بەربەشاڵاوی پەناهەندەو ئاوارەی کوردی عێراقی بگرن، هەرووەها تورکییا لەو کاتەدا بۆ سەرنج ڕاکیشانی دەرەوە سیاسەتی گۆڕاو ڕێگەی دا کە کوردەکان بێنە ناو خاکی وڵاتەکەیەوە، بەڵام مافی پەنا بەرییان پێنەدرا، ئەوان لە چەندئۆردوگایەکی وەك (موشی، ماردین، دییاربەکر)دا نیشتەجێ کران، لەڕاستیدا تورکەکان نەیاندەهێشت ڕۆژنامەنوسان و پیامنێرانی بیانی سەردانی ئەو ئۆردوگایانە بکەن، هەروەها تەگەرەیان دەخستە بە ردەم مافی مرۆڤ لەمەڕلێکۆڵینەوەی ئاوارەکان دەربارەی شوێنەواری چەکی کیمیای، چونکە تورکییا خوازییاری هەرچی زوتری گەرانەوەی پەنابەرانی کورد بوو، هەر وەك نەیدەویست هیچ لێبوردن پیشان بدات لەبەرامبەر بەغداد بە هەڵووەشاندنی قەرزی (دووبلیۆن دینار)ی ئەنکارا.

هەموو وڵاتە عەرەبییەکان (بێجگە لە سوریا) پشتگیری عێراقییان دەکرد لەجەنگ لەگەڵ ئێران و کورد، هەروەها یەکێتی سۆڤیەت بێدەنگ بوو، تەنها وڵاتە یکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو کارەی ئیدانە کرد، ئەو (داخووازی هەنگاوی شایستەو کاریگەر)بوو لەدژی ئەو حکومەتانەی کە ئەم چەکە بەکاردەهێنن، کۆمەڵی نێودەوڵەتی هەرزوو ئاستی پابەندبونی خۆی بەبڕیاری ژمارە (620) نیشاندا.

حکومەتی عێراقی بۆ وەڵامدانەوەی کاردانەوەی دەرەکی لەمەڕسیاسەتی بەرامبەر بەکورد ،هەڵمەتێکی پەیوەندی کردنی گشتی بۆ قایلکردنی کوردە ئاوارەکان بۆ گەڕانەوە بۆ عێراق دەست پێکرد، لەسەرەتای ئەیلولی (1988) سەرۆك کۆماری عێراق (سەدام حسێن) لێبووردنی گشتی بۆ کوردەکان دەرکرد، لەکۆتای ئەو مانگەدا دەسەڵاتدارانی عێراق ڕایانگەیاند کەزیاتر لە (61000) کەس گەڕاونەتەوەو خەڵاتکراون لەلایەن عێراقەوە بەهۆی گەڕانەوەیان بۆ نیشتیمان، مانگێك دوای ئەوە بەسەرکەوتنێکی گەورەوە حکومەتی عێراق ڕایگەیاند کە شاری نوێی ( هەڵەبجە) لەپارێزگای سولەیمانی دروست دەکرێت، حکومەت خانو و زەوی تەرخاندەکات بۆ دانیشتووانی هەڵەبجەی پێشوو لەم هە ڵەبجە تازەیەدا .

سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵانەی عێراق ئاوارە کوردەکان هەر بەکەمی دەگەڕانەوە لە (2\3\1989) لێبوردنی گشتی دووەمی بۆ کوردەکان دەرکرد، بڕیاری لێبوردن (سەرکردایەتی بزو تنەوەی چەکداری کوردی) نەدەگرتەوە، ئەم جارەش هێشتا خەڵك بەگومان بوون لەگەڕانەوە، چونکە لە

لێبوردنی پێشوو نزیكەی (10) هەزاركەس بێسەرو شوێن كرا بوون، لەڕاستیدا هەندێكییان لە زیندانداا بوون هەندێكی تریشیان لەسێدارە درابوون .

لەمانگی مارتی (1990) (سەدام )لێبووردنی سێیەمی دەركرد ئەمجارەیان لێبوردنی فراوان كرد بۆ هەموو گروپەعێراقییەكان بەسەركردایەتی بزاوتی چەكداری كوردیشەوە لەلایەن ئێرانەوە پشتگیری دەكران وە عێراق پێی دەگوتن (عملا الایران )، دامەزراندنی (بەرەی كوردستان )ی لەماوەی هەڵمەتی ئەنفالدا هەرچەندە دەبو زوتر بكرایە، بەڵام قۆناغێكی نوێبوو لەبەرەو پێش چونی هاوكاری پارتەكان و پێكەوە ژیانی و بەرنامەی كاری هاوبەش . بەلأم (بزوتنەوەی ئیسلامی لەكوردستان) نەچوە ناو بەرەی كوردستانییەوە بەڵكو هەر لەدەرەوەی بەرە مایەوە، هەرچەندە ئەوان ڕێكەوتنیان لەگەڵ (پ.د.ك)، (ی.ن.ك )، (حسك)دا هەبوو، كەتێیدابڕیاری یەك سەنگەری پێكەوە ژیانی ئاشتیانەو ڕووبەروبونەوەی حكومەتی عێرقیان داوە.

بەرەی كوردوستانی لەدوای (1989) چەندان كۆبونەوەی كردوە، لەسنورەكان لەنێوان خاكی كوردوستانی عێراق و كوردستانی ئێران، لەناوچەكانی (كانی خەیاران (مەریوان )، ڕاژان (شنۆ)) لەم كۆبونەوانەدا سەركردەی پارتەكان (جەلال تاڵەبانی، مەسعود بارزانی، محمەدی حاجی مەحمود, ڕەسول مامەند،......هتد) بەشدار بوون، بەرنامەی كاری هاوبەشیان دادەڕشت بۆچۆنییەتی خەبات لە هەلومەرجی نوێدا.

بەرەی كوردستای لەدووایین جەنگی عێراق –ئێران، دژوارترین كاتەكانی خۆی بەسەر برد، سنورەكان بەهۆی چاودێری ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان كۆنترۆڵ كرابوون و بەتەواوی بەسترابون، سەدان پێشمەرگە لەئەشكەوتەكاندا دەژیان لەهەلومەرجێكی سەختدا لەسنوری (عێراق –توركییا) گوزەرانیان دەكرد.

بەمجۆرە جارێكی تر پاشەكشەی كوردییان بینی لەعێراقدا، جارێكی تر سوریا عێراق بكاتەوە بەناوچەیەكی مردوو، بەهۆی ئەوەی پێشمەرگەی پارتەكان نەتوانن پەناگەو خۆراك پەیدا بكەن.

پرۆسەی ئەنفال كاری لەهەموو دانیشتووانی عێراق و لەهەموو پارت و ڕێكخراوەكان كرد، بەلأم لەهەمووی زیاتر (ی،ن،ك)ی تێك شكاند، چونكە تەنها ڕێكخراوی سیاسی كوردی بوو كە هەموو هێزەكانی و بارەگەكانی و ماڵی سەركردەو كادیرو پێشمەرگەكانی لەسەرانسەری كوردستانی عێراقدا بڵاو بوە، هەڵمەتەكانی ئەنفال لەدوای گرتنی بارەگا گرنگەكانی (ی ،ن،ك)، پاشان داگیركردنی هەموو كوردستانی عێراق و گیران و بزركردنی دەیان هەزار (ناوچە ئازاد كراوەكان)و وێرانكردنی هەموو ئەوناوچنەو وە دێهاتەكانیان، كارەساتێكی گەورەی بەسەر كورددا هێنا، كوردوستان بوو بەزیندانێكی تەنگ و كوردیش بوو بە گەلێكی دیل.

بارەگاكانی سەركردایتی (ی،ن،ك) لە(1976–1988)دا زۆرجار جێگۆڕكێیان پێكراوە، لە( برادۆست، ئاوزەنگ، قەدیل،....هتد) بەڵام هەرگیز بە دەردی ئەم جارەیان نەچووبوو، لەهەموو كوردستانی عێراقدا نەك گوندێك بەڵكو شاخێك، دۆڵێك، شیوێك، ئەشكەوتێك بەدەستەوە

نەمابوو، تاوەکو بنکەیەکی تێدا دابنێ، بەسەدان کەس لەهێزەکانی کوژرابون, سەدانی تریشی لێ بریندارو کەمئەندام بوون, زۆرێکی تریشی لێگیراو لەژێر گوشاری عێراقدا تەسلیم بونەوە, ئەمە کۆتایی قۆناغێك بوو, قۆناغی خەباتی چەکداریی _ سیاسی لەشاخەکانی کوردستانی عێراق, بەڵام کۆتاییەکی تراژیدی.

لەکاتی پاشەکشەی هێزەکان لەشاڵاوی ئەنفالدا ئەو هێزانە ورەیان بەردا, ناو بەناو بەتاك و بەکۆ, پێشمەرگە خۆیان دەدزیەوە خۆیان ئەدا بەدەست سوپای عێراقەوە هەندێ جاریش پێشمەرگە داوایان لەبەرپرسەکان دەکرد تاوەکو بگەڕێنەوە ناو خێزانەکانیان, هەندێ جاریش بەبەرنامە چەندان دەستەی پارتیزانی بۆ خەبات ئامادە کران، ئەم جۆرە گەڕانەوانە وایان کرد تاوەکو هێزی پێشمەرگەی پارتەکان گەشتنە سەر سنوری عێراق ژمارەیان کەمبێتەوە, لەناو یەکدا زۆر پەرپرس هەبون گەشتبونە ئەو بڕوایەی واز لەخەباتی چەکداریی بهێنن یان بچنە دەرەوە یان تەسلیم بە دەسەڵاتداریێتی عێراق ببنەوە, بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا کۆمەڵێك مابون کە هێشتا باوەڕیان بەخەباتی چەکداریی هەبوو.

لەمانگی نوێی1989, عێراق هەڵبژاردنی کرد بۆ پەرلەمانی ئۆتۆنۆمی ناوچەی باکور(کوردستان), وەك سەرەتایەکی نوێ لە پەیوەندی (عێراق_کورد)دا, حکومەت داوای لەهەموو هاوڵاتیانی کورد کرد بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن, دواتر ڕایگەیاند هەڵبژاردنەکان بەڵگەن بۆ سەلماندنی سیاسەتەکانی لەهەمبەر کورددا, ڕاگەیەنرا کەڕێژەی لەسەدا سەدی دانیشتوانی هەرسێ پارێزگا کوردیەکە (هەولێر, سلێمانی, دهۆك) بەشداری هەڵبژاردنەکانیان کردوە, لەو هەڵبژاردنەدا (پارتی بەعس) لەکۆی (50)کورسی, نزیکەی (30) کورسیان بەدەست هێناوە, کورسیەکانی تریش لەلایەن پاڵێوراوانی پارتە کوردیەکانی سەر بەحکومەتەوە براونەتەوە, هیچ یەك لەپارتە کوردیەکانی وەك (ی,ن,ك), (پ,د,ك),...هتد, بەشداریان لەم هەڵبژاردنانەدا نەکرد.

لەکۆتاییەکانی ساڵی 1989 (سەدام حسین) سەرۆك کۆماری عێراق سەردانی شاری سلیمانی کرد, ئەم سەردانە نیشانەی ئەوە بوو کە بزوتنەوەی کوردی بەلای ئەوانەوە کۆتایی هاتوەو کێشەی کورد چارەسەر کراوە, بەڵام پارتە کوردیەکان بەردەوام بون بەدریژەدان بەخەباتی چەکداری بە شێوازی نوێ و جیاواز لە پێشوو, (کۆمیتەی ناوەندی) (پ,د,ك) دوای گرێدانی کۆنگرەی دەیەمی لەکوردستانی ئێران لە1989 بڕیاری درێژەدانی خەباتی دەرکرد, بەمجۆرە هێزەکانی (پ,د,ك)و (ی,ن,ك) لەپاڵ یەکدا لەڕیزی مەفرەزە سەرەتاییەکاندا چەندان چالاکی سەربازیان لەکوردستاندا نواند.

بەڵام هەلومەرجی نێودەوڵەتیی و ناوچەیی گۆڕابوو, دوای جەنگ یارمەتی هێزەکانی کورد لەلایەن ئێرانەوە کەم کرایەوە, تەنانەت فشاریان لەپارتە کوردیە کان دەکرد کە سنورەکانیان بەجێبهێڵن, (پۆلیسی نەتەوە یەکگرتوەکان) لە ڕیگەی سنورەکانەوە چاودێری سنوری

(ئێران_عێراق)یان دەکرد, بەڵام هەندێ یارمەتی تر مابوون, وەك دروست کردنی ئۆردوگا بۆ پێشمەرگەی پارتەکان لەناو سنوری ئێراندا.

لە1989دا ئێران مەشقی بە چەکداری پارتە کوردیەکان کردو مانۆڕی سەربازی بۆ سازکردن, بە دریژایی ساڵی 1989 کەمترین چالاکی سەربازی تیادا ئەنجامدراوە لەلایەن بزاوتی رزگاریخازی کوردەوە.

**سەرچاوەکان:**


1.کرێس کۆچێرا: بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردو هیوای سەربەخۆیی ,و:ئەکرەمی میهرداد,بەرگی یەك,سلیمانی,2002

2.دیڤید ماکداولّ: مێژوی هاوچەرخی کورد, و:ئەبوبەکر خۆشناو, کتێب فرۆشی سۆران, چاپی دوەم , هەولێر,2005.

3.ڕێباز: قەندیل بەغدای هەژان, بەشی دوەم(1980_1988),هەولێر,1993

4.نادر ئینتیسار: ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی, و:عەتا قەرەداغی, خانەی وەرگێڕان, سلێمانی, ل 297_298

5.هاوڕێ باخەوان (هاوڕێنامە) بۆ مێژوی کوردستان و کورد, دەزگای چا پ و پەخشی سەردەم ,سلێمانی ,1999,ل326

6.دیدار لەگەڵ (کامیل ی حاجی عەلی ) ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان ، هەڵەبجەی شەهید 7/ 2/ 2008 سەعات 10 ی سەرلەبەیانی .

7.نەوشیروان مستەفا: خولانەوە لەناو بازنەدا

# ئەنفال لە دیدی ڕۆژئاوایی یە کانەوە

سەرکەوت شەریف

ئـەنفال کارەسـاتێك بـوو زۆر بـەووردی پیلانـی بـۆ داڕێـژراو هـەنگاوەکانی جـێ بـەجێکرا , پرۆسەیەکی هێندە گەورەبوو کەرژێمی بەعسی لەناوچوو دەرهەق بەقڕکردنی نەتەوەیەکی بێ دەوڵەت و بێ پشت و پەنای وەك نەتەوەی کورد بەرپایکرد . ئەم کارەساتە گەورەیی لەوەدا جگە لە کوشتنی ڕووح و جەستەی مرۆڤەکانی ئەم گەلە، وێران کردن ولـەناوبردنی تـەواوی کولتـورو شوناس و زیدیباب و باپیرانی کوردو تەفروتوناکردنی لایەنی ئابوری و بەتایبـەتیش کشتوکاڵ کەسەرچاوەی سەرەکی داهاتی کورد بوو لەئامانجەکانی تری ئەنفال بوو .

دەتوانین ئـەو ڕاستیە حاشا هەڵنـەگرە بخەینـە ڕوو بڵێین ئـەنفال بـە هـەموو پێـوەری یاسـایی و نێودەوڵەتیـەکان کـارێکی جینوسـایدکارانەبوو کەدەرهـەق بـەکورد لەمێژویـەکی دیـاری کـراودا بەوشێوە بەرفراوانە ئەنجام بدرێت . ڕاستە ئەمە جاری یەکـەم نـەبوو کە جینوساید بەرامبـەر بە میلەتی کورد دەکرێت، بەڵام شاڵاوەکانی ساڵی 1988 هێندە فراوان بوو کە ژمارەیـەکی ئێجگـار زۆر لە مرۆڤی کورد لەناوبران، ئەمەو سـەرەڕای زیانـە ئـابوری وماڵیـەکان کە لـە ژمـاردن نایـەن، هەربۆیـە بـەتیۆریزە کـردن و خوێندنـەوەی ورد و هەمـە لایەنـە ئـەرکێکی لـە پێشینەی سەرشـانی هـەموو لایەکمانـەو تـا چیتر ئـەم تـەرمایی ترسـە بـەو شێوە تەقلیدیـە ڕڤەنەکـەین و خوێندنـەوەی تـازەی بۆبکـەین ، هـەر وەکـو مـەریوانی ووریـا قـانع دەڵـێ(( نوسـین و لێکۆڵینـەوەو ناسـینەوەی ئەنفال ئەرکێکی ئەخلاقی یە , ئەمە نەك بەتەنها ئەوەیە کە ئەنفال دیاردەیەکی کارەسات ئامێزی سەر بەساتەوەختێکی تایبەتی مێژووی میللەتێکە دەبێت باس بکرێت، بەڵکو ئەمە بەو مانایەشە کەباسـکردن و وەبیرهێنانـەوەی ئـەم دیاردەیـە دەشـێت ڕێگربێـت لەدووبارەبوونـەوەی نەتـەنها لەکوردسـتاندا، بـەڵکوو لـە زۆرشـوێنی دیکـەی دنیـادا کەهاوکێـشەی زۆرایـەتی و کەمایـەتی، هاوکێـشەی دەوڵـەتی تۆتالیتـارو گرووپـی ئـەتنی جیـاواز , هاوکێـشەی کلتـوری جیاجیـاو ناسیونالیزمێکی راسترەوی تێدا بەرقەرارە )).[1]

لەدوای ڕاپەڕین و حکومەتی هەرێمی کوردستان و یادکرنەوەی کارەساتی ئەنفال تاکە شتێك کە ئێمـە تەماشـای یـادوو یادەوەریـەکانی ئـەنفالی لێـوە بکـەین ڕاگەیانـدنی حیـزب بـوو کەبەداخـەوە وەکـو پێویـست نـەیان توانیـوە ئـەم کارەساتە هێنـدەی گـەورەی و زیانـەکانی بخەنـە ڕوو ئـەوەی ڕاگەیانـدنی حیزبـی کـوردی زیـاتر لاوانـەو خـۆ بـچوك کردنـەوە وێنـە کردنێکـی مەزڵومانـە بـوو بەرامبەر بەزاڵمێك . بۆیە بەکار هێنان و پەخشکردنی ووشـەی ئەنفال وەك ووشـەیەکی ئاسـای و ئاسان بەکار هاتوو لە ڕاگەیاندنی حیزب و ئـەو وتارانـەی لەسـاڵ ڕۆژی کارەساتەکاندا نووسـران بیریـان دەکەوێتـەوە بینوسـن , نـەك هـەر نەبۆتـە هـۆی ئـەوەی کەئـەم ووشـەیە و ئـەم مەسـەلەیە لـەزمانێکی سـادەو نەغمەیـەکی کرۆزانـەوەو شـیوەن و ڕۆڕۆوە بیگوێزنـەوە بۆئاسـتێکی دیکـە ,

کەتیایدا ئەنفال ببێتە بابەتێکی گرنگ و سەنگین بۆ تێڕامان و ڕاڤەکردن تاوەك و بناغەیەکی قولّی هەست بە لێپرسراوێتی خۆمان لەئاست مێژوو و ئێستاو پاشە ڕۆژ مان لە ڕوح و جەستەماندا بچەسپێنین , بۆیە چیتر نابێت ئەم ستایلی ڕۆڕۆیە لە ویژدانماندا بهێڵینەوە و خۆمان وەها بە لاواز نمایش نەکەین و دەبێت ئیتر لەکاتی بەکارهێنانی ووشەی ئەنفالدا تەواو ببزوێن و هەروەکو بەختیار عەلی دەڵێ(( ئەنفال ئەو ووشە ترسناکەیە لەگەڵ گوتنی ڕاستیە گەورەکاندا دەبێت بەکاربهێنرێت )). [2]

زۆرن ئەو نوسینانەی چ لەکتێب و نامیلکەی شیعری و چیرۆك و گێڕانەوەی شایەتحاڵەکانی ئەنفالدا ووتراون , بەشی زۆری ئەمانە لەدیدی کورد خۆیەوە نوسراون یان گێڕاندنەتەوە , واتا کورد خۆی باسی مێژووی ئەنفال و کارەساتەکەی کردووە , ئەم نوسینەی ئێمە ئەم جارە لەساڵ ڕۆژی کارەساتی ئەنفالدا دیدێکی جیایەو هەوڵماندداوە بەشێك لەوکتێبانەی کەنووسەرانی نا کورد بەتایبەتیش ڕۆژئاوایی یەکان دەربارەی کارەساتی ئەنفال نووسیانە بخەینە ڕوو , لەوانە یە بەشێکی زۆر لە ئێمە چەندانەیەکی لەم کتێبانەی هەبێ کە ئێمە لەم نووسینەدا دەیخەینە ڕوو، بەڵام لەوانەیە هەموویان نەبێ و بەم شێوەیە پوخت و کورت نەکرابێتەوە .

ئەم نوسینە دیدی ئەوانەیە کەلەم بابەتدا ناویان دێت , تاچەند مێژوی کارەساتەکە و ژمارەی قوربانیانی و زیانەکانیو لایەنەکانی تری ئەنفال ڕاستن یان هەڵەیان تێدایە ئەوە بۆچونی ئەوانە و خۆیان بەرپرسیارن لیَ ی , ئەوەی زیاتر مەبەستی ئێمەشە هەڵدانەوەی پەڕەی ئەو کتێب و نوسراوانەیە کەدەربارەی ئەنفال نوسراون لەلایەن ئەوانەی کەچەندەها هەزار میل سنوری وولاتەکانیان لەسنوری کوردستانی ئەنفال کراودا دوورە، بەڵام ڕەنگە هەندێکیان وەکو دۆستێکی کورد هەندێکی تریشیان وەکو مەسەلەیەکی ویژدانی و مرۆیی باسی ئەم کارەساتەیان کردبێت .

سەمانس پاوەر ئەو ژنە ئەمریکیەیە کە کتێبەکەی دەنگدانەوەیەکی گەورەی لێکەوتەوە لە ئەمریکا سەبارەت بەو ڕۆڵە خراپەی یاخود بێدەنگ بوونی حکومەتی ئەمریکی بەرامبەر بە حکومەتی عێراقی لەکاتی ڕووداوەکانی ئەنفالدا ئەو کەمامۆستای زانکۆیە و ماوەیەکیش لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کاری کردووە , سەرەتا باسی زەمینە سازەکانی حکومەتی عێراقی دەکات بۆپرۆسەکانی ئەنفال ئەوە دەخاتە ڕوو لەمارتی 1987دا ساڵێك پاش واژوکردنی جاڕنامەی جینوساید لەلایەن سیناتی ئەمریکیەوە , سەرۆکی عێراق سەدام حسێن ئامۆزاکەی خۆی , عەلی حەسەن مەجیدی وەك سکێرتی گشتی نوسینگەی باکور دەست نیشان کرد , کەیەکێك لە پێنج زۆن لە عێراق , دیکتاتۆری عێراقی دەسەڵاتی ڕەهای بەعەلی حەسەن مەجیدی بەخشی و ڕایگەیاند کە : پێویستە بڕیارەکان هاوڕێ عەلی یەکلاکەرەوە بیَ بۆهەموو دەزگاکان ,جا سەربازی ,سیڤل یان ئاسایشی))بن . سالاری نوێی نوسینگەی باکور بڕیاری دا کەئەم دەسەڵاتە ڕەهایە بەکاربهێنرێت, بە وتەی خۆی کێشەی کورد چارەسەر بکات و یاخیبوەکان

سەربڕێت، هەرلەدەستپێکی شەڕی عێراقەوە دژی ئێران لەساڵی 1980 , سەدام حسێن بەتایبەت لەگەڵ کێشەی کوردا سەرقاڵ و ناتەبا بوو , کوردان زیاتر لە4ملیۆنن لە 18 ملیۆنی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن , ئەگەر چی هێزەکانی ئاسایشی سەدام دەیانتوانی کۆنترۆڵی ئەوانە بکەن کەلەشارەکان دەژیان , بەغداد زۆر گران دەیتوانی چاودێری ئەو ناوچە گوند بیانە بکات کە کورد تێدا نیشتەجێبوون , چەکدارە کوردەکان چیاکان وەك پەناگە بەکاردەهێنا , بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی عێراقی , تەنانەت هەندێکیان بونە هاوپەیمان لەگەڵ ئێران , سەدام بڕیاری دا کەباشترین ڕێگا بۆلەناوبردنی یاخیبونەکان بریتی یە لەناوبردنی ژیانی کوردی .

دواتر دێتە سەر باسی عەلی حەسەن مجید و دەڵێ (( عەلی حەسەن مجید فرمانیدا کە کوردەکان نیشینگەکانی خۆیان چۆڵ بکەن .کەبەدرێژایی چەندیین سەد تێیدا نیشتەجێشبوون , پاشان ڕاگوێزرێن بۆئۆردگای زۆرەملێ , کە لەوێ دەوڵەت دەیتوانی کۆنترۆڵیان بکات , هەرکوردێك لەوناوچەیە بمایەتەوە کەبە (زونی حەرمکراو) ناودەبران و ڕازی نەبوایە بچێت بۆئۆردوگا بەخیانەت ناوزەند دەکرا دەبوایە بکوژرایە , پۆلیس و ئاسایش و تایبەتی عێراق ماستەر – پلانەکەی بەووردبینیەکی بیرۆکراتیانەوە, شاڵاوەکەی حکومەتی عێراقی لەساڵی 1987 دەستی پێکرد , لەمانگی دوو ونۆی لە 1988 گەیشتە چڵە پۆپە. شاڵاوەکە کەناوبرا شاڵاوی ئەنفال , کەبەواتای تاڵانی دێت , ووشەی ئەنفالی عەرەبی لەسورەتی هەشتەمی قورئانەوە هاتووە کەباس لەتاڵانکردنی کاروانێك (کافر) دەکات , لەساڵی 624ی کۆچی لەلایەن موحەمەدەوە , سورەتەکە دەڵێت(( ووتەی ئەو , ئەوەی لەخودا یاخی بێت لەگەڵ هاوەڵەکانیدا لەلایەن خوداوە توندترین سزا دەدرێت , ئێمە پێمان ووتن :– ئەمە بچێژن , تیژی ئاگر چاوەڕێی کافرانە )) .

سەدام ڕایگەیاندبوو کەکوردی عێراق ' ڕووبەڕووی تیژی ئاگرەکانی هێزەکانی عێراق دەبنەوە , لەسەر خواستی سەدام لەژێر فەرمانی ئاشکرای مەجیدا , گوندی کوردی لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەناوی بوونە بابەتی تاڵانی ڕاوو ڕووتی ئۆپەراسیۆنی سوپای عێراق، سەربازە عێراقەکان هەموو شێکی دیاریان تاڵان و وێران کرد , لەهەشت شاڵاوی یەك لەدوای یەك و بەووریای پلان بۆ داڕێژراوپێکەوە بەستراوی ئەنفالدا , ژیانی گوندنشینی کوردیان ڕاماڵی یان(سەدامیزە) کرد, سەبارەت بە بەڕوبیانوەکانی ئەنفال , کاردانەوەی ئەمریکا دەڵێ:– ئەگەرچی شاڵاوەکان وەك کرداری دژە–بەرەنگاری پەردەپۆشکران، بەڵام بەهیچ شێویەك کوردەچەکدارەکان تاکە ئامانج نەبوون، سەدام حسێن شاڵاوەکەی ئاراستەی هەموو پیاو و ژن و منداڵێك دەکرد کەنیشتە جێی ناوچە تازە حەرامکراوەکان بوون، ئەوپیاوە کوردانە کەدەستگیردەکران ودەکوژران و لەگەرمەی شەڕنەبوون، یان هەڕەشەیەکیان بۆسەر سەربازەکان دروست نەکردبوو, خزێنرانە نێو پاسەوە بۆجێگەی دووریان بردن , لەوێش بەشێوەکی پلان بۆداڕێژراودەسترێژیان لێ دەکرا و کۆکوژی دەکران لەنێوان ساڵانی 1987–1988 دا هێزەکانی سەدام حسێن چەند هەزار گوندو کوخی کوردییان وێران کرد نزیکە (سەد) کوردیان کوشت , زۆربەی هەرەزۆریان بێ چەك بوون ,

زۆربەشیان منداڵ و ژن بوون , ئەگەر چی ڕاپۆرتی هەواڵگری و ڕۆژنامەیی دەست بەجێ دەرکەوتن دەربارەی دڕندەیی عێراق لەدژی کورد , بەڵام بڕیاردانی وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا و ڕۆژنامەنوسەخۆرئاواییەکان , وەك شتێك کە شایانی تێگەیشتنە مامەڵەیان لەگەڵ توندوتیژی عێراقدا دەکرد وەك هەوڵێك بۆ خامۆشکردنی یاخی بونێك یان دەرئەنجامی پریشکی جەنگی عێراق–ئێران دەیانبینی , ئەمریکا بڕیاری دابوو پشتگیری عێراق بکات و نکۆڵی لەهەبوونی بەڵگەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دەکرد لەلایەن عێراقەوە , بەڵکو ئەمریکا پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە دواجار سەدام حسێن چاك دەبێت , بەر لە مانگی 9ی ساڵی 1988, ئەوکاتەی دەیان هەزار کورد هەڵهاتن بەرەو تورکیا , وڵاتەیەکگرتوەکان سەرکۆنەی ڕژێمی عێراق نەکرد بۆبەکارهێنانی چەکی ژەهراوی لەدژی دانیشتوانی وڵاتەکەی، تەنانەت ئەوکاتەش ئەمریکا سەرکۆنەی چەکی کیمیاوی کرد , کوشتاری کوردانی وەك کوشتاری پۆل پۆت دەیەیك لەوەبەر بەرلەویش لە ساڵی 1915وەك کوشتاری ئەرمەنیەکان لەلایەن تورکەوە , وەك (کێشەی ناوخۆیی) لەقەڵەمدا.

دەربارەی یارمەتیەکانی ئەمریکا بۆڕژێمی بەعس پاوەر باسی ئەوەدەکات لەنێوان ساڵانی 1983–1988 دا وڵاتە یەکگرتوەکان ئەمریکا ساڵانە زێدەتر لەپێنچ سەد ملێونی یەکەی کڕینی بەروبومی کشتوکاڵی ئەمریکی دەبەخشی بە عێراق , پاش شاڵاوەکانی مانگی نویێ 1988, سیناتور (کلەیبۆرن پێڵ) یاسای سزاکانی (ئابلۆقە)ی بەگۆنگرێس ناسان , دەبوە هۆی وەستانی ئەم یەکانە بۆ کڕینی دانەوێڵە , وەك سزایەك لەدژی سەدام حسێن بەرامبەر بەکوشتنی هاوڵاتی بێ چەك , پێڵ لە ژێر کاریگەری هاوکارەکەی دا (پیتر گالبرێس ) جەختی لەوە دەکردەوە کە تەنانەت هاوپەیمانێکی ئەمریکای نابێت گازبارانی دانیشتوانی وڵاتەکەی خۆی بەسەردا تێپەڕببێت , بەڵام بەڕێوەبەرێت بۆش ,لەجیاتی وەستاندنی ئەویارمەتیانە و چەندینی دیکە, لەساڵی 1989 دا یارمەتیەکانی بۆعێراق دوو قات زیادی کرد کە یارمەتیەکان گەیشتە پتر لە یەك بلیۆن دولار , یاساکەی پێڵ بەناوی (یاسای بەرگرتن بە جینۆساید) کەبڕیار بوو سەدام حسێن سزا بدات لە چاڵ نرا.

دەربارەی ئەوەی کە ئەمریکا خۆی جارنامەی قەدەغەکردنی جینۆسایدی واژوکربوو عێراقی نەخستە ڕیزی جینۆساید کارانەوە پاوەر لەم بارەیەوە دەڵێت :– سەرباری تازە واژو کردنی بۆجارنامەی جینۆساید , کاتێك دەرفەتێك گەڵالە بوو بۆ ئەمریکا بۆئەوەی پەیامێکی توند بنێرێت کە جینوساید ڕێگەی پێنادرێت و پێوستە کوشتاری دانیشتوانی کورد بوەستێت , بەرژەوەندی تایبەت و دەستکەوتی ئابوری و گرنگی جیۆپۆلیتیکی عێراق نیگەرانیە مرۆییەکان پەردەپۆش کرد بەڕێوبەرێتی ڕیگان قوماری لەسەر جینۆسایدی کورد کرد , کەکورد(دواتریش ئەمریکا) شانیان دا بەقورسایی یەکەی . هەروەها ئەمریکا ئەمە جاری یەکەم نەبوو چاوی لەئاستی دەوڵەتی جینۆسایدکەر نوقاندپاوەر ئەوەش باس دەکات کەڕازی نەبوونی ئەمریکا بۆ

وەدەرنـانی ڕژێمـی جینۆسـایدکاری خـەمری ڕۆژ لەنەتەوەیـەکگرتوەکان لەسـاڵانی 1980کانـدا زادەی فراوانبـونی ئاشـکرای ناحـەزی ئـەمریکا بـوو لەبەرامبـەر ڤێتنـام , بەهـەمان شـێوە لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت دا هەڵوێـستی ئـەمریکا دەربـارەی تاوانـەکانی عێـراق بەرامبـەر بـەکورد . زادەی بڕواهێنانی بوو کە کوردەکان بەلای ئێرانی ئیسلامیدا دایدەتاشن . ئەمریکا کەلە ئەگـەری دەسـت بەسـەراگرتنی ئێرانـی ئایـەتوڵڵا خومـەینی بۆنـەوتی یـەدەکی عێـراق زەنـدەقی چـوبوو. لەوەدەترسا کە ئیسلامی ڕادیکاڵ ڕەوشی حکومـەت دۆستەکانی ئـەمریکا لـە سعودیەو ئیمارات بشێوێنێت. بـەم پێیـە لەگـەڵ هەرسـەرکەوتنێکی پێـران لەمەیـدانی جەنگدا , ئـەمریکا قـەلانجێك زیـاتر لـەعێراق نزیـك دەبـووەوە نزیـك بونەوەیـەك کاریگـەری زۆری هـەبوو لەسـەر هەڵوێـستی داهاتوی ئەمریکا دەربارەی تاوانەکانی سەدام لەدژی کورد.

دەربـارەی گـازی کیمیـاوی و زانیـاری کارمەنـدای ئـەمریکا دەربـارەی شـاڵاوەکانی ئـەنفال پـاوەر سـەرنج دەداتـە ئـەوەی کەهێرشـی گـاز لەلایـەن عێراقـەوە سـەرنجی جـەماوەری ڕاکێـشا , بـەڵام زۆربەی ئەوکوردانەی کە لە شالاَوەکانی ئەنفالدا مردن کۆکوژی کران . کارمەندە ئەمریکیـەکان بەدرێـژای سـاڵانی 1987–1988 دەربـارەی شـاڵاوەکانی عێـراق زانیاریـان هـەبوو , ئاگـاداربوون لەوە کە ئەوپیاوانە لەوشاڵاوەدا دەستگیرکران بۆزیندان، بەڵام ئاشکرانی یە کەی ئەم کارمەندانە لەسروتی کۆکوژیکان ئاگاداربوون , بەرپرسێکی باڵای بەڕیوبەرێتی ڕێگان , بەئاشکرا ڕایگەیاند کەچارەنوسی کورد جێگای نیگەرانی ئەوان نی یە, لەبەرئەوە هیچ جێگـەی سەرسوڕمان نـی یـە گەرلەوکاتـەدا کوشتارەکان ڕوویانداوە , کارمەندانی هـەواڵگری ئـەمریکی هـەوڵی بەدواداچونی هەلەمەرجی زیندانیەکان نەدابێت .(3)

یـەکێکی تـر لەوانـە (کـەریم یەڵـدن)ـە، کـەکتێبێکی نایـابی دەربـارەی کـورد لـە عێـراق نوسـیوە کتێبەکەش بەزمانی ئینگلیزی یە سەبارەت بەووشەی ئەنفال ئەوەدەخاتە ڕوو کە ووشەی ئەنفال سەرچـاوەی لەسـورەتێك یـان چـەند ئایـەتێك لەقورئانـدا هەیـە بەدەسـتکەوتەکانی شـەڕی پـیرۆز ئاماژە ئەکات . ئـەم ووشـەیە لەلایـەن ماشێنی سـەربازی کـە لەسـاڵی 1988دا ڕووی دا بـەکاربرا، جیـاوازی یـەك هـەبوو لەگـەڵ شـاڵاوەکانی تـری سـەربازی دژی کـوردان لەلایـەن بەعسیەکانەوە وهۆکـاری بەناوبانگـە خراپەکـەی لـەجیهانی دەرەوەدا کـەڵك وەرگرتنـی سـیتماتیك لەچـەکی کیمیاوی بوو دژی هەردوو ئامانجی گەلی سەربازی و مەدەنی ٫ هـەروەها خـاپورکردنی فیزیکـی بەمەزەندە (3000) گوند , ئاوارەکردنی نزیکەی یەك ملیون و نیو کەس بەکۆمەڵکوشتنی خەڵکە مـەدەنی خاڵـە گرنگـی کاولکـاری شاڵاوەکانی ئـەنفال بـوو , لەکاتێکـدا کەئامارگـەلی ڕێـك هێـشتا دیاری نەکراون بیروڕا هەیە کە زیاتر لە 180,000کەس لەئاکامی شالاَوەکانی ئەنفالدا کوژراون سـەبارەت بـەهۆکارەکانی شـاڵاوەکانی ئـەنفال و لـۆجیکی کاولکـاری یەڵـدز دەڵـێ:– هۆکـاری شـاڵاوەکانی ئـەنفال دەگەڕێتـەوە بـۆ شـەڕی ئێـران–عێـراق (1980–1988) کـەتا پـێش سـاڵی 1987 ئەوشەڕە ژمارەیەکی زۆری لـەهێزی مرۆڤی سـەربازی عێراقی کردبووە قوربانی و ئابوری

تائەوکات بەشی بۆدۆزەخێکی زۆرخراپ کردبووە لەساڵی 1986دا کاتێك حکومەتی ئێران توانی ئاگربەستێك لەنێوان(ی.ن.ك. و پ.د.ك) ڕێك بخات , سەدام حسێن مەترسی هەبوو لەئەگری بەهێزی هاوپەیمانیەك لەنێوان هێزە هاوبەشەکانی کوردوئێراندا , ئێران لەدرێژای ململانیەکە لەدۆخی بەرگری دابوو، بەشوێن ئەوەوە بوو کە خۆی باڵادەست بێت , لەوەڵام دا سەدام حسێن بە پێی فەرمانی (160) ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کەلە29کارسی 1987دا دەری کرد عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزای کردبە بەڕێوبەرێتی نوسینگەی باکوری حیزبی بەعس، فەرمانی (160) دەسەڵاتێکی بەڕاستی بێ سنوری لە (هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی دار) ی عێراق بەعەلی حەسەن دا . هەموو دەزگاکانی زانیاری سەربازی وهەموو هێزە ئاسیشەکانی ناوخۆ بەسەرۆکایەتی سوپای گەل (قیادەی جیشی شەعبی ) یەکەکانی سەربازی لەهەرێمی باکوردا ئەبوایێ سێودوو ملکەچی بڕیارەکان و فەرمانەکانی ئەلمەجید بونایە , قەراربوو عەلی حەسەن ببێت بەفەرماندەی باڵا، گەورەی هەموو ڕوەکانی ئەنفال.

دەرباری هەڵسووکەوتەکانی عەلی حەسەن مەجید دوای وەرگرتنی ئەو پۆستە دەڵێ:– لەچەند هەفتەو مانگەکانی دوا ئەوپۆستەدا، عەلی کیمیاوی(کەدواتر ئەم ناوەی لێنرا) دەستی کرد بەشەپۆلێکی سەرەتایی نەهێشتنی گوندەکان و ڕاگواستنی گوندەکانی گوندە خاپورکراوەکان بۆئۆردوگاکان یاخود کەمپ گەلی نیشتەجێکردنی حکومی , هەروەها لەم ماوەیەدا بەعس بۆیەکەم جار لەچەکی کیمیاوی دژی کوردەکان لەگوندەکانی بالیسان و شێخ وەسان و دۆڵی بالیسان ئەم هێرشانەپێشەنگ بوون بۆ ئەو شاڵاوەی بەدرێژای ساڵی دوایی جێ بەجێ کران, چەکی کیمیاوی بە بۆمبی فرۆکەو هەلیکۆپتەری هێزی هەوای عێراق ئاراستە ئەکران ,کوێری, ڕشانەوە, لەهەندێك نمونەدا مەرگی قوربای کوردی لێ دەکەوتەوە .پاش ئەوەی گوندنشینە دەربازبووەکان بۆداڵدەویارمەتی ڕایان ئەکرد , گوندەکان تاڵشان ئەکران و پاشان هێزەکانی سوپا وجاش کاولیان ئەکرد .

دوابەدوای ئەوهێرشانە ئەو گوندنشینانەی کەلەهەولێر داوای یارمەتیان لەناوەندی گرتووخانەکانی ئەمندا (بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی) بەندکران پاوەکان لەناو پاص دا دوورئەخرانەوە هەرگیزنەئەبینرانەوە ,ژن و منداڵە دەربازبوەکان لەدەشتێکی کراوەدا, لەلێواری چەمێکا فڕێ ئەدران کەلەخۆیان پارێزگاری بکەن . بەدرێژای 1987 هێزەکانی بن دەسەلاتی عەلی کیمیاوی سەرجەم (703) گوندیان خاپور کرد . گوندنشینەکان یان دەربارەی ناوچەکانی ژێر دەستی پێشمەرگە بون، یان بەخێزانەوە لە دێهات و شارۆچکەکانی تر نیشتەجێ ئەبوون، یان بۆ کەمپەکانی نیشتەجێ کردنی حکومی لە باکور و ناوەندی عێراق ڕائەگوێزران .

دەربارەی هێرشەکانی شالاوەکانی ئەنفال یەڵدز تێڕوانینی خۆی ئاوا دەخاتە ڕوو یەکەم جار کە سوپای عێراق و پارتی بەعس ووشەی (ئەنفال) یان بە شێوەی ڕۆتین بەکار برد لەماوەی

ئـەو شـالاّوە چـەکدارییەدا بـوو کـە لـە شـوباتی (1988) دەسـتی پێکـرد، قاموسـی بـەعس پێشمەرگەی وەك (تێکدەر) و جەلال تاڵەبانی سکرتێری (ی.ن.ك) وەك پیاوی ئێران پێناسە کرد یەکەم شالاّوی ئەنفال لە هێرشێك بۆ سەر گوندەکانی بەرگەڵوو و سەرگەڵوی دۆڵی جافایەتی لە جیاکانی باشوری ڕۆژهـەڵاتی کوردستانی عێراق کە پێگەی گرنگی (ی.ن.ك) بوون پێك هات . گونـدەکان هـەروەها نزیـك بـوون لـە بەنـداوی دوکـان و وێـستگەی بەرهـەم هێنـانی کارەبـا کـە ئامانجێکی سەربازی زۆر گرنگ بوو بۆ (ی.ن.ك)، لەکۆنـەوە حکومـەتی عێراق ناوچەکانی وەك (هەرێمی قەدەغە کراو) پێناسە کردبوو دانیشتوانی بە بۆمبارانی بەردەوامی هێزەکانی سوپاو تۆپخانە ڕاهاتبون . پێشتر لە کاتی ئۆپراسیۆنەکانی (1987)دا یەکەم شالاّوی ئەنفال بینـرا ، کەبەگـەمارۆی یـەك مـانگی دۆڵـی جافایـەتی کۆتـایی پـێ هـات ، چـەکدارەکانی ی.ن.ك بۆمـاوەی چەند هەفتە بەرگریان کرد ، بەلاّم ژمارەی هێزەکانی حکومەت هیوا براوانـە زۆر تـر بـوو ، پارتی بـەعس بۆگـەمارۆدانی گونـدەکان کـەڵکی لـەهێزی زەمینـی چـەکدار ، هێـزی هـەوایی سـوپای کۆماری و چەکی کیمیاوی وەرگرت ، پاشتر گوندەکان بەبلدۆزەی لەگـەڵ خاکدا تـەخت ئـەکران و ، ئەمـە خێرایـی ئـەدا بـەڕاکردنی پەنابـەران بۆسـلێمانی و ئێـران سـەدان پێـشمەرگە و خـەڵکی مەدەنی گیانیان لەدەست دا ، چەمچەماڵ ڕاستەخۆ لەئاکامانی کردەوەی سەربازی چەمچەماڵ ناڕاستەوخۆ لەبەرکەوتنە شەڕ لەکاتی پەڕینەوەیاندا بۆ ئێران ئەو پیاوو کوڕە هەرزەکارانـەی لەلایەن هێزە چەکدارەکانەوە گیران بەسانایی شوێن بزر کران .

سەبارەت بەشالاّوەکانی بەعس بۆسەر هەڵەبجە کەیەکێك لەقۆناغەکانی ئەنفال بوو یەڵدز ئاماژە بـەوە دەکـات کـەمێك پـاش ئـەو ڕووداوانـە ئـەوەی کەلەسـەرەوە بـاس کـرا هێزەکـانی چـەکداری عێراق بەچەکی کیمیـاوی هێرشـیان بـردە سـەر شارۆچکەی هەڵەبجە ، ئەم شارۆچکەیە لـەنزیك سـنوری ئێرانـەو بۆماوەیـەکی درێـژ قـەڵای پێـشمەرگەی (ی.ن.ك) بـوو لـە 1987 دا هێزەکـانی عێـراق ئـەو شارۆچکەیەیان کردبـووە ئامـانجی خۆیـان ، کاتێـك هەنـدێ شـوێنی شارۆچکەکەیان لەتۆڵـەی یارمـەتی دانـی پێـشمەرگە بەبلـدۆزەر کـاول کـرد ، گرنگـی سـتراتیجی هەڵەبجـە لەسـەر بنچینەی نزیکی بەدەریاچەی دەرەندیخانەوە بوو کەسەرچاوەی گرنگی دابینکردنی ئاوی بەغدا بوو ، لەسەرەتای مارسی 1988 دا سوپای ئێران بۆگرتنی هەڵەبجە هێرشێکی هاوبەشی ئەنجام دا ، لە 13ی مارس دا بەخەستی شارکەیان تـۆپ بـاران کـردوو دووڕۆژ دواتـر گرتیـان ، لـە 16ی مارس دا عێراقیەکان بەهێرشی ئاسمانی ئاسایی و تۆپخانە دژ هێرشیان ئەنجام دا ، لەشـەپولە یەکە لەدوای یـەکی بۆمبـاران هێـزی هـەوایی لەپێشەوە بـەوەی کەلـە بـۆمبی ناپـاڵم یـان فسفۆڕی ئەچوو هێرشی کرد ، هەر ئەو ڕۆژە دواتـر چـەکی کیمیـاوی بـەکارهێنا ، ئـەو کەسـانەی بەچـاوی خۆیـان بینیـان بـاس لـەوە دەکـەن کەچۆن لاشـەی مـردوو – مرۆڤ یـان ئـاژەڵ لەسـەر شـەقامەکان کەوتبوون لەبەر دەرگاو سوکانی ئۆتۆمبیلەکاندا کەوتبوون ، ڕزگار بوان بەم لاو بـەولادا ئەکـەوتن و بەر لەخۆچونیان پێکەنینێکی هێستریان لەسەرلێوبوو ، سەربازانی ئێران کەبـەرگی پارێزەریـان

لەبەردابوو ، دەموچاویان بەدەماکی گاز داپۆشیبوو لەشەقامە تاریکەکانەوە بۆی دەرچوون ، ئەوانەی کەدەربازبوون بەزەحمەت ئەیانتوانی ببینن و هەستیان ئەکرد دەرزی لەچاویان دایە ، میزیان لەگەڵ خوێندا تێکەڵ بوو .

هێرشەکانی سەر سێوسێنان تەوەرێکی تری باسەکەی یەڵدزەو باسی ئەوە ئەکات لە 22ی ئازاری 1988 دا ڕۆژێك دوای ساڵی نوێی کوردی ، دووەم شاڵاوی ئەنفال بەتۆپبارانی گوندی سێوسێنان دەستی پێ کرد ، ڕۆژی دوایی سوپا بەهێزی زەمینیەوە هێرشی کرد ، بەدرێژایی هەفتەی دوایی بارودۆخ لەگوندەکەدا شڵەژابوو هەندێك لەو گوندنشینانەی کەڕایان کرد خرانە کەمپەکانەوە، هەندێکیان گل درانەوەو ژمارەیەکیشیان هەر نەبینرانەوە، بەپێچەوانەی یەکەم ئەنفال، بزربوون و تەنیا پیاوان و هەرزەکارانی نەگرتە خۆ، بەڵکو سەدان ژن و منداڵیش، بەتایبەت ئەوانەی لەقەرەداغەوە بەرەو باشوری گەرمیان کەلەوێوە نزیك بوو ڕایان کرد، شوێن بزربووان لەگوندێکدا سەدان پیاوو ژن و منداڵ کەخۆیان دابەدەست عێراقەوە هەرگێز نەبینرانەوە .

دەربارەی قۆناغەکانی تری شاڵاوەکانی ئەنفال یەڵدز دەڵێ : سێهەم شاڵاوی ئەنفال لەزۆر لایەنیەوە هاوچەشنی شاڵاوی پێشوو بوو، هێرشی قورس لەلایەن هێزەکانی هەوایی و زەمینیەوە خاپورکردنی بەکۆمەڵی گوندەکان، خوڵقاندی هەزاران کوردی ئاوارە، لەدوو شاڵاوی یەکەمدا پیاوان، ژنان و زاڕۆکان شوێن بزر ئەکران، بەڵام بەشی سێهەمی ئەنفال پێشووەچونێکی بەرچاوی لەسیستامتیك کردنی نەهێشتنی جەماوەری مەدەنی کورد بەخۆوە بینی (هەرچەندە دواتر هەموو ماشێنی بوروکراسی پاڵاوتنی بەسەرداهات) مەبەست لەهێرشکردنە سەر گوندەکانی دەشتی گەرمیان دیسان لەناوبردنی یارمەتی بوو بۆ (ی.ن.ك) بەشێوەی ئاسایی بەبەڵێنی لێخۆشبوونی درۆ بەرهەردوو خەڵکی مەدەنی و پێشمەرگە بۆخۆ بەدەستەوەدان ، بەهێزەکانی عێراق تەفرە ئەدران و ئەبران بۆخاڵە کۆکردنەوەکانی سەرەتایی، وەك ئەوانەی لەیلان ، عەلی ئاوا ، قادرکەرەم و چەمچەماڵ لەباکورو توز خورماتوو قۆرەتوو کەبەرەو خوارتر بوون ، کاتێك کۆمەڵانی خەڵك ئەگیران بەپێی تەمەن و ڕەگەزی نێرو مێ لەیەك جیا ئەکرانەوە، هەندێك بەردەوام بۆکەمپی جیاجیای گلدانەوە هاتوچۆیان پێ ئەکرا، لەهەمویاندا بارودۆخ زۆر نالەباربوو، خواردن بەشێوەی کردەیی لەدەست ئەوانە بوو ، پێداویستی ستاخڵەمی هەرنەبوو یان زۆر کەم بوو ، بەردەوام گلدانەوەکان دڵنیا ئەکرانەوە کەگیانیان پارێزراوە، و پاشتر بۆکەمپی نیشتەجێ کردنی حکومی ئەگوێزرانەوە، زۆریان بەلۆری دوورخانەوەو ئیتر قەت نەبینرانەوە، بیرو بۆچوون هەیە کەزیاتر لە 10000 هەزار کەس تەنیا لەدانیشتوانی باشوری گەرمیان شوێن بزر کرابێتن ، شاڵاوەکانی دواتری ئەنفال بەوچەشنە درێژەیان هەبوو، هەرەچەندە قورسایی هەوڵەکان ئاراستەی ناوچەکانی ژێردەستی (ی.ن.ك) کرا، بەڵام دوایین شاڵاوی ئەنفال پێگەکانی (پ.د.ك) ی بارزانی کردە ئامانجی خۆی، هەندێك کەمپ وەك ئەوانەی

تکریت ، تۆپزاوا ، دوبز (کەمپی ژنان )و نوگرە سەلمان (کەمپی بەسالاچووان) لەفەرهەنگ و نەریتی کوردیدا بونەتە نمونەی ترسێك کەباس ناکرێت، لەهەموو کەمپەکاندا بەردەوام لەژنان و پیاوان ومنالان و گەورەیان ئەداو بەشە خواردنەکەیان ئەوەندە کەم بوو کەبەتایبەت بەتەمەنەکان و منداڵەکان لەبرسا ئەمردن ، دایکان لەزارۆکان جیاکرابونەوە ، زۆر کەس چا و بەستراو دەست کەلەپچە کراو دوور خرانەوەو چاویان بەکەس وکاریان نەکەوتەوە ، جگە لە سەرجەم شوێن بزرکردنی تا 10000 قوربانی کورد، بەڵگەی پێویست هەیە لەسەر کوشتنی پیاوان، ژنان و مندالان وەك ئامرازێك بۆلەناوبردنی بەرهەڵستکاری کورد، زۆر جار بەند کراوان، لەکاروانی پاص و ئۆتۆمبێلی تردا بەچاوی بەستراو دەستی کەلەپچەکراوەوە لەکەمپەکان دوور ئەخرانەوەو بۆشوێنی دوو لەباشورو ناوەندی عێراق ئەگوێزرانەوە، لەوێ لەبەر نەبوونی خواردن و ئاوو لەبەر بارودۆخی خنکێنەری ناو ئۆتۆمبیلەکان لاواز ببون، هێزەکانی ڕژێم ئایان دانە بەر دەستڕێژی گوللە، کاروانێك کە ئەوترێ زیاتر لە100 کەس پێکهاتبوون هەموویان بەم چەشنە لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا کوژران ، بۆچوونی واهەیە کە 12000 کەس تەنیا لەیەك شوێندا کوژران، تەنیا دوای نەمانی ڕژێمی بەعس گۆڕەکان خەریکن ئەدۆزرێنەوە، لە 25ی ئابی 1988 دا دواین ئەنفال بەهێرشی گازی ژەهراوی بۆسەر گوندی بادینان، بەمەبەستی تێك شکاندنی هەموو ئەو بەرهەڵستیانەی کەلەناوچەکانی کوردستانی عێراقی ژێر کۆنترۆڵی پ.د.ك مابوون، دەستی پێکرد، هێمای ئەم شالاوەش وەك ئەوانەی پێش خۆی تەقەی بەکۆمەڵ لەخەڵکی مەدەنی و گرتنی بێ بەڵگە بوو، خودی سوپای عێراق گرتنی زیاتر لە 13000 مەدەنی تۆمار کراو[4] .

یەکێکی تر لەوانە کەکوردناسێکی زۆر باشە و بەرهەمی باشیشی لەسەر کوردو کوردستان نوسیوە (دیڤید مەکداول)ە کە نوسەرو مێژوو نوسێکی دیاری ئینگلیزە، ئەو لەیەکێك لەبابەتەکانی دەربارەی مێژووی کور باسێکی تەرخان کردووە بۆلایەنی ئەنفال و دەربارەی عەمەلیاتەکانی ئەنفال ئەوە باس دەکات لەکانونی دووەمی 1988 کاتێ هێزەکانی ئێران بەرزاییە ستراتیژیەکانی زاڵ بەسەر ماوەتیان گرت و لەڕوباری قەرەچۆلان تێ پەڕین ، بەغدا کەوتە بەر هەڕەشەیەکی جدی تر، نفوزی قوڵتری هێزە کوردیەکان و ئێران لەکوردستان لەبەهار بەرەو دەشتی میزۆپۆتامیا بەرەو دیالە پێشڕەویان کرد ، ئێستا بوە بەمەترسیەکی جدی ، سەدام پەیامێکی نهێنی بۆ (ی.ن.ك) ناردو دوای دەست پێکردنەوەی دانوستانی کرد، بەڵام تاڵەبانی ئەم مەسەلەیەی پەیوەست کرد بەسەرکارلاچوونی خودی سەدام، ئەمە دوا هەوڵی ئێران بوو بۆ تێکدانی عێراق ، لەهەموو شوێنەکانی تر ئێران سەرنەکەتن ، ئەم هەڕەشەیەی ئێستا عێراق ڕووبەڕووی ببووە هەلێکی گونجاو بوو بۆ ئەو هێزانەی عەلی حەسەن مەجید بۆتەواوی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد دەستی پێویستی بوو خرایە بەردەستی بۆ تێکشکاندنی هێزەکانی کورد دەستی بەعەمەلیاتی ئەنفال کرد و ئەنفال بریتی بوو لەزنجیرە هێرشێك بۆسەر

ناوچەكانی پێشمەرگە، بەسوود وەرگرتن لەگازی كیمیاوی بۆردومانی توندی ئاسمانی، پێش داگیركردنی ناچەكان لەلایەن هێزی پیادە ، بەكارهێنانی ئەو ووشە قورئانیە، خراپ بەكارهێنانێكی بێزار بوو لەحوكمی قورئان.

دەربارەی ئامانجی شالاوەكانی ئەنفال مەكداول ئەوە دەخاتە روو كە ئامانجی شالاوەكانی ئەنفال تێكدانی نەخشەو پلانی (ی.ن.ك) و ئێران بۆگتنی سەدی دوكان بوو، ئەم عەمەلیاتانە لەسەرەتای شوبات بەبۆردومانی كوێرانەی دانیشتوانی دۆڵی جافایەتی نزك سلێمانی و هێزەكانی (ی.ن.ك) دەستی پێ كرد، داگیركردنی ئەم ناوچەیە سێ هەفتەی خایاند، زیان زەرەرێكی قورس لەناوچكە كەوت ، بەفەرمانی عەلی حەسەن مەجید هەموو ئەو كەسانەی لە (رەگەزی نێر) تەمنیان لەنێوان (12–20) ساڵی دابوو گیران وشوێن بزر كران، ئەوانەی بەرەو كوێستانەكانی رۆژهەلات رایان كرد، تووشی دژواری و زەحمەتیەكی بێ رادە بوون .

سەبارەت بەناساندنی تاوانەكانی جینۆسایدی سەدام حسێن بەرامبەر بەكورد مەكداول دەڵێ : لەكۆتایی مانگی شوبات ، جەلال تاڵەبانی بەرەسمی رژێمی بەئەنجامدانی جینۆساید تاوانبار كرد ، رژێم (1,5) ملیۆن كەسی راگواستبوو، 12 شارو شارۆچكەی زیاتر لە (3000) گوندی وێران كردبوو ، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا رۆژئاوا بەگشتی یان بەهۆی ئەوەی ئەم ئیدیعایانە لەرووی سیاسیەوە نەگونجاو لەكاتی خۆیدا نەبوون یان بەهۆی ئەوەی وا گریمانە دەكرا تەنیا ئیدیعایەكی موبالەغە ئامێزن، حەزیان لێ بوو قبوڵیان بكەن، تەنیا لەگەڵ كۆتایی هاتنی شەڕی كەنداو بوو كەلێكۆڵینەوە و گوتەی شاهیدەكان و ئەو شوێنەوارانەی لەلایەن (چاودێری رۆژهەلات) لێ یان كۆڵرایەوە، نیشانیان دا ئیدیعایەكی پێشوو نەتەنیا مسۆگەرو حاشا هەڵنەگربوون، بەڵكو گەلێ جار ئەو زەحمەت و ئازارانەی كردەكانی عێراق بینیویانە زۆر لەوەی زیاتر بووە كەخودی خەڵكەكە ئەودەم گریمانە یان كردووە .

سەبارەت بەقۆناغەكانی ئەنفال و بەتایبەتیش دوای بۆردومانی هەڵەبجە مەكداول ئەوە ئەڵی، هەفتەیەك دوای بۆردومانی هەڵەبجە ئەلماجید بۆ لەناو بردنی هەر جۆرە بۆردومانێكی كوردان لەقەرەداغ لەخواروی سلێمانی كە زنجیرە شاخێكە و پێشتر كەوتوبووە ناو ئابلۆقەی هێزەكانی عێراقەوە، دەستی بە عەمەلیاتی ئەنفالی دوو كرد، جارێكی دیكە پێش دەست پێكردنی عەمەلیاتی زەمینی، یەك بەیەك گوندەكانیان بەگازی كیمیایی بۆردومان كرد، بەزوویی گردەكان بەو خەڵكانە داپۆشران كەرایانكرد ، زۆربەی ئەو خەڵكانەی بەرەو باكورو سلێمانی رایان كردە كۆكردەوەو بەرەو ئۆردوگاكانیان بردن، لەرێ ناویان نوسین و شتە بەنرخەكانیان لێ وەرگرتن، ناسنامەكانیان لێ سەندن و پاشان ژن و پیاوەكانیان لەیەك جودا كردەوە، پیاوەكانیان بۆ شوێنی نادیار بردن و لەناویان بردن ، لەخواروی قەرەداغ شێوەیەكی تەواوتریان گرتبوە بەر، سەدان پیاوو ژن و منداڵ بێ ئەوەی شوێنەوارێكیان لێبەجێ مابێ لەناوبران .

لەناوەڕاستی مانگی نیسان مەیدانی عەمەلیاتی سێ بەرەو گەرمیان گواسترایەوە ، واتە بۆناوچەی خوارووی کەرکوك و دراوسێی پەراوێزی قەرەداغ کە قەلایەکی (ی.ن.ك) بوو جارێکی دیکە ئەو مێردمناڵ و لاوانەی بەدیل گیران گەشتی کابوس ئاسا خۆیان بەرەو (مەیدانەکانی ئیعدام) دەست پێکرد، گەرمیانی خواروو ئەوێ کەبەرەنگارونەوەی (ی.ن.ك) توند بوو هەزاران ژن و پیاوو منداڵیان گرت و ئیعدامیان کردن .

لەسەرەتای مانگی ئایار، عەمەلیاتی ئەنفالی چوار بۆکۆنترۆڵ کردنی ناوچەکانی نێوان کەرکوك و هەولێرو کۆیە، ڕووی کردە باکور، جارێکی دیکە سەدان کەس بەهۆی گازی کیمیایی لەکەناری زێی بچوك گیانیان لەدەست دا، لێرە لەوانەیە (30) هەزار کەسیان کوشتبێ لەوناوچانەی بەرەنگاری توند بوو ژنو منداڵەکانیان بەرەو کوشتارگەکان برد، بەدرێژایی هاوین سێ عەمەلیاتی تری لەو جۆرە (5،6،7) بەمەبەستی لەناوبردنی هێزەکانی کورد لەبالیسان و ناوچە شاخاویەکانی ڕۆژهەلاتی شەقلاوە ئەنجام دران، هەندێجار خەڵکیان بەگفتی لێ بوردنی درۆ بۆتەسلیم کردنەوە هان دا ، بەرهەحاڵ ئەم کارە کاریگەریەکی وای نەکردە سەر چارەنوسیان .

لە 25ی ئاب ئەنفالی هەشت لەدەوروبەری بادینان بەهێرشی کیمیاوی و بۆردومانی توندی ئەو گوندو دۆڵانەی خەڵکی بێ دیفاع و پێشمەرگەیان تێدا کۆبووبوەوە دەستی پی کرد، هەزاران کەس لەم دۆڵە هەوراز و نشێوانەی پێدا هەڵهاتن خنکان، لە29ی ئاب لەگەڵ بازێ (2980) کەس لەوانەی ڕایان دەکرد بەهۆی گازی کیمیایی مردن و پاشان هێزەکنی عێراق لاشەکانیان سوتاندن، لەشوێنەکانی دیکەش هەموو ئەو نێرانەی بەدیل گیرابوون لەناوچوون، لافاوی ڕاپۆرت کەهەوالی کوشتاری بەکۆمەڵیان ڕادەگەیاند گەیشتە ڕێکخراوی (ئەمینیستی لێبوردنی نێودەوڵەتی ).

دەربارەی جاشەکان و ڕۆڵیان لەشالاوەکانی ئەنفالدا مەکداوڵ دەڵێ : گەلێ جار جاشەکان خەڵکەکەیان کۆدەکردەوە و دەیانبردنە ئۆردوگاکان، هەندێجار ڕێگایان بەژن و منداڵان دەدا لەتاریکی دا ڕابکەن، ئەمانە دەستیان بۆ تالان کردنی هەرشتێك بویستایە ئاوەلابوو، بەگوتەی یەکێك لەلێپرسراوانی بەعس (( مردووەکان بدەنە ئێمە پارەو مولکیان بۆ ئێوە )) ، بەگشتی جاشەکان خزمەتکارانی بەوەفای ئەنفال بوون، لەوانەیە نەشیانزانیبێ کەئەم خەڵکۆکردنەوەو ناردنیان بۆ (ئۆردوگاکان) نییە، بەڵکو بۆ ئیعدامی کۆمەڵە .

ژمارەی قوربانیانی ئەنفال و ئەو زەرەرو زیانانەی کەلێ ی کەوتەوە تاکو ئێستا جێگای مشتو مڕو قسە لەسەر کردنە، بۆ ئەم مەبەستەش مەکداوڵیش بۆچوونی خۆی دەخاتە ڕوو وەدەڵێ : هەرگیز ژمارەیەکی ڕاستی ئەو کەسانە نازانین کەلەعەمەلیاتی ئەنفالدا لەناوچوون، لەوانەیە ژمارەیەك لەنێوان (150000)سەدو پەنجا هەزار تا (200000) دوسەد هەزار کەس بێ، هەندێجار گوندەکی و پێشمەرگەیان لەیەك جێگادا دەکوشت، بەلام زۆربەیان دەناردە

ئۆردوگــای (تــۆپزاوا) کەئۆردوگایــەکی عەســکەری بــوو لــەخوارووی ڕۆژئــاوای کــەرکوك، کەبەشێوەیەکی کاتی جێگای (5000) کەسی تێدا دەبووەوە، لێرەدا ناونوسین و جوداکدنەوەی ژن و پیاو بەزەبروزەنگی هاوشێوەی زەبروزەنگی ئۆردوگاکانی مەرگی نازیەکان بەڕێوە دەچوو، مێرد منالّ و لاوو پیاوەکانیان بەدوای یەکدا ڕیز دەکرد هەموو شتێکیان لیّ دەسەندن، بێجگە لە جل و بەرگ، پاشان لێکۆڵینەوەیان لەگەل دەکردن و لێدان کارێکی ئاسایی بوو، پیرو چەند ژن و منداڵێکیان بردە ئۆردوگای (نوگرەسەلمان) ی بیابانی خوارووی ڕۆژئاوای عێراق، یەکێك لەو سزایانەی لـەنوگرە سـەلمان دەرهـەقیان دەکـرا ئـەوەبوو کـە خـەڵکیان ناچار دەکـرد بۆمـاوەی چەندین سـەعات بـەبێ جووڵـە چۆك دابـدا و بەعەمودێکـەوە دەبەسـتەوە لەبـەر هـەتاو دایانـدەنا، لـەمانگی حـوزەیران بـەداوە، مـردن لـەنوگرە سـەلمان لەبەرهـەتاوی گـەنیو کـارێکی ئاسـایی و مسۆگەر بوو، هـەموو ڕۆژێك چـوار تـا پێنج کـەس دەمـردن ، گـەلێ لەلاشـەکانیش پـێش ئـەوەی بیانخاتـە ئـەو چاڵانەی کـەجێگای لاقیـان دەبـوەوە بەئەنقەسـت دەهێـشتەوە بۆئـەوەی بگـەنێ، زۆربـەی ژنـەکانیان بـەرەو ئۆردوگـای دوبـزی نزیـك ڕێگـای سـەرەکی کـەرکوك–موسـڵ دەبـرد، ئـەم دوو جۆرە زیندانیانەیان تاچوار پێنج مانگ دوای بەرەنگاری پێشمەرگەکان لەسەرەتای ئەیلول هێشتەوە، هەزاران کەس لەم خەڵکانە لـەناو گرتوخانـەکان لەناوچوون، گـەلێ منـداڵ لـەئۆردوگای دوبـز بـەهۆی بـەدخۆراکی و سـك چـوون مـردن، نزیکـەی نیـوەی ژنـەکانیان بـەرەو کۆتاییـەکانی ئەنفال برد، بۆنمونە چاڵەکانی مەرگی سەماوە .

دەربارەی وەڵامی ڕژێمی بەعس بۆئەو لایەنانەی دەربارەی ئەم کارانە پرسیارین لێدەکرد دیڤید دەڵـێ : سـەرەتاو وەڵامـی ڕژێـم بۆهـەموو ئـەو پرسـیارانەی دەربـارەی ئـەم قوربانیانـە دەکـران ئەوەبوو (( ئەمانە لەمیانەی عەمەلیاتی سەرکەوتوانەی ئەنفال دا گیران و ئێستا گیران ))، بـەڵام دوای دووساڵ کاتێك ژمارەی ئەو کەسانەی بەدوای ون بووەکانیاندا دەگـەڕان زۆر بـوو، وەڵامـی ڕژێـم گـۆڕا ((ئێمـە هـیچ زانیاریـەکمان لەچارەنوسیان نییـە ))، بـەم شـێوەیە وێـڕای ئـەوەی نـاوی قوربانیان نوسرابوو، سـەدام حسێن ڕاستی بەڕاحـەتی کـردە ڕووداوێکـی نـاخۆش کـەدەزگاکانی بەداخەوە هیچ جۆرە زانیاریەکیان لەم بارەیەوە نییە .

سەبارەت بەژمارەی ئەو گوندو شارو شارۆچکانەی کەحکومـەتی عێراقی لەپرۆسـەکانی ئەنفالـدا وێران یان زیانی بەرکەوت مەکداوڵ ئەوە باس دەکات کـەتاکۆتایی شـەڕ نزیکـەی (4000) گوند وێران کرابوون و بەلایەنی کەمەوە (1,5) یەك ملیۆن و نیو کەس بەزۆرەملیّ لەشوێنەکانی دیکە نیشتەجیّ کرابوو ، لەگەڵ ئەمانەشدا حکومـەت هێـشتا ئـەو ڕێ و شـوێنانەی تـەواو نـەکرابوو کـەتازە بـۆ کوردسـتان پیـشبینی کردبـوو، لـەمانگی کـانونی یەکـەم، مەبەسـتی خـۆی بەدروسـت کردنـی (22) شارۆچـکەی تـازە کەهەریـەکێکیان جێگـای پـانزە تـا بیـست هـەزار کەسـی تێـدا دەبـوەوە، لەسـاڵی 1989 قـەڵادزێ ڕاوێـژکاری سیاسـی باڵوێزخانـەی وڵاتەیـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـە بەغـداد، دو ڕۆژئـاوایی بووین کـە ڕێگـەمان پێـدرا سـەردانی سلێمانی لـە ڕۆژهـەڵاتی

کوردستانی عێراقدا بکەین, ئەمەش کارێکی زۆر دەگمەن بوو، گومانم هیە کە کاتێك حەمودون ئیجازەی سەردانەکەی بۆ وەرگرتین نەیدەزانی ڕەنگە ئێمە چی دەبینین .

لە ڕۆژێکی خۆڵبارانی وا مت و هێوەر پایتەختمان بە جێهێشت، کە بەغداد هەموو زەرد هەڵگەڕا بوو بە ناو بەعقوبەدا ڕەت بووین و پاشان گەیشتینە جەلەولا، لەوێ لەگەڵ مەفرەزەیەکی سەربازی بە ڕێ کەوتین لە دووری یەك میل کەمتر گەیشتینە شوێنێك کە پێشتر شاری گەورەی کورد نشین بووە, لە بەشێکی بچوکی لای ڕۆژئاوای بترازێ کە هێشتا خاپور نەکرا بوو ئەوی تری هەموو وێران کرا بوو، لە نێوان جەلەولا تا سلێمانی (29) گوندو شاری کاولکراومان ژمارد، بەڵام خۆ ئاشکرا بوو کە گەلێکی هاوشێوە لە ناوچەیەدا هەبوو، لە هەندی شوێن بلدۆزەرەکان هێشتا هەر خریکی کاول کردن بوون و لە نزیك هەندی خانووی نیوە ڕوخاو پارکیان کردبوو، لە هەر شوێنێك کە تەواو خاپوور کرا بوو سوپای عێراقی ڕەزو کێڵگەکانی سوتاند بوو، مزگەوتەکانی تەقاندبووەو کێلی قەبرەکانی ڕامالّی بوو ، وایەری کارەباشی لە دار تێلەکان بچڕاند بوو، بەڵام هیچ ئاوەدانی لێدیار نەبوو، تەنانەت تاقە شوانە وێڵەیەکیشی لیّ نەما بوو.

لە دۆڵە مەیلەو ئارامەکانی ناوچەکەدا، دیتمان شاری تازە دروست دەکران، شەقامی بەرینیان بە ناودا دەچوو ( تا بە ئاسانی تانکی بە ناودا ڕەت ببا ) لە ناو ئۆردوگاکانداو لە دەرەوەشیاندا، سەربازو هێزەکانی ئەمن خەریك بوون قەڵای سەختیان دروست دەکرد، بۆ ئەوەی لەوێوە ڕا بتوانن کۆنتترۆڵی دانیشتوانەکە بکەن، ئەو شارانە بە تەوسەوە پێیان دەوترا شاری سەرکەوتن (Victory city) جیاوازییەکی کەمیان لە گەل گرتوو وخانەکانی نازییەکاندا هەبوو، چونکە دانیشتوانە کوردەکان نەیان دەتوانی بە ئاسانی لێوەی دەرچنە دەرەوە، لەو شارانەی سەرکەوتندا بواری ئیش کردن بۆ کەس نەبوو, وای لە دانیشتوان کردبوو بۆ بژێوی ژیانیان تەنها پشت بەو بەشە خۆراکە ببەستن کە میری دابەشی دەکرد، پیاوەکان لە پەیوەندی بە میلیشیاکانی سەر بە حکومەت بترازی واتەلە بوون بە چاش (بێووی کەر یان بێچووی نێرەکەر) بترازێ هیچ ڕێگەیەکی تریان لە بەردەمدا نەبوو و هەرچەندە پێشتر هیچیان لەو بارەیەوە نەدەزانی، بەڵام من و ڕانکن گوێمان لە ئەنفال بوو (ئەنفال لە سورەتێکی قورئانەوە هاتووە و بە شێوەیەك لێکدراوەتەوە کە ماف بە خوا ناسان دەدات تا ماڵ و سامانی خوا نەناسان بە تالأن ببەن)) , ئەنفال هەڵمەتێکی سەربازی بوو بە مەبەستی ژیان لە لادێکانی کوردستانی عێراق بەڕێوە چوو, سەدام حسین لە ئاداری 1987 , عەلی حەسەن مەجیدی پشمامی خۆی کردە فەرمانداری باکورو دەسەلاتی چارەسەر کردنی کێشەی کوردی پێدا، مەجیدیش زۆربەی

ناوچەکانی کوردستانی بە مەنتیقەی محەرەمە ڕاگەیاند، لەوێ هێزە چەکدارەکان پێویست بوو هەر مرۆڤێك یان ئاژەڵێك بکوژن کە لەو ناوچانەدا دەبینرێن .*

لە درێژەی باسەکەیداو دەربارەی وێرانکارییەکانی کوردستان گالبرێت ئاماژە بەوە دەکات لە سەر کۆی ئەوە (4500) گوندی کوردستان هەبوو، حکومەتی عێراقی تا (2)ی ئابی 1990 پتر لە (4000) گوندی قەلاچۆ کرد، لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی عێراق شارەکانی هەڵەبجەو سەید سادق و قەلادزێ ی خاپور کرد.

بە بۆچوونی بەرەی کوردستانی عێراق لە سەرجەمی (7500) کیلۆمەتری دووجای ڕووبەری خاکی کوردستان مەرسومەکانی مەجید 4500 کیلۆمەتری دووجایان لەم وڵاتەدا چۆڵ کرد، ئەو کوردانەش کە لەو ناچە موحەرمانەدا دەژیان هەموویان بۆ باشوری عێراق دوور خرانەوە یان ئیعدام کران، لە دوای ڕوخانی سەدام لە 2003 محمد ئیحسان وەزیری مافی مرۆڤی حکومەتی هەرێمی کوردستان ( لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین محمد ئیحسان وەزیری ناوچەکانی دەرەوەی هەرێم نەك مافی مرۆۆ ئەمەش هەڵەیەکی هێندە گەورە نییە لە ناوەڕۆکی بابەتەکە ناگۆڕدرێت – ئامادەکار) سەرکردایەتی چەند تیمێکی پزیشکانی یاسایی کردو چوون لە نزیك سەماوەی باشوری عێراق و لە ڕۆژئاوای پاشماوەکانی خەزی سەر بە پارێزگای سەلاحەدین، چەندەها گۆڕی بە کۆمەڵیان هەڵدایەوە کە تەرمی هەزاران کوردیان تیادا بووە، حکومەتی هەرێمی کوردستان بە فەرمی ژمارەی قوربانیانی ئەنفال لە نێوان سالانی 1987–1988 بە (182000) کەس دەخەملێنن.

دەربارەی زانیاری و هەڵوێستی حکومەتی ئەو کاتەی ئەمریکا سەبارەت بە تاوانەکانی ڕژێمی عێراق گالبرێت دەڵی :– بەڕێوەبەرایەتی (ڕێگان) بەو هەولانەی زانی کە سەدام حسین بۆ خاپور کردنی کوردستان دەیدا.

ڕانکن ڕاپۆرتێکی (279 لاپەڕەیی دەربارەی دیدارەکانمان نووسی، ڕاپۆرتەکە بە ناو وەزارەتی دەرەوەی هەندێ دەزگای تری حکومەتی بلاوکرایەوە، منیش لە ڕاپۆرتێکدا باسی شێوە ڕوخاندنی گوندە کوردییەکانم کردو کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەروەی لە دوای سەفەرەکەمان ڕاپۆرتەکەی بلاو کردەوە، ناوم لە ڕاپۆرتەکەمان نا : شەڕ لە کەنداوی پارسی : ولاتە یەکگرتوەکان پشتە لایەنە شەڕکەرەکان دەگرێ و جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی (ی.ن.ك) سەرکردەی کوردە یاخیەکان لە نیسانی 1988 سەردانی واشنتنی کردو کتێبێکی ئەستوری سپی لە گەڵ خۆیدا هێنا بوو، کتێبەکە ناوی پتر لە سێ هەزار گوندی کوردانی تیادا بوو کە تا ئەو کاتە خاپور کرا بوو، تاڵەبانی کۆپییەکی پێشکەش لێری پۆپ کرد، ئەمەش لە بیرۆی ڕۆژهەڵاتی نزیك لە وەزارەتی دەروە، بەڕێوەبەری کاروباری باکوری کەنداو بوو، لەو کاتە

* ئەم مەرسومەی حوزەیرانی 1987, یەکێك بوو لەو (14) تەن بەڵگە نامە شاردراوانەی لە ڕاپەڕینی (1991) بەردەستی کوردەکان کەوت و لە ئەرشیفی نەتەوەیی کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەنجومەن پیران هەڵگیران.

سەرنجی پتر کەوتە سەر لایەنێکی تری دراماتیکی ئەنفال، ئەویش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بوو دژی کوردان .

لە کۆتایی باسەکەیدا گالبرێت سەبارەت بەم باسە دەڵێت:– لە میانەی هەوڵدانیان بۆ وەدەست هێنانی پشتیوانی بۆ شەڕە تایبەتەکانی، هەردوو سەرۆك جۆرج و , بۆشی کوڕەکەشی جۆرج بوش جەختیان کردەوە کە سەدام حسین دیکتاتۆرێکی دڵڕەق بووەو گەلەکەی خۆی بەبەرگاز داوە)) .

لەو دەمەی کە سەدام گازی بەکار هێنا بەڕێوەبەرایەتی ڕێگن چۆن گوێی بەوە نەدا کە عێراق گازی لە دژی سەربازکانی ئێرانی بەکارهێنانی بە هەمان شێوە گوێی بەوەش نەدا کە ئەو چەکانەی لە دژی کوردە سیڤیلیەکانیش بەکار برد، هەرچەندە لە ئاداری 1987ەوە گازی ژەهراویەکان لە دژی کوردان بەکار هات، واگریش دەکرێ کە بە لای کەمیەوە ئاژانسە هەواڵگرییەکانی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نە هیچ کەس لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی یەك قسەشیان بە ئاشکرا لێ نەکرد.

یەکێکی دیکە لەو سەرچاوەو پەرتوکانەی سودمان لێوەرگرتووە دکتۆر کەمال مەعروفە, هەرچەندە دکتۆرکەمال کوردە، بەڵام نوسەر لە بەرهەمەکەیدا کە درەبارەی کێشەکانی کورد و هەندی کێشەی تری جیهانیشی پشت پێ بەستوە بە چەندین سەرچاوەی ڕۆژئاوای کە باسی کارەساتی کوردیان کردووە بە تایبەتیش هەڵەبجە کە یەکێك بوو لە قۆناغەکانی ئەنفالی هەشت قۆناغەکە، کەمال مەعروف پشت بە پشت بەستن بەڕاپۆرتێکی تایبەت بۆ کۆنگریسی ئەمریکی دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (تقرير خاص الى الكونغرس الامريكي حول استخدام الاسلحه الكيمياويه) ئەوە نیشان دەدات کە کارەساتی هەڵەبجە کە یەکێك بوو لە قۆناغەکانی ئەنفال و هەموو جیهانی هەژاند، بەڵام حکومەتەکانی ئەوروپا نەوروژاندو بە ڕەسمی لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە حکومەتی عێراقی سەرزەنشت نەکرا، ئەمەش بە هۆی هەڵوێستی چەند وڵاتێکەوە بوو کە دژی ئەوە ڕاوەستان عێراق تاوانباری بکرێ , بە بیانوی پاراستنی تەرازوی هێزەکان و بەرژەوەندییە ئابورییەکانەوە، ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە بڕیاری (S–2763) دا دەربارەی قەدەغە کردنی تاوانی جینۆسایدی ساڵی 1988 ڕەفتاری ڕژێمی عێراقی لە کوردستاندا بە جینۆساید پێناسە دەکات، بە فەرمانی سەرۆکی کاروباری دەروە لە کۆنگریسی ئەمریکی دوو نوێنەری پەرلەمانی هاتنە کوردستان بۆ لێکۆڵینەوە لە وەزعی کورد، هەردوو نوێنەرەکە (پتر گالبرێت و کریستۆڤەر ڤان هۆلین) بوون لە ڕاپۆرتیکی تایبەت دا کە لە 12ی ئەیلولی 1988دا داویانە بە کۆنگریسی ئەمریکی , سیاسەتی عێراق بە کوشتن و بە کارهێنانی گازو ڕاگواستن تاوانبار دەکەن دیارە مەبەستی فەوتاندنی کەلتورو تایبەتمەندی ژیانی کوردە.

هەرچەندە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا بە بڕیار ژمارە (2763) دژی لە ناو بردنی گەلی کورد پێشکەش کراوە داواکرا کە سزای عێراق بدرێت، بەڵام لە دوایدا کاری پێ نەکرا .

دواتر دکتۆر کەمال دەربارەی هەڵوێستی فەرنسا دەڵێ : میسیۆ میتران (میتران سەرۆکی فەرەنسا بوو ئەو کاتە کە بە دۆستی کوردیش ناسراوە) .

ڕاڕایی و نیگەرانی خۆی بەرامبەر بە کارهێنانی چەکی کیمیاوی دەربڕی، بەڵام بە شێوەیەکی ڕەسمی عێراق سەرزەنشت نە کرا ، بۆ ئەم مەبەستەش فەرنسا لە 1990/11/17 کۆنفرانسێکی نیودەوڵەتی ڕێکخست بە سەرۆکایەتی میسۆ میتەران بۆ قەدەغە کردنی چەکی کیمیاوی، بەڵام ئەوەی لە هەموو شت سەیر تر بوو بە هیچ شێوەیەك ڕژێمی بەعسیان تۆمەتبار نەکردوو بە تاکە ووشەیەکیش ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ باسی هەڵبجەو ئەنفالیان نەکرد ڕێگەشیان نەدا کە کورد نوێنەرێکی لە کۆنفرانسدا هەبێت .

دەربارەی هەڵوێستی بەرتانیاو ئەڵمانیای فیدرالیش بە پشت بەستن بە دۆکیومێنتی خۆیان ئەوە دەخاتە ڕوو کە دەوڵەتی بەریتانیا و ئەڵمانیای فیدراڵیش نیگەرانی خۆیان دەربڕی و داوایان لە عێراق کرد کە واز لەم کارانە بهێنێ و ڕێگای ئاشتیانە بگرێتە بەر بۆ چارەسەر کردنی کێشەی ئاشتیانەی گەلی کورد، هەروەها هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەتی جارانیش ئەوە باس دەکات یەکێك بوو لەو دەوڵەتانەی دژی ئەوە ڕاوەستا کە عێراق سەرزەنشت بکرێت لە ڕۆژنامەی (پراڤداشدا) تەنها کورتە هەواڵێك لە سەر قڕ کردنی بە کۆمەڵی خەڵکی بێگوناهی هەڵەبجەو ناوچەکانی دیکەی عێراق ناسرا بوو (ئەلکسەندەر زۆتۆڤ) کە لێپرسراوی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بوو دەڵێ :– (( بۆ ئێمە شەڕ لە کاتێکدا کە هەموو جیهان پشتیوانی لە کوردستان دەکات و هاوبەشی خەمیانن کەچی وا پیشان دەدەن کە هیچ ڕووی نەداوە)).

هەروەها سەبارەت بە هەڵوێسیتی وڵاتانی دیکەی ئەوروپا بەرامبەر بەم کارەساتە وەکو وڵاتانی سوید، دانیمارك و فیلندا , هۆڵەنداو نەرویج و چەند وڵاتێکی دیکە، داوایان لە سکرتێری (U.N) کرد کە مەسەللەی بەکارهێنانی چەکی کیماویی بکۆڵنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش وەفدی خۆیان ناردە کوردستان بۆ ساغ کردنەوەی ئەوەی کە ئایا چەکی کیمیاوی بەکار هاتووە یان نە؟ چونکە حکومەتی عێراق بە هەموو شێوەیەك نەفی کردو حەملەیەکی دیبلۆماسی کرد بۆ ئەوەی دەوڵەتە عەرەبییەکان پاڵپشتی بکەن لە ڕاستیدا بەشێك لە ولاتە عەربییەکان پشتیان گرت

کریس کۆچێرا, یەکێ ترە لە سەرچاوەکانمان ئەم پیاوە فەرنسییە کە دەمێکی نزیکایەتیکی پتەوی لەگەڵ دۆزی کوردو خەڵك و سەرکردەکەی هەیە کۆمەڵێك پەرتوك و بەرهەمی نایابی لە سەر کوردو کوردستان نووسیوە، کۆچێرا لە یەکێك لە بابەتەکانی کە تایبەتە بە کارەساتەکانی کیمیا باران کردن کە خۆی بە قۆناغی دیاری ئەنفال ناوی بردووە دەڵێ: لە نیوەی مارسی 1988 پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) پاش هێرشە گەورەکانی هێزەکانی عێراق پایگا سەرەکییەکانی خۆیان لە دەست دا , شاری (70) هەزار کەسی هەڵەبجە لە باشوری ڕۆژهەلاتی کوردستانی عێراق لە نیزك سنوری ئێرانییەکان داگیر کرد، ئەم شارە چەند هەفتەیەك پێشتر لە لایەن هێزەکانی ئێرانەوە کە کێوەکانی باکوری ڕۆژئاواییان داگیر کردبوو، لەوێوە جێگاکانی سوپای

عیراقیان بۆردومان دەکرد گەمارۆ دابوو، پاش ئەوەی سەربازگەی هەڵەبجە کە لە لایەن فەرماندەکەی کە ئەفسەرێکی شیعە بوو چۆڵ کرا . هێزەکانی عێراق بریاریان دا لە هلو مەرجێکی دیژواردا پاشەکشێ بکەن و بەرەو سلێمانی بکشێنەوە، ئەمە تەنها رێگای دەرباز بوون بوو لەم جەنگە کە کەوتبوونە نێوان دەریاچەی سیروان و ناوچەی شاخاوی، کوشتاری بەکۆمەل روویدا، 80٪ هێزەکانی عێراق کوژران و ئەوانی تر دیل کران . رۆژی سیازدەی مارسی 1988 شارەکە لە لایەن سەدەها پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی و پاسدارانی ئێران ئازاد کرا.

تۆڵی سەدام حسێن ترسناک بوو، رۆژەکانی 16 , 17 ی مارسی 1988 فرۆکەکانی عێراق بە هۆی بۆمبای گازی کوشندەوە هەڵەبجەیان بۆردومان کرد و پێشمەرگەکان و پاسدارەکان پێشتر هاتبوونە دەرەوە لە ماوەی چەن دسەعاتێکدا نزیکەی (5) هەزار کەس لە هاولاتیان لە ناو چوون، خێزانی وا هەبوو هەموویان کوژران ،حکوموتی عێراق چەندین جاری تر گازی کیماوی بەکار هێنا بەرامبەر گەلی کوردو هەزاران کەسی لەناو برد، ئەمانەش بوونە سومبوڵی بەربەریەتی سەدام حسین تەنها چەند مانگێك و چەند ساڵێك دواتر ئەوەی بەدەست هات کە سوپای عێراق بە شیوەیەکی بەرنامە رێژی چەکی کیمیاوی لە چوا رچێوەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال لە دژی کوردەکان بەکار هێنا بوو، ئەو عەمەلیاتە بووە هۆی ترس و لاوازی و بێ هێزی بزوتنەوەی کورد و کوشتاری بە کۆمەل یەك لە دوای یەك دوو بارە دەبووەوە، لەگەل هەموو کارەساتەکاندا کوردەکان رێزو شەرەفی خۆیان پاراست.

جارێکی تر سەرچاوەیەکی ترمان هەر کوردە ئەویش دکتۆر علی تەتەر نێروەییە، دکتۆر عەلی پەرتوکەکەی کە تێزی دکتۆرایەکەو تایبەتە بە بارودۆخی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا، یەکێك لە باسەکانی دکتۆر عەلی تایبەت بە کارەساتی ئەنفال و لەم باسەشدا پشتی بە چەندین سەرچاوەی رۆژئاوایی بەستوە وەك گروپ یان وەك کەسایەتی، دەربارەی بارودخی ساڵانی هەشتاکانی کورد لە عێراق رێکخراوی 0میدال ئیست وۆچ) باسی ئەوە دەکات بارودۆخی عێراق لە سالانی کۆتایی جەنگ لە دەست دەرچوو بوو، ساڵی 1985 کاروباری باکور بە محمد حەمزە زوبیدی سەرۆکی نوسینگەی رێکخستنی باکوری حزبی بەعس سپێردرا بوو فەرمانی پێدرا کە لە ماوەی شەش مانگدا بە هەرە شێوەیەك بێت وێرانکردوو دانیشتوانە (100) هەزار کەسیەکەی بردە ئۆردوگای زۆرە ملێکان سەد هەزار کەسی دیکەش کەلە دەورو بەری شاردا دەژیان هەر ئەو چارە نوسەیان پێبرا. رانیەش کەشارێکی 25 هەزار کەسی بوو روو بەروی هەمان هەرەسە بوەوەو بەپێ ی ئیدیعای (بەرەی کوردستانی)تامانگی تەموز لە 750,000 کیلۆتری چورگۆشەی خاکی کوردستان، 450,000 لەکورد پاك کرانەوە ئەمە ئیدی مەسەلەی دابین کردنی ئاسایش نەبوو، بەڵکو مەبەست وردوخاشکردنی کۆمەڵی کوردبو، بێجگە لەوانەی لە خزمەتی حکومەت دابون.

یەکێکی دیکە کەبەڕەگەز ڕوسەو لەگەڵ کۆمەڵێك نوسەری دیکە بەرهەمێکی کۆکراوەیان هەیەو باسی کارە ساتی ئەنفالیان کردوە (ن.لازاریف)ە. لازاریف یەکێکە لەو ڕۆژئاوای و بێگانانەی کەبەرهەمی باش و بەپێزی دەربارەی مێژووی کۆن و نوێ ی کورد هەیەو تاڕادەیەکیش بەرهەمەکانی بونەتە سەرچاوەیەکی باش بۆ مێژوی کورد. لازیف سەرەتا وەکو پیشەیەك دەربارەی بارو دۆخی کورد لەهەشتەکانی سەدەی ڕابردوودا. ئەوە باسدەکات کەلەهەشتاکاندا ئەو وڵاتانەی کەکوردستانیان دابەش کردوە لەگەڵ ئەو ناکۆکیە مەترسیدارانەی کەلەنێوانیاندا هەبوو، چەند هەنگاوێکی هاو بەشیان گرتە بەر لەململانێکانیان لەدژی بزوتنەوەی کورد کەئەمەش زۆر بەڕونی دەرکەوت لەکاتی جەنگی ئێران و عێراق و تەنگەژەکەی ناوچەی کەنداودا.

سەبارەت بەمەسەلەی کورد لەعێراق و گۆڕانکاریەکانی هەڵوێستی حکومەتی عێراق بەرامبەر بە کورد لازاریف دەڵێ! لەکۆتای ساڵی 1979 گۆڕانکاری هات بەسەر سیاسەتی عێراق لەپرس و کێشەی کورد، ئاشکراشە کەمەبەستەکە خۆ ئامادەکردنی عێراق بوو شەڕەکەی لەدژی ئێران لەپایزی ساڵی 1979 سەدام حسێن هەستا بەسەردانێك بۆ کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی دیاریکراویش بۆ شاری سلێمانی بەومەبەستەی کەخۆی بەلایەنگری (ناوچەی ئۆتۆنۆمی) نیشان بدات، لەهەمان کاتدا ڕایگەیاندا کەبە هەزاران کورد دەدات بۆ گەڕانەوە لە ناوچەکانی باشوری عێراقەوە بۆ کوردستان بۆ جارێکی تر، هەروەها لەساڵی 1980 پرۆسەی هەڵبژاردن لەکوردستان ئەنجامدرا کە(50) پەنجا نوینەر کاندید کرا بۆ ئەوەی کە ناونرا (ئەنجومەنی تەشریعی) بە شێوەیەکی بنەڕەتیش لەوانەی کە هاوکار بوون لەگەڵ ڕژێمی فەرمان ڕەوادا . شەڕی ئێرن و عێراق لەسالأنی 1980-1988 مەینەتی و کارەساتی تازەی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ گەلی کورد، چونکە هێڵی بەرەی شەڕەکە لەبەرەی باکوری ڕۆژ ئاوا بەناو چەکانی کوردستاندا تێدە پەڕیً، هەروەها هێزە چەکدارە گەورەکانی هەردوو وڵات لەناوچەکانی کوردستانی عێراق و ئێران جێگیر بوون، هەڵدەستان بەکردەوەی تۆڵەسەندنەوە لە دژی کوردەکان لە هەردوو لای سنوور . بەم جۆرەش ئەم کارو کردەوە کاولکارانەی هەردوو لای شەڕەکە بوونە هۆی تێکچوونی بارودۆخی ئابوری‌و سیاسی و کۆمەڵایەتی دانیشتوانی کوردستان . ئەو هەولأنەی کە دەسەلأتی عێراقی ئەنجامی دەدا بۆ بەکارهێنانی نەیارە کوردەکانی عێراق بەمەبەستی یەکخستنیان لە ژێر ئالأی بیر و باوەڕی ئیسلامی ئەو هەولأنە ئاکامێکی ئەو تۆیان نەبوو . ژمارەیەك لەو ڕێو شوێنە سیاسی و سەربازییانەی تر کە هەر دوو لای شەڕەکە گرتیانە بەر بە زۆربێت یان بەخواست ((طوعاً أو کُرهاً)) هێزە نیشتمان پەروەرەکانی کوردی دورخستەوە لە ئەرکە سیاسی و خەبات و تێکۆشانەکانیان کە بووە هۆی دروست بوونی دوبەرەکی و دژایەتی لە نێوان دیموکرات خوازەکانی کورد . بەهۆی ئەم هۆکارانەو هۆکارە تەقلیدییەکان کە بریتیی بوو لە پەرتەوازەی بزافەکانی کورد . بۆیە

بەکاربهێنن بۆ بەدیهاتنی ئامانجە نەتەوەییەکان . ڕژێمە خوێناوییەکەی سەدام بەتۆمەتبارکردنی کورد بەهاوکاری لەگەڵ هێزەکانی ئێران بەبێ بەڵگەش دەست پێشخەری کرد لەکردەوەیەك کە شتی وا ڕووینەداوە لە تیرۆر و تۆقاندن، ئەوە بوو لەساڵی (1984) خەبیر و شارەزای ئەمریکی قسەیان دەکرد لەسەر بەکارهێنانی گازی (خەردەل و تابون) لەلایەن هێزە چەکدارەکانی عێراق لە بەرەی شەڕی ئێران ئێران و ئێراق .

هەروەها سەدام دەست پێشخەری کرد لە هەنگاوێکی تری تازەی تاوانباری ئەمەش بە قۆستنەوەی بێ دەنگی ڕای گشتی جیهانی و سزانەدانی .

دەربارەی چەکی کیمیاوی و بەکارهێنانی دژی گەلی کورد لازارین دەڵێ : لە (16ی ئازاری 1988) ڕژێمی عێراق هەستا بەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە دژی دانیشتوانی شاری هەڵەبجەو دەوروبەری . کە لەچاو تروکانێکدا بەگازی (سام) هەزاران خەڵکی بێ تاوانی لە ناوبردو بەدەیان هەزاریشی شێواند بەپێ ی شایەتی ئەو ڕۆژنامە نوسانەی کە چوو بوونە ناوچەی هەڵەبجە بەهەزاران لاشەی پیاو و ئافرەت و منداڵ و پیر لەناوماڵ و حەشارگەو شەقامەکان و دەوروبەری شارەکەدا . هەروەها چەکی کیمیاوی بەکارهێنا لە دژی کورد لە مانگەکانی ئاب و ئەیلولی (1988) کە لە زۆر ولاَتەوە شەپۆلی ناڕەزاییەکان دروست بوو لە دژی تاوانەکانی ڕژێمی سەدام لە کوردستان کە ناودەبرا بە (هێرۆ شیمای دووەم) .

بەعس بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە هەڵی دەدا گۆڕانکاری بەدی بهێنێت بەسەر پێکهاتەی نەتەوەیی لە کوردستاندا، واتە "بەعەرەب کردنی ناوچەکانی کورد" کە بۆ لە ناوبردنی ڕەسەنایەتی کەلتووری نەتەوەیی کورد و گۆڕینی بۆ کەمە نەتەوایەتیەکی بێ بەشکراو لەزەوی و زارە ڕەسەنەکانی، کە لەسەر خاکی باوپیرانی خۆی دەژی بگۆڕێت بۆ کێشەی کەمینەیەکی نەتەوایەتی، بۆ گەیشتن بەم مەرامانەی ڕژێمی بەعس بەردەوام بوو لە وێرانکردنی گوند و لادێکانی کوردستان، دەسەلاَتدارانی عێراق توانیان هەموو گوند و لادێکانی کوردستانی عێراق بە گشتی وێران بکەن یاخود بەشێکی تەنانەت لە ژمارەیەك لەناوچەکان بلدۆزەرەکان هەڵدەستان بەتەخت کردنی پاشماوەی گوندەکانی کورد بەڕووی زەویدا هەورەها ماددە ژەهراوییەکان بونە هۆی لەناوبردنی گژوگیاو ڕووەکەکان . هەروەها سەرچاوەکان و کارێزەکان بە چیمەنتۆ پڕکرانەوە هەر وەکو چاودێرێکی ئەورووپی لە نوسینێکدا دەڵێت : " ئەو کوردستانەی کە هەژماردەکرێت بەناوچەی بەخێوکردنی مەڕومالاَت، ژمارەی مەڕەکانی لە ماوەی (5) ساڵدا دەگەیشتە (7) ملیۆن سەر، تەنها (50) هەزار سەری مایەوە، ئەویش لەو ناوچە دوورە دەستانەی کە دەستی وێرانکاری پێ ی نەدەگەیشت ، وەدەیان هەزار شانەی هەنگیان وێران کرد . بەم جۆرەش بەخێوکردنی هەنگیان لەناو برد ، کەبەخێوکردنی هەنگ یەکێکە لە پیشە کۆنەکانی کوردستان لەدێر زەمانەوە .

سەبارەت بە کاردانەوەی نێو دەوڵەتی تاوانەکانی حکومەتی عێراق بەرامبەر بەکورد لازاریف دەڵی : لەشوباتی 1989 ڕێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتی ڕاپۆرتێکی تایبەتی بڵاوکردەوە سەبارەت بە کردەوە کۆمەڵکوژیەکان لەعیراقدا . کەلەناو قوربانیەکاندا منداڵ و ئافرەتی تێدایە . ئەم ڕاپۆرتە زانیاری ئەوتۆی لەخۆ گرتبوو ، کەبەلای مرۆڤەوە خوێندنەوەی زەحمەتە ، کاتێك دەبینی باس لەسزای دڕندانە دەکات بەرامبەر ئەو منداڵە بچوکانە کەلەپێش چاوی باوکەو داکیان سزا دەدرێن ، تاوەکو ئیعترافیان پێ بکەن کەبەشداری کارو چالاکی نهێنیان کردووە . بەهەمان شێوە کوشتنی ئەو مندالانەی کەتەمەنیان لەنێوان (12 – 13) ساڵیدایە لەبەر ئەوەی دەسەلآتداران گومانیان هەبوو کەباوکیان بەشداری چالاکی دژ بەدەوڵەتی کردووە ، هەروەها لاشەی ئەو مندالآنە نەدەدرایەوە بەکەس‌وکاریان ، ئەوانەی کەلەژێر ئەشکەنجەدان دا دەمردن ، تا پارەی باجی لەسێدارەکەیان نەدایە بە حکومەت[6] .

پیتەر گالبرێت یان گارلبرێت هەندێك جاریش بەباڵوێز ناودەبرێت بەڕەگەز ئەمریکی یەو چەند\ین پۆستی حکومی هەبووە لەئەمریکا ، لەکاتی شالآوەکانی ئەنفالی کوردستان بۆخۆی مەیدانی سەردانی ناوچەکانی کوردستانی کردووەو ڕوداوەکانی بەچاوی خۆی بینیوەو کاتی خۆیشی قسەی خۆی کردووە لەسەر ڕووداوەکان . گالبرێت لەەکێك ەبەهەمەکانیدا کەپەرتوکێکەو بەگشتی بۆهەموو عیراقی تەرخان کردووە لەسالآنی هەشتاکاندا بەسەر کوردا هاتووە ، گالبرێت لەکاتی شالآوەکانی ئەنفال و بەر لەشالآوەکانیش بەتایبەتی وەك نێردراوی حکومەتی ئەمریکی هاتۆتە کوردستان و لەزرێك لەناوچەکانی کوردستان دا گەڕاوە کەحکومەتی عیراقی لەوکاتەدا خەریکی کاول کردنیان بووە ، لەم باریەوە گالبرێت دەڵێت : لەئەیلولی 1987 ، من و (مەبەست گلبریت خۆیەتی ) ، هێوودرانکی ڕاوێژکاری سیاسی باڵوێزخانەی ولآتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغداد , دو ڕۆژئاوایی بووین کە ڕێگەمان پێدرا سەردانی سلێمانی لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی عێراقدا بکەین , ئەمەش کارێکی زۆر دەگمەن بوو , گومانم هیە کە کاتێك حەمودون ئیجازەی سەردانەکەی بۆ وەرگرتین نیدەزانی ڕەنگە ئێمە چی دەبینین .

لە ڕۆژێکی خۆڵبارانی وا مت و هێور پایتەختمان بە جێهێشت , کە بەغداد هەموو زەرد هەڵگەڕا بوو بە ناو بەعقوبەدا ڕەت بووین و پاشان گەیشتینە جەلەولا , لەوێ لەگەڵ مەفرەزەیەکی‌سەربازی بە ڕێ کەوتین لە دووری یەك میل کەمتر گەیشتینە شوێنێك کە پێشتر شاری گەورەی کورد نشین بووە, لە بەشێکی بچوکی لای ڕۆژئاوای بترازێ کە هێشتا خاپور نەکرا بوو ئەوی تری هەموو وێران کرا بوو , لە نێوان جەلەولا تا سلێمانی , (29) گوندو شاری کاولکراومان ژمارد , بەڵام خۆ ئاشکرا بوو کە گەلێکی هاوشێوە لە ناوچەیەدا هەبوو , لە هەندی شوێن بلدۆزەرەکان هێشتا هەر خریکی کاول کردن بوون و لە نزیك هەندی خانووی نیوە ڕوخاو پارکیان کردبوو, لە هەر شوێنێك کە تەواو خاپوور کرا بوو سوپای ی‌هێراقی ڕەزو کێڵگەکانی سوتاند بوو , مزگەوتەکانی تەقاندبووەو کێلی‌ە قەبرەکانی ڕامالی بوو , وایەری کارەباشی لە

دار تێلەکان بچراند بوو , بەڵام هیچ ئاوەدانی لێدیار نەبوو , تەنانەت تاقە شوانەوێڵەیەکیشی لێ نەما بوو.

لە دۆڵە مەیلەو ئارامەکانی ناوچەکەدا , دیتمانشاری تازە دروست دەکران , شەقامی بەرینیان بە ناودا دەچوو ( تا بە ئاسانی تانکی بە ناودا ڕەت ببا ) لە ناو ئۆردوگاکانداو لە دەرەوەشیاندا , سەربازو هێزەکانی ئەمن خەریك بوون قەڵای سەختیان دروست دەکرد , بۆ ئەوەی لەوێوە ڕا بتوانن کۆنتڕۆڵی دانیشتوانەکە بکەن, ئەو شارانە بە تەوسەوە پێیان دەوترا شاری سەرکەوتن (Victory city) جیاوازییەکی کەمیان لە گەڵ گرتوو وخانەکانی نازییەکاندا هەبوو , چونکە دانیشتوانە کوردەکان نەیان دەتوانی بە ئاسانی لێوەی دەرچنە دەرەوە , لەو شارانەی سەرکەوتندا بواری ئیش کردنبۆ کەس نەبوو , وای لە دانیشتوان کردبوو بۆ بژێوی ژیانیان تەنها پشت بەو بەشە خۆراکە ببەستن کە میری دابەشی دەکرد, پیاوەکان لە پەیوەندی بە میلیشیاکانی سەر بە حکومەت بترازی واتەلە بوون بە چاش (بێووی کەر یان بێچووی نێرەکەر) بترازێ هیچ ڕێگەیەکی تریان لە بەردەمدا نەبوو و هەرچەندە پێشتر هیچیان لەو بارەیەوە نەدەزانی , بەلامەن و ڕانکن گوێمان لە ئەنفال بوو (ئەنفال لە سورەتێکی قورئانەوە هاتووە و بە شێوەیەك لێکدراوەتەوە کە ماف بە خوا ناسان دەدات تا ماڵ و سامانی خوا نەناسان بە تالان ببەن)) , ئەنفال هەڵمەتێکی سەربازی بوو بە مەبەستی ژیان لە لادێکانی کوردستانی عێراق بەڕێوە چوو , سەدام حسین لە ئاداری 1987 , عەلی حەسەن مەجیدی پشمامی خۆی کردە فەرمانداری باکورو دەسەلاتی چارەسەر کردنی کێشەی کوردی پێدا , مەجیدیش زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی بە مەنتیقەی محەرەمە ڕاگەیاند, لەوێ هێزە چەکدارەکان پێویست بوو هەر مرۆڤێك یان ئاژەڵێك بکوژن کە لەو ناوچانەدا دەبینرێن .*

لە درێژەی باسەکەیداو دەربارەی وێرانکارییەکانی کوردستان گالبرێت ئاماژە بەوە دەکات لە سەر کۆی ئەوە (4500) گوندی کوردستان هەبوو , حکومەتی عێاقی تا (2)ی ئابی 1990 پتر لە (4000) گوندی قەلاچۆ کرد , لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی عێراق سپا شارەکانی هەڵەبجەو سەید سادق و قەلادزێ ی خاپور کرد.

بە بۆچوونی بەرەی کوردستانی عێراق لە سەرجەمی (7500) کیلۆمەتری دووجای ڕووبەری خاکی کوردستان مەرسومەکانی مەجید 4500کیلۆمەتری دووجایان لەم ولاتەدا چۆڵ کرد, ئەو کوردانەش کە لەو ناچە موحەرمانەدا دەژیان هەموویان بۆ باشوری عێراق دوور خرانەوە یان ئیعدام کران , لە دوای ڕوخانی سەدام لە 2003 محمد ئیحسان وەزیری مافی مرۆڤی حکومەتی هەرێمی کوردستان ( لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین ممد ئیحسان وەزیری ناوچەکانی دەرەوەی

* ئەم مەرسومەی حوزەیرانی 1987, یەکێك بوو لەو (14) تەن بەڵگە نامە شاردراوانەی لە ڕاپەڕینی (1991) بەردەستی کوردەکان کەوت و لە ئەرشیفی نەتەوەیی کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەنجومەن پیران هەڵگیران.

هەرێم نەك مافی مرۆڤئەمەش هەڵەیەکی هێندە گەورە نییە لە ناوەڕۆکی بابەتەکە ناگۆڕدرێت – ئامادەکار) سەرکردایەتی چەند تیمێکی پزیشکانی یاسایی کردو چوون لە نزیك سەماوەی باشوری عێراق و لە ڕۆژئاوای پاشماوەکانی خەزی سەر بە پارێزگای سەلاحەدین, چەندەها گۆڕی بە کۆمەڵیان هەڵدایەوە کە تەرمی هەزاران کوردیان تیادا بووە, حکومەتی هەرێمی کوردستان بە فەرمی ژمارەی قوربانیانی ئەنفال لە نێوان سالانی 1987–1988 بە (182000) کەس دەخەمڵێنن.

دەربارەی زانیاری و هەڵوێستی حکومەتی ئەو کاتەی ئەمریکا سەبارەت بە تاوانەکانی ڕژێمی عێراق گالبرێت دەڵی :– بەڕێوەبەرایەتی (ڕێگان) بەو هەولانەی زانی کە سەدام حسین بۆ خاپور کردنی کوردستان دەیدا.

ڕانکن ڕاپۆرتێکی (279 لاپەڕەیی دەربارەی دیدارەکانمان نووسی , ڕاپرتەکە بە ناو وەزارەتی دەرەوەی هەندێ دەزگای تری حکومەتی بلاوکرایەوە، منیش لە ڕاپۆرتێکدا باسی شێوە ڕوخاندنی گوندە کوردییەکانم کردو کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەروەی لە دوای سەفەرەکەمان ڕاپۆرتەکەی بلاو کردەوە, ناوم لە ڕاپۆرتەکەمان نا : شەڕ لە کەنداوی پارسی : ولاتە یەکگرتوەکان پشتە لایەنە شەڕکەرەکان دەگرێ و جەلال تالەبانی سکرتێری گشتی (ی.ن.ك) سەرکردەی کوردە یاخیەکان لە نیسانی 1988 سەردانی واشنتنی کردو کتێبێکی ئەستوری سپی لە گەڵ خۆیدا هێنا بوو, کتێبەکە ناوی پتر لە سێ هەزار گوندی کوردانی تیادا بوو کە تا ئەو کاتە خاپور کرا بوو , تالەبانی کۆپییەکی پێشکەش لێری پۆپ کرد , ئەمەش لە بیرۆی ڕژهەلاتی نزیك لە وەزارەتی دەروە , بەڕێوەبەری کاروباری باکوری کەنداو بوو , لەو کاتە سەرنجی پتر کەوتە سەر لایەنێکی تری دراماتیکی ئەنفال , ئەویش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بوو دژی کوردان .

لە کۆتایی باسەکەیدا گالبرێت سەبارەت بەم باسە دەڵێت:– لە میانەی هەوڵدانیان بۆ وەدەست هێنانی پشتیوانی بۆ شەڕە تایبەتەکانی، هەردوو سەرۆك جۆرج هو , بۆشی کوڕەکەشی جۆرج, و. بوش جەختیان کردەوە کە سەدام حسین دیکتاتۆرێکی دڵڕەق بوو ەو گەلەکەی خۆی بەبرگاز داوە)) .

لەو دەمەی کە سەدام گازی بەکار هێنا بەڕێوەبەرایەتی ڕێگن چۆن گوێی بەوە نەدا کە عێراق گازی لە دژی سەربازکانی ئێرانی بەکارهێنانی بە هەمان شێوە گوێی بەوەش نەدا کە ئەو چەکانەی لە دژی کوردە سیڤیلیەکانیش بەکار برد , هەرچەندە لە ئاداری 1987ەوە گازی ژەهراویەکان لە دژی کوردان بەکار هات , واگریش دەکرێ کە بە لای کەمیەوە ئاژانسە هەواڵگرییەکانی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نە هیچ کەس لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی یەك قسەشیان بە ئاشکرا لێ نەکرد.

یەکێکی دیکە لەو سەرچاوەو پەرتوکانەی سودمان لێوەرگرتووە دکتۆر کەمال مەعروفە، هەرچەندە دکتۆر کەمال کوردە، بەڵام نوسەر لە بەرهەمەکەیدا کە دەربارەی کێشەکانی کورد و هەندی کێشەی تری جیهانیشی پشت پێ بەستوە بە چەندین سەرچاوەی ڕۆژئاوای کە باسی کارەساتی کوردیان کردووە بە تایبەتیش هەڵەبجە کە یەکێك بوو لە قۆناغەکانی ئەنفالی هەشت قۆناغەکە , کەمال مەعروف پشت بە پشت بەستن بەڕاپۆرتێکی تایبەت بۆ کۆنگریسی ئەمریکی دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (تقرير خاص الى الكونغرس الامريكي حول استخدام الاسلحه الكيمياويه) ئەوە نیشان دەدات کە کارەساتی هەڵبجە کە یەکێك بوو لە قۆناغەانی ئەنفال و هەموو جیهانی هەژاند، بەڵام حکومەتەکانی ئەوروپا نەوروژاندو بە ڕەسمی لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە حکومەتی عێراقی سەرزەنشت نەکرا, ئەمەش بە هۆی هەڵوێستی چەند وڵاتێکەوە بوو کە دژی ئەوە ڕاوەستان عێراق تاوانباری بکرێ، بە بیانوی پاراستنی تەرازوی هێزەکان و بەرژەوەندییە ئابورییەکانەوە , ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە بڕیاری (2763-S) دا دەربارەی قەدەغە کردنی تاوانی جینۆسایدی ساڵی 1988 ڕەفتاری ڕژێمی عێراقی لە کوردستاندا بە جینۆساید پێناسە دەکات، بە فەرمانی سەرۆکی کاروباری دەروە لە کۆنگریسی ئەمریکی دوو نوێنەری پەرلەمانی هاتنە کوردستان بۆ لێکۆڵینەوە لە وەزعی کورد، هەردوو نوێنەرەکە (پتر گالبرێت و کریستۆڤەر ڤان هۆلین) بوون لە ڕاپۆرتیکی تایبەت دا کە لە 12ی ئەیلولی 1988دا داویانە بە کۆنگریسی ئەمریکی , سیاسەتی عێراق بە کوشتن و بە کارهێنانی گازو ڕاگواستن تاوانبار دەکەن دیارە مەبەستی فەوتاندنی کەلتورو تایبەتمەندی ژیانی کوردە.

هەرچەندە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا بە بڕیار ژمارە (2763) دژی لە ناو بردنی گەلی کورد پێشکەش کراوە داواکرا کە سزای عێراق بدرێت , بەڵام لە دوایدا کاری پێ نەکرا .

دواتر دکتۆر کەمال دەربارەی هەڵوێستی فەرنسا دەڵێ : میسیۆ میتران (میتران سەرۆکی فەرەنسا بوو ئەو کاتە کە بە دۆستی کوردیش ناسراوە) .

ڕاڕایی و نیگەرانی خۆی بەرامبەر بە کارهێنانی چەکی کیمیاوی دەربڕی , بەڵام بە شێوەیەکی ڕەسمی عێراق سەرزەنشت نەکرا , بۆ ئەم مەبەستەش فەرنسا لە 1990/11/17 کۆنفرانسێکی نیودەوڵەتی ڕێکخست بە سەرۆکایەتی میسۆ میتەران بۆ قەدەغە کردنی چەکی کیمیاوی، بەڵام ئەوەی لە هەموو شت سەیر تر بوو بە هیچ شێوەیەك ڕژێمی بەعسیان تۆمەتبار نەکردوو بە تاکە وشەیەکیش مصگفی ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ باسی هەڵبجەو ئەنفالیان نەکرد ڕێگەشیان نەدا کە کورد نوێنەرێکی لە کۆنفرانسدا هەبێت .

دەربارەی هەڵوێستی بەریتانیاو ئەڵمانیای فیدرالیش بە پشت بەستن بە دۆکیومێنتی خۆیان ئەوە دەخاتە ڕوو کە دەوڵەتی بەریتانیا و ئەڵمانیای فیدراڵیش نیگەرانی خۆیان دەربڕی و داوایان لە عێراق کرد کە واز لەم کارانە بهێنێ و ڕێگای ئاشتیانە بگرێتە بەر بۆ چارەسەر کردنی کێشەی ئاشتیانەی گەلی کورد، هەروەها هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەتی جارانیش ئەوە باس

دەكات یەكێك بوو لەو دەوڵەتانەی دژی ئەوە ڕاوەستا كە عێراق سەرزەنشت بكرێت لە ڕۆژنامەی (پراڤداشدا) تەنها كورتە هەواڵێك لە سەر قڕ كردنی بە كۆمەڵی خەڵكی بێگوناهی هەڵەبجەو ناوچەكانی دیكەی عێراق ناسرا بوو (ئەلكسەندەر زۆتۆڤ) كە لێپرسراوی كۆمیتەی ناوەندی پارتی كۆمۆنیستی سۆڤیەت بوو دەڵێ :- (( بۆ ئێمە شەڕ لە كاتێكدا كە هەموو جیهان پشتیوانی لە كوردستان دەكات و هاوبەشی خەمیانن كەچی وا پیشان دەدەن كە هیچ ڕووی نەداوە)).

هەروەها سەبارەت بە هەڵوێستی وڵاتانی دیكەی ئەوروپا بەرامبەر بەم كارەساتە وەكو وڵاتانی سوید، دانیمارك و فیلندا , هۆڵەنداو نەرویج و چەند وڵاتێكی دیكە، داوایان لە سكرتێری (U.N) كرد كە مەسەللەی بەكارهێنانی چەكی كیماویی بكۆڵنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش وەفدی خۆیان نارده كوردستان بۆ ساغ كردنەوەی ئەوەی كە ئایا چەكی كیمیاوی بەكار هاتووە یان نە؟ چونكە حكومەتی عێراق بە هەموو شێوەیەك نەفی كردو حەملەیەكی دیبلۆماسی كرد بۆ ئەوەی دەوڵەتە عەرەبییەكان پاڵپشتی بكەن لە ڕاستیدا بەشێك لە ولاتە عەرببییەكان پشتیان گرت

كرێس كۆچێرا, یەكێی ترە لە سەرچاوەكانمان ئەم پیاوە فەرنسییە كە دەمێكی نزیكایەتیەكی پتەوی لەگەل دۆزی كوردو خەڵك و سەركردەكەی هەیە كۆمەڵێك پەرتوك و بەرهەمی نایابی لە سەر كوردو كوردستان نووسیوە، كۆچێرا لە یەكێك لە بابەتەكانی كە تایبەتە بە كارەساتەكانی كیمیا باران كردن كە خۆی بە قۆناغی دیاری ئەنفال ناوی بردووە دەڵێ: لە نیوەیمارسی 1988 پێشمەرگەكانی (ی.ن.ك) پاش هێرشە گەورەكانی هێزەكانی عێراق پایگا سەرەكییەكانی خۆیان لە دەست دا، شاری (70) هەزار كەسی هەڵەبجە لە باشوری ڕۆژهەلاتی كوردستانی عێراق لە نیزك سنوری ئێرانییەكان داگیر كرد، ئەم شارە چەند هەفتەیەك پێشتر لە لایەن هێزەكانی ئێرانەوە كە كێوەكانی باكوری ڕۆژئاواییان داگیر كردبوو، لەوێوە جێگاكانی سوپای عێراقیان بۆردومان دەكرد گەمارۆ دابوو، پاش ئەوەی سەربازگەی هەڵەبجە كە لە لایەن فەرماندەكەی كە ئەفسەرێكی شیعە بوو چۆڵ كرا . هێزەكانی عێراق بڕیاریان دا لە هەلو مەرجێكی دیژواردا پاشەكشێ بكەن و بەرەو سلێمانی بكشێنەوە، ئەمە تەنها ڕێگای دەرباز بوون بوو لەم جەنگە كە كەوتبوونە نێوان دەریاچەی سیروان و ناوچەی شاخاوی، كوشتاری بەكۆمەل ڕوویدا 80٪ هێزەكانی عێراق كوژران و ئەوانی تر دیل كران . ڕۆژی سیازدەی مارسی 1988 شارەكە لە لایەن سەدەها پێشمەرگەی یەكێتی نیشتمانی و پاسدارانی ئێران ئازاد كرا.

تۆڵی سەدام حسێن ترسناك بوو , ڕۆژەكانی 16 , 17 ی مارسی 1988 فڕۆكەكانی عێراق بە هۆی بۆمبای گازی كوشندەوە هەڵەبجەیان بۆردومان كرد و پێشمەرگەكان و پاسدارەكان پێشتر هاتبوونە دەرەوە لە ماوەی چەن دسەعاتێكدا نزیكەی (5) هەزار كەس لە هاولاتیان لە ناو چوون، خێزانی وا هەبوو هەموویان كوژران، حكومەتی عێراق چەندین جاری تر گازی كیماوی بەكار هێنا بەرامبەر گەلی كوردو هەزاران كەسی لەناو برد، ئەمانەش بوونە سومبلی بەربەریەتی

سەدام حسین تەنها چەند مانگێك و چەند ساڵێك دواتر ئەوەی بەدەست هات كە سوپای عێراق بە شیوەیەكی بەرنامە ڕێژی چەكی كیمیاوی لە چوا رچێوەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفالی لە دژی كوردەكان بەكار هێنا بوون، ئەو عەمەلیاتە بووە هۆی ترس و لاوازی و بێ هێزی بزوتنەوەی كورد و كوشتاری بە كۆمەل یەك لە دوای یەك دوو بارە دەبووەوە، لەگەڵ هەموو كارەساتەكاندا كوردەكان ڕێزو شەرەفی خۆیان پاراست .

جارێكی تر سەچاوەیەكی ترمان هەر كوردە ئەویش دكتۆر علی تەتەر نێروەییە، دكتۆر عەلی پەرتوكەكەی كە تێزی دكتۆرایەكەو تایبەتە بە بارودۆخی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی كورد لە ساڵانی هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا , یەكێك لە باسەكانی دكتۆر عەلی تایبەت بە كارەساتی ئەنفال و لەم باسەشدا پشتی بە چەندین سەرچاوەی ڕۆژئاوایی بەستوە مصگفی وەك گروپ یان وەك كەسایەتی , دەربارەی بارودخی ساڵانی هەشتاكانی كورد لە عێراق ڕێكخراوی میدال ئیست وۆچ) باسی ئەوە دەكات بارودۆخی عێراق لە سالانی كۆتایی جەنگ لە دەست دەرچوو بوو , ساڵی 1985 كاروباریباكور بە محمد حەمزە زوبیدی سەرۆكی نوسینەی ڕێكخستنی باكوری حزبی بەعس سپێردرا بوو فەرمانی پێدرا كە لە ماوەی شەش مانگدا بە هەرە شێوەیەك بێت كوردستان كۆنترڵ بكات . كەماوەكە تەواو بوو شەش مانگی تری درایە دەم ، بەڵام هەر دیسان باری تێك چوون و ئالۆزی بەردەوام بوو ، بۆیە حكومەت بیری لەوە كردەوە كەتوندو تیژ ترین كردەوە دژ بەكورد بەتایبەتی پاش ڕێك كەوتنی هێزە سیاسیەكانی كوردج بەكار بهێنێت ، بۆئەم مەبەستەش (ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش ) لە 29ی ئاداری 1987 بڕیاری ژمارە 160 ی دەركرد كەبەپێی ئەم بڕیارە دانانی عەلی حەسەن مەجید وەك نوێنەری بەعس لەكوردستان و هەموو دەسەڵاتێكیان پێ دا .

سەبارەت بەماوەی دەسەڵاتی عەی حەسەن مەجید لەكوردستان و ئەو كارانەی لەو ماوەیەدا كردی ڕێكخراوی (Human rights wateh) لەڕاپۆرتێكی دا كە لەساڵی 1993 بلاوكرایەوە دەڵێ : ماوەی دەسەڵاتداری عەلی حەسەن مەجید (29)ی ئاداری 1987 بۆ 23ی نیسانی 1989 ، خوێناوی ترین ماوەی مێژووی كوردستان و لەڕووی پێوەری جیهانیش بەیەكێك لە خوێناوی ترین دەسەڵاتەكان لەئاستی جیهاندا دەژمێردرێت و زۆر ڕوداوی دڕاندانەو خوێناوی بەخۆیەوە بینی ، كەیەكەم جار بوو لەمێژووی مرۆڤایەتی د ا ڕووی دەدا .

بەم شێوەیە سەدام حوسێن بەعەلەی حەسەن مەجیدی ئامۆزای لە 29ی ئاداری 1987 تاكو 23ی نیسانی 1989 دەسەڵاتێك وەهای پێدابوو كەتەنیا سەرۆكێكی تۆتالیتاری هەبوو ، بۆیە بوو بەدەسەڵات داری ڕەهای كوردستان ( حاكم الكوردستان المگلق) . ئەلمەجیدیش ئەو دەسەڵاتەی كەپێ درابوو بەتوندترین و دڕندانەترین شێوە دژ بەكورد بەكاری هێنابوو ، بەڕەمزی جینۆساید لە كوردستان دا و بەناوی (عەلی كیمیاوی) ناوبانگی دەركرد .

راپۆرتەکەی هیۆمان رایتس هۆچ لەدرێژەی راپۆرتەکەیدا ئەوە باس دەکات چالاکی پێشمەرگە لەساڵی 1987 و سەرەتای ساڵی 1988 ، ترسێکی زۆرتری لەناو حکومەتدا بەتایبەتی لەبەرۆکەکانی جەنگ لە کوردستان دا پەیدا کردبوو، هەروەك پێشتر باس کرا عەلی حەئەن مەجید و نوسینگەی باکوریش، سەرەڕای نەبوونی هیچ هاوسەنگیەك لەنیوان هێزەکانی هەردولا لەڕووی ژمارەی چەك و جۆرو ئاستی چەکەکاندا سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر کورد بەدەست نەهێنابوو . بۆیە پاش پێداچوونەوەی بەرنامەیەکی هەمەلایەنەو دارێژراو لەڕووی بەشداران و چەکی بەکارهێنراودا لەڕوبەرێکی زۆر فراونی کوردستان ئۆپەراسیۆنەکانی بەنفال لەژێر سەرکردایەتی ئەلمەجیدو بەشداری فەیلەقی یەك و پێنج بەرێوەبەرایەتی گشتی ئەمن و هەواڵگرە سوپاو فەوجە جاشەکان لە (8) قۆناغدا دەستی پی کرد . هەروەها راپۆرتەکە ئەوەش باس دەکات حکومەتی عێراقی بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال پێویستی بەهیچ بیانوویەك نەبووە ، هیچ پەیوەندیەکیش بەجەنگی عێراق ئێرانەوە نەبوو ، بەڵکو کورد کوژی و جینۆساید لەخورەوشت و سروشتی رژێمی دیکتاتۆری رەگەزپەرستی بەعس لەعێراق سەرچاوەی دەگرت ، کەهەر کاتێك دەرفەتی هەبوایە بەم کارە هەڵدەستا .

لەکۆتایی راپۆرتەکەی هیومان رایتیس هۆچ دا کەتایبەتە بەتاوانی جنۆساید ئەوە دەخاتە روو سەبارەت بەجینۆساید لەعیراقدا لەئەنفالی دژی کورد تاوانەکانی عیراق دژ بەکورد لەخانەی جینۆساید دادەنێت . هەروەها دەڵێت : حکومەت تەڕو وشکی تێکەڵ کردبوو ، گوندی جاشەکانیشی کاول دەکرد ، عەلی حەسەن لەکۆبونەوەی لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی رێکخستنی باکورو بەرپرسانی بارەگاکانی حزبی بەعس لەپارێزگاکانی باکوردا لە 26ی گوڵانی 1988 گوتی : من بەموستەشارەکانم راگەیاند کەوا رەنگە بڵێین : ئێمە گوندەکانی خۆمان خۆشگەرەکەو نامانەوێ بەجێیان بێڵین، وتم : بەچەکی کیمیاوی و لێدەدەم و تق بردەکەم، بزانم کێ قسە دەکات ؟ کۆمەڵی نێو دەوڵەتی لەعنەت لەکۆمەڵی نێو دەوڵەتی ... لەوانە گوێیان لێدەگران .

ئەمانە مشتێك بوون لەخەرواری ئەو سەدان و هەزاران کتێب و بەڵگەو راپۆرتانەی کەلەسەر کارەساتی ئەنفال نوسراون لەلایەن غەیرە کوردەکانەوە . ژمارەی قوربانیەکان و شێوازی گەرانەوەکانیان و تۆمتەکانیانی یاخود فاکتەرکانی لایەنی کوردی، خۆی بۆکارەساتەکە تا چەند راست یاخود گەرمو گوری تێدایە ، بەڵام ئەمانە هیچ لەجەوهەری مەسەلەکان ناگۆڕن کەئەویش تاونی جینۆساید بوو، کەرژێمی بەعس دەرهەق بەمیللەتی کورد کردی، ئەو ژمارە زۆرەی میللەتی کوردی لەناو برد ، وەکو لەپێشەکیەکەشدا ئاماژەم پێکرد، گرنگی ئەم نوسینانە لەوەدایە کەلەلایەن ناکوردانەوە نوسراون ، ئەمەش زیاتر شەرعیەت دەدات بەوەی کەراستە میللەتی کورد قوربانی زۆری بەدەستی حکومەتی عیراق لێکراوەو گومانی جینۆساید نەکردنی کورد ناهێڵێت و دەبنە بەڵگەیەکی زیندوو بۆ بەجینۆساید ناساندنی مەسەلەی ئەنفال .

**بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە :**

1/ مەریوان وریا قانیع ، دەسەڵات و جیاوازی ، کۆمەڵە وتار ، چاپی دووەم ، 2001 .
2/ گۆڤاری ڕوانگە و ڕە نخنە ، ژ 10 ، بەهاری 2005 .
3/ سەمانساپاوەر ، ئەمریکاو ئەنفال ، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە بەختیار کەریم ، چاپی یەکەم ، سـلێمانی ، 2008 .
4/ کەریم یەڵدز ، کورد لەعیراق ، وەرگێڕانی شاهۆ بورهان ، چاپی یەکەم ، 2007 .
5/ دیڤید ماکداوڵ ، مێژووی هاوچەرخی کورد ، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو ، هەولێر ، 2005 .
6/ ن . لازاریف ، مێژووی کوردستان ، وەرگێڕانی هۆشیار عەبدڵڵا سەنگاوی ، هەولێر .
7/ پیتەرو گالبریت ، کۆتایی عیراق ، چۆن کارناڕێکی ئەمریکا ، شەرێکی بێ کۆتایی بەرپا کرد ، ورگێڕ مامك ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، 2007 .
8/د.کمال معروف ، کێشە نەتەوایەتیەکان و ڕوداوە سیاسیەکانی جیهان و کوردستان ، سلێمانی ، 2005 .
9/ کرێس کۆچێرا ، بزوتنەوەی نەتەوەی کورد ، کوردو هیوای سەربەخۆیی ، وەرگێڕانی ئەکرەمی میهرداد ، بەرگی یەکەم ، سلێمانی ، 2002 .
10/ د.عەلی تەتەر نێروەیی ، بزاڤی ڕزگاری خوازی نەتەوەی کورد لەکوردستانی عیراق لەساڵەکانی جەنگی عێراق و ئێراندا ، ( 1980 – 1988) ، هەلێر ، 2008 .

# ئەهامەتیەکانی کورد، تاوانی شەڕ
# پێشێلکاری مافی مرۆڤ یان جینۆساید

دارای محامی

تەکیفکردنی کردەیەکی تاوانکاری دژی مرۆڤایەتی بە جینۆساید، یان پێناسەکردنی چەمکی جینۆساید یەکێکە لە هەرە کارە مشتومڕ لەسەرەکان، ئاسان نیە هەمان بینین لە لای دوان یان زیاتر لە شارەزاو سکۆلارەکانی ئەم بوارە بدۆزینەوە .

لەپانتایی یاسایی و دادوەریی و فیقی و یاسایشدا گەلیٚ جار ڕوبەڕوی ڕاجیایی و بگرە سەرنجدانی دژو جیاوازیش ئەبینەوە، لەپشت هەرکام لە ئارگومێنت و سەیرکردنەکانەوە چەندەها گۆشە گۆشە نیگا، بەرژەوەندی، دیسکۆرسی ئەکادیمی و فیقهی جیا هەیە، بە پلەی یەکەم تاوانی جینۆساید لەبەر ئەوەی تاوانێکی سیاسیە بۆیە لێکدانەوەو کار لەسەر کردن و تەکیفیشی ناتوانێت لەکایەی ململانیٚ سیاسیەکان بەدەربێت کام کردە جینۆسایدە؟مەرجەکانی تەکەیفکردنی کردەیەك بەتاوانێکی جینۆسایدی کامانەن ؟ هۆی ڕودانی کردە جینۆسایدیەکان چین ؟ ئەنجامەکانی چین ؟ کام ڕێگە بگرین بۆ ڕێگرتن، وەستاندن یان دوبارە نەبوونەوەی کردەی جینۆساید ؟

ئەم پەیپەرە دەیەویٚ ئەوەندەی بکریٚ کار لەسەر وەڵامی ئەم پرسیارانە بکات . سەرەتا کاری کۆمەڵکوژی، قەتل و عام و سڕینەوەی ئاسەواری ژیانی مرۆڤ کردەیەکی تازە نیە . ڕەنگە مێژوی ئەم تاوانە بگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی گەشەی خاوەندارێتی بۆ تاکە کەس و هەوڵدانی بێت بۆ قۆرخکردنی کۆمەڵگەی مرۆیی و ژینگە بە ئاقارێکدا کە کار بۆ مانەوەی خاوەندارێتی تاکێك یان گروپێك بکات دژی ئەو یان ئەوانی تر . هەر یەك لە ئێمە چیرۆکی چەندین داگیرکاری مێژووی لە بیردایە . هۆلاکۆ، جەنگیز خان، تەیمور لەنگ، ئەسکەندەری مەسەدۆنیا وچەندانی تر، کوشتوبڕ و بێڕەحمی ئەمانە چیرۆك گەلێکن کەم هەبێت نەیبیستبێت . ئەم پەیپەرە لە دیدێکەوە ئەڕوانێتە ئەم ڕوداوانە کە جیایان ئەکاتەوە لەو خاپورکردن و کاولکاریانەی کە دوای کایەهاتنی مۆدێرنە دێتە کایەوە . وای دەبینێت کە ئەو کردارانە هەم لە ڕوی زەمەنی ڕودان و هەم مۆتیڤ و مەبەستی ڕودانیان لەوانەی پێشتر جیان کە لێرەدا هەوڵی ناساندنیان دەدا وەك جینۆساید .

ئەگەر چی ڕافایل لیمکن داهێنەری چەمکی جینۆساید پێیوایە جینۆساید ناوێکی نوێیە بۆ تاوانێکی کۆن . سەرەتا ڕەنگە سوودی هەبێت بە پێناسە یاسایی و فۆڕماڵەکەی جینۆساید دەستپێبکەین، ئەو ناسینەی کە لە پەیمانی قەدەغەکردن و سزادانی تاوانبارانی ساڵی (1948)دا هاتووە .

The Convention of Prevention and Punishment of Genocide

بەندی دووی پەیمانەکە دەڵێت : جینۆساید هەر یەکە لەم کردانەی خوارەوە دەگرێتەوە کە بەمەبەستی خاپورکردنی هەموویان بەشێکی هەر نەتەوەیك، ئەتنێکێك، ڕەگەزێك یان گروپێکی ئاینی ئەنجام بدرێت :-

ئەلف :- کوشتنی ئەندامانی گروپەکە

بێ :- ئازاردانی هزری یان جەستەیی ئەندامانی گروپەکە

جیم :- بەنیازەوە بارودۆخێکی وا بۆ ژیانی گروپەکە فەراهەم بکرێت کە ببێتە هۆی تیاچوونی جەستەیی هەموو یان بەشێکی گروپەکە

دال :- سەپاندنی چەند پێوەرێك بۆ ڕێ لە زاوزێ گرتنی گروپەکە

هێ :- بە زۆر گواستنەوەی منالآنی گروپەکە بۆ گروپێکی تر

بەسەرنج دان لەم پێناسەیەی سەرەوە دەتوانین چەند ڕەگەزێکی گرنگ تێبینی بکەین کە زۆر بنەڕەتین لە دیاری کردنی هەڵسوکەوتی هەرکردەیەکی تاوانکاری بۆ ئەوەی بەکردەی جینۆساید بناسرێت ئەکرێت لێرەدا ئاماژە بەچوار ڕەگەزی بنەڕەتی بکەین :-

یەکەم : نییەت

دووەم : خاپور کردن

سێیەم : قوربانی بونی گروپی و کاتەگۆریانە

چوارەم : بە پلانیی و سیستماتیك بوون

وا لە خوارەوە مەبەست لە هەریەك لەم ڕەگەزانە ڕوون دەکەمەوە

**سەرەتا ڕەگەزی یەکەم : نییەت** Intent

پێم وایە جیاکردنەوەی دوو چەمکی نییەت و مۆتیڤ لێرەدا ڕەنگە یاریدەدەر بێت و وردتر تێگەیشتن لەچەمکی نییەت، نییەت واتە مەبەست لەهەستان بەکردەیەك، یان تاوانکار دەیەوێ بەکارەکەی چی جێبەجێ بکات یان کام ئامانج بە دی بهێنێت، لێرەدا زۆر گرنگە بۆ ناسینی کردەی جینۆسایدیی بزانین ئایا کردەکە بەمەبەستی لەناوبردنی گروپەکە بووە یان نا، چونکە دەکرێ کردەی توونددوتیژی بۆ چاوترساندن، تەمێکردن یان کۆنترۆڵ کردن بێت نەك لەناوبردن . دیارە زانینی نییەتی تاواکار دیاری بکات زۆر جار بۆ زانینی نییەتی تاوانکار دەکرێ گەڕانەوە بۆ ئەم خالآنەی خوارەوە کۆمەکێکی زۆر بکات :

ئەلف : سروشتی کردەی تاوانکارییە کە

بێ : بارودۆخی ڕودانی کردەکە

جیم : ژمارەی قوربانی و زیانەکان

زۆر جار دادوەر و شارەزایان بۆ گەیشتنە ئامانجی دۆزینەوەی نییەتی جینۆسایدیی پەنا دەبەنە بەر ئەو خالآنەی سەرەوە . ڕەنگە خراپ نەبێت چەند ڕستەیەکیش لەسەر مۆتیڤ بڵێن .

مۆتیڤ واتە پاڵنەر، ئەو هۆکارەی ڕەوایەتی داوەتە تاوانکار بۆ خاپور کردن . بەشی ڕاشناڵی کردەکەیە کە زۆر جار و لەهەر تاوانێکی جینۆساید دا مۆتیڤ بە شتێکی ڕەوا دەردەکەوێت وەك لەناوبردنی بەکرێگیراوان، مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی لە جینۆسایدی کوردا یان پاکردنەوە و پیورفیکەیشن لە جینۆسایدی جولەکەو هۆمۆسێکسواڵ، هاندیکاپ و قەرەجەکاندت . مۆتیڤ لە تەکیفی تاوانی جینۆساید دا ڕۆڵێك وازی ناکات ئەوەی کە گرنگە نییەتە، جۆرێك لە مەبەستگەرایی بۆ لەناوبردن دەبێت ئامادە بێت، بۆ نموونە سیاسەتی ڕێگرتن لە زاوزێ لە چین و هیندستان پەیڕەو دەکرێت ئەمە وەك فۆرم جۆرێکە لە ڕێ لە زاوزێ گرتن، بەڵام ناکرێت بە جینۆساید ناوزەند بکرێت چونکە مەبەست لەو کردەیە ڕێگری دانانە لە بەردەم قەبارەی گروپەکەدا نەك لەناوبردن و خاپورکردنی . ڕەنگە ئاماژەدان بە لەبارىردن بەگشتی نمونەیەکی خراپ نەبێت لێرادا هەرچەندە هەندێ لایەنی کۆنسێرڤەیتڤ ئەمە بە جینۆسایدی سەردەم ناودەبەن .

نەهیما ڕۆبنسۆن دەڵێ :- کردەی وێراکردن ناکرێت بە جینۆساید پۆلێنبکرێت ئەگەر ویستی لەناوبردنی گروپەکە ئامادە نەبێت . زۆرێك لە شارەزاو سکۆلارانی بواری جینۆساید وای بۆ دەچن کە دەبێ بۆ ناوزەد کردنی کردەیەك بە جینۆساید نییەتێکی زۆر تایبەت و سپێشاڵ هەبێت کە تاوانکار قوربانی بەتایبەتی بکات بە ئامانج لەسەر بنەمای شوناسی گروپی، دەبێ خواستێکی لە پێشڕا بڕیار لەسەر دراوی هەبێت بۆ خاپور کردن و لەناوبردنی گروپەکە .

بۆ نموونە لە تاوانی هۆمۆسایدی ئاسیادا دەکرێ کردەی لەناوبردن کە کوشتنە ڕوبدات بەهەڵە، بەبێ ئەوەی بکەر هیچ پێشینەیەکی خۆ بۆ سازدان و چاودێری کردنی هەبێت واتە بەبێ (سبق الإصرار والترصد) بەڵام تەکەیفی ئەم تاوانە هەر وەکو تاوانی کوشتن دەمێنێتەوە وەڵێ کوشتنی هەڵە . چونکە نییەت وەك ڕەگەزییەك ئامادە نییە، بەڵام لەکردەی جینۆساید دا بە نەبوونی نییەت کردەکە دەچێتە پانتایی تەکەیفێکی تر نەك جینۆساید .

بۆیە زۆر لە پسپۆڕان پێیان وایە ئەو نەهامەتییەی هیرۆشیماو ناکازاکی ڕوبەڕوی بۆوە گەر چی ژمارەیەکی یەکجار زۆر خەڵك لەناوچوون، سیستماتیك بوو پلان و نەخشەی لە پێشینەی هەبوو بەڵام جینۆساید نەبوو چونکە نییەتی لەناوبردنی گروپێکی دیاریکراو ئامادە نەبوو بەڵکو بەشێك بووە لە ستراتیژو پانۆرامای شەڕی جیهانی دووەم کە دەکرێ بە تاوانی شەڕ تاوانی دژی مرۆڤایەتی ناوزەد بکرێت بەڵام لەبەر نەبوونی نییەتی تایبەت ناکرێت بوترێت جینۆسایدە .

**ڕەگەزی دووەم: خاپورکردن** Destruction

بۆ ئەوەی کردەیەك بەکردەی جینۆساید بناسرێت دەبێت شێوەیەك بەلای کەمەوە لەشێوەکانی لەناوبردن یان خاپورکردنی تێدابێت واتە ئەبێت کوشتنی جەستەیی وهزری بەمەبەستی لەناوبردن، فەراهەمکردنی بارودۆخ و پێوەرێك بۆ لەناوبردنیان لە ئارادابێت .

**ڕەگەزی سێهەم : قوربانی بوونی گروپی و کاتە گۆڕیانە**

خاپورکردنەکە دەبێت خاپورکردنێکی کاتەگۆڕیانە بێت، واتە دەبێت دژی ئەندام یان ئەندامانی گروپێك بێت بەپێی شوناسی گروپی، دەبیٚ لایەنی قوربانی دیاریکردبێت، واتە کردەی کۆمەڵکوژی ڕەشە کوژی گەر ئاراستەی تێکڕایی کۆمەڵگەیەکی مرۆڤی بکرێت بە بیٚ بیرکردنەوە لە پێکهاتەی ڕەگەزی، نەتەوەیی، ئەتنیکی و ئایینیان ئەوا کوشتنە کە کاتە گۆڕی نابێت، دەکریٚ بەتاوانی دژی مرۆڤایەتی یان تاوانی شەڕ یان پێشێلکاری مافی مرۆڤ بێتە ئەژماردن بەلاٚم ناتوانرێت بەجینۆساید و هەڵگری تایبەتمەندی جینۆسایدی بێتەژماردن .

**ڕەگەزی چوارەم : سیستماتیکبوون**

پلانی لە پێش و ڕێکخراوبوونی تاوانەکە ناسینەوەیەکی تری جینۆسایدە . دەبیٚ پلانی پێشتر داڕێژراو و سیناریۆ و ئەگەرەکانی پێشتر دیاری کراو بێت . ئەم ئاستە لە پۆلێنکردن و ڕێکخراوبوون ئەگەری ڕودانی ئەم تاوانەی لە سەدەکانی پێشتردا کردۆتە ئەستەم، بەهۆی نەبوونی زانستەکانی ئامار و پۆلێنکردن و زانستە سەربازی و سیاسیەکانی تر بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانە . بۆیە ئەم تاوانە بە یەکێك لە فینۆمینۆکانی مۆدێرنە دەزانرێن زۆر جیایە لەو کوشتار و قەتلٚ و عامانەی سەردەمی ئیمپایەر و شاهەنشاکان . هەر کردەیەك گەر لە ئەنجامی ناکۆکی ساتەوەختیەوە بێت بە چاوپۆشی لە ئەنجامەکەی ناکرێت بە جینۆساید بژمێردرێت ڕەنگە هەندێك بڵێن کۆمەڵکوژی هەر کۆمەڵکوژییە، سەرەنجام گرنگە نەك پێشینەو پلان، بەلاٚم ئەوەی جینۆساید دەکاتە تاوانێکی لە ڕادە بەدەر ترسناكودژی مرۆڤایەتی بونی سیستماتیکیی وپلان ڕێژیەتی، ناسینی ئەوپلانرێژیەتی.

ناسینی ئەو پلان ڕێژییە بۆ وەستان و ڕێگرتن و نەهێشتنی ڕودانیشی زۆر چارەنوس سازە .

لەسەر ئەم ناسینە یاسایی و پەیمان نامەییە زۆر ڕوانین و سەرنجی جیاجیا هەن لەوانە :

یەکەم : دەڵێن پێناسەکە زۆر تەسکە چونکە بە دیاریکراوی تەنها باس لەو کردە تاوانکاریانە ئەکات کە ڕوبەڕوی نەتەوە، ڕەگەز، ئەتنیك، و گروپی ئایینی ئەبنەوە . بەمەش ئەو کردە تاوانکاریانە پشتگویٚ دەخات کە دژی گروپە کۆمەلاٚیەتی، سیاسی و جێندەریەکان دەکرێت . کە ئەمانەش لە لایەکەوە سیستماتیکن و بە نییەتی خاپورکردن ئەنجام دەدرێن لەلایەکی تریشەوە خاپورکردنێکی کاتەگۆڕیانەن،و چەندین نمونە و کەیسی وا هەیە نو بەردەوامیش ڕودەدەن، بۆ نمونە کوشتنی توێژی ڕۆشنبیران لە کەمبۆدیا، کۆمەڵکوژی چەپرەوەکانی ئەمریکای لاتین و ئەندۆنیزیا، تاوان و کۆمەڵکوژی کاتەگۆریانە دژ بەژنان و وەك ژنانی پشو بۆ سەربازانی یابانی، کاڵجرۆسایدی تبێت و دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمەریکای لاتین و لانگویساید . یان ئەو کۆمەڵکوژی و خاپورکردنەی کە دژی هۆمۆسێکسواڵەکان کرا لە شەڕی جیهان دووەم تا ئێستاش لە هەندێك شوێن بەردەوامە ئەمانە و چەندین نمونەی تر دەتوانن نمایشی ئەو بەرتەسکیە بکەن کە لە کرایتریای ناسنەکەی پەیماننمەی دژی جینۆسایدیدا هەیە.

دەشێ بۆ بەشێکی ئەم بەرتەسکیە پرۆسەی ناونان و هاتنە ئارای چەمکی جینۆساید بەهۆ بزانرێت، یەکەم جار چەمکی جینۆساید لەلایەن پارێزەر و یاساناسی بەناوبانگ ڕافایل لیمکن لە ساڵی (1933) هاتە ئارا . بەلێکدانی هەردو ووشەی جینۆسی گریکی بەمانای خەڵك، گروپ، یان خێڵ و وشەی سایدی لاتینی بەمانای هەناوبردن . بەم یاسای نێودەوڵەتی، تاکو وەك تاوانی نێودەوڵەتی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت نەك وەك تاوانی لۆکاڵی و ناوخۆیی، بەمەش دەبویست زۆرترین پارێزگاری بۆ ئەم کەمینە دینی و ڕەگەزیانە زامن بکات . ئەو کات توندوتیژیەکی لەڕادە بەدەر دژی جولەکەکان لە ئەوروپا پراکتیك دەکرا بە تایبەتی لە ئەڵمانیا . لیمکن جینۆسایدی ئەرمەنی و ئاشوری و جوەکانی وەك سامپل بۆ بنچینەی پێناسەکەی لەلابوو بیروراکانی لەساڵی (1944) لە مۆنۆگرافی (فەرمانڕەوایی میحوەر لەئەوروپای داگیرکراودا) بلأوکردەوە تێڕوانین و بینینەکانی لیمکن بوونە بنەمای پەیمانی دژە جینۆساید .

دووەم : هەندێك پێیان وایە کە پێناسەی جینۆساید زۆر فراوانە . دەڵێن نمونەکانی نەتەوە، ڕەگەز، ئەتنیك گروپی ئایینی ئەوانە تەنها وەك نمونەن نەك وەك تەنها ڕەگەز بن پێناسەکە بیانگرێتەوە . ئەم تێڕوانینە پێی وایە بۆ ئەوەی جینۆساید کاردانەوەی جدی و نێودەوڵەتی بە نسیبیبێت نابێت هەموو ئالۆزی و شەڕو کردەیەك بە جینۆساید بێتە ژماردن , دەبیٚ وشەی جینۆساید زۆر بەکەمی و بۆ حاڵەتی زۆر تایبەت و پڕ مەترسی بەکار بهێنرێت . دەڵێن گەر وشەو چەمکو پێناسەی جینۆساید بۆ هەموو ئەو کارەسات و ناکۆکی و توندوتیژیانە بەکاربهێنرێت کە ئەمڕۆ ڕودەدەن، ئەوسا جینۆساید دەبێتە ڕوداوێکی ڕۆژانەو ئاسایی کە ناتوانین پێودانگێکی جیاواز بۆ مامەڵەکردنی دابنێین و داوا لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان و دەوڵەتانی جیهان بکەین بۆ دەخاڵەت و وەستان و ڕێگیرکردنی . هەرچۆنبوو رافائیل لیمکن سەرکەوتوبوو لە بەجیهانیکردنی جینۆسایدو یونیڤێرشالیزەکردنی پێناسەکەی، گەرچی زۆر ولأت واژۆی ئەم پەیمانەیان کرد بەلأم هەموو ئەمانە نەیکرە وەستان و ڕێگرتن لە ڕودانی جینۆساید . ئەو وتەزایەی چالاکانی دژە جینۆسایدی بەکاریان دەهێناو دەیانوت (چارێکیتر هەرگیس نا) بەداخەوە سەدەی بیستەم بووە سەدەی جینۆساید ولەبری ئەمە(بۆ هەمیشە جینۆساید)بووە فینۆمینۆی ژیانی مۆدێرن. جەین سپرینگەر... بەچەند هۆیەك ئاماژە دەکا کە ڕێگربوون لەبەردەم وەستان و قەدەغەکردن و ڕێگری و دەخاڵەتکردن بۆ وەستانی جینۆساید کە گرنگترینیان ئەمانەن :-

ئەلف :- شەڕی سارد و پێشبڕکێی ئەتۆمی لە (1947 – 1991)، ڕێکەوتنی لەسەر چەمکەکانی مافی مرۆڤ و جینۆساید و چەندین بابەتیتر کردە شێوەیەك لە موستەحیل .

بیٚ :- ناوزەدکردنی کردەیەك ب جینۆساید، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و ولأتانی دەخستە ژێر ئیلتیزامی دستێوەردان و ئینتەرڤێنشنیزم بۆ ڕاگرتنی، بۆیە زۆر جار بە هۆی سیاسی یان بازرگانی ولأتان خۆیان لەم جۆرە ناونانە ئەدزییەوە .

جیم :- نەبوونی گرنگی ستراتیژی و ئابوری ولأتانەی کە جینۆسایدیان تیا ڕوو داوە . دەبینین لە شەڕی جیهانی دوەمەوە تا جینۆسایدی ڕواندای ساڵی (1994) کۆمەڵگەی نێودەولەتی هیچ جۆرە بەرپرسیارییەکی نیشاننەدا بەرامبەر ئەو هەموو کۆمەڵکوژییەی لە جیهاندا ڕویاندا لەوانە :-

* کوشتنی نیو ملیۆن چەپرەوی ئەندۆنیزی .
* کوژرانی سێ ملیۆنی بەنگلادیشی و هندۆس .
* لاقکردنی دو سەدو پەنجا هەزار ژنی بەنگلادشی .
* کوشتنی سێ سەد هەزار هۆتۆ لەلایەن توتسیەکانەوە لە بۆرەندی .
* کوشتنی دوو سەد هەزار خەڵکی تیمۆری خۆرهەلأت لەلایەن ئەندۆنیزیاوە .
* کوشتنی یەك ملیۆن و حەوت سەد هەزار کەس لەلایەن خەمیری ڕۆژەوە لە کەمبۆدیا .
* کوشتنی دوو سەد هەزار خەڵکی مایا لەلایەن حکومەتی گواتیمالاوە .
* کوشتنی دوو سەد هەزار کورد لەلایەن حکومەتی عێراقیەوە .
* کوشتنی دوو سەد هەزار بۆسنی لەلایەن سربەکانەوە .

**جینۆساید وەك چەمکێکی سۆسیۆلۆژی**

ناسینە یاسایی و پەیماننامەیەکی چەمکی جینۆساید نەیتوانی هەموو ڕەهەند و ماناو دەلالەتەکانی جینۆساید لە خۆبگرێت، دوابەدوای ناوەڕاستی سەدەی بیستەم مرۆڤایەتی ڕوبەڕوی چەندین توندوتیژی و بەربەریزم بووە کە خۆی لە کۆمەڵکوژی و گۆڕی بە کۆمەڵ و چەندین تاوانی تری دژ بە مرۆڤایەتی بینیوە . زۆربەی هەرە زۆری ئەم تاوانانە لەلایەن حکومەتەکانەوە بەرامبەر هاولأتیەکانی ئەنجام دەدرا کە هەندێ لەم جۆرە کوشتنانە جیابوون لەوانەی لە پەیمانی دژی جینۆساید دا هاتبوون . کوشتن و قەتڵ و عام کردنی هەزاران بە هۆی جیایی بیروڕا لە ولأتانی جیهانی سێهەم و لاقەی ژنان و لەناوبردنیان، پراکتیزەکردنی ترسناکترین توندوتیژی لەلایەن دەوڵەت و هێزی پارامیلیتاری و میلیشیاکانیەوە وای لە مێژووناس و سۆسیۆلۆژی و شارەزایانی بواری زانستە سیاسیەکان کرد بە دوای دەربڕین و چەمك و گۆشەنیگای تردا بگەڕێن بۆ چارەسەر و تێگەیشتن لە سروشت و کارکردی ئەو تاوانانە . شارەزایان چەندین زاراوەی تریان داهێنا لەوانە دیمۆساید واتە خەڵك کوژی کە هەموو ئەو تاوانانە دەگرێتەوە کە بەهۆی پراکتیزەکردنی توندوتیژی لەلایەن دەوڵەتەوە دژ بە خەڵك دێنەکایەوە .

لەوانە (جینۆساید، پۆلیتیساید، جێندەر ساید، کەڵچرۆساید، لانگویساید) . سیاستناس ڕۆمێڵ چیمکی دیمۆسایدی بەکار هێنا چونکە پێیوابوو جینۆساید سێ مانای جیای هەیە :-

یەکەم : مانای ئاسایی جینۆساید واتە کوشتنی خەڵك لەلایەن دەوڵەتەوە بە هۆی شوناسی نەتەوەیی، ئەتنیکی، ڕەگەزی ئایینەوە .

دووەم : پێناسی یاسایی وەك ئەوەی لەبەندی دووی پەیمانی قەدەغەکردن و سزادانی تاوانبارانی جینۆسایدی ساڵی (1948)دا هاتووە .

سێهەم : پێناسەی بەرفراوانی جینۆساید کە لە مانا ئاسایەکەی جینۆسایدەوە نزیکە کە هەموو ئەو کوشتنە مەبەستگەرایانە دەگەڕێتەوە کە دەوڵەت پێ هەڵدەستێت، کە کوشتن و لە ناوبردنی ئۆپۆزسیۆنە سیاسیەکانیش دەگرێیتەوە .

ڕامێڵ بۆ ئەوەی تێکەڵی و سەر لێێواوی دروست نەبێت ئەوەی سێهەمی ناونا دێمۆساید . ڕامێڵ پێی وایە ئەو دەوڵەتانەی پانتایی ئازادی تەسکدەکەنەوە و نەیاران دەیانکوژن پراکتیکی جۆرێك لە دیمۆساید دەکەن بۆیە لەیاسەکەیدا دەڵێت (تا پانتایی ئازادی بەر تەسەك بێتەوە، ئەگەری کوشتن لەلایەن حکومەتەوە زیاد دەکات) یەکێکی تر لەشارەزایانی بواری جینۆساد(جینۆساید واچ) گریگۆری ستانتون قۆناغەکانی گەشە کردنی پرۆسەی جینۆساد بە هەشت قۆناغ دیاری دەکات :

**یەکەم : پۆلین کردن** Classification

ستانتۆن پێی وایە لەهەر کەڵچەرێکدا کاتەگۆڕی پۆلێن کردن هەیە بۆ ئێمەو ئەوان لەسەر بناغەکانی ڕەگەز ، نەتەوە ئایین ، ئەتنیك وەك ئەڵمانی و جولەکە، توسی و هۆتۆ، کورد و عەرەب . لەم قۆناغەدا هاولاتیبوون بنەڕەتی دەبەشکردن و پۆلێنەکان نیە بەڵکو ئینتیمای ئەتنیك، ڕەگەز، ئایین هتد ... ستانتۆن بۆ ڕێگری گەشەسەندن بە ئاقاری جینۆساید دا باشترین هۆکار بە پرۆمۆتی کەڵچەری لێبوردەیی و ئینتیگراسیۆن و کارکردن لەسار ڕایەڵە هاوبەشەکان بە ئایدیاڵ دەزانێت .

**دووەم : نیشانە کردن** Symbolization

لەم قۆناغەدا ڕەمز و سومبل و نیشانە دەدرێت بە پۆلینکردنەکەی پێشو . هەندێ جار ئەم نیشانە کردنە، نیشانە کردنێکی زمانەوانیە زۆر جاریش فزیکی وەك جۆری جل و بەرگ، ڕەنگ، داخکردن و نیشانە کردن بۆ جیاکردنەوەی گروپێك لە گروپێکی تر وەك ئەستێرەی زەر بۆ جولەکەکان ملپێچی شین بۆ کەمبۆدیە خۆرهەلاتیەکان . یان زۆر جار کورت کردنەوەی گروپێك بۆ سومبلێك یان کۆدێك زمانەوانی وەك (کاکە) بۆ کورد، وەحشی بۆ ئینیجنەس یان دانیشتوانە ڕەسەناکانی وڵاتانی ئوستراليا و ئەمریکاکان کە ئەم ڕەمزانە ڕەمزی ڕق و جیاکردنە و بەکەم زانینن .

**سێهەم : دیهیومەناز کردن** Dehumanization

لەم قۆناغەدا گروپێك ئینکاری مرۆبوونی دەکرێت . یان لە باشترین حاڵەتا بە کێوی، وەحشی، گرگن، پیس، خڵتە، نزم، قالۆنچە، ئاژەڵ،مەگەز،ناتەواو،نەخۆش دەیان جوێنن. میدیاو بلاوکردنەوە دەورێکی زۆر گرنگ دەبینێت لە جێکەتەکردنی ئەم قۆناغەدا بۆ ناشرین کردنی وێنەی بەرامبەر و وێناکردنی وەك دوژمن، ڕەنگە نموونەی زۆر دیار لەسەر دەوری

میدیا ڕادیۆ ڕوەندا بێت کە توتسیەکانی بە قالۆنچەو زیانبەخش ناوزەد دەکرد و هانی هۆتۆکانی دەدا بۆ قەلاًچۆ کردنیان .

**چوارەم : ڕێکخستن** Organization

لەم قۆناغەدا پلانی لەناوبردنی گروپەکە دادەنرێت. یەکەولایەنەکان دیاری دەکرێت‌وکارەکانیان بۆ دیاری دەکرێت پلانادنان بۆ ئەم جۆرە لەتاوان توانایەکی تەکنیکی‌و لۆجیستیکی بەرزی ئەوێت، بۆیە ئەم جۆرە لە ڕێکخستن و پلان دانان تەهنا بە دەوڵەت یان ڕێکخراوە نێودەوڵتیەکان دەکرێت . ئەگەر جێبەجێکردنی ئەم پلانە بدرێتە دەستی میلیشا، خێڵ یان هێزە پار میلیتاریەکان بەلاًم هەمیشە پلان دانانەکەی لەلایەن دەوڵەت یان ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانەوە ئەبێت .

**پێنجەم : جەمسەرگیری** Polarization

لەم قۆناغەدا تێگەیشتنی پەرگیرانە و ئێکستریمینیزم دەبێتە تێگەیشتنی باوی کۆمەڵگا و گروپەکان دەخاتە دوو جەمسەری لێك دوور لە کۆمەڵدا، هەولٚ دەدریً ڕێگە لەهەر چەشنە تێکەڵبوونێکی کۆمەلاًیەتی، ئابوری و سیاسی گروپە ڕکەبەرکان بگیرێت، لەوانە قەدەغەکردنی هاوسەری گیری لەنێوان ئەندامانی گروپەجیاکاندا، هەوڵدان‌وبۆترساندوتۆقاندی کەسانی میانڕەوو و ئاسایی .

**شەشەم : ئامادەکردن** Preparation

لەم قۆناغەدا ئەو کەسانە دیاری دەکرێت کە دەبیٚ لەناوببرێَن، هەندیً جار ناچار دەکرێن بە هەڵگرتنی نیشانەو سومبول بۆ جیاکردنەوەیان لە گروپی دی، یان زۆر جار دەخرێتە کۆمەڵگا زۆرە ملێکان، گیتۆکان یان دایاندەبڕن لە ئەندامانی گرۆپەکانی تر . هەروەها لەم قۆناغەدا گروپەکانی مەرگیان بۆ دیاری دەکریًت ۆ ئامادە دەکرێن بۆ لەناوبردن .

**حەوتەم : لەناوبردن** Extermination

لەم قۆناغەدا لەناوبردنی گروپەکە دەست پێدەکات کە بە زۆری ڕەشە کوژی و کۆمەلکوژیە، تاوانکار کاتێك بەم کارە هەڵدەسێت هەست بە تاوانباری ناکات، چونکە وا هەست دەکات قوربانیەکان مرۆڤی تەواو نین، لەمەراسیمی کوشتن و ناشتن و شاردنەوەیاندا هیچ جۆرە ڕێورەسمێکی مەرگ و کوشتنی ئینسان نیە . لاقە کردن و ئازاردان و شکەنجە بە زۆری لەبەردەم خەڵکانی دی بە ئاشکرا دەبێت، زۆر جار لاقەکردنی گروپیی و ئەشکەنجەی گروپییە، تاوانکار هەست بە لێپرینەوە ناکات، ئەسڵەن هەست ناکات تاوانێك ئەنجام دەدات . جگە لە بەهاکانی سەرکەوتن تۆڵەساندنەوە و پاککردنەوە هیچ بەهایەکی تر ئامادە نیە . بۆیە زۆر جار تەرمەکان بە کۆمەڵ ژێرخاکدەکرێن فرێدەدرێتە سەجادە وڕێگەکان هیچ دوعاو ڕێچواڵێکی ئایینی‌و کۆمەلاًیەتیان بۆ پەیڕەو ناکرێت .

**هەشتەم : ئینکاریکردن** Denial

لەم قۆناغەدا ئینکاریکردن هەمیشە وەك دواقۆناغی جینۆساید دێت تەنانەت لەو جینۆسایدانەشدا کە زۆرترین بەڵگەو دۆکیومێنتیان لەسەرە . هەمیشە ئینکاری ئەوە دەکرێت کە کارێکی تاوانکاری ئەنجام درابێت لەلایەن تاوانکارەوە، بەزۆری قوربانی تاوانبار ئەکەن و بەهۆی ڕوودانی ڕوداوەکانی دەناسێنن . هەوڵدەدەن بەڵگەکان بشارنەوە ڕێڵە هەرجۆرە بە دواداچوونو لێکۆڵینەوەیەك بگرن . نموونەی دیاری ئینکاریکردن بۆ ڕودانی جینۆساید تورکیایە کە دەڵێ تیاچوونی ئەرمەنەکان بەسێکە لە ئەتمۆسفێری شەڕی جیهانی یەکەم نەك جینۆساید .

**کۆمەڵگاو ئەگەری ڕودانی جینۆساید**

دوای ئاماچەدان بەهەشت قۆناغەکەی جینۆساید ڕەنگە پشتبەستن بە دیاگرامەکەی (هۆڤانسیان) بتوانێت کۆمەکمان بکات لە دیاری کردنی ئەو کۆمەڵگایانەی کە کردەی جینۆسایدیان تیا ڕوودەدات . هۆڤانسیان بۆ ڕودانی کردەی جینۆساید ئەم پێشمەرگانە بە گرنگ دەزانێت .

یەکەم : بوونی کۆمەڵگایەکی پلوڕاڵی واتە بوونی پێکهاتێکی تێکەڵ لە ڕەگەز، کەڵچەر، ئەتنیکی و ئایینی جیا .

دووەم : ئامادە بوونی هەستکردن بە مەترسی لەلای یەکێك لە گروپەکان .

سێهەم : بۆنی سیستەمێکی ئایدۆلۆژی کە وابزانێت ڕاستیەکان لای ئەون .

چوارەم : ئامادە بوونی بڕیاری دروستکردنی سیستەمێکی نوێ

ئەوەی لێرەدا گرنگە باسبکرێت کارکردنی ڕژێمە تۆتالیتاری و دەسەلاتخوازەکانە یە ئاوەز و مینتاڵیتی مۆنۆدایمێنشنی یەکڕەهەندی بۆ دروست کردنی کۆمەڵگایەکی یەکڕەنگ لەسەر جەستەی کۆمەڵگایەك کە بۆ خۆی فرە ڕەنگ و دایڤێرسە . دروستکردنی دەوڵەتی یەکڕەهەندی و یەکڕەنگی هەمیشە پێویستی بە توند و تیژی و خاپورکردنە بۆ دیهێنان یۆتۆپیاکەی .

**تیۆرەکانی ڕوودانی جینۆساید**

چەندین لێکدانەوەی تیۆری جیا جیا هەن بۆ هۆکارەکانی ڕوودانی کردەی جینۆساید,کە دەکرێ بە کەڵك بن گەر لە خوارەوە ئاماژەیان پێبدەین.

یەکەم:تیۆری پیاوە شەیتانەکە The Evil Man

هەندێك پێیان وایە بۆڕودانی هەر کردەیەکی جینۆسایدی دەبێ کاراکتەرێکی شەیتانی بێبەزەیی و توندو تیژ ئامادە بێت وەك هیتلەر ,ستالین ,سەدام حسین ,سوهارتۆ,ئیدی ئەمین ,ئەم ڕوانینە ڕوودانی جینۆساید بۆ شەڕانگێزی کەسێتی سەرکردە دەگێڕێتەوە ,هەرچەندە سەرکردە وەك سەرچاوەی بڕیاردان زۆر گرنگە بەلاّم ئەم تیۆرە ناتوانێ پاساوی چەندین جۆری جینۆساید تر بکات کە سەرکردە کاراکتەری سەرەکی نییە وەك جینۆسایدی سپی دژی

دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکاو ئوسترالیا و نیوزلەند,پاشان سەرکردە خۆی ئەنجامە نەك هۆكار واتە كۆمەڵگەكان پێشتر لە بار و دروست بوون بۆیە ئەو جۆرە سەركردانەش دەركەوتوون ..

دووەم:تیۆری دەست بەسەراگرتنی خاك Take Over the Land

ئەم تیۆرە دەكرێ ئەو جینۆسایدانەی لە ئەمریكاو جیهانی نوێ ڕوویان داوە ڕوونكاتەوە بەڵام ناكرێت بكرێتە بنەڕەتی تێگەیشتن لە زۆر جینۆسایدی تر وەك هۆمۆسێكسواڵ و قەرەج و جولەكەكان .

**سێهەم : تیۆری پەرەسەندنی نوێ New Development**

وەك دۆزینەوەكان و دارستان و كێڵگەی نوێ كە دانیشتوانە ڕەسەنەكان بەم هۆیەوە ڕو بە ڕوی قەلاَچۆ و ئاوارەیی بونەوە وەك ئەوەی لە كۆڵۆمبیا لە ساڵی 2005ڕویدا كە 3000 خەڵكی ئەفرۆكۆڵۆمبیایی كوژران و نزیكەی 300.000ئاوارە بوون بە هۆی ئەوەی شوێنی ژیانیان كرایە كێڵگەو كان ,.بە هەمان شێوە ئەم تیۆرەش هەموو جۆرە جینۆسایدەكان ڕووناناكاتەوە .

**چوارەم:ویستی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی تەواو و یۆتۆپیایی Perfect or Utopian Society**

ئەم ویستە دەیەوێت كۆمەڵگەیەكی تەواو و پاك دروستبكات بۆ ئەمەش پێویستی بە پاكتاو كردن و پالأوتن هەیە,ئەم تیۆرە دەكرێت بكرێتە بناغەی هەندێك لە جینۆسایدە دیادەكان وەك نازی ,بەعسی,كەمالیزم ,ستالینیزم و جینۆسایدی كەمبۆدیا .هەندێ كات زیاد لە تیۆرێك پێویستە بۆ لێكدانەوەی كەیسێكی تایبەتی جینۆسایدیی چونكە دەكرێ سەركردەیەكی شەڕانگێز ئامادەبێت و بیەوێ كۆمەڵگایەكی تەواوو یۆتۆپی دروستبكات و زەویش داگیر بكات و پاشان هەوڵی دروستكردنی كان و كێڵگەكانیش بدات بۆ تێگەیشتنی كەیسێكی وا هەموو تیۆرەكان پێویستن بۆ لێكدانەوەی.

*** کوردو جینۆساید**

لە گەڵ هاتنی چەمكەكانی دەوڵەت –نەتەوە و ناشناڵیزم و دەولەتی مۆدێرن بۆ جوگرافیای خۆرهەلاَتی ناوەند كە ئەو كات لە ژێر فەرمانڕەوایی ئیمپایەرەكانی عوسمانی و سەفەویدا بوو .زۆربەی پێكهاتە نەتەوەیی و ئتنیكی و كەلَچەریەكانی كوتنە بەر كاریگەریی و هەژمونی ئەم بیركردنەوە نوێیە . چەندین هەوڵی سەركەوتوو و سەرنەكەوتوو بۆ دروستكردنی دەوڵەتی نوێ ئەبینین لە سەر پاشماوەی تێكشكاوی ئمپراتۆریەتی عوسمانی .ئەو جۆرە لە ناشناڵیزم كە جەخت لە سەر پەیوەندی خوێن دەكاتەوە بووە ئەڵگۆ و نمونە بۆ دەوڵەتە نوێكانی ناوچەكە ,ناشناڵیزمی ئەتنیكی وەك ئاكامێكی دەخاڵەتگەری كولۆنیاڵیزم و كاركردنی لە سەر جیاوازیە ئەتنیكی و زمانی و كەلچەریەكانی نێو پێكهاتەكانی ئمپراتۆریەتی عوسمانی هاتە كایەوە .ئەم جۆرە لە دەستێوەردان بەشێك بووە لە ستراتیژی كۆلۆنیالیزمی نوێی ئەوروپی بۆ ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی .دروستبوونی ئەم ناكۆكیانە شوێنێكی نەهێشتەوە بۆ هاتنە ئارای فۆرمی دووەمی ناشناڵیزم كە ناشناڵیزمی سیڤیكە ,یان ناشناڵیزمی مەدەنی كە هاولاَتی بوون دەكاتە

بنچینە بۆ ئینتیما ,ئەم بارودۆخە تایبەتە تاقە دەروازەیەکە بە ئاوەڵایی هێشتێوە بۆ دروستکردنی دەوڵەتی یەکدایمێنشنی و ئەتنۆناشناڵیزم بوو ,ئەمە لە کاتێکدا ئەم ناوچەیە لێوان لێو بوو لە ئەتنیکو کەڵچەرو ئایینو ڕەگەزی جیاواز کە دەبا دەوڵەتی نەتەوە وەلاّمدانەوەی ئەو ستراکچەرە دایڤێرس و فرەیە بایە لەئۆڵگۆی ناشناڵیزمی مەدەنی, لە دەمی شەڕی یەکەمی جیهاندا تورکەلاوەکان بەهۆی :

نزیکیان لە پانتاییەکانی دەسەلاّتەوە

ئاشنایی زیاتریان بە دەوڵتی نوێو کەڵچەری ناشناڵیزم

بوونی ئەزموونی فەرمانڕەوایی دوورو درێژ

بوونی خەونی گەورەی دەسەلاّتدارێتی

بۆشایی لاوازی دەسەلاّتی خەلافەتیان قۆستەوە بۆ پڕمۆتی ناشناڵیزمی ئەتنیکی بنیاتنراو لە سەر ڕەگەزی تورك ,لە مەودوا کورد ,ئەرمەنی ,ئاشوری ,کلدانیەکان بوونە قوربانی دروستبوونی دەوڵەتی تورك و عەرەب و فارس لە ناوچەکە .جەیکەب کونزلەر کە پیاوێکی سویسری کرستیانە و لە ساڵانی 1899–1922لە ئورفە بووە ئاوا باسی بارودۆخی کولرد دەکات لو دەمەدا(کوردەکان زۆر بە قووڵی کوتنە بەر کاریگەری سیاسەتی نیشتەجێکردن و لە ناوبردنی تورکە لاوەکان هەروەها بوونە بابەتی ئەندازیاری کۆمەلاّیەتی پێش دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی تورك لەلایەن کەمال ئەتاتورکەوە لە ساڵی 1922زۆر گرنگە ئەوە بزانرێت کە ڕابەرانی تورکە لاوەکان دەیانویست شوناسی کوردبوون بسڕنەوە کاتێك دیپۆرتیان ئەکردن ,نزیکەی 700.000کورد لە شوێنی ژیانی خۆیان دوورخرانەوە ,

جیکەب باس لەوە دەکات کە چۆن ئەو ڕۆژانە کورد وەك پیاو کوژ ,خوێنخۆر وبێبەزەیی پۆرترێت ئەکران ,زیاتریش دەڵێت کوردەکان بوونە قوربانی هەمان سیاسەت کە دژی کریستیانەکانی دەوڵەتی عوسمانی وەك ئەرمەنی و ئاشوری و گریکەکان بەکاردەبرا ,ئەمەو چەندەها سەرچاوەی تر ئاماژە بەو نەهامەتیو توندو تیژیو لە ناوبردنو قڕکردنە دەکەن کە کورد ڕووبەڕوویبۆتەوە.

کورد چارەنووسی لە هیچکام لەو دەوڵەتە نوێیانەی کوردیان بەسەردا دابەشکرا باشتر نەبوو لە عێراق,سووریا,کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت کورد مەحکوم بوو بە ئسیمیلاسیۆن,توانەوەو لە ناوچوون لە ئێرانیش بە لە ناوچوونی کەلچەری .

بۆناسینی ئەو پەیوەندییەی کورد هەیبووەو هەیەتی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی بە زۆر کرا بە بەشێك لێیان .دەمەوێ کۆنسێپتی (پەیوەندی جینۆسایدی )لە تۆنی بارتای مێژوناسی ئوسترالیەوە قەرزکەم .پیوەندی جینۆسایدی لە دیدی بارتاوە ئەو پەیوەندییە یە کە دانیشتوانی ناوچە کۆلونیاڵکراوەکانی وەك ئوستراليا و ئەمریکاو بە حکومەتەکانەوە دەبەستێت کە بەشێوەیەك لە شێوەکان مەحکومن بە لە ناوچوون و ئەو پەوەندییە پەیوەندییەکی

جینۆسایدییە.کوردیش لە سەردەمی مۆدێرنەوە لە پەیوەندییەکی جینۆسایدیدا دەژی .زمانی,کەلچەر و بوونی ڕۆحیی و فیزیکی هەمیشە کاری تواندنەوەو خاپورکردن و لە ناوبردنی لە سەر کراوە ..مانەوەی کورد تا ئێستا مانەوەیەکی هودنەییانەیە حکومەتەکان هودنەیان لە گەڵ کردووە نەك ڕێکەوتن,ئەم ساتانەی تیای دەژی زۆرتر دواخستنی هودنەییانەی حوکمی ئیعدامەکەیەتی نەك بە ڕەوا زانینی ماف ژیان و سەلماندنی ئەم مافە زۆرتر کاتدانە بە خۆیان بۆبەهێزبوون و هێز کۆکردنەوە بۆلەناوبردنی .کێشەی کورد هەمیشە مامەڵەی کێشەیەکی ئەمنی و مەترسیداری لە گەڵ کراوە کە سەرچاوەی مەترسییە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی ئەو وولآتانە ,بەلآم بارودۆخی ناوچەیی و جیهانی و بونی ژمارەیی کورد ئەو حکومە ئیعدامەی بۆکاتی لە بار دواخستووە تا ئەم ساتە وەختەش کورد لە هەمان پەیوەندی جینۆسایدیدا هەناسە دەدات.سیاسەتەکانی پاکتاوی ڕەگەزی ,بەتورککردن و عەرەبکردن,کەلچەر ساید ,لانگویساید ,ئوردوگای زۆرەملیّ و تێکدانی ژینگەیی و شوێنەواری کوردستان ,پشتێنەی ئەمنی لە جەستەدا دروستکردن .پراکتیزە کردنی تۆقاندن و تیرۆریزمی دەوڵەتی دژی بوونی لە کاردان .نییەتی جینۆسایدی لە خاپورکردنی کوردا زۆر ڕوونەو تا ئێستاش بوونی بزووتنەوەیەکی گۆڕانخواز بوگۆڕینی ستراچکەری جینۆسایدی ئەو دەوڵەتانە ئامادە نییە .ئاوەزی جینۆسایدی ئاوەزی هەرە بلاوو دیاری ئەو کۆمەڵگایانەیە .تەنانەت لە هێزە نەیارو ئۆپۆزسیۆنەکانیشدا .بەسەرنجدان لە پێناسە یاسایی و پەیماننامەیەکەی جینۆساید تەنانەت بە مانا تەسکەکەشی ,بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو نەهامەتیانەی ڕووبەڕووی کورد دەبنەوە جینۆسایدەو زۆر بە تایبەت مەبەست لە ناوبردنیەتی .

ئەلف : کوشتنی هەزاران مرۆڤ تەنها بە تاوانی کوردبوون

بێ : ئازاردانی جەستەیی و هزری بەردەوامی تاکی کورد

جیم : فەراهەم کردنی بارودۆخی هەژاری . پرتوندو تیژی , بێ ئاسایشی و ئارامی کە بەردەوام کار لەسەر لەنا وبردن و خاپورکردنی کورد دەکات .

دال : دانانی ڕێگری لەبەردەم زاوزێ کردن وەك لەنا وبردنی پیاوان و جیاکردنەوەیان وەك چۆن لەسەر نگوم کردنی (8000) بەرزانیدا ڕوویدا .

پرۆسەی ئەسیمیلاسیۆنی کورد، گۆڕینی شووناسی کەلچەڕی و نەتەوەیی لەنا وبردنی فیزیکی هەمووی ترێندی ئەو پرۆسە جینۆسایدیە پێك دێنێ کە بە کوشتن و دیپۆرت کردن و ئاوارە کردنی کورد دەستی پێکرد تا گەیشتە ترۆپکی لە هەڵەبجە و ئەنفالدا . وەك مەریوانی وریا قانع دەڵێ :

ئەنفال ڕوداوێك نییە لە دوامانەوە بۆی هەیە هەر کاتێك دووبارە ببێتەوە . هاوکێشە و پەیوەندیەکان نەگۆڕاون ئاوەز و نییەتی جینۆسایدی هەر ماون، ستراکچەری دەوڵەتەکان هەمان

ستراکچەرن دەکرێ چەند هۆیەك ڕیز بکەین بۆ دووبارە بوونەوەی کردەی جینۆساید دژی کورد:

**یەکەم :** بوونی پەیوەندی جینۆسایدی

**دووەم :** ئامادەبوونی داروینیزمی کۆمەڵایەتی وەك فەلسەفەی بەڕێوەبردنی دەسەڵات

**سێهەم :** بوونی بێ دەنگی وەك ئەتمۆسفێری پەیوەندیێ ناوخۆیی و جیهانیەکان .

**ستراتیجیەت لە بەجینۆساید ناساندنی نەهامەتیەکانی کورد**

تەکیف کردنی نەهامەتیەکانی کورد بە جینۆساید چەند گرنگی یەکی هەیە لەوانە :

**یەکەم :** دەرخستنی ڕاستی دەربارەی ئەوەی ڕوویداوە .

**دووەم :** بەجێ هێنانی دادوەری بۆ سزادانی ئەو کەس و لایانانەی ڕۆڵیان وازی کردووە لە پلان دانان و جێ بەجێ کردنی جینۆساید دژی کورد .

**سێهەم :** ڕێگرتن لە دووبارەبوونەوەی و هەوڵدان بۆ ڕاگرتنی کردەی جینۆسایدی .

**چوارەم :** هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئەو هاوکێشانەی حوکمی پەیوەندی کورد دەکەن لەگەڵ ئەو گروپانەی لەگەڵیان دەژین .

زانینی ڕاستی و دروستی ئەو ڕوداوانەی ڕوویان داوە و دۆزینەوەی چەمکی شیاو و گونجاو بۆیان لە ڕووی ئەکادیمی و مێژووییەوە گرنگییەکی زۆریان هەیە بۆیە کارکردن بۆ دۆزینەوەی ڕەهەندەکانی نەهامەتیەکانی کورد گرنگی زۆری هەیە . هەروەها زانینی سروشتی ئەو تاوانانەی دژی کورد کراوە دەتوانێت تەکیفێکی ڕاستمان بداتە دەست بۆ دادگایکردنی تاوانباران لەسەر تاوانێك کە کردویانەو قوربانیانیش هەست بە سارێژ بوون بکەن بە جێ بەجێ کردنی دادوەری لەلایەکی ترەوە زۆر زۆر گرنگە لە دلالەتەکانی ئەو کردانە تێبگەین و پێناسی تەواومان بۆیان هەبێت تا بتوانین ڕێ لە ڕوودانەوەی بگرین و ڕایگرین و قەدەغەی بکەین با جارێکی تر ڕوونەداتەوە .

لەهەمووی گرنگ تر تێگەیشتنە لەو نەهامەتیانە بۆ ئەوەی پشتیوانی ناوخۆی و جیهانی کۆبکەینەوە بۆ گۆڕینی ئەو هاوکێشانەی کوردی بەو دەوڵەتانەوە پەیوەست کردووە، گۆڕانی ستراکچەری دەوڵەت یا مافی جیابوونەوە و دروست کردنی دەوڵەتی سەربەخۆ .

**سەرچاوەکان :**


1- jane Springer , Genocide, Toronto, 2006 .
2- Dr. S.D. stein Definition and controversies 2007 .
3- R . J Rommel, Genocide, Death by Government, New Brwnswick, N.J. Transaction Publishers, 1994 .
4- Dr. Gregory Stanton, How We can Prevent Genocide .
5- Journal of Genocide Research, Volume 10 Issue 1 2008 ,Late Ottoman genocides

# ئەلێنا سلافسکایا: ئەگەر کورد ئەیەوێت لێپێچینەوەی خۆی لەگەڵ تاوانباراندا بکات دەبێت ئێستا بیکات تا کۆن بێت قورستر ئەبێت



جینۆساید لەهەر ئانوساتێکداو لەهەر کوێیەکی دنیادا بێت کردەیەکی نامرۆڤانەیە، ئەنفال وەك جینۆسایدی نەتەوەیەك لە توانایدا هەیە لە ئاستی دونیادا بناسرێت، بەمەرجێك کاراکتەری بەتوانا هەبێت بۆ دەستگیرۆیی کردنی.

بۆ زانینی گەورەیی ئەم تاوانە لە دیدی کەسانی دەرەوەی کوردو وەك هەوڵێکیش بۆ نێودەوڵەتی کردنی تاوانەکە، عەرعەر مێزگردێکی تایبەتی لە زانکۆی واشۆی پۆڵندا بۆ چەند پرۆفیسیۆرو مامۆستای زانکۆ رێکخست.

د.ئاندژێی ڤیژبیتسکی، تایبەتمەند لە بواری ئەتنۆسیاسی و ئەتنۆدیمۆگرافی نەتەوەکانی ئاسیای ناوەڕاست

د.پیۆتر زاوێسکی، تایبەتمەند لە بواری دەروونناسی سیاسی و کۆمەڵایەتی سیاسی

د. ئەلێنا سلافسکایا، تایبەتمەند لە بواری تێوری تازەکردنەوەی سیستەمی سیاسی دەوڵەت

یارسواڤ چڤێکارپۆڤیچ، تایبەتمەند لە بواری پەیوەندی سیاسی، بەشداربوانی مێزگردەکەبوون.

**ئەمین عەبدوڵا:** ئەو پاڵنەرە نەستی و هەستیانە کامانەن کە پاڵ بە ئەنجامدەرانی جینۆسایدەوە ئەنێت کە پرۆسەی جینۆسایدی ئەنجام بدەن؟

**د. پیۆتر زاوێسکی:** تراژیدیا بەڕای من ئەوە دەگەیەنێت هەرشتێك کە ببێتە هۆی ئازاردان و گە یاندنی هەستێکی ئازاردەر یاخود بە جێهێنانی مێژویەکی ڕەش و غەماوی بۆ گەلێك کەستمی لیٚ کرابێت، جا ئەو تراژیدیایە ئایدۆلۆژی بێت یان هەر شێوەیەك بێت کە ببێتە هۆی ئازار.

پاڵنەری زۆر هەیە بۆ ئەنجامگەیاندنی جینۆساید یەکێك لەو پاڵنەرانە نەخۆشی دەرونی ئەنجامدەرانی کەسی هەڵساوە بە جینۆساید، پێویستە پێش ئەوەی باس لە دەرئەنجامی جینۆساید بکەین ڕاڤەیەکی گرنگو قوڵی دەرونی ئەنجامدەری جینۆساید بکەین بەبیٚ تێگەیشتن لە دەرونی ئەوانە پێناسکردنی جینۆساید ئەستەم دەبێت، چونکە کرتەی جینۆساید هەڵقولاٚوی ناخی ئەنجامدەرانیەتی، ئیتر ئەنجامدەرانی چی تاکێك بێت یان گروپێك.

**د.ئاندژێی ڤیژبیتسکی:** من لەگەڵ ئەو بروایەدام کە جینۆسایدو کۆمەڵکوژی دەرئەنجامی بریارێکە کە پێشکات پلانو بەرنامەی بۆ دارێژراوە، هەروەها ئامادەکاری پێشتری بۆ کراوە، چونکە ناکرێت بە بریارێکی بەپەلە کۆمەڵێك مرۆڤ ببێتە بکوژی کۆمەڵێکی تر.

ئەوانەی بەر جینۆساید کەوتونو لە ناوبراون هەمیشە وا پیشاندراون کە لە مرۆڤی ئاسایی کەمترنو لە پێش چاوی بکوژەکانیان کەم بایەخکراون، بۆ نموونە کاتێك سوپای هیتلەر دێت بۆ پۆڵەندا باسی ئەوە دەکات کە گەلی پۆڵەندی نابێت لەسەر ئەم نیشتمانە جوانە بژین چونکە ئەمان شایستەی ئەم خاکەیان نییەو پێویستە سەربازانی ئەڵمان خۆشیەکانی ئەم ولاٚتە بنۆشن، هەروەها کاتێك کە جووەکانی ئەڵمانیایان پاکتاوکرد بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەمان لە خواری خوارەوەی هەرەمی مرۆڤایەتین.

**یارسواڤ چڤێکارپۆڤیج:** سەرەرای ئەوانەی کە هاورێکانم باسیان کرد خاڵیکی گرنگ ئەوەیە کە ئەوانەی کرتەی جینۆساید ئەنجام دەدەن پاڵنەری مادیان هەیە وەك چاوبرینە سەروەتو سامانی ولاٚتانی تر یان گەلانی تر بە رێگر دەزانن لەبەردەم بەرژەوەندیە مادییەکانیان، هەروەها پاڵنەرێکی تر ئەوەیە کە مێژوو بریاری ئەنجامگەیاندنی جینۆساید ئەدات بەوەی ئەنجامدەرانی جینۆساید مێژوویەکی تاڵیان لەگەڵ قوربانی جینۆسایدا هەیەو بریار دەدەن چیتر خۆیان رزگاربکەن لەو دەردەسەرییە.

**ئەمین عەبدولا:** دەوڵەت وەك کیانێکی سیاسی تا چەند لێپرسراوێتی مێژوی جینۆساید ئەگرێتە ئەستۆ؟ ئەگەر ئەو نیزامەی پرۆسەی جینۆسایدی ئەنجامداوە لەسەر حوکم نەمێنێت, ئەو بەر پرسیارێتیە ئەخلاقی و نێودەوڵەتیانە چین ئەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت و نیزامی دواتر؟

**ئەلێنا سلافسکایا:** بەرپرسیاریەتی زۆر گرانە لەکاتی جینۆسایدکردندا، بە لاٚم لەو کاتەی کە دیکتاتۆر یان هەر کەسێکی دیکە کە هەڵدەسێت بە جینۆسایدکردنی گەلێك دیکتاتۆرەکە دان بەو جینۆسایدەدا نانێت و ئیعترافی پیٚ ناکات چونکە ئەو شەرعیە ت بەخۆی دەدات کە ئەو کارە بکات جابە هەر مەرامێك بێت.

دەوڵەتێك كە لەدوای ڕوخاندنی دیكتاتۆرێك بێتە كایەوە كە كاتی خۆی جینۆسایدی ئەنجامداوە ئەوا ئەو دەوڵەتە لێپرسراوە، هەرچەندە سیستەمێكی تازەی حوكم هاتۆتە كایەوە بەڵام دەوڵەت هەر ماوە جا ئەبێت لێرەدا مامەڵەیەكی عەدالەتی لەگەڵ دیكتاتۆرو هاوكارەكانیاندا بكەرێت و ڕاپێچی دادگایان بكەن ، بۆ نمونە گەلی پۆڵەندی لەكاتی جەنگی جیهانی یەكەم و دووەم توشی چەندەها تراژیدیا هات و بەكۆمەڵكوژكران لەسەر دەستی ئەڵمانە نازیەكان و ڕوسە فاشیەكان لەو كاتەدا كەسیان دانیان بە تاوانەكانیاندا نەدەنا وە ئێستاش هەردوو دەوڵەت هیچ مەسئولیاتێكی ئەوكردەوانە هەڵناگرن، بەڵام ئەخلاقیەن دەبێت هەڵی بگرن. ئێستا ئێمە تەنها ئەم تراژیدیایە وەكو مێژویەكی ئازار بەخش تەماشا دەكەین‌و ئەیهێڵینەوە، لەكاتی حوكمی ستالیندا یان هیتلەردا كە باسی بە كۆمەڵكوژی گەلی پۆڵەندیمان دەكرد ڕوسەكان ئەیانوت ئەڵمانەكان كردویانەو ئەڵمانەكان ئەیانوت ڕوسەكان كردویانە. مەرج نیە ستالین یان هیتلەر بەهەموو ئەو كردەوانەیان زانیبێت بەڵكو ئەو كەسانەی كە لەدوای ئەوانەوە دەهاتن و پلەی باڵایان هەبو ئەوان هەندێ جار سە ربەخۆ دەیانكرد.

**ئەمین عەبدوڵا:** گەلی پۆڵەندا لەسەردەمێكدا بەر جینۆساید كەوتووە و ئەو تراژیدیا نەتەوەییەی بینیوە, گەلی پۆڵەندا لە پاش جینۆسایدی چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو تراژیدیایەدا كردووە؟ چۆن توانی كۆستێكی گەورەی وا لە زاكیرەی تاكی پۆڵەندیدا بهێڵێتەوەو؟ چۆن سودی لە جینۆساید وەرگرت بۆ زامنكردنی ئاسایشی نیشتمانی خۆی؟

**د. پیۆتر زاویسكی:** جینۆساید پەیوەندیەكی پتەوی بەئاسایشی نیشتمانیەوە هەیە، مامەڵەكردنی گەلی پۆڵەندی لەگەڵ تراژیدیادا بە دوو جۆر بووە:

**یەكەم:** تراژیدیای ڕوسی یە كە زیاتر توانیمان بیسەلمێنین وەكو جینۆساید ئەمەش لەڕیگەی سیاسیەكانی د وڵەتەوە كە چۆن لە زۆربەی وتارو بانگەشەكانیاندا لەناوخۆو دەرەوە باسی ئەم تراژیدیەیان دە كردو بە هەموو جیهاندا هەوڵی بڵاوە پیێ كردنی درا زیاتر لە ڕێی دەزگا حكومیەكانە وە.

**دووەم:** ئەو جینۆسایدەی كە ئەڵمانەكان دەرحەق بەئیمە كردیان ئەمەیان زیاتر بەرگێكی نەتەوەیی و كۆمەڵایەتی وەرگرت زیاتر نەچوە بواری ڕەسمیاتەوە زیاتر وەكو جینۆساید نەناسرا تەنها ئەوەندە توانرا كە بكرێتە یادەوەریەكی پۆڵۆنی كە ئەڵمانەكان چۆن ڕەشەكوژیان ئەنجامداوە لەوڵاتی ئێمە دەرحەق بەئێمە

لە ناو تاكەكانی كۆمەڵدا توانرا جێگەی هەردو تراژیدیای ناوبراو بكرێتەوە ئەویش لەڕێگەی وەزارەتی خوێندنی باڵاو فێركردنی منداڵان‌و گەنجەكان و هەرزەكارەكان لە ڕێگە ی بە مێژووكردن وەكو مەنهەج وەكو گێرانەوەیەكی ڕاستەقینەش بۆ ئەوانی تر.

**ئەمین عەبدوڵا:** كورد لە ئەنفال و هەڵەبجەدا زیاتر لە 200,000 هاوڵاتی سیڤیلی لە قەتلٌ و عام كرا بە دەستی حیزبی بەعس كە ئەوكات دەسەڵاتداری عێراق بوون، كورد چۆن هەوڵی بە

جیهانی ناساندنی ئەم دۆزەی بدات؟ سوود لە بەجیهانی ناساندنی چیە بۆ نەتەوەیەکی وەکو کورد کە تا ئێستاش دەوڵەت و کیانی سەربەخۆی نییە و ترسی دووبارە بوونەوە لە هزریدا ئامادەیە؟

**یارسواڤ چڤێکارپۆڤیج:** کورد هەوڵی بە جیهانی ناساندنی ئەو تراژیدیایە بدات لە ڕێگای حکومەتێکی قانویەوە یان سیاسەتێکی قانونیەوە هەروەها خوێندن بە تایبەتی خوێندنی باڵاوە یان لە ڕێگەی مێژویەکی سیاسی.

بە جیهانی ناساندنی تراژیدیا سودی بۆ کورد زۆرە چونکە لەلایەن دەوڵەتانەوە ڕێگا لەدوبارە بونەوە دەگیرێ بەڵام کە نەتەوەیەك خاوەنی دەوڵەتی خۆی نەبێت گرەنتیەکی ئەوتۆی نیە تاوەکو بڵێین جینۆساید دووبارە نابێتەوە.

کورد ئە بێت بیر لە فیدراڵیەکی بە هێز بکاتە وە یان بیر لە کۆنفیدراڵی بکاتەوە بۆ ئەوەی زەمانەتی دووبارە نەبونەوەی بۆ خۆی دەستەبەر بکات یان ئێستا کەئێوەی کوردهاوپەیمانی ئەمریکانو هاوکارن، ئێستاش ئەتوانن ئەو هەلە بقۆزنەوەو داوای زەمانەت لە ئەمریکا بکەن بۆ دووبارە نەبوونەوەی جینۆساید هەلێکتان بۆ ڕەخساوە هیچ کات وا بۆتان نەڕەخساوە چونکە ئێستا ستراتیژی ئە مریکاو دەوڵەتە زلهێزەکان لەگەڵ زۆرێك لە ستراتیژیەتەکانی ئێوە هاوئاراستەن. وە هەروەها دەتوانرێت لە ڕێگای فیلمی دۆکومێنتاری گێڕانەوەی بەڵگاوی تراژیدیای نەتەوەکەتان بەجیهان بناسێنین بۆ نمونە جوولەکەکان لەنەتەوە یەکگرتوەکان و لەوڵاتانی ئەوروپاو لە پەڕلەمانی ئەوروپا ڕۆژی یادکردنەوەی هۆڵۆکۆستیان هەیە ئەمەش لە ڕێگای فیلم و بە ڵگەوە بوو.

**ئەمین عەبدوڵا:** کورد وەکو قوربانی چۆن مامەڵە لەگەڵ جەلادەکانیدا بکات؟ چۆن مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا بکات؟

**ئەلێنا سلافسکایا:** دەوڵەتی ئێستای عێراق دەوڵەتێکە لە دوای دیکتاتۆرەوە بەرگێکی تری وەرگرتوە، دەتوانرێت مامەڵە لەگەڵ تاوانباراندا بکرێت و ببرێنە دادگا ئەوانەی تاوانباری سەرەکین وەکو سەددام و ئەو گەورە سیاسیانەی تری دوای سەدام، بەڵام لە حکومەتی ئێستای عێراقدا ناتوانرێت هەمو شتێك کە لەوەو پیش هەبوە بگۆڕدرێت چونکە دەوڵەتێکی تازەی بێ ئەزموون ناتوانێت بێ بنەما دروست ببێت دەتوانرێت سود لەکەسە خاوەن تواناکانی پیشو وەربگیرێت، بەڵام ئەگەر زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی کە ئێستا لە حکومەتدان کاتی خۆی جەلاد بوون ئێستا بتەوێت لە ناویان بەری ئەمە زۆرگران و زەحمەتە ئێمە دوو چارە سەرمان داناوە بۆ ئەم حاڵەتە ، کە چۆن مامەڵە لەگەڵ جەلادەکانا بکەیت:

**یەکەم:** ئەوانەی تاوانبارن و زۆر خەڵکیان کوشتوە ببرێنە دادگاو بەسزای خۆیان بگەن وە هەروەها چاوخشانەوەیەکی عادلانە بکرێت لەناو حکومەتدا ئەگەر تاوانباران زۆر زۆرن بەشێکی

گرنگ و گەورەو ئەزموونداری دەوڵەت پێك دێنن ئەوا هەوڵ بدرێت سود لە ئەزموونەکانیان وەربگرێت.

**دووەم:** لاپەڕەیەکی تازە هەڵبدرێتەوە لە تێڕوانینەکان و بیروبۆچونەکان، ڕەش و سپی نەکرێت ، بە تایبەتی کە حکومەتێکی لاواز هەبێ کە پێویستی بە یارمەتی حکومەتی پێشو هەبێت، بۆ نمونە کە پۆڵونیا ئازادبوو ئازارو مەینەتی زۆری کێشابوو لە دەست ئەڵمانەکانو ڕوسەکان زۆر کەس هەبوون کە لەگەڵ ئەواندا بوون و بەڵام تاوانبار نەبوون نەتوانرا تۆڵە سەندنەوە بکرێت توانرا سود وەربگیرێت لە حکومەتی ڕۆیشتو و کەسی شارەزا بهێنرێتە ناو حکومەتی تازەوە نەدەبوو تۆڵە بکرایە چونکە نزیکەی پێنج ملێون پۆڵۆنی کاریان دەکرد لەحکومەتی ئەوکاتەی پۆڵۆنیادا چونکە پۆڵۆنیەکان چاریان نەبوو بۆ دەسکەوتنی ژیان ناچار بوون کاربکەن لەناو حکومەتی ڕوسیادا، بەڵام لە چیك و سلۆفاکیا گەلی ئەو دەوڵەتانە تۆڵەیان سەندەوە چونکە سیستەمی سیاسی دەوڵەت وای دەخواست، توانرا لێپێچینەوە لەگەڵ ئەو کەسانە بکرێت کەدژی گەل بوون، ئەگەر کورد ئەیەوێت لێپێچینەوەی خۆی لەگەڵ تاوانباراندا بکات دەبێت ئێستا بیکات تا کۆن بێت گران ئەبێت.

## د.نووری تاڵەبانی:

# کورد تا ئێستاش بەشەرمەوە داوای قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە ماددی و مەعنەویانە دەکات کە لێی کەوتووە.



**ئەنفال دۆسیەیەکی گرنگو چارەنوس سازی نەتەوەییەو لێکۆڵینەوە لێی بۆ ئێستاو مێژوو پڕ مەهامەو توانای بنیادنانی ئایندەیەکی پڕ سەروەری هەیە بۆ نەتەوەکەمان، بۆ گرنگیدان بەم باسەو ویستی دەوڵەتی عێراق لە ئەنفالداو کاریگەری ئەنفال لەسەر روحی بزووتنەوەی کوردایەتی و پێویستی مامەڵەکردنی کورد لەگەڵ جینۆسایددا ئەم چاوپێکەوتنەمان لەگەڵ قانوون ناسو ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی کوردستان د.نووری تاڵەبانی سازکرد.**

**چاوپێکەوتن: عەرعەر**

**عەرعەر: هۆکاری بوونی سەدام بەدیکتاتۆرو تۆتالیتێر لە عێراق چی بوون؟ ئەکرێت بڵێین هۆکارێکیان ئەوەبوو حیزبی بەعس ئەیویست دەوڵەتی عێراق بکاتە دەوڵەتێکی تەواو نەتەوەیی عەرەبی و عەرەبی سونە فەرمان رەوایی بکات؟**

**د.نووری تاڵەبانی: حیزبی بەعس حیزبێکی عەرەبی شۆڤینی یە، هەموو ئەو وڵاتانەی عەرەبی تێدا زۆرینەن بەخاکی عەرەبی دەزانێت و**

نەتەوەکانی دیکە بە"میوان". لە عێراق ئەم حیزبە دووجار لەڕێگای کودێتاوە گەیشتووەتە سەر حوکم، یەکەمجار لەشوباتی 1963 بەکودێتایێکی خوێناوی بەهاوکاری دەزگای موخابەراتی ئەمریکا، وەك پاشتر سکرتێری ئەو حیزبە لەو دەمەدا عەلی سالح سەعدی ئاشکرای کردووە، کودێتای دووەم لەسالی1968بوو، سەرەتا خۆی واپیشاندەدا توندو تیژی بەکارناهێنێ، بەلام پاش ماوەیەکی کەم دەستی کرد بەسەرکوتکردنی لایەنە سیاسیەکانی عێراقی یەك لەدوای یەکیان، ئەو حیزبە لەبەشی زۆری ولاتانی عەرەبیدا لقی هەیەو کار بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی عەرەبی یەکگرتوو دەکات، لە سالی 1979دا سەدام حسێن بەکودێتایێکی ناوخۆیی خوێناوی خۆی سەپاند بەسەر ئەو حیزبەدا، لەپایزی سالی 1980دا عێراقی بەرەو شەرێکی خوێناوی درێژخایەن برد لەگەل ئێران، پێشتریش لەشەرو پێکدادان بوو لەگەل کورد، لەناوەراستی سالی 1990دا کوێتی داگیرکردو سەرەوەت سامانی ئەو ولاتەی بەتالانبرد، ئەوەش بووە هۆی ئەوە تووشی شەرێکی گەورەتر بێت لەگەل بەشی زۆری ولاتانی عەرەبی ورۆژئاوادا، ماوەیەك پاش دەرکردنی لە کوێت کەوتە هەولدانی بەدەستهێنانی چەکی کۆمەلکوژی، شەری کەنداوو هەولدان بۆ بەدەستهێنانی چەکی کۆمەلکوژی بوونە هۆی لەناوچوونی لەنیسانی 2003دا.

سەدام هەولی دروستکردنی عێراقێکی "یەکگرتووی"بەهێزی دەدا کورد وەك کەمینەیەکی ژێردەستە بمێنێتەوە، شیعەی عەرەبیش هەرچەندە سووتەمەنی سەرەکی بوون بۆ ئەو جەنگانەی دژ بەکورد و ئێران و کوێت و رۆژئاوا بەرپای کردبوو، بەلام وەك بەکرێگیراوی ئێران تەماشادەکران و بە"عەجەم" دەدرانە قەلەم، کوردی شیعەی فەیلی لە سەرەتای هەفتاکانەوە کەوتنە بەر شالاوی بەزۆر کۆچپێکردن و سەروەت وسامانیان تالانکران، پاش دەستپێکردنی جەنگی نێوان عێراق و ئێران هەزارەها گەنجیان بێ سەروشوێن کران وئەوانی دی رەوانەی ئێران کران، بەعس لەسەر بنەمای سیاسەتی ئینگلیز لەعێراق کاری دەکردو هەولی دروستکردنی عێراقێکی عەرەبی دەدا کە سوونەی عەرەب بالادەست بن تێیدا، حوکمی بەعس بەهۆی رەفتارە فاشیەکانی دژ بە کورد و شەری دژ بە ئێران نەرووخا، بەپێچەوانەوە لەو شەرانەدا بەشی زۆری دەولەتانی عەرەبی و رۆژئاوا پشتگیریان دەکرد، ئێران ئەوەی لەبیر نەکرد، بەلام کورد زوو ئەوەیان لەبیرکرد!

**عەرعەر: لە سالی 1988 سالی هەلەبجەو ئەنفالدا کوردو پرۆژە نەتەوەیەکەی کورد بەبەرزترین خالی ترسناکی مێژوویدا تێپەری، ئایا کورد توانی ئەم تراژیدیا نەتەوەییە بکاتە هەوێنی هەستانەوەو روحێك بەبەری پرۆژە نەتەوەییەکەیدا بهێنێتەوە؟**

**د.نووری تالەبانی:** بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەبەهاری 1988دا لەشاری هەلەبجە، لەگەل کارەساتی ئەنفال دوو تاوانی گەورەن کەدژ بەگەلێکی ژێردەستە کراون ودەچنە خانەی تاوانی جێنۆسایدەوە بەمەبەستی قرکردنی گەلێکی بێ پشت وپەنا، ئەو تاوانانەی بەعس لەکوردستان کردوویەتی، پێشتر نازیەکان بەپێی سیاسەتێکی دارێژراو دژ بەجولەکەکانی ئەلمانیاو وئەوروپا

کردوونی، لەکاتی جەنگی جیهانی دووەم بەشێکی زۆر لەولآتانی ئەوروپا لەلایەن لەشکری نازییەکانەوە داگیرکران، جووەکانی ئەو ولآتانە بەر سیاسەتی کوشتن ولەناوبردن کەوتن، کە بە هۆلۆکۆست ناسراوە، ئەو جولەکانەی مابوونەوە بەتایبەتی ئەوانەی لە ئەمریکا بوون، خەریکی پرۆپاگەندەکردن بوون دژی ئەو تاوانانەی لەهۆلۆکۆست کرابون، ئەوە رێگای خۆشکرد بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر خاکی فەلەستین، کۆنراود ئەدیناوەر، کە سەرۆکی یەکەمین حکومەتی ئەلمانیای رۆژئاوا بوو، بەفەرمی دانی بەتاوانی هۆلۆکۆستدا نا، ئەوەش لەرووی قانوونییەوە بووە هۆی ئەوە بەرپرسیاریەتی ئەو تاوانانەی نازیەکانی کردبوویان بکەوێتە سەرشانی ئەڵمانیاو قەرەبووی کەسوکاری ئەوانەی لە هۆلۆکۆست تیاچووبوون بکاتەوە، بەملیارەها مارکی ئەڵمانی تەرخانکرا بۆ قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری ئەو جولەکانەی لەسەردەمی حوکمی نازیدا کوژرابوون یان سەروەت و سامانیان لەدەست دابوو، بەشێکی زۆریان لە ئیسرائیل نیشتەجێ ببوون، ئەو پارەیە لە ئیسرائیل خەرجکراو ژێرخانی ئەو ولآتەی پێ دروستکرا، کورد تا ئێستاش بەشەرمەوە داوای قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە ماددی و مەعنەویانە دەکات کە بەهۆی تاوانی ئەنفال و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەهەڵەبجە بەسەری هاتووە، دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراق ئەنفالی بەجێنۆساید ناساند، ماوەیەك پاشتر ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق هەمان ئەو تاوانەی بە جێنۆسایدا ناساند، حکومەتی عێراق دەبوو هەنگاو بگرێتەبەر بۆ جێبەجێکردنی ئەو بریارە، کە لەلایەن دوو دەسەڵاتی باڵای دادوەریی وقانووندانەر دەرچوون، بەقەرەبووکردنەوەی کەسوکاری شەهیدەکانی هەڵەبجەو ئەوانەی تا ئێستا بەهۆی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییەوە نەخۆشن ودەناڵێنن، هەروەها دروستکردنەوەی شاری هەڵەبجەو دێهاتەکانی، لەگەڵ قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان ودروستکردنەوەی دێهاتەکانیان، ئەرکی حکومەتی عێراق بوو ساڵانە برێك پارە لە بودجە تەرخان بکات بۆ ئەو مەبەستە، هەروەها دەبوو دەوڵەتی عێراق داوای لێبوردن لە خەڵکی هەڵەبجە و ئەنفالکراوەکان بکات، بەڵام دەبێ دان بەوەشدا بنێین کە خۆمان کەمترخەم بووین، دەبوو پەرلەمان وحکومەتی کوردستان ئەو دوو داواکاریە لە حکومەتی بەغدا بکەن، لیستی هاوپەیمانی کوردستانی کە نوێنەری خەڵکی کوردستانە لەناو ئەنجومەنی نوێنەرای عێراق دەبوو هەموو ساڵێك لەکاتی تاوتوێکردنی بودجەی ئیتحادی داوای تەرخانکردنی برێك پارە بکات بۆ ئەو مەبەستە، کە کەمترین داواکاریە لە حکومەتی عێراق بکرێت، ئەگەر کورد بەشێوەیەکی قانوونی داوای قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری کیمیابارانی هەڵەبجەو ئەنفالکراوەکانی نەکردبێ، چۆن دەتوانێ داوای زیاتری لێ بکات؟ بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە هەڵەبجەی شەهیدو چەندین ناوچەی دیکەی کوردستان، لەگەڵ خاپوورکردنی زیاتر لە 4000 گوند لەلایەن ئەو رژێمەوە لەکاتی جێبەجێکردنی تاوانی ئەنفال دەبوو بکرێتە بنەمایێکی

قانوونی بۆ داواکردنی قەرەبووکردنەوە، جگە لەداوای زەمانەتێکی نێودەوڵەتی بۆ ئەوەی جارێکی دی دەوڵەتی عێراق ئەو جۆرە تاوانانە دووبارە نەکاتەوە لە کوردستان.

**عەرعەر: بۆچی تاکو ئێستا پرۆژەیەکی گەورەی نەتەوەیی لە گۆڕێ نییە بۆ ئەوەی جینۆسایدی کورد بەشێوەی زانستی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت وەك ئەوەی جوەکان بۆ هۆڵۆکۆستیان کرد؟**

**د.نووری تاڵەبانی:** لەنیسانی 2002دا لە هەولێر کۆنفرانسێك سازکرا سەبارەت بە ئەنفال، یەکێك لەو پێشنیازانەی خستمە بەرچاو ئەو کۆنفرانسە دامەزراندنی دامەزراوەیەکی کوردستانی _ نێودەوڵەتی بوو، کە ئەرکی سەرەکی ناساندنی کارەساتی ئەنفال بێت بەرای گشتی لە ئەوروپاو ئەمریکا، پێش بەستنی ئەو کۆنفرانسە، لە ئەوروپا پەیوەندیمان بەچەند رێکخراوەیێکی مرۆڤ دۆست کرد بۆ ئەو مەبەستە، بەشێکیان ئامادەبوون هاوکاریمان بکەن، لەکۆنفراسەکەدا بریارێك بەو مانایە پەسەندکرا، بەڵام بریاری سەر کاغەز بوو، کارێکی جیددی بۆ جێبەجێکردنی نەکرا، لە کۆنفرانسێکی دیکەدا هەر لە هەولێر ساڵی پار بەسترا، هەمان ئەو داواکاریە خرایە بەرچاو، ئومێدەوارین لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کاری جیددی بۆ ناساندنی ئەو دوو تاوانە بکرێت.

**عەرعەر: ئایا لە پێش تاوانی ئەنفالو هەڵە بجە ئەو تاوانانەی تری حکومەتی عێراق بەرانبەر بەکوردو لە کوردستان ئەنجامدراون ئەچنە چوارچێوەی جینۆسایدەوە؟**

**د.نووری تاڵەبانی:** سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوك و ناوچە دابراوەکانی دیکەی کوردستان، لەگەڵ کوشتن وبەزۆر دەرکردنی دەیان هەزار خێزانی کوردی فەیلی دوو تاوانی گەورەن دەچنە خانەی جێنۆسایدەوە، کورد دەبێ بەفەرمی داوای ناساندنیان وەك جێنۆساید بکات، چاکترە بەبریارێکی پەرلەمانی کوردستان بێت لەگەڵ پشتگیریکردنی رێکخراوە مەدەنیەکان لەناوەوەو لە دەرەوەدا، داننان بەو دوو تاوانە وەك جێنۆساید دەبێتە هۆی ئەوە ئەو خەڵکانەی زیانیان لێکەتووە بەهۆی ئەو تاوانانەوە بتوانن داوای قەرەبووکردنەوە بکەن، لەساڵی 1998 بەزمانی عەرەبی نامیلکەیێکم بڵاوکردەوە، کە پاشتر لە بریتانیا کرایە ئینگلیزی، تێیدا هەرچوار تاوانی ئەنفال وبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و سیاسەتی بەعەرەبکردن و کوشتن ودەرکردنی دەیان هەزار خێزانی کوردی فەیلی بەتاوانی جێنۆساید دراونەتە قەڵەم، لەو دەمەوە دەبوو کار بۆ بەجێنۆساید ناساندنی ئەو چوار تاوانە گەورەیە بکرێت وبە بەڵگەوە بخرێنە بەرچاو رای گشتی و دەوڵەت و رێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان.

**عەرعەر: ئەو شێوە مامەڵەکردنەی کە عەرەبەکان لەگەڵ دۆزی جینۆسایدی کوردا دەیکەن بەوەی کە ئەنفال و هەڵە بجە هاوشێوەو هاوشانی تاوانەکانی تری دەوڵەتی عێراقە وەکو تاوانەکانی تر کە بەرانبەر شیعەکانو سونیەکان کراوە، ئایا ئەم مامەڵەکردنە چ گرفتێك دەخاتە بەردەم بە جینۆساید ناساندن و بە جیهانی ناساندنی ئەنفال و هەڵە بجەی کورد؟**

**د.نووری تاڵەبانی:** رژێمی بەعس تاوانی گەورەی دژ بەعەرەبی شیعەو سوونە كردووە، بەڵام هۆكاری جێبەجێ كردنیان سیاسی بووە نەك رەگەزیان، بەپێچەوانەوە، ئەو تاوانانەی دژ بەكورد كراون، بە مەبەستی لەناوبردنی گەلێك بووە بەپێی پلانێكی دارێژراو، رژێم داوای هاوكاری لەدەوڵەتانی دیكەش كردووەو چەند دەوڵەتێكی عەرەبی ژن ومنداڵی كوردیان وەك "غەنیمە" بەركەوتووە، لەئاداری 1999 لەیادی هەڵەبجەی شەهید كۆبوونەوەیەك لەناو پەرلەمانی بریتانیا سازكرا تێیدا بەناوی "رێكخراوی كورد بۆ مافی مرۆڤ لەبریتانیا" بابەتێكم پێشكەشكردو گوتم لە ساڵی 1988 سەرۆكی دەوڵەتێكی عەرەبی، كە ئێستاش سەرۆكە، سەردانی عێراقی كرد، لەكاتی گەرانەوەی لە فرۆكەخانەی نێودەوڵەتی بەغدا سەدام بەرێی دەكرد، یەكێك لەو رۆژنامەنووسانەی لەگەڵ ئەو سەرۆكە بوون پرسیاری لە سەدام كرد، ئایا راستە لەشكری عێراق چەكی كیمیاوی لە"گوندی" هەڵەبجە بەكارهێناوەو بووەتە هۆی كوشتنی خەڵكێكی زۆر، وەك رۆژنامەكانی رۆژئاوا بلاویان كردووەتەوە؟ ئەو سەرەك دەوڵەتە نەیهێشت سەدام وەلام بداتەوە، گوتی ئەو قسانە پرۆپاگەندەی سایۆنیزمن وبەمەبەستی شێواندنی ناوشوورەتی لەشكری عێراق بلاو دەكرێنەوە! هەر لەو ساڵەدا لەكوێت كۆنفرانسی دەوڵەتانی ئیسلامی بەسترا تێیدا باس لە خراپ مامەڵەكردنی موسلمانانی بولغاریا كرا، بەڵام كەسێك باسی بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی لە هەڵەبجە نەكرد، ناوبردنی كورد بەلای بەشێك لەو دەوڵەتانە بەتاوان تەماشاناكرێت، چونكە كار بۆ "جیاكردنەوەی" بەشێك لەخاكی عەرەب دەكەن!

**عەرعەر: ئەنفال و هەڵە بجە لە دوو دادگایی گەوردا و اە ئە نجومەنی نوێنەرانی عێراقیش وەكو جینۆساید دانی یاسایی پێدا نرا، سود و گەورەیی ئەم دوو سەلماندنە چیە بۆ پرسی ئەنفال و هەڵە بجەو دۆزی كورد لە جیهاندا؟ ئەكرێت كورد چۆن ئەم دوو دادگاییە بەكار بهێنێت؟**

**د.نووری تاڵەبانی:** داننان بەو دوو تاوانە لەلایەن دوو دامەزراوەی سەرەكی عێراقی، كە یەكێكیان دەسەلاتی دادوەریی یەو ئەوی دی دەسەلاتی قانووندانەرە (ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق) گرنگە بۆ كوردو ئەركی ناساندیان بەجێنۆساید لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی ئاسانكردووە، لەبەشی زۆری ئەو ولاتانەی تاوانی جێنۆساید كراون، حكومەتەكان نكوڵی لێ دەكەن، بۆ نموونە، لە توركیا ئێستاش دان بەقركردنی ئەرمەنەكان نانێت لەكاتی جەنگی جێهانی یەكەم، داننانی ئەو دوو دامەزراوە سەرەكیەی عێراق بە ئەنفال و بە بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی لە هەڵەبجە ئەركی كوردی ئاسانكردووە، گەر كارێكی جیدی بكرێت چەندین دەوڵەت و رێكخراوی نێو دەوڵەتی و هەتا نەتەوە یەكگرتووەكان ئەنفال و بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی لەهەڵەبجە بە جێنۆساید دەناسن، دەبێ نكوڵی لەوەنەكرێت كە كوردی خۆفرۆشی هەبووەو بەشداریان لەو تاوانە گەورانە كردووە، بەبۆنەی ناساندنی ئەنفال بە جێنۆساید لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق وەزارەتی شەهیدان و وئەنفالكراوەكان ساڵی پار مێزگردێكی بۆ زیاتر لە 40 شارەزای كوردی رێكخست، بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ئەو بریارە، یەكێك

لەبەشداربووان کە ئەندامی لیستی هاوپەیمانی کوردستانیە لەناو ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق راشکاوانە گوتی نابێ باسی بەشداری کردنی کورد لە ئەنفال بکرێت، بەبیانگەی ئەوە زەرەر بەو مەسەلەیە دەگەێنێ! بەداخەوە کەسێك پێش من وەلامی نەدایەوە، بەبۆچوونی من لەبەرئەوەی کورد هەمیشە ژێردەستە بووە، کەسانێك هەتا لە میرو گەورەپیاوانیش جاروبار هاوکاری داگیرکەرانی کوردستانیان کردووە، چاکترە خۆمان باسی ئەو دیاردە بکەین، لە سالی 1965 خوێندکاربوم لە زانکۆی سۆربۆن لە فەرەنسا، بەبۆنەی تێپەربوونی (50) سال بەسەر قرکردنی ئەرمەنەکان لە تورکیا، رێکخراوەکانی ئەرمەن لە ئەوروپاو ئەمریکا چەندین چالاکی و خۆپیشاندان وکۆبوونەوەیان رێکخست بەبۆنەی ئەو تاوانەوە، سەرۆکی مەلبەندی فەرەنسی – ئەرمەنی لە شاری (لیۆن) نووسینێکی لە رۆژنامەی (لیبێراسیۆن)ی فەرەنسی بلاوکردەوە تێیدا، پاش ئەوەی بە دۆکیمەنەت رووناکی خستبووە سەر ئەو تاوانانەی لەلایەن لەشکری عوسمانیەوە دژ بە ئەرمەنەکان کرابوون، نووسیبوی کوردەکانیش بەشداریان لەو تاوانە کردووە، نامەێکم بەهۆی ئەو رۆژنامەوە بۆ نووسەری ئەو بابەتە نارد، تێیدا سەرەتا سەرەخۆشیم لێ کردبوو لەگەل مەحکومکردنی ئەو تاوانەی دژ بەگەلی ئەرمەن کرابوو، بەلام بۆم نوسیبوو چۆن دەبێ هەموو کورد بەئەنجامدانی ئەو تاوانە گەورەیە بداتە قەلەم، لەکاتێکدا ئەو کوردانەی هاوکاری لەشکری عوسمانیان کردبوو چەند کەسێك بوون لەپێناو دەستگرتن بەسەر سامان و زەویی ئەو ئەرمەنانە، کوردێکی زۆریش هاوکاری ئەرمەنەکانی کردبوو بەشاردنەوەیان، هەر لەو نامەدا نوسیبووم لەکوردستانی عێراق پێشمەرگە شەری داکۆکیکردن لەکورد دەکات، لەهەمانکاتدا هەزاران خۆفرۆشی کورد شان بەشانی دوژمن گوللە دەنێنە سنگی پێشمەرگەوە، لە وەلامدانەوەدا نووسەری ئەو مەقالە نامەێکی جوانی بۆ ناردم لەگەل کارتێکی شەرەف بۆ بەشداریکردن لە گەورەترین ئاهەنگ کە لە پاریس بەسترا لەژێر چاودێری سەرۆکی شارەوانی پاریس، نووسەری ئەو مەقالە بابەتێکی لە ئاهەنگەکەدا پێشکەشکرد تێیدا، لەجیاتی باسکردنی بەشداریکردنی کورد لە قەتلوعامکردنی ئەرمەنەکان، گوتی پاش ئەوەی لەشکری عوسمانی لەقرکردنی ئەرمەنەکان بووەوە، دەستی کرد بە کوشتنی کوردەکان! کوردی خۆفرۆش هەبووەو دەمێنێت، جێگای داخە بەشێك لەوانەی بەهەموو شێوەیەك لەخزمەتی بەعسدا بوون، ئێستا لەپێشەوەن هەرچەندە خەلك وەك جاران تەماشایان دەکات هەرچییەك بێت پلەو پایەی ئێستایان.

**عەرعەر: هەرچەندە بریاری لە سێدارەدانی تاوانبارنی ئەنفال دەرچووە بەلام تا ئێستا ئەم بریارە جێبەجێ نەکراوە، تۆ وەك یاساناسێك و سیاسیەك هۆکار و دەرئە نجامی ئەمە چۆن شرۆڤە دەکەین؟**

**د.نووری تالەبانی:** بەبۆچوونی من هۆکاری جێبەجێ نەکردنی بریاری لەسێدارەدانی ئەو تاوەنبارانە سیاسیە نەك قانوونی، سەدام وچەند تاوانبارێکی دیکە وەك براکەی وتەها جەزراوی

بە پەلە لەسێدارەدران، دەبوو بەپێی هەمان قانوون ئەو کەسانەی حوکمی لەسێدارەدانیان بەسەردا براوەتەوە، جێبەجێ بکرێت.

**دکتۆر نوری تاڵەبانی لە چەند دێڕێکدا**

*لە کەرکوک لە دایك بووە، لە 1968دا دکتۆرای لە قانوون دا لە زانکۆی پاریس وەرگرتووە.

*کتێبی (نیکیتین)ی لە فەرەنسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی. لە 1974دا فەرهەنگێکی قانوونی لە لەندەن ئامادەکردووە.

*لەپاش ڕاپەرینی 1991دا ئەندامی "دەستەی قانوونی باڵای کوردستان "بووەو لە 1992دا یەکەم پرۆژەی دەستووری بۆ هەرێمی کوردستان ئامادەکردووە.

*چەندەها کتێب و لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی لەسەر سیاسەتی بە عەرەبکردنی ناوچەی کەرکوك بڵاوکردووەتەوە

*ئەندامێکی سەربەخۆی پەرلەمانی کوردستانە.



### فەرید ئەسەسەرد:

## لەناو کورددا کەسانێك هەن پێیان وایە سوڵتان هاشم شایستەی ئیعدامکردن نییە

**ئا: شاهۆ غەفور**

**لە ئان و ساتی نزیکبونەوەی بیست و یەکەمین ساڵرۆژی شاڵاوەکانی ئەنفال و تێپەڕبونی دادگایی تاوانباران و جێبەجێ نەکردنی بڕیارەکانی دادگای باڵای تاوانەکانی عیراق بەسەر تاوانبارانی ئەو دۆسێیەدا، لەگەڵ چۆنێتی کارکردن بۆ زیاتر ناساندنی ئەم تاوانە لەسەرئاستی عیراق و ناوچەکەو جیهان و بەکارهێنانی دۆسێی ئەنفال وەك وەسیلەیەك بۆ دروستکردنی دەوڵەت و چەند لایەنێکی تری دۆسییەی ئەنفال ، گۆڤاری عەرعەرچەند پرسیارێکی ئاراستەی فەرید ئەسەسەرد سەرۆکی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان کرد.**

**عەرعەر: ئەکرێت ئەنفال بکرێت بە روداوێکی نێودەوڵەتی، یاخود گەورەیی روداوەکە قابیلییەتی ئەوەی هەیە لە ئاستی دنیادا بناسرێت؟**

ئەسەسەرد: دەرفەتێك هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، بەڵام لەهەمان کاتدا تەگەرەی زۆری لەبەردەم دایە، یەکێك لە گرنگترین تەگەرەکان ئەوەیە ئەم روداوە ئیهانەیەکی تێدایە بۆ نەتەوەیەکی گەورە کە نەتەوەی عەرەبە، لەبەر ئەوە بە دڵنیاییەوە وەکو چۆن تا ئێستا تورکەکان دان بە جینۆسایدی ئەرمەندا نانێن، پێیان وایە ئەمە لەکەیەکە لە مێژووی ئەواندا ئەگەر دانی پێدانێن، دژایەتی هەموو ئەو لایەنانەش دەکەن کە دان بە جینۆسایدی ئەرمەندا دەنێن. عەرەبەکانیش بەهەمان شێوە هەرچەندە خۆیشیان بەتایبەتی لە عیراق هەنگاوی زۆر گرنگیان ناوە، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە ئەنجامدەرانی ئەو تاوانەیان دادگایی کرد، بەڵام لانی کەم بە نیسبەت عەرەبەکانی دەرەوەی عیراق کە پێیان ناخۆشە ئەمە وەك تاوانێکی گەورە بەرامبەر

كورد بناسرێت. مەسەلەكە بەبۆچونی من پەیوەندی بە شۆڤێنیزمەوە نییە، پەیوەندی بە رێزی گەل بۆخۆی هەیە كە حەزناكات مێژووی شتی لەم بابەتەی تێدا بێت،. بە نیسبەت ئەوروپییەكان ئەمان توانیان ئەو مەسەلەیە تێپەڕێنن بەوەی كە داوای لێبوردنیان لە جولەكە كردو ویستیان قەرەبویان بۆ بكەنەوە كە خۆیان ببونە هۆی دروستكردنی بەرامبەر جولەكە، بەڵام گەلێكی پێشكەوتوو ئەو هەڵوێستە دەنوێنێت، بە نیسبەت گەلانی دواكەوتووو هێشتا زۆر زەحمەتە بگەنە ئەو ئاستەی كە گەلانی ئەوروپا پێی گەیشتون، بۆ نمونە گەلی تورك یەكێك لە گەلە پێشكەوتووەكانی رۆژهەڵاتی ناوەراستە ئێستەش قبوڵی ئەوە ناكات كە وەكو گەلێكی ئەنجامدەری جینۆساید دژی گەلێكی بچوك بناسرێت لە جیهاند، من پێم وایە عەرەبەكانیش لەم روانگەیەوە سەیری مەسەلەكە دەكەن، من مەسەلەكە جیائەكەمەوە لە مەسەلەی شۆڤێنیزم ئەوەی توركیش پەیوەندی بە شۆڤێنیزمەوە نییەو ئەوەی عەرەبیش بەهەمان شێوە. زیاتر پەیوەندی بە رێزی گەل بۆ رابردوی خۆی هەیە، بۆ نمونە ئێمەی كوردیش هەندێك كردەوەمان كردووە كە پێم وایە مایەی شەرمەزارییە بەرامبەر گەلانی بچوكتر بەتایبەتی بەرامبەر ئاشورییەكانو مەسیحییەكانو تەنانەت بەرامبەر كوردە ئیزیدییەكان كە ئێمە بە كەمترین شێوە باسی ئەكەینو هەوڵ ئەدەین رابردوی خۆمان بەپاكی نیشانی نەوەكانی ئێستەو داهاتوو بدەین، عەرەبەكانیش بەهەمان شێوە.

**عەرعەر: ئەوەی كە باستان كرد لەسەر ئاستی عیراق بوو، ئایا سیاسییەكانی كوردە كە نەیانویستووە یان نەیانتوانیوە ئەم كارەساتە لەسەر ئاستی دونیا بناسێنن یان دەسەڵاتە زلهێزەكانی دنیایە رێگرییان كردووە؟**

ئەسەسەرد: مەسەلەكە مەسەلەی ویست نییە، ئێمە حەزدەكەین ئەنفالو هەڵەبجە بەهەموو دونیا بناسێنین تەنانەت ئەگەر دەرفەت هەبێت بیكەینە یادێكی جیهانی، بەڵام ئەوە ویستی ئێمەیە مەرج نییە ویستی هەندەران بەهەمان شێوەی ویستی ئێمە بێت، جگەلەوەی كە ئەمە پێویستی بەكاركردنێكی زۆرە، ئەمە لەلایەك، لەلایەكی تر ئەمە راستە پرۆپاگەنددەیەكی زۆرە بۆ مەسەلەی كوردو بۆ ئەو ستەمەی كە لێی كراوە، بەڵام لە روی مادییەوە قازانجێكی زۆری بۆ مەسەلەی كورد نییە، ئێمە بەوجۆرە سەیری دەكەین كە ئەمە رەنگە مەسەلەی كورد بەجیهان بناسێنێت، راستە ئەمە بەڵگەی ئەوەیە كە گەلی كورد ستەمێكی گەورەی لە چوارچێوەی عیراقدا لێكراوە، بەڵام لە روی مادییەوە تەنانەت لە روی مەعنەویشەوە شتێكی زۆر گەورەی لێناكەوێتەوە، ئێمە زۆر تەركیز دەكەینە سەر ئەنجومەنی جولەكە لەگەڵ ئەڵمانیا زۆربەی كات دەمانەوێت ئێمەش بەهەمان شێوەی جولەكە كەلەگەڵ ئەڵمانیا كردی ئێمەش لەگەڵ عیراقییەكانو لەگەڵ عەرەب بیكەین، ئەمە شتێكی جیاوازبوو، چونكە ئەڵمانیا زلهێزێكی گەورەی دۆڕاوبوو ئەڵمانیایەكی تر پاش ئەو دامەزرا، جگەلەوەی بەرژەوەندی زلهێزەكانی پاش جەنگی دووەمی جیهان لەوەدابوو كە مەسەلەی هۆڵۆكۆست گەورە بكەن بۆ ئەوەی بیكەنە بیانویەك بۆ پەرەدان بە دروستكردنی دەوڵەتی ئیسرائیل، من مەبەستم ئەوەیە پرۆژەی هۆڵۆكۆست یان پرۆژەی گەورەكردنو

ناساندنی هۆلۆکۆست پرۆژەیەك بوو کەلەگەڵ بەرژەوەندی زلهێزە کانی دنیادا ئەگونجا، ئەوەی ئێمە بەداخەوە بەو جۆرە نییە کە لەگەڵ بەرژەوەندی زلهێزەکانی دونیاو ناوچەکەدا بگونجێ، لەبەر ئەوە بەراوردکردنەکەش دەبێتە بەراورد کردنێکی خراپ.

**عەرعەر: کەواتە ئەگەر پۆلێنێك بۆ ئەو کارە جینۆسایدیانە کەلە جیهاندا ئەنجامدراون بکەین دروستە هۆلۆکۆست و ئەرمەن و ئەنفال لەیەك خانەدا دابنێین؟**

ئەسەسەرد: بەڵی دەکرێت، بەڵام ئەوەی کە تۆ دەیلێیت کارێکی ئەکادیمییە یاخود کارێکی زانستییە، ئێمە لەم رووەوە ئەتوانین زۆر سەرکەوتوو بین، بەڵام نێودەوڵەتی کردنی مەسەلەکە کارێکی ئەستەمە، هەرچەندە کارێکی مەحاڵ نییەو ئەکرێت لەسەر ئەم ئاستە کار بکرێت، بەڵام کارێکی هەروا ئاسان نییە کە ئێمە بیری لێئەکەینەوە، چونکە ئەمە بێتە ناو کایەی نێودەوڵەتان بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش رۆڵی خۆیان دەگێرن، بەڵام ئەگەر ئێمە بیخەینە ناو کایەی زانستیو ئەکادیمییەوە لەو روانگەیەوە ئەتوانین لەسەر مەودای دور کاربکەین بۆئەوەی کە بچێتە ناو کایەی نێودەوڵەتییەوە.

**عەرعەر: لە ناوخۆی عیراقدا ئەو دۆسێیانەی کە دانیشتنی دادگای باڵای تاوانەکانی عیراقی لەسەر کراوە، دۆسێی ئەنفالو دۆسێ کوردییەکانی تر بەبەراورد بە دۆسێ کانی دوجەیلو رۆژی هەینیو بازرگانەکان جۆرێك لە ساردی پێوە دیاربوو، ئایا دەسەلاتێکی سیاسی بەبەرنامە ئەمەی کرد یان کەناڵەکانی راگەیاندن لە عیراق نەیانتوانی بە رۆڵی خۆیان هەستن؟**

ئەسەسەرد: ساردو سڕییەکە رەنگە پەیوەندی بە راگەیاندنەوە هەبێت، بەڵام وەکو ئیجرائاتی دادگا هەمووی بەشێوەی ئسولی دادگاییکردن بەڕێوەچووە.

**عەرعەر: ریزبەندی دۆسێکانیش لە دادگای باڵای تاوانەکان لە عیراق هەر بە بێ بەرنامەی سیاسی بوو؟**

ئەسەسەرد: نا، کاتی خۆی باس لەوە کرا کە ئەنفالو ئەوانە پێشبخرێن، بەڵام کورد زۆری پێباش نەبوو، ویستی دۆسێکانی تر پێشبخرێن، ئێمە خۆمان پێمان باش نەبوو لە شتێکەوە دەست پێبکات کە پەیوەندی بە کوردەوە هەبێت، تەنانەت ئێمە لای خۆیشمان لە سلێمانی بیرمان لەوە کردەوە کە ئێمە لەباتی ئەوەی تەنها ئەم مەسەلەیە بوروژێنین، مەسەلەی کوشتنی بەعسییەکانیش لە ساڵی 1980 بوروژێنین، کە سەدام بەشێکی زۆری لێ کوشتن، بۆ ئەوەی کە دادگا وا خۆی پیشان بدات کە تەنها بەرگری لە کوردو شیعە ناکات، بەڵکو بەرگری لە خودی بەعسییەکانیش دەکات کەبەدەستی سەدام کوژراون، مەسەلەکە مەسەلەیەکی سیاسی بووە.

**عەرعەر: بۆ راگەیاندنەکانی عیراق نەیانتوانیوە ئەم دانیشتنانەی دادگا وەکو خۆی بگوازنەوەو وەکو پێویست قسەی لەسەر بکەن؟**

ئەسەسەرد: ئەمە پەیوەندی بە کەناڵەکانەوە هەیە، دادگاییەکان بە ئاشکرا هەمووی بڵاو دەکرێنەوە، وەکو چۆن هەر هاوڵاتییەك مافی ئەوەی هەیە لە تەلەفیزیۆن سەیری کام کەناڵە بکات، هەر کەناڵێکی راگەیاندنیش مافی ئەوەی هەیە هیچی لەبارەیەوە بڵاو نەکاتەوە، لەهەمان

کاتیشدا مافی ئەوەی هەیە هەموو شتێکی لەبارەوە بلاّو بکاتەوە، لەهەمان کاتیشدا مافی ئەوەی هەیە کە هەموو شتێك دەربارەی بلاّوبکاتەوە، ئەمە ئەوەستێتە سەر سیاسەتی کەناڵەکە خۆی، ئێمە ناتوانین کەناڵێك یان رۆژنامەیەك ناچار بکەین کە بایەخ بەو دادگاییانە بدات، بۆ نمونە ئەوەندەی ئێمە بایەخمان بە مەسەلەی هەڵەبجەو ئەنفال داوە ئەوەندە بایەخمان بە مەسەلەی دوجەیلو بازرگانەکان نەداوە، لەبەر ئەوەیە ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە، شیعەکانیش ئەوەندەی بایەخیان بە دوجەیل داوە ئەوەندە بایەخیان بە ئەنفال نەداوە، ئەوەستێتە سەر لایەنەکان کە چی مەسەلەیەك زیاتر جێگەی سرنج راکێشانیانە.

**عەرعەر: ئەگەر دوای هەڵبژاردنەکانی داهاتوی عیراق نوێنەری کورد لە پۆستە سیادییەکان کەم بۆوە، واتە دەسەلاّتو هە یمەنەی کورد بەبەراورد بە ئێستە کەم بۆوە باسو خواس لەسەر ئەنفال لە عیراقدا بە کوێ دەگاو لە کوێدا دەوەستێت؟**

ئەسەسەرد: من پێم وایە کورد پاشەکشە ناکات لە وەرگرتنی پۆستە سیادییەکان، بەلاّم رەنگە پاشەکشە بکات لە ئەولەوییەتی ئەو پۆستانە، بۆنمونە لە ناو پۆستە سیادییەکاندا سیٚ پۆستی زۆر گرنگ هەیە، سەرکۆمارو سەرۆك وەزیرانو سەرۆکی پەرلەمان، بەلاّم ئەم سیانە دوانیان پەیوەندی بە دەسەلاّتی راپەڕاندنەوە هەیە کە لەبەرچاوترو گرنگترە، ئەویش پۆستی سەرۆك کۆمارو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە، ئەوەی تیان کە پۆستی سەرۆکی پەرلەمانە بەپلەی سێیەم دێت، ئێمە لەو سیانە یەکێکمان هەر بەرئەکەوێت، بەلاّم بەبۆچونی من ئێمە ئەمساڵ رەنگە پۆستی سەرۆك کۆمارمان بەر نەکەوێت، چونکە ئەوان زۆرینەی دانیشتوانن، ئێمە رەنگە تەنها پۆستی سەرۆکی پەرلەمانمان پێببردرێت. مەبەستم ئەوەیە لە پۆستە سیادییەکاندا یەکێکمان هەر بەردەکەوێت، بەلاّم لە ریزبەندییەکەدا رەنگە نەتوانین یەکێك لەو دوو پۆستە گرنگەمان بەرکەوێت، بەلاّم رەنگە دیسان لە وەزارەتە گرنگەکان رەنگە جارێکیتر وەزارەتێکی گرنگی وەکوو وەزارەتی دەرەوەمان دەست نەکەوێت لەهەمان کاتدا دەتوانین وەزارەتی لەئاستی ئەو گرنگمان دەست کەوێت. کە ئەویش هەر وەزارەتی سیادییە، خاڵێکیتریش هەیە کە هەندێك گۆڕانکاری هەیە لە 2009وە دەستپێدەکات پاش هەڵبژاردنەکە، ئەویش ئەوەیە کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بە کردەوە نامێنێتو وشەی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لە دەستوردا ئەسرێتەوە، چونکە دەستەوتژەکە کاتییە، ئەوەی کە ئێستە هەیە ئەنجومەنێکە مافی ڤیتۆی هەیە، ئەگەر سەرۆك کۆمار لەگەڵ یەکێك لە جێگرانی رەزامەندبوون لەسەر مەسەلەیەك، بەلاّم جێگرەکەی تر رەزامەندی پیشان نەدا، بڕیارەکە پەکی ئەکەوێت، بەلاّم لە دوای هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری تازە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نامێنێت، ئەوەی ئەمێنێتەوە وشەی سەرۆك کۆمار جێگەی دەگرێتەوەو ئەو کاتە ڤیتۆ نامێنێت.

بەبۆچونی من سەرۆك کۆماری داهاتوو کەسێکی سونەیە ئەو کاتە دوو جێگرەکەی شیعەیەكو کوردێك دەبێت، بەلاّم کوردو شیعەکە مافی ڤیتۆیان نامێنێت، ئەو کاتە پۆستەکەی ئەوان

پۆستی جێگرییە نەك پۆستێك كە هاوتای سەرۆكە، سەبارەت بە ئەسڵی پرسیارەكە، ئێستە دۆسییەی ئەنفال لەسەر سكەی خۆیەتیو دراوە بە دادگا، هەر شتێكیش كە درا بە دادگا دەبێت بێدەنگ بیت تا بڕیارەكە دەردەچێت.

**عەرعەر: بەلاّم ئێستە چەندین دانیشتنی دادگایی لەسەر ئەو دۆسییەیە بەڕێوەچووەو دادگاش بڕیاری خۆی بەسەر ئەنجامدەرانی ئەنفالدا داوە ؟**

ئەسەسەرد: بەلاّم دادگا تەنها بڕیار دەردەكات جێبەجێی ناكات لایەنی تر هەیە جێبەجێی دەكەن كە دەسەلاّتی راپەڕاندنە، كەسێكی وەكو عەلی حەسەن مەجید چەند جارە بڕیاری لەسێدارە دانی دراوە، قەلاّم نەكراوە، دەبوایە ئێستە لەسەر ئەم دۆسێیانە دادگایی نەكرایەو ئیعدام بكرایە مەسەلەكە كۆتایی بهاتایە.

**عەرعەر: بۆ ناكرێت؟**

ئەسەسەرد: ئەم مەسەلەیە كە تێكەڵبووە بە مەسەلەی ئاشتبونەوەی نیشتیمانیو مەسەلەی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەك بۆ كێشەكانی نێوان سێ گروپەكەی عیراق.

**عەرعەر: بەلاّم ئێستە نەكراوە كە ئێمە پۆستی بالاّمان لە هەرسێ دەسەلاّتەكەی دەوڵەتدا هەیە، من ئەو مەترسییەم لا هەیە كە ئەگەر دوای ئێستە دەسەلاّتی سەرۆك كۆمار لای كورد نەبوو، مافی ڤیتۆ لە جێگرەكان سەندرایەوە دۆسێی ئەنفال ئەكرێت بڵێین ون دەبێت یان چی لێدێت؟**

ئەسەسەرد: نا، ون نابێت ئەمە بڕیارێكی دادگایە، بڕیاری دادگا هەر دەبێت جێبەجێبكرێت، مەگەر دەستور خاڵێكی تێدابێت ماف بدات بە سەرۆك كۆمار یان سەرۆك وەزیران كە لێبوردن بۆ ئەو كەسانە دەربكات، یاخودحوكمەكەیان سوكتر بكات لە ئیعدام، بەلاّم ئەمانە هەر دەبێت سزا بدرێن، مافی لێخۆشبون بۆ ئەم كەسانە نییە، چونكە ئەمە مەسەلەی جینۆسایدە، لە هەموو دنیادا بەتایبەتی لای ئەوروپییەكانەوە گوشارێكی زۆر لەسەر عیراق هەیە تاوەكو سزای لەسێدارەدان نەهێلێت، بەلاّم تائێستە عیراقییەكان بەرگەیان گرتووە نایانەوێت مل بنێن بۆ ئەو گوشارە، مەسەلەكەش ئەمان لەو روانگەوە سەیری دەكەن كە ئەمە شتێكە پەیوەندی بە ئاینەوە، چونكە ئاین رێگەی بە لەسێدارەدان داوە، بەتایبەتی شیعەو سونە لەو روانگەیەوە سەیری مەسەلەكە دەكەن، رەنگە لەناو كورددا هەبێت یان لەناو دیموكراتو عەلمانییەكاندا هەبێت، كە لەروانگەی مرۆڤایەتییەوە سەیری مەسەلەكە بكەن، بەلاّم لایەنی تر هەیە لە روانگەی دینییەوە سەیری مەسەلەكە دەكەن.

**عەرعەر: بەلاّم كە دادگا بڕیاری لەسێدارەدانو سزادانی ئەو كەسانەی دا كاتەكەشی بۆ دیاریكرد؟**

ئەسەسەرد: راستە ئەمە مەسەلەیەكی گەورەیە لە عیراقدا، بەلاّم ئەمە دەستی كوردیشی تێدایە، ئێمە خۆشمان هەندێك تێڕوانینی خۆمان هەیە سەبارەت بەو كەسانەی دراونەتە دادگا، یەكێك لەوانە (سوڵتان هاشم)ە كە لەناو كورددا كەسانێك هەن پێیان وایە ئەم كەسە شایستەی

ئیعدامکردن نییە، من وردەکاری مەسەلەکە نازانم، نازانم شایستەی ئیعدامکردنە یان نا، بەلاّم ئەم بۆچونە لەناو کوردیشدا هەیەو لەهەمان کاتیشدا تێکەڵبووە بەهەندێك مەسەلەی سیاسی.

**عەرعەر: کەواتە دەسەلاّتی سیاسی بەسەر دەسەلاّتی دادگادا زاڵە؟**

ئەسەسەرد: بەڵێ وایە، ئەمە جگە لەوەی رۆڵی ئەمریکییەکانیش لەم مەسەلەیەدا هەیە، چونکە بۆنمونە سوڵتان هاشم کە خۆی بەدەستەوە داو ئەشیتوانی خۆی بەدەستەوە نەداتو نەشگیراوە، ئەم بەڵێنێکی وەرگرتبوو کە دادگایی ئەکرێت، بەلاّم دادگاییەکەی ناگاتە ڕادەی سزادانی، ئەمە ئەوەندەی من بزانم ئەمریکییەکان بەڵێنی لەو جۆرەیان پێدابوو، لەبەر ئەوە بەشێك لەو گوشارانە پەیوەندی بە ئەمریکییەکانەوە هەیە.

**عەرعەر: بە بۆچونی تۆ سیاسییەکانی کورد ئەوانەی لە دەسەلاّتدانو ئەوانەشی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی شارەزاییەکی تەواویان هەیە چی بکەن بۆ ئەوەی سود لە دۆسییەی ئەنفال وەربگرن بۆ دۆسییەی کوردو بتوانن وەکوو وەسیلەیەك بەکاری بهێنن بۆ دروستکردنی دەوڵەت، هەروەك جولەکەکان کردیان؟**

ئەسەسەرد: من ئەڵێم ئەزمونی هۆڵۆکۆست دووبارە نابێتەوە، ئیسرائیل سودی لە تاوانەکانی هۆڵۆکۆست وەرگرت بۆ ناساندنی رەوایی خۆی، پێم وایە ئێمە ئەوەمان پێناکرێت، چونکە لەهەموو حاڵەتێکدا ئیسرائیل تەنها پشتی بە هۆڵۆکۆست نەبەستبوو پێش ئەوە پشتی بە بەلێنی بەلفۆر بەستبوو، پشتی بە سێ زلهێزی جیهان بەستبوو کە بریتیبوون لە ئەمریکاو بەریتانیاو یەکێتی سۆڤییەت، ئەمانە رۆڵی گرنگیان هەبوو لە مەسەلەی دامەزراندنی ئیسرائیل نەك مەسەلەی هۆڵۆکۆست، بەلاّم هۆڵۆکۆست فاکتەرێکی یارمەتیدەربوو بۆ ناساندنی مەسەلەی جولەکەو دۆزینەوەی بیانوویەکی ئەخلاقی بۆ هەوڵدان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك بۆ ئەو گەلەی کە فاشیزم هەوڵی لەناوبردنی داوە، بەداخەوە ئەم بیانووە ئەخلاقییە ئێستە لەئارادا نییە، دەوڵەتەکان ناتوانن وە ناشیانەوێت ئەنفال بکەنە بیانوویەك بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ کورد، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە جولەکە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتی ئیسرائیل دەدات وە هەوڵی جدیشی بۆ کردبوو، ئێمە تائێستا بەجدی کارمان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کورد نەکردووە، حۆشمان داوای دەوڵەتی کوردیمان نەکردووە، لەبەر ئەوە خۆمان داوای نەکەین کەسیش باسی ناکات، واتە جیاوازی ئێمەو جولەکە ئەوەیە کە جولەکە هەوڵی خۆی خستەگەڕو توانی سود لە دەوڵەتان وەربگرێت، بەلاّم ئێمە تا ئێستا هەوڵی خۆمان نەخستۆتە گەڕو هەوڵی بەدەستهێنانی پشتگیری جیهانیشمان نەداوە. ئەوەی کە لێرە باسی مەسەلەی کورد دەکرێت زیاتر بۆ وروژاندنی شەقامە، بەلاّم پرۆژەیەکی رەسمی لەلایەن کاربەدەستانی هەرێمەوە بۆ کارکردن بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی تا ئێستا نییە.

**عەرعەر: ئایا ئەو مەسەلەیە گونجاو نییە یان کاربەدەستانی هەرێم بە گونجاوی نازانن، یاخود لە بنەرەتدا کورد قابیلییەتی ئەوەی نییە دەوڵەتی هەبێت؟**

ئەسەسەرد: پەیوەندی بە کۆمەڵێك فاکتەرەوە هەیە، ئەوەی کە ئێمە هەمووجار زیاتر پشت بە مافی چارەی خۆنوسین دەبەستین، من پێم ناخۆشە وابڵێم بەلاَم مافی چارەی خۆنوسین لەروی یاسای نێودەوڵتییەوە ئێمە ناگرێتەوە، ئەوەی زیاتر ئێمە دەگرێتەوە یەکپارچەیی خاکی عیراقە، ئێمە دەتوانین لە دوو دۆخدا مافی چارەی خۆنوسین بە شێوە جیابونەوە وەربگرین، یەکێکیان ڕەزامەندی عیراق خۆی، دووەمیشیان بەرەزامەندی ناوچەکە، بەبێ ئەم دوو ڕەزامەندییە ئێمە ناتوانین لە عیراقدا جیاببینەوە، ئەمەش پەیوەندی بە گۆڕینی عەقلییەتی عیراقییەکانی ناوچەکە هەیە، ئەمەش مەسەلەیەکە کاتی ئەبێت، بۆنمونە ئەگەر عیراقییەکان گەلێکی ئەوروپی بوونایە ئاسانتر دەبوو وەك لەوەی لە گەلێکی دواکەوتوو داوابکرێت، ئەمە کاتی ئەبێت وە پێم وایە ئەوەی ئێمە بەختەوەرە بەوەی کە شتێکی بنیات ناوە وە شتێکی تریش بۆ ئەوەی داهاتوو بەجێ دێڵێ ئەوەی داهاتوو خۆی بڕیار بۆ ئەوە دادەنێت ئایا بە گونجاوی دەزانێت دەوڵەت دروستبکات‌و کار بۆ ئەوە بکات یاخود بەگونجاوتری بزانێت لە چوارچێوەی عیراقدا بمێنێتەوە، چونکە لەهەموو بارودۆخێکدا مەرج نییە ئەوە داهاتوو وەکوو ئێمە بیر بکاتەوە‌و بەتەنگ مەسەلەی دەوڵەتەوە بێت، ئێمە چونکە کارەساتی ئەنفال‌و هەڵەبجە‌و جینۆسایدو ناخۆشی‌و نەهامەتییەکی زۆرمان بینیوە لەبەر ئەوە خەونی ئێمە دروستکردنی دەوڵەتە، بەلاَم بەهۆی ئەمەوە ئێمە چەندین گرێ‌و گۆڵە لە دەرونماندا هەیە بەلاَم پێم وایە نەوەی داهاتوو ئەو گرێ‌و گۆلاَنەی نابێت‌و لەگەڵ عیراقییەکان‌و لەگەڵ ناوچەکەدا، ئەو کاتە سیاسەت بەرامبەر بە ئابوری پاشەکشە دەکات، ئێمە تا ئێستا بیر لە مەسەلەی ئابوری ناکەینەوە، زیاتر بیر لە مەسەلەی سیاسەت دەکەینەوە، بەلاَم بزوێنەری نەوەی داهاتوو سیاسەت نییە، بەڵکو ئابورییە، لەبەر ئەوە من گرەوم لەسەر ئەوەیە کە ئەوەی داهاتوو وەکو ئێمە نابێت‌و زۆر بەتەنگ مەسەلەی دەوڵەتەوە نابێت، مەسەلەی دەوڵەت وردەوردە لەسەر ئاستی جیهان پاشەکشەدەکات، تەنانەت لە ناو ئەوروپییەکان پێش ئەوەی یەکێتی ئەوروپا دابمەزرێت بۆچونێکی واهەبوو کە هەموو ئەوروپا بکرێتە یەك دەوڵەت، بەلاَم دەوڵەتێك بێت لەباتی کۆنفیدراسیۆنێکی گەورە، خۆیان بەمە رازی نەبوون‌و ویستیان ئەم هەلومەرجەی ئێستا بمێنێت بەلاَم مەرج نییە ئەوروپییەکانی 50 ساڵی داهاتوو بەم پرۆسەی فیدراسیۆنکردنی ئەوروپا رازی نەبن.

**عەرعەر: بەلاَم کاك فەرید پێت وانییە بەر لە ئێمە‌و هەر کەسێکی تر ئەرکی ئێوەیە وەك سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی لێکۆڵینەوەی جدی لەم بوارەدا بکەن لەسەر ئاستی ناوخۆ‌و دەرەوە؟**

ئەسەسەرد: ئێمە زیاتر بایەخ بەو کێشانە دەدەین کە ئێستا لەئارادایە، لەو روانگەیەوە سەیری مەسەلەکان دەکەین کە ئەو کێشانە چەند کاریگەرییەکی خراپ یان باشی دەبێت، بەلاَم دانانی پرۆژە بۆ ئایندە ئەمە ئەرکی ئێمە نییە ئەرکی سیاسەتمەدارانە کە پرۆژە دابنێن‌و کار بۆ پرۆژەکان بکەن، ئێمە دەزگایەکی راوێژکارین تەنها مەسەلەکان‌و رای خۆمان دەربارەی مەسەلەکان دەردەبڕین.

**عەرعەر: ئێوە رای خۆتان هەیە لەسەر ئەوەی ئەنفال چۆن بکرێت بە کارەساتێکی نێودەوڵەتی؟**

ئەسەسەرد: نا چونکە ئەو مەسەلەیە زیاتر پەیوەندی بە حکومەتەوە هەیە، ئەمە حکومەت ئەبێت بەرنامەیەکی بۆ دابنێت.

**عەرعەر: ئەو جۆرە یادکردنەوانەی کە بەشێوەیەکی رۆتینی ساڵانە دەکرێتەوەو کۆمەڵێك دروشمی تیادا دەوترێت، ئایا قازانج بەمەسەلەکە دەکات؟**

ئەسەسەرد: ئەمە ئەقڵێکی جەمعی هەیە، ئەم جۆرە یادکردنەوانە رۆڵی گرنگی هەیە لە دروستکردنی نەتەوە، چونککە ئەمە بیرەوەرییەکی نەتەوەییەو میتۆدی بیرکردنەوە بۆ ئەم گەلە دروست دەکاتو یەکێکە لە فاکتەرەکانی تۆکمەکردنی کۆمەڵایەتی لەناو ئەم گەلەداو ئەمەش بایەخێکی گرنگی هەیەو وادەکات کە هاوڵاتیانی ئەم گەلە هەست بکەن کە شتێك هەیە لەبەکیان نزیك بکاتەوەو پەیوەندییەکانیان پتەوتر بکات، ئەمە ئەقڵێکی زۆر بەهێز لەناو کوردا دروست دەکات، هیچ سلبیاتی نییە.

## د.کەریم قەرەچەتانی:

# پێویستە لە ساڵیادی ئەنفالدا وا بکرێت بەجێماوانی ئەنفال هەست بکەن کەسوکاریان بۆ ئەم وڵاتە ئەنفال کراوە



ئا: لەنجە شێخ عوسمان

**کاتێك تاوان گەشە ئەکات لوتکەی مرۆڤ بوون هەرس بێنیۆ و مرۆڤ مرۆڤ لەناو بەرێت، لێرەدا تاوان باڵ بەسەر تەواوی جیلەکاندا ئەکێشیۆ و وڵاتێکی تاوانستان وجودی ئەبێت، مرۆڤ لەهەرقۆناغێکی ژیاندا بێت لەهەر کاتو سەردەمێکدا بژی پێویستە وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئەگەرنا تاوان دەرونی هەموان داگیر ئەکات، بۆ قسەکردن لەسەر تاوانی ئەنفالو سایکۆلۆژیای بکەرانی ئەم تاوانەو کاریگەری ژینگە لەدروست بونی کەسێتی تاوانبارو بارودۆخی دەرونی بەجێماوەکانی ئەنفال، ئەم چاوپێکەوتنەمان لەگەڵ دکتور کریم شەریف قەرەچەتانی پسپۆڕی دەرونی سازدا.**

**عەرعەر: ئەکرێت پۆلێن کردنێك هەبێت بۆ تاوان، یاخود جۆرەکانی تاوان چی یە؟**

**د.کریم شەریف: بێگومان ئێمەکە ئەڵێین تاوان هەرشتێك دژی ئاینە ئاسمانیەکان یا دژی یاسا مرۆڤایەتییەکان بێت ئەچێتە خانەی تاوانەوە، کەواتە تاوان بچوك بێت یان گەورە هەرتاوانە، بۆنمونە ئەگەر کەسێك مریشکێك بدزێت یان ملیارێك بدزێت هەر تاوانە, بەڵام بەنیسبەت شێوازەکان جیاوازی هەیە, تاوان هەیە زۆرزۆر نامرۆڤانەیە، بۆنمونە پیاو ئەکوژێت ئەیسوتێنێ و لەت لەتیشی ئەکات، کەواتە شێوازی تاوانە کە یان لەناوبردنەکە بەپێی تەکنەلۆژیا و ڕۆژگار ئەگۆڕێت.**

**عەرعەر: ئایا دەرونی ئەو کەسانە چۆنە کەتاوانێکی گەورەی وەك جینۆساید ئەنجام ئەدەن؟ بۆ تاوان ئەکەن؟**

**د.کریم شەریف: بێگومان کاتێك دێینە سەر مەسەلەی جینۆساید و تاوانی زۆر زۆر گەورە و لەناوبردنی نەتەوەیەكو توخمو ڕەگەزێك ئەمە هیچ قانون و یاسایەك نایگرێتەوە، بەڵکو تەنها دەرونی مرۆڤە نەخۆشەکان نەبێت,بێگومان مرۆڤێك دەرون دروست بێت ناچێت تاوانی گەورە بکات ,ڕاستە لەوانەیە هەندێ کەس هەبێت,بەڵام ناگاتە ئاستی ئەوە , لە قانوندا هەیە کە تۆ یەکێك لێت یاخی ئەبێت یاسای نێودەوڵەتی هەیە یاسای خۆت هەیە هەندێ شتی بەرامبەر**

ئەکەی ,بەڵام ئەمەی ئەمانە کردویانە یاسای عێراقی رێگای نەداوە حەتا لەیاسای عێراقیدا یاسایەك نییە بڵێت ئەگەر بێت و ناوچەیەك لێت یاخی بێت وبچیت پاکتاویان بکەیت و لەناویان بەریت ,بێگومان هەر کەسێك تاوانێك بکات یان مرۆڤێك بکوژێت یاخود لەناوبردنی بەکۆمەڵ ئەنجام بدات لەلایەنی دەروونییەوە مرۆڤێکی دەرون نەخۆشە ,چەندەها مرۆڤی دەرون نەخۆشمان هەیە,هەیانە کەسانێکی (سادی)ن، یەکێکی وەك صدام و هیتلەر کە دەچنە خانەی سادییەوە.

سادی: بریتیەلەوەی کەتام وچێژو خۆشی لەکوشتنی کەسانی ترەوە وەرئەگرن, واتا سزای بەرامبەرەکەی ئەدات تا هاوارنەکات و نەپارێتەوەو ئیهانەی نەکات ئەم مورتاح نابێت، کەواتە تام‌و چێژ لە کوشتن‌و برین وەرئەگرن. ئەمە پێی ئەوترێت کەسێتی سادی. کەسێتیەکی ترمان هەیە پێی ئەوترێت (ماسۆشی) پێچەوانەی ئەوی ترە تام‌و چێژ لە لێدانی خۆی وەرئەگرێت، ئەمە ناچێتە ئەو خانەیەوە، بەڵام کەسی ترمان هەیە (سایکۆپاسیف)ین واتە دژە کۆمەڵ، ئەم مرۆڤانە هەرچی دژی کۆمەڵ‌و بەهای ئەخلاقی وڕێسای کۆمەڵایەتی بێت ئەم لەناوی ئەبات، بۆنمونە ئەو کەسانەی سایکۆپاسیفن پەند لە ڕابردویان وەرناگرن، هەرچی ئیهانەو سوکایەتی پێکردن هەیە مایەی دڵخۆشییانە، ویژدانیان نی یە لێپرسنەوەیان لەگەڵدا بکات، کەواتە ئەو مرۆڤانەی کە دەسەلاتدارە لە سەرۆکایەتیدا ئەگەر ئیستیعدادێکی دەرونی نەبێت خەڵك لە ناو بەرێت، ئەتوانێت ئەو کارە نەکات، کەواتە ئەوانەی بەشداری تیا ئەکەن بەتایبەت ئەوانەی بڕیارەکە دەرئەکەن‌و جێبەجێی ئەکەن مرۆڤی دەرون دروست نین‌و نەخۆشن و تۆڵە سەندنەوە پاڵنەریانە، بۆیە هەموو شتێك ئەکەن.

**عەرعەر: ئایا ژینگە کاریگەری هەیە لەسەر دروستبونی کەسایەتی تاوانبار؟**

**د.کریم شەریف:** ئێمە کە دێنە دنیاوە فریشتە نینن وە شەیتانیش نین ، ئەگەر بۆ دینیش بگەرێنەوە خوا فریشتەی دروست کردووە خێرە وە شەیتانی دروستکردووە شەڕە، بەڵام مرۆڤیشی دروستکردوە، مرۆڤ لە نێوان هەردوکیاندایە، واتە کە دێنەدنیاوە تۆوی شەڕو و خێرمان تێدایە، فریشتە قەد خراپە ناکات ، چونکە کاری ئەو باشەیە، شەیتانیش قەد کاری چاکە ناکات ، چونکە هەموو تەبیعەتەکەی تەواو بووە بە شەڕ، بەڵام مرۆڤ هەردوو تەبیعەتەکەی تیایە، بەڵام کاتێك لەنێو کۆمەڵگایەکی‌و باش خێزانێکی باش پەروەردە ئەبیت سۆزو خۆشەویستیت ئەیاتێ و پێداویستیە دەرونی‌و کۆمەڵایەتییەکانی بۆ دابین ئەکات ، وەکو مرۆڤ مامەڵەت لەگەڵدا ئەکەن‌و ئیرادەیەکی بەهێزت بۆ دروست ئەکەن، وردە وردە تۆوی خێرەکە سەوز ئەبێت، وە تۆی شەڕەکە هەر ئەمێنێتەوە لە ناخمانا، بەڵام ئەمانەی کە ئەبن بە دیکاتۆر و سایکۆپاسیف و پیاو کوژ ئیرادەی شەڕەکەی خۆشیان سەرەڕای کۆمەڵگەش و ئەو ژینگەییەی تیایا ژیاون بێ دایك‌و بێ باوکی‌و ستەم‌و ناحەقی‌و سوکایەتی‌و تێگەیشتن بۆ ژیان بەمەش لە وانەیە فەلسەفەیەکی هەڵەی هەبێت بۆ ژیان، ڕەنگە وا تێبگات مرۆڤ هیچ نی یە، بۆیە زۆر

ئایدۆلۆژیا هەیە لەناوبەرە وەك میکیاڤیلی ئەڵێ "هەموو وەسیلەیەك بەکار ئەهێنن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیان".

**عەرعەر: ئایا بەجێماوانی ئەنفال کەسانی ئاساین؟ ئەکرێت وەك کەسی ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت؟**

**د.کریم شەریف:** بێگومان بەجێماوانی ئەنفال هەر کەسێك بێت ئەتوانرێت ببێت بە کەسێکی ئاسایی، چۆن؟ ئەمەش جیاوازی هەیە، ئەگەر ئافرەتەکەی یا خێزانەکەی ژنی بووبێ زیاتر زەرەری لێدەکەوێ لەوەی منداڵێکی شیرە خۆرەی هەبووبێ، چونکە منداڵە شیرە خۆرەکە باوکی یا دایکی نەبینیوە ئەو خۆشەویستی و سۆزە دروست نەبووە، کەواتە نەمانیشی ئەوەندە کاریگەری لەسەری جێنەهێشتووە، بەڵام ئەگەر بێتو دوای ئەوەی کە بێ باوك یا دایك ئەبێت بەهۆی ئەنفالەوە، واتە سەرگەردان ببێت، بۆ نمونە دایکی شوو بکاتەوەو کەسێك نەبێت لەخۆی بگرێت یا ڕۆژانە ئیهانەی کەیت بیخەیتە سەر جادە ئیشی پێبکرێت یا لێیبدرێت، ئەو کاتە وەكو هەمو مرۆڤێکی تر لایەنی شەڕەکەی وردە وردە سەوز ئەبێت، چونکە بەدوای تۆڵە سەندنەوە ئەگەڕێ، بەڵام ئەگەر بەجێماوی ئەنفال بێتو باوکیو دایکی نەمابێت لەو کاتەدا مامێك یا باپیری یا دامو دەزگایەکی کۆمەڵایەتی حکومی بۆ دروست بوبێت پێداویستیەکانی بۆ دابین بکات ، ئەتوانێت خۆی بکاتە سەر پێ وەك و ژیانی ئاسایی بژی، چونکە مرۆڤ ئامادەباشی لەناخیا هەیە ئەگەر بێتو بێ دایكو باوك بێت، جێگر ئەتوانێ ئازار مەینەتیەکانی کەم بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئاسەوارێك بەجێ ئەهێڵێ.

بەداخەوە لە وڵاتی ئێمەدا ئەوەی بمانەوێ وەكو پێویست بۆ کەس‌وکاری ئەنفال نەکراوە، بۆ نمونە تاوەکو ئێستا نەتوانراوە ئافرەتێك کە بێوەژن بووە ئیشێکی وای بۆ بدۆزرێتەوەو داهاتێکی وای بدرێتێ منداڵەکانی پێ بە خێوبکات، ئەو موچەیەشی بۆیان بڕاوەتەوە ئەوەندە نی یە ئەو ئافرەتە بتوانێ منداڵی پێ بەخێوبکات، ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە کاتێك پیاو نامێنێت ئەو زەختو فشارەی پیاوەکە ئەکەوێتە سەر شانی ژنەکە، لێرەدا ئافرەتەکە ئەبێت دەوری دایكو باوك ببینێت سەرەڕای ئەو بۆ شاییەی باوکەکە بەجێی هێشتووە ئەبێت ئەم پری بکاتەوە، کەواتە لە زۆر لایەنەوە کە لێنی ئابوری و کۆمەڵایەتی ودەرونی کەوتۆتە جەستەو دەرونی بەجێماوانی ئەنفالەوە، بەڵام ئەبێت کاریان بۆ بکرێت، ئێستا وەزارەتێك هەیە بەناوی وەزارەتی شەهیدو ئەنفال ئەبێت ئەم وەزارەتە هەوڵبدات قەرەبویان بۆ بکاتەوە ، ئەبێت لە لایەنی دەرونی یەوە چەندەها سەنتەر لە گەرمیانو بارزانو ئەو ناوچانەی ئەنفالیان بەرکەوتووە بکرێتەوە.

**عەرعەر: دادگاییکردنی تاوانبارانی ئەنفال بەڕێوەچوو، دواتر بڕیاردرا سزابدرێن، ئەمە لەلایەك بەجێماوانی ئەنفالی دڵخۆش کرد کە تاوانباران لەقەفەزی دادگانو بڕیار دراوە بەسزای خۆیان بگەن، لەلایەکی ترەوە بڕیارەکان جێبەجێ نەکرا، ئەمە چ حاڵەتێکی دەرونی دروست ئەکات؟**

**د.کریم شەریف:** ئەوە بێ متمانەیی دروست ئەکات، زۆر کەس هەیە متمانەیان بە قانونی عێراقی نی یە، چونکە کاتێك قانونێك دەرئەچێت جێبەجێناکرێت کەواتە قانونەکە ناتەواوییەکی تیایە، بۆ قانونەکە جێبەجێناکرێت ئەمە پرسیارێکە؟ وەڵامەکەی لای من نی یە منیش نیگەرانم، ئەبێت ئەم پرسیارە لە دەسەڵاتداران بکرێت، چونکە ئەمە ئاسەواری جێهێشتووە، بەم جێبەجێنەکردنە وامان لێدێ باوەڕمان بە قانونەکەو دەسەڵاتەکە نەبێت، گومانمان لەلا دروست ئەبێت‌و ڕاڕا ئەبین، بۆیە ئەبێت تا زووە جێبەجێبکرێت بۆ ئەوەی هیچ نەبێت لە لایەنی دەرونی یەوە کەس‌و کاری ئەنفال دڵیان ئاو بخواتەوە، ئەمە تۆڵە نی یە قانوون دایناوە. تۆ دوژمنەکەت بە بەرچاوتەوە بڕوات‌و بچێت لە سجنشدا هیچی لێنەکرێت لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك فرۆکەوانەکە ئەوانیش وو بن، ئەمانە شك‌و گومان دروست ئەکەن، بەمە ڕوق‌و قینە لە دڵی تاکی کوردی بەرمبەر دەسەڵاتی کوردی دروست ئەکات، چونکەدەسەڵاتی کوردیش لە بغداد وجودی هەیە، بۆ نایە بپرسێت بۆ جێبەجێناکرێت، ئەمانە هەموی وەڵامی ئەوێت، ئەگەر وەڵامنەدرێتەوە خەڵك هەزران پروپاگەندە دروست ئەکات.

**عەرعەر: ساڵانە یادکردنەوەی ئەنفال ئەکرێتەوە، لەڕوی زانسی یەوە چ کاریگەرییەکی هەیە؟ئایا ئەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر لە ناخی تاکی کوردیدا بمێنێتەوە؟**

**د.کریم شەریف** ؟ لەهەموو وڵاتێکدا ساڵانە یادکرنەوە هەیە، بەڵام ساڵیاد نەوەکو لای ئێمە بیکەینە موناسەبات بڵێین لەو ڕۆژەدا ئەنفال کراوە ئەوەندەی تر برینەکانی کەسەکاری ئەنفال بکولێنینەوە، ئەوە کاتێك ئەبێت وەکو لە زۆر وڵاتانی دنیا کراوە ئەو کەسانەی بەرکەوتون مافەکانیان بۆ بگەرێنرێتەوە، بۆ ئەوەی کەسانی ئەنفالکراو هەست بکەن کەسوکاریان بۆ ئەم وڵاتە ئەنفال کراوە.

ئەم ساڵیادە ئەبێت بکرێتەوە بۆ دوو شت..

یەکەم: بۆ ئەوەی هەموو نەتەوەی کورد نەوە لە دوای نەوە بیری بکەوێتەوە کە نەهامەتی وا بەسەر کوردا هاتووەو بیریان نەچێتەوەو لە ویژدانیاندا زیندو بێت.

دووەم: ئەبوایە هەموو ساڵێك کە یادمان ئەکردەوە کۆمەڵێك پرۆژەو خزمەتگوزاری لە لایەن بەرپرسان‌و حکومەتەوە پێشکەش بەکەس‌وکاری ئەنفالکراوەکان بکرایە بەبۆنەی ساڵیادەوەکەوە نەوەك‌و بە وتارو کۆمەڵێك پەیمانی ناڕاست، بەڵکو جێبەجێش بکرێت..

## گۆران ئەدهەم:

# جێبەجێنەکردنی بڕیارەکەی دادگا تا ئێستا بۆ رازیکردنی سونیەکان و کۆنە بەعسیەکان و ئەوانەن کە پێشتر ئەنفالی کوردیان کردووە.



چاوپێکەوتن: عەرعەر

دادگـایکردنی تاوانبـاران و ئەنجامـدەرانی تـاوانی ئـەنفال و هەڵەبجە لـە دادگـای باڵای تاوانـەکان لـە عێـراق بـۆ گـەلێکی قوربانی وەکو کورد، سـودی سیاسـی و ئـابووری زۆر باشـی هەیە ئەگەر بتوانرێت لەکات و شوێنی خۆیدا بەکاربهێنرێت، بـۆ تیـشك خـستنە سـەر چـەند رەهەنـدێکی دادگاییەکـەو چۆنیەتی بەڕێوەچوونی دادگادگایکردنی تاوانباران لەسـەر ئـەنفال و بڕیـاری دادگـا بـەوەی کـە کـورد لـە ئەنفالـدا جینۆسـایدکراوە، هـەروەها بـۆ قـەرەبووی خـودی قوربـانی و کەسـوکاری قوربـانی (عەرعـەر) ئـەم چـاوپێکەوتنەی لەگـەڵ (گـۆران ئەدهـەم) ئەنـدامی تیمـی پارێزەرانی مافی کەسی لە کەیسی ئەنفال و سـەرۆکی تیمی پارێزەرانی مـافی کەسی لـە دۆزی هەڵەبجە ئەنجامدا.

**عەرعەر: یەکەم پرسیار با لەوەوە دەست پێبکەین پـاش تـەواوبوونی دادگـایکردنی تـاوانبـارانی بـەعس لەسەر ئەنفال، ئەو دادگاییە بە شێوەیەکی گشتی چۆن بەڕێوە چوو؟ ئێوە وەکو پـاریزەرانی بـەرگری مـافی کەسی راتـان چۆن بوو لەسەر بڕیاری دادگا؟**

**گۆران ئەدهەم:** بەشێوەیەکی گشتی دادگایەکە زۆر باش بەڕێوە چوو، ئەوەی کە مەبەستمان بـوو لە دادگاییەکە، ناساندنی جینۆسایدی کورد بـوو لـە هێرشـەکانی ئەنفالدا، خۆشبەختانە یـەکێك لەو مادددانـەی کە تاوانبـارانی پـێ حکوم دران مـاددەی 11ی دادگـای باڵای تاوانـەکانی عێـراق و دووەمـیش مـاددەی جینۆسـایدە کـە کۆمـەڵکوژی کـوردی پـێ یاساسـی کـرا، لـە پـاڵ ئەوەشـدا تاوانبـاران ئیدانـە کـران و تاوانبـارکران بـە تاوانـەکانی دژی مرۆڤایـەتی و تاوانـەکانی جـەنگ کـە هەرسـێ مـاددەی 11و12و13ی یاسـای دادگـای باڵای تاوانـەکان لـە عێـراق کـە لـە سـاڵی 2005 لەلایـەن پەرلـەمانی عێراقـەوە دەرچـووە، گرنگییەکـەشی لەوەدایـە کـە پـاش دەرچـوونی بڕیارەکـە دەوڵـەتی عێراقـی و پەرلـەمانی عێراقـی دانـی بـەوەدا نـاوە کـە کـورد لـە هێرشـەکانی ئەنفالـدا جینۆسـایدکراوە، بێگومـان ئـەم دان پێـدا نانـە سـودی سیاسـی و سـودی ئـابووری و سـودی ناوخۆیی و دەرەکی هەیە، وەکو پارێزەرانی مافی کەسی بڕیاری دادگاکە تا سنوورێکی زۆر باش دەگونجا لەگەڵ داواکاریەکانی ئێمە، هەرچەندە ئەو تاوانانەی خراوەتە پاڵ ئەم تاوانبارانە بە

هیچ پێوەرێك ناگونجێت لەگەڵ تاوانی بچوکدا یان کوشتنی بچوکدا، بۆ دادگاش روون بووەوە کە ئەم تاوانبارانە لەسەرەتاوە هەستاون بە کیمابارانکردنی لادێکانی کوردستانو زیاتر لە (4000) چوار هەزار لادێیان لە شالاوەکانی ئەنفالدا خاپورکردونو بەرنامە رێژیشیان بۆ ئۆپراسیۆنەکانی ئەنفال کردووەو بە پراکتیکیش لە مانگی شوبات تا مانگی ئەیلولی 1988 ئەم بەرنامەیە بە هەشت قۆناغ لە لایەن فەیلەقی پێنج فەیلەقی یەك فەیلەقی دوو جێبەجێکراوەو ئەو کوردانەشی بەرکەوتوون براون بۆ گرتوخانەکانی دبسو چەند جێگایەکی تری عێراقو بەشێکی زۆریان کراون بە ژێر خۆڵەوە، لە بیبانی سەماوەو لە ناوچەی حەزەرو لە ناوچە جیاجیاکانی تری باشوری عێراق.

**عەرعەر: بریاری دادگایی باڵای تاوانەکان لە عێراق لە رووی یاساییەوە بۆ تاوانباران ئەگەری جێبەجێنەکردنی هەیە؟**

**گۆران ئەدهەم:** زۆرکەس هەیە جێبەجیٚ کردنی بریاری ئەم تاوانبارانە ئەبەستێتەوە بە واژۆی سەرۆکایەتی کۆمارەوە، بە بروای من ئەمە زیاتر کێەشمەکێشی سیاسییە، نەك هۆکاری یاسایی چونکە لەمادەی 27ی یاساکەدا هاتووە ئەڵیٚ بۆ هیچ کەسێك نییە لە هەر دەسەڵاتێکدا بێت کە دەستوەرداتە بریارەکانی دادگایی باڵای تاوانەکان لە عێراق چی بە کەمکردنەوەی حکوم چی بە لێخۆشبوون یان بەهەرشێوەیەك کە دەستکاری بریارەکان بێت، جێبەجێنەکردنی بریارەکەی دادگا تا ئێستا بۆ رازیکردنی لایەنێکی گۆرەپانی سیاسی عێراقیە کە ئەوانیش سونیەکانو کۆنە بەعسیەکانو ئەوانەن کە پێشتر ئەنفالی کوردیان کردووە، ئەگەر بریاری دادگا سەبارەت بە کەیسی ئەنفال جێبەجیٚ نەکرێت ئەوا دەوڵەتی عێراقی ئەکەوێتە بەر تانەی ئەوەی بۆچی حوکمی سەدام لە 2006/12/30 جێبەجێکرا لە پاش چوار رۆژ لە تەمیزکردنەوەی لە لایەن دادگاوە، 15 رۆژ پاش ئەوەش عەواد بەندەرو بەرزان تکریتی زربرای سەدام بریارەکەیان بەسەردا جێبەجێکرا، لە کاتێکدا پێویستی بە واژۆی سەرۆکایەتی کۆمار نەکرد، لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوەو ئاراستەی دەوڵەتی عێراق دەبێتەوە، کە ئایا لەم ماوەیەدا نە یاساکە گۆراوە نە دەستور گۆراوە نە تەشریعاتەکان گۆراون بۆچی بریارەکە بەسەر ئەواندا جێبەجیٚ کراو بەسەر ئەماندا جێبەجیٚ ناکرێت، ئێمەش وەك پارێزەرانی دەستەی داکۆکی کاری کەسوکاری ئەنفالکراوەکان چەندەها داواکاریمان ئاراستە کردووە چی لە دادگا چی لە رێگەی راگەیاندنەکانەوە چی بە فەرمی چی بە نا فەرمی داوام لە حکەمەتی عێراقی کردووە کە ئەو بریارانە جێبەجیٚ بکات بەلاّم تا ئێستا وەلاّم نەدراوینەتەوەو ئەو بریارەش وەکو خۆی ماوەتەوەو جێبەجیٚ نەکراوە.

لە لایەکی تریشەوە جێبەجێنەکردنی بریارەکە پرسیار دەخاتە سەر سەربەخۆی دەسەڵاتی تەنفیزیو تەشریعیو دادگای باڵای تاوانەکان.

**عەرعەر: دادگا بڕیاری دا کە نەتەوەی کورد لە ئەنفالدا جینۆسایدکراوە، ئەم بڕیارە لە ڕووی یاساییەوە هەڵگری چی خەسڵەتێکە؟ کورد چۆن بتوانێت مامەڵەیکی زانستی یاسایی لەگەڵ ئەم بڕیارە گرنگەدا بکات؟ کورد چۆن قەرەبوی خۆی وەربگرێتەوە؟**

**گۆران ئەدهەم:** جینۆسایدو بابەتی هاوشێوەی ئەنفال لە هەموو جیهاندا بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بۆ نموونە هۆلۆکۆست، جولەکەکان سودیان لە هۆلۆکۆست وەرگرتووە چی وەك قەرەبووی ماددی لە ئەڵمانەکان یاخوود قەرەبووی مەعنەوی لە جیهاندا، کە هەستی تەواوی جیهانیان بۆ خۆیان ڕاکێشاوە، بێگومان ئەگەر کوردیش زانستیانەو عەقڵیانە مامەڵە لەگەڵ ئەنفالدا بکات سودی مادیو مەعنەویو کۆمەڵایەتیو ناو و شوهرەتی جیهانیشی دەبێت، پێویستە ئێستا کەدوای ئەوەیە پەرلەمانی عێراقی دانی بەوەدا ناوە کە کورد جینۆسایدکراوە، هەڵمەتێکی جیهانی دەست پێبکات بۆ ناساندنی جیهانی دەرەوە لەمەر جینۆسایدی کورد، بۆ ئەوەی ئەو دەوڵەتو کۆمپانیایانەی کە هاوکاری ڕژێمیان کردووە فشاریان لێ بکرێت بۆ بەژداری کردن لە بنیات نانەوەی کوردستانو ئەو شوێنانەی بەر شالآوی ئەنفالو جینۆساید کەوتوونو قەرەبوو کردنەوەی کەس‌وکاری ئەنفالکراوەکان، پێویستە ئەم بڕیارانە بگەیەنرێتە نەتەوەیەکگرتوەکانو لە ئاستێکی بەرزی جیهانیدا دانی پێدا بنرێت کە کورد جینۆسایدکراوە، لە ڕووی ئابووریشەوە دەوڵەتی عێراقی کە جێگرەوەی دەوڵەتی پێشووەو ئیلتیزامێکی یاساییو ئەخلاقی لە ئەستۆدایە، پێویستە قەرەبووی کوردستانو کەس‌وکاری ئەنفالکراوەکان بکاتەوە کە ئەمەش بەشێکی بنەڕەتی بڕیاری دادگاکە بوو بە برگەیەکی جیاوازیش باسی کردوە کە زەرەرمەندانی شالآوەکانی ئەنفال دەبێت قەرەبوو بکرێنەوە، چی ئەوانە کەم ئەندام بوون یان زیانی مەعنەویان لێ کەوتووە چی ئەوانەی زیانی ماددیان بەرکەوتوە یان کەس‌وکاریان تیاچوون.

**عەرعەر: ئایا خودی ئەنفالکراوەکان وەکو قوربانیەك لە ڕووی یاساییەوە چی جۆرە قەرەبوویەك دەکرێتەوە؟**

**گۆران ئەدهەم:** قەرەبووکردنەوەی قوربانی ئیلتیزامێکی ئەخلاقیە وەك ئەوەی یاسایی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە بڕیاری ئەنفالدا برگەیەك هەیە کەباس لەوە دەکات حکومەتی عێراقی پێویستکراوە لەسەری بە گەڕانەوەی ڕوفاتی ئەنفالکراوەکان بۆ زێدی خۆیان، بڕیارێکی یاسایش سەبارەت بە گۆڕەبەکۆمەڵەکان هەیە بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانە تا ئەوکاتەی ئەهێنرێنەوە پارێزراو بێتو لەو بڕیارەدا سزایی یاسایی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی گۆڕێکی بەکۆمەڵ ئەشێوێنێت یان بەبێ فەرمانی لایەنی پەیوەندیدار دەستکاری گۆڕێکی بەکۆمەڵ دەکات.

**عەرعەر: لەم ماوەیەدا دەنگۆی ئەوە هەبوو کە ئەو موستەشارانەی بەشداری ئەنفالیان کردبوو دەدرێنە دادگا، ئەم موستەشارانە بەچی شێوەك لە ڕووی یاساییەوە تاوانبارن؟ بۆچی لەگەڵ سەرانی بەعسدا یەك کەیسیان بۆ نەکرایەوە؟**

**گۆران ئەدهەم:** کەیسی ئەنفال لە سەرەتادا یەك کەیس بوو، بەڵام ناوی ئەو موستەشارانە چی لە کاتی دادگایکردنی تاوانباراندا هاتووە یان لە دۆکۆمێنتەکاندا ناویان هەیەو تاوانبار کراون یان

شکاتکارەکان یان کەس‌وکاری ئەنفالکراوەکان سکالآیان لەسەر تۆمارکردوون، ئەم دادگایکردنی موستەشارانە ئێستا سیاسەت تەحەکومی پێوە دەکات و زۆر لە تاوانبارەکانیش لە کوردستاندان و بەشێکیشیان لە دەرەوەی کوردستانن، دادگا بریاری دەستگیرکردنی 423 تاوانباری دەرکردووە کە زیاتر لە 200یان کوردن، دەبێت بە شێوەیەکی هەستیارانە مامەڵە لەگەڵ ئەم کەیسەدا بکرێت چونکە ئەگەر وانەبێت کێشەی ناوخۆیی دروست دەکات، بە تایبەتی کەبەشێك لەو تاونبارانە لەلایەن هەردوو پارتی دەسەڵاتداری کوردستاوە پشتگیریان لێ دەکرێت، پێویستە ئەم پارتانە شوێنی ئەم جۆرەکەسانە نەکەنەوە.

**عەرعەر: ئێستا دانیشتنەکانی دادگا بەرێوە دەچێت لەسەر کەیسی هەڵە بجە، بەرێزت وەکو سەرۆکی تیمی پارێزەرانی مافی کەسی ئاستی بەرێوەچونی ئەم دادگاییە چۆن دەبینن؟**

**گۆران ئەدهەم:** کەیسی هەڵەبجە قۆناغی زۆر باشی بریوە، تا ئێستا 10دانیشتن کراوەو 22 سکالآکارمان پێشکەشی دادگاکردووە و چوار شاهیدی بیانیشمان پێشکەش کردووە کە تورکی و نەرویجی و سویدی بوون، ئەمان زۆر بە جوانی و بە چاکی بۆ دادگایان رونکردەوە کە بە چی شێوەیەك ئەو کۆمەڵە تەرمانەیان لە هەڵەبجە بینیوەو بە روونی باسی شێوەی مردنەکانیشیان کرد کە دیاربووە ئەمانە بریندار یان شەهیدی چەکی کیمیاوی بوونە، ئەمەش راستیەکانی بەتەواوی بۆ دادگا رونکردەوە، تا ئاستێکی باشیش دادگا بڕوای بە کەیسەکە هێناوە، ئێمە 325 سکالآکارمان هەبوو بەلآم دادگا داوای کرد بەکەمکردنەوەی سکالآکارەکان بۆ 22 سکالآکار ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە دادگا بڕوای تەواوەتی هێناوە بەم کەیسە، وا بریاریشە کە 4/26 یانزەهەمین دانیشتنی دادگاکە بەریوە بچێت کە ساڵیادی بۆردومانکردنی شاری هەڵەبجەیە، ئێمە بۆ ئەو دانیشتنە کۆمەڵێك شاهیدی تر دەبەین، لە ناویاندا فرۆکەوانێکی عێراقی تێدایە کە شاهیدی ئەدات لەسەر کەیسەکە، بەلآم لەسەر داوای خۆی ناتوانین ناو و ناونیشانی ئاشکرا بکەین نە لە ئێستاداو نە لە داهاتوودا، ئەم مافەشی یاسا پێیداوەو پێویستە رێزی یارمەتیەکەشی بگرین، زۆر کەس هەیە لە کوردستاندا دەژێت و کوردیشە کە زانیاری گرنگ و باوەرپێکراوی لایە ئێمە داوامان لێکردوون بێن شاهیدی بدەن بەلآم ئامادەنین، یان کەسی وا هەیە دەکەس زیاتری شەهیدە ئامادە نەبووە بێت سکالآ تۆمار بکات، هەروەها چەند کەسێکی تر هەبوون کە کورد بوون دۆکۆمێنتی گرنگ و باشیان لەسەر چەکەکانی عێراق هەبووە وەکو فیلم و بەڵگەی نوسراو بەلآم لە بەرانبەردا داوای پارەی زۆریان کردووە کە بماندەنێ ئێمەش نەمان ویستووە. بەلآم خۆشبەختانە لە رێگەی ترەوە ئەو کێشانەمان چارەسەرکرد، بڕواشم وایە ئەگەر دادگاکە دەستی تێنەخرێت بە ئەنجامێکی باش کۆتای پێدێت.

محمد حمەصالح تۆفیق:

## عێراقی ئێستا وەك ئەڵمانیای دوای قۆناغی فاشیستیو نازییەکان وایەو ئەبێت پۆزش بۆ نەتەوەی کورد بهێنێتەوە



چاوپێکەوتن: عەرعەر

جینۆساید گەورەترین تاوانە دژ بە مرۆڤایەتیو لە هەموو سەردەمێکی مرۆڤایەتی دا ئامادە بووە، بەڵام بەر لە ئێستا بە دەگمەن نەبێت هەمیشە بەشێك بووە لە جەنگ، لە ئێستاشدا بووەتە خاڵی یەکگرتنەوەی هێزە تێکدەرەکان و چەند شێوەیەکی جیاجیایی وەرگرتووە، بۆ تیشك خستەسەر ئەنفالو جینۆسایدو بەرپرسیاریەتی ویژدانیو ئەخلاقی حکومەتی عێراق بەرامبەر بەکوردو عەقلی سیاسی ئێستای دەسەڵاتدارانی عەرەبی عێراق لەمەر جینۆسایدی کوردانو ئەگەری دووبارە بونەوەی ئەنفال، (عەرعەر) ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ محمد حمەصالح تۆفیق پسپۆڕ لە بواری جینۆسایددا ئەنجامدا.

**عەرعەر: ئەگەرتەماشا بکەین لە مێژوودا زۆرترین شەرو پێکدادانی نەتەوەیی و ئاینی هەیە، کام لەم شێوە جەنگانە دەچێتە خانەی جینۆسایدەوە ؟ واتە ئەکرێت جینۆساید پێناسەیەکی دیاری هەبێت؟**

**محمد حمەصالح تۆفیق:** مێژو پرە لەجینۆساید، پرە لەقرکردن، نمونەی ئەمە هیندە سورییەکانی ڕەسەنی دانیشتوی ئەمریکا بەو شێوەیە قرکرا، بەشێوەی ئەنفالی لای خۆمان، ئەوەی ئێستا لە زاراوەدا وەك جینۆساید بەکارئەهێنرێت، ئەمە لە (میکائیل لیوشینەوە) سەرچاوەی گرتووە لە ساڵی (1944) کە ئەم صیغەیە بەم شێوەیەیە، جینۆساید هاوشانی مودێرنیتەو عصری نوێیە، واتە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەوە لە ساڵی (1948) دا کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان هەڵبەتە ساڵی (1948) دوای ئەوەی کە لە ساڵی (1945) نەتەوەیەکگرتوەکان دامەزرا، پێشتر کۆمەڵەی گەلان بوو لەسەردەمی کۆمەڵی گەلاندا ئەو قرکردنەی هۆڵۆکۆست ڕوویدا لەنێوان (33–45) کە نازییەکانی ئەڵمانیا هاتنە سەر حکوم و بەملیۆنان خەڵك کوژران. لە ڕاستیدا کارێکی گەورە بۆ هۆڵۆکۆست کراوە، لە مانگی (12)ی ساڵی (1948)دا بڕیارێك دەرچوو، کەبڕیارەکە بریتی بوو لەناساندنی جینۆسایدو سزادانی ئەو لایەنانەی کەپێی هەڵدەستن، ئەم بڕیارانە کۆمەڵێك وڵات تەنانەت عێراقیش ئیمزای لە سەر کردووە، (107) وڵات لەو سەردەمەدا ئیمزایان لەسەر کرد، ئەمە پێی ئەوترێت ڕێکەوتنامەی جینۆساید، ئەم بڕیارە لە ساڵی (1948) دەرچوو، لە ساڵی (1951) کەوتە بواری کار

پێکردنەوە، پاڵنەریش ئەو مەسەلە گەورەیە بوو بەسەر جولەکەکاندا هات لە ئەڵمانیا، لێرەدا جینۆساید بریتیە (لە زیان پێگەیاندنی تەواو یا بەش بەش بەگروپێکی نەتەوەیی یان ئاینی یا هەر گروپێکی تر، لە کۆمەڵێ ڕوەوە بریتیە لە قرکردنی ئەو گروپە یا نەزۆککردنی و ڕاگواستنی منداڵو لێ زەوتکردنی کۆمەڵێك شت ئەمە دەچێتە خانەی جینۆسایدەوە) ئەمە چوار چێوەیەکی نێودەوڵەتییە بۆ ئەوەی تۆ بەرچاو ڕوون بیت جینۆساید چی یە، لە ئەنفالدا جینۆسایدێکی بەش بەش پیادەکرا، خەڵکی شارەکان بەو شێوەیە بەرنەکەوتن، بەڵام خەڵکی دێهات چوار دەوری بەخەتی سور دیاری ئەکرا، ئەو شوێنانە هەموو ژنو پیاو گەنجو منداڵی تیا بوو، لەبەر ئەوەی کە کوردە بەرکەوتن، بۆیە دەچێتە قاڵبی جینۆسایدەوە، ئەگینا بەدرێژای ساڵانی (1961) هەتا ئێستا لە کورد ئەکوژرێت ڕەنگە زۆر زیاتر بێت لەو (200) هەزارە یا (182) هەزارە، لێرەدا شێوازی کوشتنەکە دەور ئەبینێت.

مێژونوسێکی ئەڵمان هەیە کتێبێکی هەیە بەناوی (لەناوبردنی جولەکەکانی ئەوروپا) ئەڵێ لە هیچ وڵاتێکداو لە هیچ سەردەمێکی کۆنو نوێدا قرکردنی بەکۆمەڵ لە سێ قۆناغ یا سێ حاڵەت بەدەر نی یە، حاڵەتی یەکەم: کۆکردنەوەی گروپەکەو دەست نیشان کردنی، حاڵەتی دوەم: پاکۆدانو گرتنو ئابلوقەدان، حاڵەتی سێ یەم: لەناوبردنی ئەو گروپە، ئەم سێ حاڵەتە بەتەواوەتی لە تاوانی ئەنفالدا بەدی ئەکرێت.

**عەرعەر: دەوڵەت تاچەند بەربرسیارە لە ئەنجامدانی جینۆسایدێك کەچوبێتە مێژووەوە، نمونەی عێراق کە ڕژێمی بەعسی فەرمانرەوای ئەوکاتی عێراق جینۆسایدی گەلی کوردی کردووە، ئێستا خۆی نەماوە تاچەند دەوڵەتی عێراق بەرپرسیارە؟ فەرمانرەوای دوای ئەو ئەرکی چ ئەبێت؟**

محمد حمەصاڵح تۆفیق: ئەم حکومەتەی ئێستا کوردش تیایا بەشدارە، وە پێشتریش هەندێ وەزیری کوردی تیا بەشداربوو، ڕاستە ئەم وەك دەوڵەتی عێراق کردویەتی، بەڵام دەوڵەتی عێراق لە ئیلتیزاماتو ئەخلاقیو قانونی خۆی بەدەر نییە، ئەم حکومەتە کە کوردیشی تیا بەشدارەو سەرۆکی وڵاتەکەش کوردە لە ئیلتیزامی ئەخلاقی بەدەر نی یەو ئەبێت وەك دەوڵەت پێ بنێ لەتاوانی ئەنفال وەك پرۆسەیەکی جینۆساید، ئەمە مەسەلەیەکی ئاڵۆزە دەوڵەتی عێراق ئەیەوێ خۆی لەمە بپارێزێت، عێراقی ئێستا وەك ئەڵمانیای دوای قۆناغی فاشیستیو نازییەکان وایەو ئەبێت پۆزش بۆ نەتەوەی کورد بهێنێتەوە، ئەڵمانیا ئێستا پۆزش بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل ئەهێنێتەوە کەچی بەجولەکە کردووە، خۆ ئەم حکومەتەی ئەڵمانیای دوای ساڵی (1945)یش جیاوازە لە حکومەتی (هیتلەر) ئێستا ساڵانە بە ملیۆنان دۆلار ئەدات بە قوربانیانی هۆڵۆکۆست وەك ئیلتیزامی ئەخلاقی، لەبەرئەوەی دەوڵەتەکەی لە ڕابردودا ئەو کارەی کردوە، لەبەرئەوە دەوڵەتی عێراق مولزەمە لەڕوی ئەخلاقی یەوە ئەوە بکات، بچێتە ژێر ئەوە بارەوە، بەڵام ئەمەی ئێستا وەزعێکی تایبەتە لە عێراقداو ناشیانەوێ پێی لێبنێنو ناشیانەوێ مافی کوردو خەڵکی جینۆسایدکراوی کوردش بگێرنەوە.

**عەرعەر: لە ئێستادا سەرکردایەتی کورد یا سیاسی یەکانی کورد یاخود رۆشنبیرانی کورد چی بکەن و رۆڵی ئەوان چ ئەبێت بۆ ئەوەی جینۆسایدی ئەنفال وەك هۆلۆکۆست و ئەرمەنەکان لەسەر ئاستی جیهان بناسرێت؟**

محمد حمەصالح تۆفیق: پێم وایە ئەوا مەسەلەیەکە ئەکرێت لەچەند تەوەرێکەوە کاری لەسەر بکرێت، ئەوە (60) ساڵە تا ئێستا کار لەسەر هۆلۆکۆست ئەکرێت، تا گەیشتوەتە ئەم ئاستە، ئەم مەسەلەیە لەسەر ئاستی رۆشنبیریو لەسەر ئاستی خەڵكو لەسەر ئاستی دەزگاکانو لەسەر ئەوەی ئەمە بکرێتە خیتابێکی نەتەوەیی و قسەی لەسەر بکرێت، ئەبێت تۆ لەکۆمەڵیٚ تەوەرەوە کاری لەسەر بکەی، بۆ نمونە بەئەرشیف کردنی هەرچی بەجێماوەکانی ئەنفالەو جینۆسایدی کوردە ئەمە لای ئێمە وەکو پێویست نەکراوە، تۆ تا ئێستا نازانی ژمارەی قوربانییەکانت چەندە چەندی ژن و چەندی پیاو چەندی گەنجو منداڵن، تا ئێستا سەنتەرێك نییە بۆ دروستکردنی ئەو مەسەلەیە، سەنتەرێك نییە بۆ کتێبو بەڵگەنامەو ئەرشیفی ئەو مەسەلەیە بۆ ئەوەی بەرێكوپێكی بپارێزرێت، لێرەدا نەحکومەتو نەخەڵکمان وەك پێویست بەرنامەیەکی رێكو پێکیان نییە بۆ کارکردن لەو بارەوە، لەبەر ئەوە وەکو دەیان دەردی تر ئەمەش دەردێکی گەورەو کاریگەرە.

**عەرعە: گریمان ئەنفال کرا بەکارەساتێکی نێودەوڵەتیو لەسەر ئاستی جیهان ناسێنرا، لەم سەردەمی جیهانگیریەدا ئێمە ئەتوانین وەکو وەسیلەیەك بەکاری بێنین بۆ پرسە رەواکانی کورد لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی؟**

محمد حمەصالح تۆفیق: لێرەدا شتەکان ئاڵۆزە مەسەلەن هۆلۆکۆست بۆ جولەکە خزمەتی کردون، بەڵام لەوانەیە ئەو بارودۆخە جیاواز بێت لەگەڵ ئێستادا، لۆبێکەی ئەو لە تۆ بەهێزترە مەفروزە تۆ لە وڵاتانو لە نەتەوە یەکگرتوەکانو لە ئەوروپا لۆبێکی بەهێزت هەبێت، من لێرەدا ئەوە ئەڵێم ئەبێت ئەم مەسەلەیە والێبکەین کە ئەم هەموو قوربانی یەمان هەیە یەعنی یەکێکین لەو میللەتە دەگمەنانەی لەسەر ئەرزدا ئەم حاڵتەمان هەیە، چۆن ئەم مەسەلەیە بقۆزینەوە بۆ بەرژەوەندی میلەت، نەك بەکوروزانەوەو گریانو لاواندنەوە، چۆن ئەمە بکرێتە وتارێکی نەتەوەیی، چۆن لە ئاستێکدا منو تۆ وەك دوو لای نەیار بەیەکتر دولا لە ئاستی ئەم قوربانی یە گەورە مل کەچ بین، لای ئێمە قوربانییەکانمان زۆرن، پێوەرە جینۆسایدەکانمان هەیە، بەڵام ئێمە کێشە ئەوەیە ئامادەنین قەد هێڵی سور نەپەرێنین، لەبەر ئەوە قوربانیمان زۆرەو سودمان لێ وەرنەگرتوە، بۆ ئەوەی ببێتە هێمایەکی مەعنەوی، راستە ئەلێ ی تازە ئەمانە فەتاونو تیاچون، بەڵام چی لەسەر ئەمە دروست ئەکەی لەپێناو بەرژەوەندی خەڵکی وڵاتەکەی خۆت.

ئێمە هەندێ جار زۆر بە هەڵە ئەڵێین ئەمریکاو ئینگلیز چیمان بۆ ئەکاو فلانو فیسار ئەوەمان بۆ ئەکا، ئەگەر تۆ میللەتەکەت پشتی پیٚ ببەستی میلەتەکەت ئەوەت بۆ بکات زۆر گەورەترە، واتە خۆت خۆت ئەسەپێنی، تۆ ئەگەر خۆت بیت دەورو بەریش رێزت لێدەگرێت، بەڵام لە حاڵتێکدا

ئەگەر پشتت کردە خەڵکی خۆت ئەو هێزەی خەڵکت لەخۆت تۆران ئەو کاتە خەڵکیش ڕێزت لێناگرێت، ئێستا ئێمە لەو قۆناغەداین.

**عەرعەر: ئەو پاڵنەرە هەستیو نەستیانە چی یە وا لە مرۆڤ ئەکات ببێت بەجەلاد و کاری جینۆساید ئەنجامبدات؟ ئایا ئەمە بەرنامەی ئەوێت؟**

محمد حمەصالح تۆفیق: بەڵێ تۆ لە جینۆسایدی ئەنفالدا بەدرێژای (45بۆ50) ساڵ ڕەش کراوی لەبەرچاویدا، کەواتە بەرنامە بۆ داڕێژراوە، لێرەدا زەمینەسازییەکی بۆ دروست کراوە لە لایەن ناسیۆنالیستی عەرەبی یەوە ئەم کارە بکات، بەهەمان شتەوە جولەکەکانیش ڕەش کران خۆ لەخۆیەوە دروست نەبوو (هیتلەر) فەرمان بکاو بڵێت جولەکە قربکەن، ئەمە لە عقڵیەتی ئەڵمانیا کۆمەڵێك شت دروست بوو کە ئامادەیی بۆ کرا.

لەحاڵەتی کوردیشدا ئامادەییەکی زۆر پێش وەختی بۆ کرا لەعقڵیەتی ناسیۆنالیستی عەرەبیدا، جینۆساید لە کاتێکدا ئەکرێت کە تۆ بەرامبەرەکەت وا نزم کەیتەوە وا بیَ کەڵكو ڕەشی کەیت لەبەرچاوی ئەوی تر ئامادە بێت بۆ هەموو شتێك، بۆ نمونە هەندێ حاڵەت بیشوبهێنێتە سەر حەیوانات (علی حەسەن مجید) ئەڵێت (ئەم بزنانە ئەم کەرانە چین لە شاخەکاندا چ سودێکیان هەیە من دایان ئەگرم بۆ ناو مجمعات بۆ ئەوەی دنیا ببینن و فێری ژیان بن) واتە ڕەشکردنی بەرامبەر حالەتێك ئەدات بەوەی تر کە ئیتر بتکوژێت و خوێنەکەت بخواتەوە ئەو بە حەقو ڕەوایی خۆی ئەزانێ.

**عەرعەر: لەم دوایەدا دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق لەسەر چەند دۆسیەیەك تاوانبارانی دادگایی کرد، پرۆسەی ئەنفال یەکێك بوو لەو دۆسیانەو تاوانبارانی سزادا بەڵام بریارەکانی نەگەیشتە قۆناغی جێبەجێکردن، تۆ پێت وایە ئەم دواکەوتنی جێبەجێ کردنی بڕیاری دادگایە وەکو بەردەوامییەك بێت بە پرۆسەی ئەنفال؟**

محمد حمەصالح تۆفیق: بۆنا، لە عەقڵێتەکاندا کۆمەڵێ بیرکردنەوە هەیە کە دەلیلە، هەمان عەقڵێت ڕەنگە لە عەقڵێتی بەعس خەتەر تر بێت، ئەگەر سبەی دەسەڵاتو جەیشو قوەتی دەسکەوێت، هەمان عەقڵێت ئامادەییەکی لە زاکیرەیدا تێدایە خراپ ترت پێبکات، هەروەها ئەم دواکەوتنە جۆرێك لەڕەوایەتی ئەداتە ئەو پرۆسەیەو جۆرە زەمینەیەك ساز ئەکات کە مەرج نییە بەعسییەکان تێیدا وەکو جەلاد دەرکەون، لەبەر ئەوە ئەنفال مەسەلەیەکی ڕابردوەو ئەگەرێکە لە هەموو کاتێکدا لێت ڕوبداتەوە، چونکە هیچ لەشتەکان نەبووە بە لوت شکانو ڕەدێك بۆ ئەو هێزەی کە ئەو ئەیکرد، عەقڵێتێکت هەیە تا ئێستا ئیعتراف بەوە ناکات ئەم کۆمەڵکوژییە جینۆسایدە. وەكو چۆن دەوڵەتی ئەڵمانی تا ئێستاش باجی کاتی (هیتلەریەت) ئەدات، ئەمان نایانەوێ ئەوە بکەن، لەبەر ئەوە عەقڵێتەکە هەر ئامادەی خۆی هەیە.

سالار مەحمود:

## کەمتەرخەمیەکەی ئێمە وەکو گەلی ئەنفالکراو بەو دەسەڵاتەشی هەمانە لەچوارچێوەی هەرێمدا لەبەرامبەر کارەساتی ئەنفالدا بەراستی مەترسیدارە

چاوپێکەوتن: عەرعەر



ئەنفال رووداوێکی هێندە سادەنیە کەلە ساتەوەختێکی مێژوویدا روویدا بێتو پێمان وابێت پەیوەستە بەهەلومەرجو کاتێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو پەلاماری ئەنفال رەگوڕیشەیەکی قوڵی هەیە لەنێو کەلتورو فەرهەنگی کۆمەڵایەتیو سیاسی کۆمەلگای کوریدا. تاوەکو ئەمرۆش زۆر لایەنی ئەو کارەساتە گەورەیە بەشاراوەیی ماوەتەوە.

بۆ قسەکردن لەسەرچەمکی ئەنفالو ئەو کارە نامرۆیانەی کە بۆسەر هاولاتیانی کورد ئەنجامدرا لەلایەن رژێمێکی دیکتاتۆری سەدامەوە، هەوڵە ناوخۆییو نێودەوڵەتیەکان بۆ ناساندنی کەیسی ئەنفال وەکو جینۆسایدکردنی نەتەوەی کوردو هەوڵەکانی دەسەلاتی کوردی لەپێناو قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکانداو چەند تەوەرەیەکی تری گرنگ، گۆڤاری (عەرعەر) ئەم دیمانەیەی لەگەڵ (سالار مەحمود) شارەزا لەبواری ئەنفالو جینۆسایدو سەرنوسەری گۆڤاری هەشتاوهەشت سازکرد.

**عەرعەر: وەك رۆشنبیرو تاکێکی کۆمەلگەی کوردی پێناسەت بۆ ئەنفال چیە بۆ پەلاماری ئەنفالی بەعسیەکان بۆ سەر کۆمەڵگای کوردی؟**

**سالار مەحمود:** ئەنفال ئەو ناوەی تەنیا بەعسیەکانو شۆڤێنیەکانو لەئێستاشدا پاشماوەکانیان شانازی پێوە دەکەن، زنجیرەیەك پەلاماری یەك لەدوای یەکی لەناوبردنی بەشێکی دیاریکراوی کوردستان بوو بەدانیشتوانەکەیەوەو قڕکردنیی ژیان بوو لەهەموو بونەوەرێك، بە پیلانێکی نەخشە بۆکێشراو پەلامارەکان دابەشکرابوونە سەر هەشت قۆناغ بۆ سەر شەش ناوچەی جوگرافیایی، کەبەسەرپەرشتی راستەوخۆی عەلی حەسەن مەجید لە1988/2/23ئەنجامدراو تا رۆژی 1988/9/6ی خایاند، لەو شالاوانەدا توانرا4500 گوندی پرلەمرۆڤی بێدەرەتانو بەمانا زانستیەکەی (سڤیل)، کەلە ژیانێکی ئاسایدابوون بەهەموو سەروەتو سامانێکی ئاژەڵداریی کشتوکاڵیو مرۆییو سروشتیەوە هەوڵی لەناوبردنیان دراو، تیایدا ئەنجام زیاد لە 182هەزار مرڤی کورد بوونە قوربانی. هەروەها ناوچەیەکی زۆری کوردستان لەژیان قڕکرا.

ئەو کارەساتە بێگومان پێشینەی هەبووەو پێشوەختیش بەبەرنامە ئیشی لەسەر کراوە، رژێمی بەعس لەو سەردەمەدا هەموو ئیمکانیەتێکی داراییو سیاسیو سەربازیو لۆجستیو هەواڵگرییو اگەیاندنیشی بۆ ئامادەکردبوو.

رژێمی سەدام حسێن لەقۆناغێکدا ئەنفالی ئەنجامدا کەچیتر هەوڵی جینۆسایدکردنی نەتەوەیەکی لەناو وڵاتێکدا بەشاراوەیی نەهێشتەوە، بێپەردە کەوتە هەڵسوکەوتێك کەبەشێوازێکی ئاشکراو دوور لەمەترسیو سڵکردنەوە لەوڵاتانی گەورەی زلهێزی دونیاو ناوەندەکانی جیهانی مافی مرۆڤ و دادگای دادی نێودەوڵەتیوئەنجومەنی ئاسایشو نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو ئەو زلهێزو ناوەندانەی بەهەند وەرنەگرت، جگە لەوە لەبەڵگەنامەکانی دواتردا دەرکەوت عەلی کیمیایی بەشریتی دەنگی لەبەرامبەر هەر بەدەنگەوە هاتنێکی ئەو ناوەندانەدا جنێوی زۆر خۆی ئاسای پێداوون. بەو پەڕیی ملهوڕیەوە رژێمەکە ویستی چیتر ئەو بەرنامەیەی کە هەیبوو بۆ لەناوبردنی خەڵکی کوردستان لەکوردستانی عیراقدا بیکاتە مەسەلەیەکی ئاشکرا. واتە ئەنفال قۆناغی ئاشکراکردنی جینۆسایدکردنی خەڵکی کوردستان بوو.

لەڕۆژانی دوای تەواوبوونی شاڵاوەکانەوە ئیدی پرۆژەو دەزگاو قوتابخانەو سەربازگە دامەزرانو بەناوی(ئەنفال)ەوە ناونران وەك شانازیەکی گەورە بۆ ئەو کۆمەڵکوژیە، هێشتا بەشێکی ئەو ناوانە لەباشورو ناوەڕاستی عیراق قوتابخانەو دەزگا هەن ناونراون بەنفال بۆ نمونە قوتابخانی ئەنفال لەبەسرە.

**عەرعەر: کەواتە ئەنفال پرۆسەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو بووە بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کورد لەعیراقدا؟**

**سالار مەحمود:** بەڵێ وەك وتم نەك هەربەرنامە بۆ دارێژراو بوو، بێگومان لەو سەردەمەدا بەپێی بەرژەوەندیە ئابووریو سیاسیەکانی وڵاتانی دەوروبەر، هەروەها بەهۆی شۆڤێنیەتی هەندێ وڵاتانی عەرەبیو ئیسلامی، بەهۆی پەیوەندیە زەبەلاحە دیبلۆماسیەکانی رژێمی ئەو کاتەی عیراق لەگەڵ وڵاتانی زلهێزدا وای کرد بێدەنگیەکی گەورە لەئاست ئەو تاوانانەدا بنوێنرێت، لەپیلانو بەرنامەکانی رژێمی دیکتاتۆری سەدام حسێن هەموو ناوەندە نێودەوڵەتیەکان لەوە بەئاگا بوون.

لەمێژوودا بەتایبەتی لەساڵی 1988دا بێ دەرەتان ترین نەتەوەو میلەت تەنیا کورد بووە بەبەرچاوی دونیاوە قەتڵ و عام بکرێت، لەو ماوەیەدا هەموو کەرەستە سەربازیە مۆدیرنەکان بەکارهێنران بەچەکی کیمیاویشەوە، لەماوەیەکی زەمەنی کورتدا مەساحەیەکی زۆر لەدانیشتوان بەخەڵکەکەی چۆڵکراو ژیان تیایدا فڕکرا.

رژێمی بەعس ئەو سەردەمە ئەیویست بۆ هەتاهەتایە مەترسی لەسەر ئەو رژێمە نەهێڵێتەوە، چونکە بوونی بزووتنەوەیەکی بەرەنگاریی لەکوردستانی عیراقداو، خەباتکردن بۆ بەدەستهێنانی مافە نەتەوەیەکانی خۆیو چەسپاندنی سیستەمێکی دیموکراسی لەعیراقدا هەڕەشەیەکی گەورەبوو، لەبەردەم بەرژەوەندیو دەسەلاتی تۆتالیتاریی ئەو سیستەمە سیاسیە تاکڕەوە دیکتاتۆریەی کەلە عیراقدا خۆی سەپاندبوو، رژێم ئەو سەردەمە ئەیویست بەو شێوازە توندوتیژیە، تائەوپەڕی درندەیی بتوانێت ماکی ئەو بزوتنەوەیە لەڕەگو ریشەوە هەڵکێشێت، بۆیە یەکەم قۆناغی دەستپێکردنی شاڵاوی ئەنفال بۆ سەرسەرکردایەتی شۆڕشی نوێی خەڵکی کوردستان بووە کە ئەوکاتە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ڕێبەرایەتی ئەو شۆڕشەی ئەکرد بەشێوەیەکی سەرەکی، بۆیە بارەگاکانی سەرکردایەتی رادیۆی مەرکەزیو بارەگا سەرەکیەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانو تەنانەت بارەگای سەرەکی

مام جەلال، هەموو ئەوانە ئامانجی سەرەکی شالاّوی ئەنفال بوو. وەکو چۆن سەدام حسێن بۆچاودێریکردنی شالاّوەکانی ئەنفال لە1988/3/12دا هاتۆتە سلێمانیو لەنزیکەوە چاودێری بەڕێوەچوونی شالاّوی ئەنفالی کردوە، کاتێك ئەو ڕێوشوێنانەی کەلەهەڵەبجەو دەوروبەری شارەزوور گیرابوونەبەر، بەسەدام حسێن رائەگەیەنرێت کەمەترسی گرتنی هەڵەبجە لەلایەن هێزی پێشمەرگەو خەڵکی تروە لەئارادایە، ئەو بە رستەیەك وەلاّم دەداتەوەو بەدەوروبەرەکەی دەڵێت: هەڵەبجەو شارەزوور گرنگ نیەو چارەسەرەکەی ئاسانە، گرنگ سەری مارەکەیە لێرە، مەبەستی بارەگای مام جەلال بووە لەناوچەی سەرگەڵوو.

بەچەند رۆژێکی کەم دەرکەوت چارەسەری ئاسان بەنیسبەت سەدامەوە کیمیاباران بووە.

**عەرعەر: ئەنفال پەلامارێك بوو بۆ سەر هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگای کوردی بەژنو پیاو منالەوە، نمونەی جیهانیی دیکەی وەکو ئەنفال لەکوێ روویداوە؟**

**سالار مەحمود:** بەڕای من ئەنفال لەمێژووی هاوچەرخدا نمونەیەکی زیندووی ئەوتۆی نیە، لەمێژوودا کۆمەڵکوژییو تاوانی جۆربەجۆر کراون دژ بەمرۆڤایەتی. جینۆسایدی جیاجیای رەگەزیو کەلتورییو نەتەوەییو ئاینیی کراوە، بەلاّم شالاّوی ئەنفال لەقۆناغێکدا کراوە کەیاسای قرکردنی جینۆساید لەلایەن ئەنجومەنی گەلانەوە دەرکراوە، هەروەها دروستبوونی ناوەندی گەورەی وەکو رێکخراوی نەتەوەیەگرتوەکان، ولاّتانی خاوەن پەیماننامەی دژ بەهەر هەوڵێك بۆ جینۆسایدکردنی رەگەزێکی ئاینی یان نەتەوەی یان هەرجۆرێکی تر ئیمزا کراوە، دادگای دادی نێودەوڵەتی دروست بووە. لەسایەی دوای ئەو ریکەوتنامانەدا شالاّوی ئەنفال جێبەجێ کراوە، دیارە بەبیرێکی کۆنو کەرەستە هەرە پێشکەوتووی قڕکردن، چونکە ئەگەر ئێمە بگەرێینەوە بۆ مێژووی عەرەبو مێژووی کەلتووری ئیسلامیش دەبینین ئەنفال بەجۆرێك لەجۆرەکان کراوە، ئەگەر لەسەردەمی ئیسلامدا دژ بە بێباوەڕان یان دینێکی تر، یان خەڵکانێکی تر کەلەسەر ئاینێکی تر بوون، یان خود ئەگەر لەقۆناغی جەهالەتدا لەشەڕو رێگەی بەرژەوەندیە هەرە تەسكو کۆنە خوازیەکانەوە کرا بێت، بەلاّم لەسەردەمی تازەی کوردستاندا کورد وەکو ئاین هەڵگری ئاینی ئیسلام بووە، لەدونیای پێشکەوتوشدا گەلانو نەتەوەکانی دونیا، بەپێی پەیماننامە نێو دەوڵەتیەکان مافی ئەوەیان هەیە کەچارەنوسی خۆیان دەستنیشان بکەنو داوا بکەن، خاوەنی ئازادیو ژیانی ئاسایی بن، بەلاّم لەکوردستانو لەسایەی سیستەمێکی وەکو بەعسدا هەموو ئەوانە بەجینۆسایدو قڕکردن وەلاّم دەدرێنەوە، ئەگەر ئێمە بەبەراورد قسە لەسەر ئەرمەنەکان بکەین، ئەوە قۆناغێکی تر بووە هیچ بەراوردێك لەبارەی ئەنفالی کوردو ئەرمەنەکاندا ناکرێت، هەروەها بەتایبەت هۆلۆکۆستیش چونکە ئەو سەردەمە، سەردەمێك بووە شەڕی جیهانی بووە، لەهەردوو قۆناغەکەدا ئەو کات هەموو دونیا لەشەڕدا بووە، بەلاّم لەساڵی 1988دا هەموو دونیا لەشەڕدا نەبوو، شەڕی نێوان عیراقو ئێرانیش لە قۆناغی کۆتایی هێناندا بوو، حەز دەکەم ئەوەش بیر بهێنمەوە کەقۆناغی هەشتەمی ئەنفال لەسەردەمێکدا بووە کەشەڕی نێوان عیراقو ئێران بەڕەسمی راگیراوە، لەبەر ئەوە بەپێی خوێندنەوە عەقڵانیو زانستیەکانیش بەراودرێکی ئەوتۆ نابینم لەنێوان

پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کوردەکانو ئەو هەوڵە تاوانکاریانەی تر کەلە جیهاندا روویانداوە. بەڵام تاوان هەر تاوانە، جینۆسایدە هەر جینۆسایدەو بۆ ئەنفالی کورد بەعس سودی لەهەموو شێوازەکانی تاوانی لەناوبردندا بینیوە بەتایبەتی ئەنفالی سەردەمی ئیسلامو هۆلۆکۆستی جولەکەکانو جینایەتی تریش.

**عەرعەر: لەقسەکانتدا باست لەپەیوەندی نێوان ئاین و پرۆسەی ئەنفال کرد، دەکرێت بڵێین رژێمی سەدامو داردەستەکەی ئاینی ئیسلامیان کرد بەئامرازێك لەپێناو بەرژەوەندی خۆیان بۆ ئەنجامدانی تاوانی ئەنفال بۆ سەر گەلی کورد؟**

**سالار مەحمود:** بێگومان مەسەلەیەکی حاشا هەڵنەگرە، کەئەنفال لەسەردەمێکدا روویداوە کەمەسەلەی ململانێی ئاینی لەعیراقدا نەبوە، بەڵام رژێمی دیکتاتۆری بۆ ئەوەی بتوانێت جۆرێك لەهاوپشتی لەئەنجامدانی ئەو تاوانە بۆخۆی پەیدا بکات، سودی لەهەموو چەمکەکان بینیوە هاتووە وای پیشانداوە کەکورد مەترسین لەبەردەم یەك پارچەییو یەکڕیزیی هەموو وڵاتانی عەرەب، گوایە مەترسین لەسەر ئاینەکەیان، بۆ ئەوەش ناونیشانی سورەتێکی قورئانیان کردوە بەناونیشانی پرۆسەیەکی شەڕخوازی بۆ لەناوبردنی سەدان هەزار مرۆڤو تەختکردنی هەزارەها گوندو شارۆچکەی بچوكو تەنانەت شاریش کەهەر یەکێك لەو گوندانە خاوەن مزگەوت یان خاوەن خانەقاو بووەو بێ قورئان نەبووە، لەبەر ئەوە ئەگەر ئێمە بەهەرجۆرێك لێکیبدەینەوە  دەبینین دونیای عەرەب لەو کارەساتەدا بێدەنگیان نواند، بێدەنگی نواندنیش بۆ ئەنفال خۆی بۆخۆی بەشێکە لەبەشداری کردن لە پرۆسەی ئەنفالدا، وەك چۆن(کەنعان مەکیە)لەکتێبی(بێدەنگیو دڵڕەقیدا)باس لەوە دەکاتو ئاماژەی پێدەکات کەبێدەنگی دونیای عەرەب لەبەرامبەر تاوانی ئەنفال کەدەرهەق بە خەڵکی کوردستان کرا، بەئەستانەی دڵڕەقی سەدام حسێنو رژێمی بەعس بۆ ئەنجامدانی تاوانی ئەنفال، تاوانبارییە.

خۆ ئەگەر لەتاوانەکانی پێشتردا وڵاتانی ئاگادارو نزیك بێدەنگ نەبوونایە بێشك بەو بەرفراوانییەوە لەو ئاستە هەرە مەترسیدارەدا هەموو شتێك کۆتایی پێندە هێنرا.

**عەرعەر: هەوڵە ناوخۆی و نێودەوڵەتیەکان چۆن هەڵدەسەنگێنی بۆبەجینۆساید ناساندنی پەلاماری ئەنفال بۆسەر گەلی کورد؟**

**سالار مەحمود:** زیاد لەبیستو یەك ساڵە  ئەنفال ئەنجامدراوە تائێستا بەخوێندنەوەیەکی واقعیانەوە لەگەورەی ئاسەوارەکەیو دۆخەکە تێنەگەشتووین،  هێشتا هەوڵەکانی ئێمە لەئاستی پێویستدا نین بۆ ناساندنی کارەساتی ئەنفال، بەئەستانەیەك کەئێمە وەکو نەتەوەیەکی خاوەن تراژیدیای بێ وێنە لەمێژووی هاوچەرخدا نەمانتوانیوە ئیستسماری ئەو کارەساتانە بکەین لەرووی سیاسی، لەرووی ئابوریی، لەرووی کۆمەڵایەتییەوە، ئەمە بەشێوازێکی راستەقینە نەمانکردۆتە بەشێك لەناسنامەی خۆمان، وەکو چۆن پێویست دەکات ئێمە لەهەموو گفتوگۆ سیاسی و دیبلۆماسیەکانماندا وا خۆمان بناسێنین کەگەلێکین خاوەنی ئەنفالو خاوەنی کیمیابارانی هەڵەبجەینو مەزلۆمترین نەتەوەی ئەم سەردەمەین کەهێشتا خاوەنی کیانێکی جێگیرنین لەبەرئەوەش دەبینین کەمتەرخەمیمان لەئاستێکی زۆر نیگەرانیدایە بەتایبەتی هێشتاکە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ئێمە نەمانتوانیوە ئیش بۆناساندنی

کەیسی ئەنفالو کیماباران بکەین، هێشتاکە لە ئاستێکی باڵادا ڕێکخراوی گەورە دروست نەبوون لۆبی گەورە دروست نەبووە، نەتوانراوە لەئاستی دادگای نێودەوڵەتی ئیش لەسەر ئەو کەیسە بکرێت، بەشێکی زۆر لەتاوانبارانی ئەنفال هێشتاکە وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون بەشێکیشیان بەهەر هۆیەکەوە تیا چووبن کرانە شەهیدی ئەم نەتەوە ئەنفالکراوە.

ڕاستە دادگای باڵای تاوانەکان لەعیراقدا، توانی هەرە گەورە تاوانبارەکانی بەعس لەسەدام حسێنەوە تاوەکو ئەوانی تر لەقەفەسی زیندانی قەتیس بکات، بەڵام دواجار دەبینین لەکەیسی ئەنفالدا هێشتاکە بەشێکی زۆر لەوانەی کەسزای دادگایان بەسەردا سەپێنراوە، ئەو سزایانە جێبەجێ نەبوون! ئەمەش کاریگەری لەسەر مسداقیەتی ئەو بڕیارانەو، هەروەها ئەو دەسەڵاتەی هەیە کەلەدوای دیکتاتۆریەتەوە ئەیەوێت جیاوازیەکی جەوهەری لەرووی پرەنسیپو سەروەریی دادگاو بەڕێکردنی سزاکانی، کەدادگا بەسەر هەر تاوانێکدا دەیدا جێبەجێی بکات، لەئاستی رۆشنبیریشدا ئێمە نەمانتوانیوە وەکو پێویست ئیش لەسەر ئەم مەسەلەیە بکەین، نەمانتوانیوە ئەم کارەساتە تەرجەمە بکەین بۆ زمانە جیاجیاکانی جیهان، هێشتاکە لەجوغزی رەش پۆشینو تازێباریی‌و مەرگەسات نەهاتوینەتە دەرەوەن بۆ ئەوەی ئەم کارەساتانە بکەینە کەرەستەیەك بۆخۆ نوێ کردنەوە بۆ زیندوکردنەوەی جارێکی تر، ژیانەوەی ئەو گوندو شوێنانەی بەر شاڵاوەکانی ئەنفال کەوتوون، بۆ بەهەستانەوەی باری تێکشکاوی دەروونی کەسوکاری قوربانیانی ئەنفالو کیمیاباران، هەروەها بۆ دروستکردنی سیمبولی گەورە گەورە لەو شوێنانەی کە کارەساتو تاوانەکانیان تێدا ئەنجامدراوە. بۆ ئەوەی ببنە رەمزێك کەبەهەقیقی هەموو کەسێك کەساتێك لەساتەکاندا چاوی بەو سیمبولانە دەکەوێت یەکڕاست کارەساتەکانی بیتەوە پێشچاو، دەسەڵاتی سیاسی کوردستان وەکو پێویست کاری لەسەر ئەوە نەکردوە کەنەوەی نوێ بەهەقیقی تێبگا ئەو کارەساتانە بە چ ئاقارێکدا دروست بوون، کەمتەرخەمیەکەی ئێمە وەکو گەلی ئەنفالکراو بەو دەسەڵاتەشی هەمانە لەچوارچێوەی هەرێمدا لەبەرامبەر کارەساتی ئەنفالدا بەراستی مەترسیدارە، لەبەرئەوەی هەموو دەرفەتێك لەبەردەستدایە ئیش بکەین، چونکە مەترسی گەورە نەماوەو دەروازەکان کراوەتەوە، ئەمڕۆ جیهان لەبەردەم خەڵکی کوردستان و ناوەندەکاندا کراوەتەوە، ئێمە لەهەرێمی کوردستاندا دەسەڵاتێکی رەهامان هەیەو دەتوانین ئەم کارەساتانە بکەینە لۆبیەکی گەورە، بەڵام کەناکرێت یان دەبینین هەوڵەکان زۆر زۆر بچوکن، ئەمەش یەکێکەلە پرسیارەکانو یەکێکیشە لەو گازندانەی کەئێمە ساڵانە نەك لە4/14دا، بەڵکو لەهەموو بۆنەو فۆناغەکانی ئەنفالدا تیشکی خراوەتە سەرو ئاماژەی پێکراوەز

هیوادارین لێرە بەدوا بتوانرێت لەرێگەی ئەو دادگایەی کەیسی ئەنفالو کیمیابارانی هەڵەبجەو کەیسی بارزانیەکانو کەیسی فەیلیەکانی لەخۆگرتووە بتوانین هەنگاوێکی زیاتر، هەروەها ئەو هەنگاوەشی لەرێگەی ئەنجومەنی نیشتمانی عیراق لە 2008/4/14دا ورژێنرا بۆ ناساندنی هەموو ئەو تاوانانەی کە دەرهەق بەخەڵکی کوردستان کراوە بەجینۆساید لەلایەن رژێمی پێشووی بەعسەوە کراوە، هەموو ئەمانە بکەینە توێشوویەك بۆ ئەوەی بتوانین لەداهاتودا ئیش لەسەر کەیسی ئەنفال بکەین،

لەڕەهەندە نێو دەوڵەتیەکەی، چونکە ئەم کارەساتە ئەکرێ بیکەینە کەرەستەیەك بۆ بەدیهێنانی زۆر ماف کەهێشتا بەدەست نەهاتوون خەونی لەپێشینەی کەسوکاری قوربانیانی ئەنفالو کیمیابارانیشە، بۆ ئەوەی نەك تەنیا لەکوردستانی عیراق بەڵکو لەپارچەکانی تری کوردستان کەدابەشکراون بەسەر چەند وڵاتێکدا کەچەند رژێمێکی سەپێنراو بەسەر خەڵکی ئەو وڵاتانەوە حوکم دەکەن، بۆ ئەوەی کارەساتی لەو بابەتە دووبارە نەبێتەوە،

ئێمە لەهەموو رەهەندەکانەوە پێویستمان بەوەیە بەبەردەوامی ئیش لەسەر ئەو کەیسانە بکەین، وابکەین ئیشەکانمان هەوڵی واقعی بن دوور بن لەکاریگەری سۆزو عاتیفە، مەسەلەی لۆژیك‌و فکرو مەسەلە رۆشنبیریەکان زاڵ بن، بارگاوی بن بەهەقیقەتێکی زانستی بۆ ئەوەی بتوانین هەم بە بارتەقای تاوانەکان ئیشی گەورە بکرێت ،وەکو چۆن ویژدانی ئێمەی هەژاند ئەو کارەساتانە بەو جۆرەش وابکەین بێدەنگی هەموو ناوەندە نێودەوڵەتیەکان، هەموو رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان، هەموو وڵاتانی زلهێزی ئەو سەردەمە کەبێدەنگیان نواند بیهێنینە سەر بارێك کەئەوانیش بەجۆرێك لەجۆرەکان بەشداربوونە لەو تاوانانە، لەرووی ویژدانیەوە بیانهێنینە هۆش بۆ ئەوەی لەدەرئەنجامی ئەو بەهۆش هاتنەدا بتوانین لەئایندەی ژیان‌و گوزەران لەم هەرێمە، خەڵکی کوردستان لەهەر پارچەیەکی تری کوردستان کارێك بکەن بتوانن بەربەستێك دابنێن لەبەردەم هەر ئەگەرێکی تری دووبارەبوونەوەی کارەساتی هاوشێوەی وەکو ئەنفال‌و کیمیاباران.

**عەرعەر: لەدوای چەندین ساڵ لەپەلاماری ئەنفال بۆ سەر هاوڵاتیانی مەدەنی لەهەرێمی کوردستان‌و دامەزراندن‌و سەربەخۆبوونی حکومەتی هەرێم و پەرلەمان‌و دەسەلاتی کوردی، بەڕای تۆ چی کراوە بۆکەسوکاری شەهیدان و قوربانیانی دەستی ئەنفال؟**

**سالارمەحمود:** هەرچیەك کرابێت کەمتازۆر ئەم دەسەلاتەی کەهەیە بەرهەمی خوێنی شەهیدان‌و کەسوکاری ئەنفالەکانە، بەر لەهەر هەنگاوێك واجبی سەرەکیەتی ئیش لەسەر هێنانەوە باری تەندروستی خەڵکەکە بکاتەوە لەرووی دەروونیەوە، خەڵکی پاشماوەی ئەنفال‌و کیمیاباران بەڕاستی هەست بکەن کەئەم دەسەلاتە دەسەلاتی خۆیانە، هەموو ئیمکانیەتێکی نەك تەنیا مەسەلەی ئاوەدانیی‌و پرۆژەی تەندروستی‌و خوێندەواریان بۆ فەراهەم بکرێت، پێویست دەکات زۆرتر لەرووی سیاسیەوە ئەم دەسەلاتە سیاسیە ئیش لەسەر ئەوە بکات کەبەبەردەوامی قوربانیەکانی کەسوکاری ئەنفال‌و زامی ئەنفال بەشێك بێت لەناسنامەی نەتەوەیی لەهەموو رێورەسمە نێودەوڵەتی‌و سیاسی‌و دیبلۆماسیەکاندا بەزمانی ئەوانەوە قسە بکات، دواجار ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان، دابینکردنی ژیانێکی شایستە بۆیان، داکۆکیکردن لەسەر خواستە تایبەتی‌و گشتیەکانی کەسوکاری قوربانیان‌و ئەنفال، بەشی سەرەکیترینی ئەجندای حکومەتی هەرێمی کوردستان بێت، وە ناردنی برینداراني کیمیاباران بەشێوەیەکی بەرچاوتر لەوەی کەهەیە ببرێنە دەرەوە بۆچارەسەرکردنیان، هەروەها ئامارێکی راستەقینەتر لەوەی کەهەیە دەربارەی ژمارەو جۆرو قەبارەی ئەو کارەساتەی کراوە بۆ نمونە پێویست دەکات وەزارەتی پەروەردە ئاماری راستەقینەی لەبەردەستدا بێت کەچەند قوتابخانە

لەشالآوی ئـەنفال‌و کیمیابارانـدا رووخێنـراوە، وەزارەتـی ئـەوقاف‌و کاروبـاری ئـاینی ئامارێـك بکـات بـۆ ئـەوەی بزانرێـت لەسـاڵی1988و قۆناغـەکانی تـری ئەنفالـدا چـەند مزگـەوت‌و خانـەقا روخێنـراون، وەزارەتی کشتوکاڵ بزانێت چەند سەروەت‌و سامانی کشتوکاڵی‌و دانەوێڵە فەوتێنراون، هەروەها هـەموو ئـەو رێوشـوێنانەی کەپەیوەندیـدارن بـەدامودەزگا پەیوەندیـدارەکان لـەبواری ئـابوریی‌و کۆمەڵایـەتی‌و پیشەسازیی‌و کشتوکاڵیی و مرۆیی‌و دەروونی، هەموو لایەنەکانی ئەوانی تریش کـاری لەسـەر بکرێـت، وەزارەتـی تەنـدروسـتی ئـیش لەسـەر ئـەوە بکـات بزانێـت چـەند نەخۆشـخانەو بنکـەی تەنـدروسـتی روخێنراون، چەند کەسی پاشماوەی ئەنفال‌و کیمیاباران توشی نەخۆشی دەروونی، توشی زیانگەیانـدنی جەسـتەی بـوون لـەو شـالآوانەداو لەرێگـەی زیندانـەکانی نـوگرە سـەلمان و دوبـزو تـۆپزاواو شـوێنەکانی تـرەوە، هـەموو ئەمانـە پێویـست دەکـات ئـەو رێوشـوێنانە بـن کـە بـەپێی بەرنامـە بگیرێنەبـەر، نـەك وەزارەتـی شـەهیدان یـان هـەر دەزگایـەکی تـر لەحاڵـەتی نەسـتیـشدا لەخەیاڵیـشدا وا هـەنگاو هـەڵبێنن مێـژووی کارەسـاتەکان بـشێوێنن بـۆ مەبەسـتی تـر، لەناوخەڵکـەوە ئیـشی لەسـەر بکـرێن بـۆ ئـەوەی کەسوکاری ئەنفال‌و کیمیاباران بەڕوونی لایان بچەسپێت کە ئەم دەسەڵاتە بەگرنگیەوە دەڕوانێتە بـارو گـوزەران‌و ژیانیـان، بەشـێوەیەکی گشتی دەسـەڵاتی کـوردی‌و حزبـەکان بەتایبـەتی، بۆنـە نەتـەوەیی‌و تراژیدییـەکان لەچوارچێوەی بۆنـەی حزبـی‌و کـارو چالاکی حزبیـدا قـەتیش نەکـەن، چـونکە ئەمانـە کارەسـاتێکی نەتــەوەیی گــەورەن. کارەســاتێکە بەســەر هــەموو گــەلی کــورددا هــاتووە بەهــەموو بۆچوونەکانیەوە، تاوانێکی گەورەیە لەهەر ساتێکدا خـەڵك هەسـت بکـات کـەلێرەو لـەوێ پارتێـك یـان دەسەڵاتێك بۆنـە حزبیـەکانی خۆیـان فـەرز بکەنـە سـەر بۆنـە نەتـەوەیی‌و نیـشتیمانی‌و تراژیـدیاکانی نەتەوەدا، ئەم قۆناغەی کەئێستا بیست‌و یەك ساڵ بەسـەر شـالآوی ئـەنفال‌و کیمیابارانـدا تێدەپـەڕێت شیاوترین قۆناغە کەئێمە لەهەموو ئەو لایەنانەی کەلەچوارچێوەی ئەم گفتوگۆیـەدا قـسەمان لەسـەر کـرد، ئیـشی لەسـەر بکرێـت بـۆ ئـەوەی بتـوانین ژیـانێکی شایـستە بـۆ کەسـوکاری ئـەنفال‌و کیمیابـاران بەتایبەتی‌و نەوەی نوێ بەگشتی، هەروەها بۆناساندنی کەیسی ئەنفال، بۆ بەرز راگرتنـی ژیـانی مـرۆڤ، گێرانــەوەی بــەهای راســتەقینە نــەك تــەنیا بــۆ مــرۆڤ، بــەڵکو بــۆ سروشــت‌و بــۆ ئــاژەڵان‌و بــۆ هــەموو گیانەوەرێك کەلەچوارچێوەی شالآوەکانی ئەنفالدا زیانیان بەرکەوتووە ئەمـەش بەچـەندین رێوشـوێنی تایبــەت بــەدیکۆمێنتکردن‌و بەبــەردەوامی خوێندنــەوەو شــرۆڤەکردنی رێوشــوێن‌و بەرێوەچــوونی کارەساتەکان، بەبەردەوامی دواندنی ئەو کەسانەی لەناو واقیعەکەدان‌و ژیاون، تێکڕا ئەم شتانە لەگەڵ چـەندین رێوشـوێنی تـر، گـرنگن بـۆ ئـەوەی بەبـەردەوامی نـەوەکانی داهـاتووش ئاگـاداربن‌و هـەم لەکارەساتەکانمان تێبگەن، هەروەها لەسیستەمی پـەروەردە لەباخـچەی ساوایانەوە تابـەرزترین ئاسـتی پـەروەردەیی‌و فێکـردنیش بیـچەسپێنین. بـۆ ئـەوەی نـەوە لـەدوای نـەوە ئـەم پەیامـە بدەینـە دەسـت نەتەوەکەمان، بۆ ئەوەی چیترلەبەرامبەر کارەساتێکی لەو بابەتە ئامادەی بەرگریان تێدا بێت، دونیاش لەم کارەساتە بەجدی ئاگادار بکرێتەوە.

# تەحسین حەمە غەریب:
# پۆرسەی ئەنفال هیچ پیەوەندی بە دینەوە نیە، بەڵکو لە سەدا سەد پەیوەندی بە مۆدیرنێتەوە هەیە

چاوپێکەوتن: سامان ئەحمەد



هەرکاتێك گوێبیستی ناوی ئەنفال دەبین راستوخۆ سەرنجمان بۆ سورەتێکی قورئان دەچێت، بۆ تیشك خستنە سەر ئایناندنی ئەنفال‌و رۆڵی ئاین وەکو ئامرازێك بۆ ئەنجامدانی ئەنفال، هەروەها ئاین وەکو قوربانیەکی تری حیزبی بەعس‌و رۆڵی وڵاتانی جیهانی عەرەبی‌و ئیسلامی لەکاتی شاڵاوەکانی ئەنفال‌و دوای ئەو شاڵاوە، گۆڤاری عەرعەر ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ نوسەرو روناکبیر (تەحسین حەمە غەریب) ئەنجامدا.

**سامان: لەڕووی سیاسی یەوە ئەنفال بەو نەخشە بۆ دارێژراوە دادەنرێت کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە دژ بە نەتەوەی کورد ئەنجامدراوە، لە رووی ئاینیەوە ئەنفال چۆن دەناسێنی؟**

تەحسین حەمە غەریب: لە ڕاستیدا ئەنفال هەروەکو چۆن لە ڕووی سیاسی و سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەوە چەندین ڕەهەندی جیاوازی هەیە بە هەمان شێوە لە ڕووی ئاینیشەوە چەندین ڕەهەندی هەیە یان با بڵێین ئاین تەنها یەك قسەی بۆ ئەنفال نیە، پێش ئەوەی باسی ئەنفال بکەین لە ڕووی فیقهی و مەعریفی و ڕووحیەوە پێویستە باس لە سوورەتی ئەنفال بکەین، سوورەتی ئەنفال سورەتێکی ئابووری یە، دیدی ئابووری ئیسلامی پیشان دەدات هیچ پەیوەندیەکی بە لایەنی سیاسی و عەسکەری یەوە نیە، ئەگەر چی زۆرێك لەوانەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان کردووە لەو لایەنانەوە بۆی چوون، ئیتر دەتوانین ئەوە ڕەت بکەینەوە بە دەلیلی ئەوەی ئەنفال کۆی (نفله) نفلیش بەواتای زیادەیە، هەموو ساڵێك لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا ئاستی بژێوی کۆمەڵگا دیاری دەکرێت ئەوەی سەروەت و سامانی لەو ئاستی زیاتر بێت کە دیاری کراوە دەبێت زیادەکەی ببەخشێت، ئەو زیادەیە کە دەبەخشرێ پێی دەوترێت (نفل)، ئەوەی لە سوورەتی ئەنفالدا ڕوون دەبێتەوە سیستەمێکی ئابووری ئیسلامیە نەك بابەتێکی عەسکەری و ڕامیاری، هەروەها لەچەندین فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتووە کە

خوای گەورە داوای کردووە کۆمەڵێک ببەخشن بە کۆمەڵێکی تر چی (نفل)ە، دەتوانین بڵێین بەشێك لە سورەتی ئەنفال بریتی یە لە بابەتی شەڕو سەربازی واتە دابەشکردنی ئەو دەستکەوتە ئابووریانەی لەشەڕدا دەستی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەوێت ئەو دابەش کردنەش دەبێت بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بێت بەسەر هەموو کەسێکدا واتە پەیوەندی بە عەدالەتی تەوزیعەوەی هەیە، بۆیە بە بۆچوونی من هیچ پەیوەندی بە بابەتی عەسکەری و جەنگەوە نیە، یەکخستنەوەی ئەم بابەتە لەگەڵ پرۆسەی ئەنفال خۆی لە خویدا جۆرە شێواندنێکی تێدایە، ئەگەر بێت و بەراوردێك بکەین ئایا ئەنفال دابەشکردنی دەستکەوتێك بوو بەسەر کۆمەڵگای ئیسلامیدا یاخود لەناو بردنی کۆمەڵێك موسڵمان بوو یان ئەوەی دەسەتیان کەوت بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی بوو یان بۆ کۆمەڵێکی دڕندە بوو بۆ تێرکردنە ئارەزووە سایکۆلۆژیە شێواوەکانی خۆیان بوو ئایا عەدالەتی تەوزیع هەیە، لەم بابەتەدا لەکاتێکدا سوورەتی ئەنفال بۆ دابەشکردنی سەرلەنوێی داهاتی کۆمەڵگای ئیسلامی هاتووە، بۆ ئەوەی نەکەویتە دەست کۆمەڵێکی کەم کە بە پێچەوانەوە خودی کۆمەڵگا لە پرۆسەی ئەنفالدا هەڵوەشایەوە نەك سامانیان بەسەردا دابەش بکرێت، بۆیە پۆرسەی ئەنفال هیچ پیەوەندی یەکی بە دینەوە نیە، بەڵکو لە سەدا سەد پەبوەندی بە مۆدیرنێتەوە هەیە و لە سیاسەتی سیستەمی نویدا پەیدا بووە ڕاستی ئەم پرۆسەیە لە کوردستاندا ناوی ئەنفالی لێ نراوە، لە شوێنەکانی تر بە شێوەیەکی دی لە دژیان ئەم پرۆسەیە ئەنجام دراوە وەکو ئەوەی لە دژی هیندی یە سوورەکان ئەنجام درا یان ئەوەی نەرم نەکان کرا ، ئەم جۆرە پرۆسانە لە سیستەمی نوێدا پێی دەوترێت ستراتیژی ناو لێنان واتە چ جۆرە ناوێك بۆ پرۆسەکە هەڵدەبژێریت، ڕژێمی بەعس توانی جۆرە شێواندنێکی تەواو بکات و جینۆسایدێك لە سەردەمی نوێدا ئەنجام بدات بۆیە پرۆسەی ئەنفال بە هیچ چەمکێك لە چەمکەکانی ئاین ناخوێندرێتەوە و هیچ پەیوەندی یەکی بە ڕووحی سورەتی ئەنفالەوە نیە.

**سامان: ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال لەژێر نانیشانی یەکێك لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز دا بەناوی ئەنفال چ مەعزایەکی سیاسی لە پشتەوە بوو، ئایا بۆ بێدەنگ کردنی جیهانی ئیسلامی و عەرەبی بوو، لەکاتێکا کە میللەتی کوردیش هاو ئاینی نەتەوەکەی خۆی بوون .؟**

تەحسین حەمە غەریب: بێگومان پرۆسەی ئەنفال لە قوڵای هزری ناسۆنیالیستی عەرەرەبی دێتە دەرەوە کە شوناسی خۆی ناناسێت جارێك لە دیندا بۆ شوناسی خۆی دەگەڕێت جارێك لە عەعلامانیەت وسەردەمی نوێدا بۆ شوناسی خۆی دەگەڕێت، جارێك لە عەلامانەی سەردەمی نوێدا بۆ شوناسی خۆی دەگەڕێت، تینوی ناسۆنالیستە کە پەیڕەوی عەسکەرتارە بکوژە لەبەرئەوەی شوناسی واچاك نیە، بەپێی مەوقیعەکان چی بێت بە دەستەوە بەکاری دەهێنێت بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانی خۆی، ڕژێمی بەعس و سەدام توانیان جەهلەتی عەرەبی ئیسلامیان تەوزیف بکەن بەو شێوەیەی کە ئەمانە نەتەوەیەکن لەدین دەرچوون کافربوون بە ئێستاشەوە ڕەنگبێ کۆمەڵێ خەڵك هەبێ هەر بەو شیوەیە سەیرمان بکەن، بەداخەوە تا ڕادەیەك خۆشمان

ڕۆڵمان هەیە لەو تێگەیاندنەدا چونکە ڕاگەیاندنی ئێمە زۆربەی بەدەستی کۆمەڵێ کەسی سیکۆلارەوەیە کە پەیوەندیان لەگەڵ دیندا نیە، ئەم فاکتەرە بۆ قووڵ کردنەوەی ئەم تێگەیشتنە لای عەرەب و موسڵمانەکان کە ڕاست کورد بەو شێوەیەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئێمە بۆ شەرعیەتی ئەم بابەتە بگەڕێین لە دیندا چونکە سەدام حوسێن زۆر زیرەکانە ئەم کارەی تەوزیف کردبو لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا زۆربەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهانی ئیسلامی لەدەستی دەوڵەتدا بوو . زۆربەی دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتەکانیش هاوشێوەی دەسەڵاتی صەدام حوسێن بوون.

**سامان: بێ دەنگ بوونی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی پەیوەندی بە جەهالەتی عەرەبیەوە هەیە یان دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ڕژێمی صەدام و بەعس وایان لە ئەوان گەیاندبوو کە ئەمانە نەتەوەیەکن پەیوەندیان لەگەڵ هەندێ لە وڵاتی نەیاری ڕژێمی صەدام و بەعس و تەنانەت دینی ئیسلامیشەوە هەیە؟**

تەحسین حەمە غەریب: خوێندنەوەی من بۆ شتەکان خوێندنەوەیەکی ئەخلاقیانەیە دیدی ئەخلاقیانەی من ڕەشبین نیە بەرامبەر بە مرۆڤەکانی تر ئەو بیردۆزەی هاقەر و مانسم قبوڵ نیە کە دەڵێت مرۆڤ گورگی مرۆڤە ڕاستە لەناو مرۆڤەکاندا گورگ دەست دەکەوێت، بەڵام من پێم وایە زۆرینەی مرۆڤەکان ئەکەر حەقیقەتیان دەستکەوێت شوێنی دەکەون، ئەوەندەی لەم بابەتەدا سەدام حوسێن و سیستەمی بەعس تەوزیفی نەزانین و بێ ئاگایی جیهانی عەرەبی ئیسلامی کرد، ئەوەندە خراپی ئەو میللەتانە نیە، من قەناعەتم وانیە کە عەرەب خراپ بێت یان هاوکاری سەدامی کردبێت بۆ ئەوەی میلەتی کورد لەناو ببات، نەگەیشتنی هەواڵ بە ئەوان جەهالەت هۆکارە لەبێ دەنگ بوونی ئەوان لە کێشەی ئەنفالدا. سەدام حوسێن لە ڕووی ئەخلاقیەوە مونافیقانە **مامەڵەیان** لەگەڵ جیهانی دەرەوە کورد دا کردووە، چونکە مونافیق ئەوەیە کە ڕاستی یەك ئەزانێ و ئەیشارێتەوە، پاشان گریمان کورد دکافریش بێت و پشتیوانی دەوڵەتانی غەیرە ئیسلامیش دەکات ئایا لەکوێی دینی ئیسلامدا ڕەوایە منالی کافر بکوژرێت دینی ئیسلام ڕێگە نادات نەمامەکان ببڕنەوە. بەڵام ئەی ئەو منداڵەی کە کیمیایی کرا بە قوڕگیا، ئەو ئافرەتانەی کە بران کام لۆژیکی ئاینی و ئەخلاقی ئەمە دەخوێنێتەوە، مرۆڤ بە ئەخلاقەکانی جیهانی ئیسلامی ئەوەیان قەبوڵ نیە، کێشەکە ئەوەیە کە پێیان نەگەیشتووە، ئێستاش هەندێ لە ڕاگەیاندنەکانی عەرەبی وا پیشان دەدات کە ئێمە خەتایەکمان کردووە یان باوەڕناکەن کە سەدام کارێکی وای کردبێت، تا ئێستاش هەندێك لەم سیستەمانە بوونەتە پەردەیەك بۆ شاردنەوەی ئەو حەقیقەتانە، ئەم کێشەیە کێشەی ڕژێمی نوێ و ڕژێمە هاوشێوەکانی خۆیەتی، ئەگینا جیهانی عەرەبیش وەکو هەموو مرۆڤە بە ئەخلاقەکانی تر مرۆڤی بەهەستیان تێدایە، بەڵام کاتێك کە ڕاستیان پێناگات تاوانیان چیە، ئەم بێدەنگیە تەنها جیهانی ڕۆژهەڵاتی نەگرتەوە بەڵکو جیهانی ڕۆژئاواش لێی بێدەنگ بوون لەسەر ئاستی سیستەم نەك لەسەر ئاستی تاك، لە کاتێکدا بەهۆی مامەڵە کردنمان لەگەڵ جیهانی ڕۆژئاوا زووتر ڕاستیەکانیان پێ گەیشت. تاوانی ئەنفال چۆن لە

جیهانی ڕۆژهەڵات شارایەوە بەهەمان شێوەش لە ڕۆژئاواش شارایەوە، زۆر درەنگ بەوەیان زانی کە ئێمەی کورد چیمان بەسەردا هاتووە ئەگەر کۆڕەو و داگیرکردنی کوەیت نەبوایە لەوانەیە هەر نەزانرایە، کارەساتی ئەنفال مامەڵەی نائەخلاقیانەی گروپێکە بەرامبەر نەتەوەیەك لە ئەنجامدا نەتەوەی کورد مافی چارەی خۆنوسینی هەیە خواردنی ئەم مافە نائەخلاقیانەیە، کاتێك کە ئەنفال کراوە مامەڵەیەکی نائەخلاقیانەیە لەگەڵ ئێمە کراوە لەسەر ئاستی کۆمەڵ، چونکە لەناوبردنی مرۆڤێك تەنها خودی مرۆڤەکە نەبووە بەڵکە هەموو کۆمەڵگایە.

**سامان: تۆ باسی ئەوەت کرد کە لەوکاتەدا جیهانی عەرەبی و ئیسلامی بێئاگابوون لە پرۆسەکە. بەڵام لە دادگایە کردنی صەدام و تاوانبارەکانی تردا بۆ هەموو سەرکردە عەرەبیەکان و جیهانی عەرەبی و ئیسلامی ڕوونبوویەوە کە صەدام و ڕژێمەکەی چ تاوانێکیان دژ بە گەلی کورد ئەنجام داوە، ئایا بێدەنگ بوونیان لەکاتی ئێستادا پەیوەندی نیە بە هزری ناسیۆنالیستی عەرەبیەوە؟**

تەحسین حەمە غەریب: لە ڕووی فیکری یەوە کێشەی ناسۆنالیستی عەرەبی و سەردەمی نویَ بەتایبەتی و ناسۆنالیستی ڕۆژهەلاتیە. کێشەی ناسۆنیالیستێکی شەرقیە کە ناتوانێت بەرامبەرەکەی قەبوڵ بکات، واتە دەبێت بەرامبەر بوونی نەبێت، ناسۆنالیستی ڕۆژئاوا تاڕادەیەك ناسیۆنالیستێکی لێبوردەیە بەتایبەتی لەدوای هەشتاکانەوە کە ڕێگەبە نەتەوەکانی تر دەدات کە بوونیان هەبێت، بەلام ناسیۆنالیستی ڕۆژهەڵات دەڵێت : یا دەبیَ من بێت یان دەبیَ نەبێت، بەم لۆژیکە مامەڵەت لەگەڵ دەکات، ناسیۆنالیستی شەرقی ناسیۆنالیستێکی نائەخلاقیانەی فاشیە، تاوانی ئەنفال لە ڕووی فکرەوە کێشەی ناسیۆنالیستی عەرەبیە ، وە هەروەها کێشەی ناسیۆنالیستی تورك و فارس و کوردیشە . چونکە کورد تاوەکو ئێستاش دەسەڵاتی نیە کە ئەڵیَ وەکو ئەوان نابێت، کێشەی ئەخلاقیانەیە کێمان هەیە بەزەییمان بە ئەفریقیەکدا نەیەتەوە کێمان هەیە بەزەییمان بە منداڵێکی عەرەبدا نەیەتەوە مەگەر کەسێك کە مرۆڤ نەبێت، ئەمرۆش جەهالەتی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی بە شێوەیەکی تر تەوزیف دەکرێت. دەڵێن ئەو دادگایی کردنە دادگایی کردنێکی دادپەروەرانە نیە تەنانەت هەندێك لە دەوڵەتانی عەرەبی صەدام حوسێن بە پاڵەوان ناو دەبەن و شانازی پێوە دەکەن، من وانازانم هەستی ئەوان وابکات بەڵکو ئەوان وا تێگەیشتوون لە ڕاستیدا ئێمە کەمتەرخەمین کە نەمان توانیوە حەقیقەتەکان بگەیەنین.

کێشەی سەردەمی ئەمڕۆ ئەوەیە کە یان دەبیَ نەبی یان دەبیَ دەرکەویت، ئێمە توانامان هەبوو لە زۆر ڕووەوە بەتایبەتی لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە بۆ گەیاندنی ڕاستیەکان، بەڵام دەسەڵاتی کوردی کەمتەرخەمی کردووە لە گەیاندنی ڕاستیەکان ، ئێمە داوا لە دەسەڵاتی کوردی ناکەین کە کێشەی ئەنفال و کیمیا باران گەورە بکات بەڵکو ئێمە دەمانەوێت وەکو خۆی پیشانی بدات بەڵکو کەمترین بەشی پیشان بدات، بەڵام بەداخەوە نەیتوانیوە ئەوەش باس بکات .

**سامان: دەستپێکردنی پرۆسەی ئەنفال بە فتوای هەندێ لە زانایانی ئاینی بۆ شەریعەت دان بە پرۆسەکە، پێت وانیە فتوای ئەو زانا ئاینیانە لەوکاتەدا لە میسداقیەتی ئاینی کەم کردۆتەوە، یان ئەو زانایانە کۆمەڵێ بەکرێ گیراو بوون؟**

تەحسین حەمە غەریب: من پێم وانیە میسداقیەتی لێسەندرابێتەوە بەڵکو میسداقیەتی زیاتری بەو زانا ئاینیانە بەخشیوە، کە بەشێوەیەکی ڕاستەقینە پشگیری لە حەقیقەت دەکەن، بەبۆچوونی من ئاین نایەت تەنها شتە باشەکان پیشان بدات بەڵکو شتە خراپەکانیش نیشان دەدات، کاتێك کە محمد بوو بە پێغەمبەر – صلی الله علیه وسلم – تەنها نەهات ئەبوبەکر و عومەر ی کوڕی خەتاب دەربخات بەڵکو هات ئەبولەهەبو ئەبو لەهەبەکانیشی دەرخست، ئەگەر پێغەمبەر و ئاینی ئیسلام نەبوایە خەڵکی نەیان ئەزانی ئەبوجهل و هاوشێوەکانی ئەوەندە خراپن، ئاین جۆرێکە ئەبێتە پێوەری پیشاندانی چاکە و خراپەکان، ئێمە بەئاین بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو مەلایانە هەڵەیان کردووە، خەڵکی بە ئاین بۆیان دەردەکەوێت، کامە مەلای ڕاستەقینەیە و کامە مەلا نیە. کوردی ئەنفالکراویش بە هەمان شێوە بۆیان دەرکەوت مەحوی جوانی فەرمووە دەڵێت "ناوی لە ناوا نەماوە خوا" خەڵك هەیە کاسبی بەناوی خواوە دەکات، بەڵام ئایا ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی ناوی خوا لەکەدار بکات چونکە هەر ئەو خواو ئاینەیە پێمان دەڵێت نەك لەناوبردنی نەتەوەیەك بەڵکو بڕینی درەختێکی بەرهەمدار تاوانە، هەر ئەو ئاینەیە ئێمەی فێرکردووە. لەگەڵ ژیاندابین نەك مردن، هەموو موناسەبەتە دینیەکانی ئاینی ئیسلام هەمووی بۆ ژیانەوەن، هیچ تەوسیەیەك لە دیندا نیە بۆ لەناوبردن، هیچ ئامۆژگارییەك نیە بۆ کوشتن نە لە قورئاندا نە لە فەرموودەکاندا، نە لە فیکری دیندا نە لە فەلسەفەی دیندا، بە تەحەداوە دەڵێم هەمووی موناسەباتی ژیانەوەن تەنانەت تەعزیەش چونکە دینی ئیسلام داوای نەکردووە پرسە بگێڕین بەڵام ڕێگەی داوە بۆ لەدایك بوونی منداڵێك ئاهەنگ بگێڕین، هەموو ئەو ئەحکامانەی هەیە لە ئاینی ئیسلامدا هەمووی بۆ دیوی ئیجابی ژیانە هیچ ئەحکامێك نیە بۆ دیوی سەلبی ژیان، باسی دیفاع هەیە کە ئەیانەوێت بتکوژن بەلام باسی ئەوە نیە کە خەڵك بکوژی هەرکەسێك پشتگیری دەسەڵاتی خراپ بکات بێگومان وەك ئەو وایە، ئێستاش لەناو کۆمەڵی کوردیدا هەیە کە نانی ئەوە دەخوات لە هەمان کاتیشدا کۆمەڵێك لە مامۆستایانی ئاینی بەهۆی هەڵوێستیانەوە دەربارەی ئەو کارەساتانە لەناو بران، بە ئێستاشەوە هەیە لەسەر ئەو هەڵوێستانە بێبەشە لە خۆشیەکانی ژیان.

**سامان: ئایا کارەساتی ئەنفال تەنها زیندە بەچاڵ کردن و شوێن بزرکردنی کۆمەڵێك مرۆڤ بوو کۆتایی هات، یان سات بەدوای سات دووبارە دەبێتەوە بەهۆی ئەو شوێنەوارە کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیانەی کە بەجێی هێشتووە؟**

تەحسین حەمە غەریب: بێ گومان لە ڕووی سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەوە پێوەر هەیە بۆ دیاری کردنی مرۆڤێکی نۆرماڵ، ئێمە پێش ئەوەی کۆمەڵناس بین یان دەروونناس دەزانین ئەو ژیانەی

کە بەجێماوانی ئەنفال تیایدا دەژین، ژیانی مرۆڤێکی نۆرماڵ نیە لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، سایکۆلۆژیایەکی ڕووخاوە سایکۆلۆژیای مرۆڤێکە لەخۆی وەزراوە ئاخر منی تاك بەئەوی دی مرۆڤ لە ڕووی سایکۆلۆژیەوە گرینگترین تایبەتمەندییەکانی منی تاك بەئەوەی دی دەردەکەوێت موحیبەتیش شتێکی سایکۆلۆژیە دەبێت کەسێك هەبێت موحیبەتی خۆتی بەسەردا بەخش کەیت، ئەی ئەو کەسەی کەتۆ خۆشت دەوێت لێمان بردبێتی وەکو ئەوە وانیە تۆیان بردبێ ئەو دایکەی کە هەموو مناڵەکانی لە پرۆسەی ئەنفالدا براوە ئەو دایکە هەرزوو مردووە لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە . هەموومان ئەزانین ئەو مرۆڤانەی کەماون مرۆڤێکی نۆرماڵ نین حاڵەتێکی ناسروشتیان تیایە، ئایا ئێمە هەوڵمان داوە کە ئەم مرۆڤە خۆی بدۆزێتەوە لە هەموو ڕەهەندەکانەوە، ئایا ئێمە هەموومان بە ئەرکی ئەخلاقی خۆمان هەڵساوین، ئایا دەسەلاتی کوردی بە ئەرکی ئەخلاقی خۆی هەڵساوە، کاتێك کە کەس و کاری ئەنفال هەڵدەسێت بە خۆپیشاندان یان ناڕەزایی دەربڕینێك لە ئاکامی ئەوەیە کە دەسەلاتی کوردی هەڵنەساوە بە جێ بەجێ کردنی ئەرکی ئەخلاقی خۆی، دەبێت لەڕووی سایکۆلۆژیەوە مامەڵەیەکی دروست لەگەڵ تاکی بەجێماوانی ئەنفالدا بکرێت تاوەکو دەبێتە تاکێکی نۆرماڵ. پرۆسەی ئەنفال کارەساتێك نیە تەنها پەیوەندی بە کەس و کارێکەوە هەبێت، بەڵکو پەیوەندی بەهەموو کۆمەڵگاوە هەیە تەنها پەیوەندی نیە بەو ناوچانەی کە پرۆسەکەی تیادا ئەنجام دراوە بەڵکو دەبێت بە دیاردەیەکی گشتی کۆمەڵگا.

**سامان: بێ دەنگ بوونیوڵاتانی ڕۆژئاوا بەتایبەت ئەمریکا لەئەنجامدانی کارەساتی ئەنفال دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندیە ئابوری و بازرگانیانەی نێوان عێراق و ئەو وڵاتانە یاخود پێویستیان بە ڕژێمی سەدام هەبوو بۆبەرەنگاربوونەوەی هەندێ لەو وڵاتانەی کەنەیاری سیستمی سیاسی ڕۆژئاوا بەتایبەت ئەمریکا بوون یان بێ دەنگ بوونیان نیشانەی هەڵکردنی گڵۆپی سەوز نەبوو بۆ ڕژێمی بەغدا؟**

تەحسین حەمە غەریب: لەڕووی یاسایەوە ناعادلترین یاسا یاسای نێو دەوڵەتیە. ڕۆژئاوا لەیاسا ناوخۆیەکاندا تا ڕادەیەك عەدالەت بوونی هەیە مافی تاکەکانی ناو کۆمەڵگا دابین کراوە. بەلام ئەگەر لەڕووی فەلسەفەی یاساوە سەیربکەین کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان دۆخی سروشتیان تێپەڕاندبوو ئەو دۆخەی کە یاسا تیایدا بوونی نیە. لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا تووشی کێشەیەك دەبێت ڕێکخراوێك هەیەپەنای بۆ بەرێت یاسایەك هەیە بەرگری لێ بکات بەقسەی یەکێك لە فەیلەسوفەکان ئێستا ئێمە لە دۆخێکی سروشتیدا دەژین ئەو دۆخەی کە یاسای تێدا نیە یاسایەك نیە کە پەنای بۆ بەرین کاتێك تاوانێکمان لە دژ ئەنجام دەدرێت لە ڕاستیدا کە ئێمە دەوڵەتمان نیە ئەم جۆرە تاوانانەمان بەرامبەر دەکرێت هەتا یەکێك لە فەیلەسوفەکانی فەلسەفەی یاسا دەڵێت لە نێوان نەتەوەکاندا عەدالەت ناکرێت بوونی هەبێ دەکرێت شوبهی عەدالەت بوونی هەبێت. هەمیشە دەسەلاتەکانی ڕۆژئاوا بەتایبەت ئەمریکا توانیویەتی دوا لیزمەیەك لە مامەڵە کردندا لەنێوان مامەڵەی دەرەوەی لەگەڵ ناوخۆدا بکات. لەناوخۆدا دەکرێت

یاساوعەدالەت بوونی هەبێت بەڵام لە مامەڵەی دەرەوەیدا لە دۆخی سروشتیدایە واتە ئەو دۆخەی کە یاسا بوونی نیە ئەتوانم بڵێم ئەمە یەکێکە لە گەورەترین کێشەکانی ڕۆژئاوا واتا بەشێوەیەکی گشتی عەدالەت و یاسا تا ئەو ڕادەیە بوونی هەیە کە پەیوەندی بەناوخۆی ئەو وڵاتەوە هەبێت. لە بەڕێوەبردنی ئەویاساو ڕێسایانەی کە لە دەرەوەی کۆمەڵگا جێ بەجێ دەکرێت تا ڕادەیەك دژ دەبنەوە لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە لەناوخۆدا جێ بەجێ دەکرێت بۆ نموونە یەکێك لە نورمە ئەخلاقیکانی سەردەمی نوێ دابین کردنی مافی مرۆڤە چ لەئاستی تاکە کەسی چ لە ئاستی کۆمەڵگا لە ئاستی تاکە کەس مافی مرۆڤی تاکە لەئاستی کۆمەڵگا ئەو نەتەوەو ئەتنیکانەی کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا دەژین مافیان دیاری کراوە، ئایە ئەمە بۆ دەرەوەی ڕۆژئاوا وایە، ئێمە مامەڵەیەکی نێونەتەوەیمان لەگەڵ کراوە نەك مامەڵەیەکی ناوخۆی ئێم نەتەوەکین هێشتا لەدەرەوەی دەوڵەتدا دەژین بۆیە ئەوان کە مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن وەکو نەتەوەی خۆیان مامەڵەمان لەگەڵ ناکەن، بەڵکو وەك نەتەوەیەك لە دەرەوەی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن کە لەوێدا هیچ بنەمایەکی یاسایی وئەخلاقی پەیڕەو ناکرێت. بەدڵنیاوە دەتوانم بڵێم سیستەمە سیاسیەکانی ئەو سەردەمە ئەگەر بەژداریان نەکردبێت لایەنی کەم بێ دەنگ بوون توانیان ئەوەش بکەن بەهۆی جیاوازی مامەڵە کردنیان لەناوخۆو دەرەوەدا. ئەگەر ئەنفال لەکۆمەڵگایەکی ئەوروپیدا بوایە بەدڵنیایەوە ڕێگەی لێ دەگیرا چونکە یاسایەك هەیە ڕێگر بێت، بڵێ بێ دەنگ بوون لە کارەساتی ئەنفال نیشانەی هەڵکردنی گڵۆپی سەوز بوو بۆ سەدام و ڕژێمەکەی بۆیە سیستەمی سیاسی ئەو سەردەمەی ڕۆژئاواو هی ئێستاش سیستەمێکی زاڵمیە بە یاسا زێڕینەکەی (کانت) مامەڵەیان نەکردووە کە دەڵێت ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکانی تریش پێت خۆش بێ .

**سامان: تاوانباران و ئەنجامدەرانی جینۆسایدی کورد تەنها ئەو نوخبەیە بوون کە هێنرانە بەردەم دادگا یان هەموو کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراقی فاکتەربوون بۆ ئەنجامدانی پرۆسەکە بە ئەنفال چیە کوردەکانیشەوە ؟**

تەحسین حەمە غەریب: لەڕووی فیکرییەوە تەنها ئەوان نەبوونە کە دادگایی کران ئەوە هزری ناسیۆنالیستی ڕۆژهەڵاتیە کە کارەکتەری وای دروست کردووە لە رووی یاسایشەوە تەنها ئەوانە تاوانبار نین بەڵکو لە یاسادا ئەوەش تاوانبارە کە هانی تاوانەکەی داوە ئەوەش کە کەرستەو ئامرازەکانی هێناوە یا لەدوریشەوە بێت لەبەر ئەوە تەنها کەسێك بە تاوانەکە هەڵنەساوە هەر ئەوانە تاوانبار نین بەڵکو هەموو ئەوانەتاوانبارن کەبەتاوانەکە هەڵساون بەقسەی شاهیدەکانوبەڵگەکان ئەوە دەردەکەوێت کە تەنها ئەو نوخبەیە تاوانبار نین کەهێنرانە سەر شاشە بەڵکوهەموو ئەوانە تاوانبارن کە هۆکاربوون بۆجێ بەجێ کردنی کارەساتەکە لێرەدا مامەڵەکردنێکی ناعەدالانەیە چونکە زۆرێك هەن کە تاوانبارن کە ناکرێت لێرەدا باسی بکەم. تەنها کۆمەڵێکیان دادگایی دەکرێن لەناو ئەوانەشدا کۆمەڵێکی زۆر کەمیان بۆیە دەبینین

بابەتەکە لە بابەتێکی یاساییەوە کراوە بە بابەتێکی سیاسی لەبەر ئەوە ئەنفال چیەکان تەنها ئەوانە نین بەڵکو خەڵکی تریش تاوانبارن. ئەم دادگایی کردنە ئەکرێت شتێکی سەرەتایی باش بێت لەیاسادا بابەتە سزایەکان بە تێپەڕبوونی زەمەن کۆتایی نایەت بەڵکو سەد ساڵیش بەسەریدا بڕوات هەر دەمێنێتەوە وەکو کەیسە مەدەنیەکان نیە کە بە تێپەڕبوونی زەمەن کۆتایی دێت .

**سامان: کورد و دەسەلأتی کوردی لە ئێستاو ئایندەدا پێویستە چی بکات بۆ ئەوەی بتوانێت لە ڕێگەی کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانەوە پشتیوانی نێودەوڵەتی بەدەست بهێنێت بۆ بەرەو پێش چوونی دۆزەکە؟**

تەحسین حەمە غەریب: لە ڕاستیدا بابەتی ئەنفال و کیمیا باران لە ڕووی نەتەوەییەوە کورد بوونی ئێمە زیاتر دەسەڵمێنێت یان هەندێك دەڵێت بۆ ئێمە بەسوود بوو چەمکی سوود بۆ من چەمکێکە لە ڕووی رووحیەوە ئازاردەرە چونکە هەموو سەر زەوی بدە بە من ژیانی کەسێك ناهێنێ کە کیمیاوی کرا بە قورگیا دەنگی ئەنفال کراوێك ناهێنێ هەناسەی ئەو دایکە ناهێنێ کە منداڵەکانی لێبڕا. کێشەکە لە بەرژەوەندی گەورەترە دەبێت بەو ڕووحەشەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین ئەگەر ئەنفال (182) هەزاریش نەبێت تەنها یەك کەسیش بێت دەبێت وا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین کە هەموومانین چونکە تاوانەکە تەنها دژ بەو کەسانە نەکراوە کە تیاچوون بەڵکو دژی نەتەوەیەك ئەنجامدراوە. مردنی کەسێك مردنی جیهانێکە لە ناوبردنی جیهانێکە. دەبێت لێم بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ تاوانی ئەنفال بکەین هەر یەکێك لە ئێمە خۆمان لە جێگەی کەس و کاری ئەنفال دابنێین بۆ ئەوەی کەمترین ماف بۆ نەتەوەکەمان دابین بکەین. واتە دەبێت سەرۆکی کۆمار و سەرۆکی هەرێم خۆیان بخەنە جێگەی ئەو دایك و باوکەی کە منداڵەکانیان تیاچوون، وەك دەڵێت (خودب جای من) خۆت بخەرە شوێنی من ئەو کەسەی کە چیرۆکی کوژراوێك دەگێڕێتەوە زۆر جیاوازە لە کەسێك کوڕێکی کوژرابێ کورد وەکو نەتەوە تەماشا نەکراوە بەڵکو بە چەتەو ڕێگر ناوبراوە تاوانبارکراوە بۆ مێژوو لە داهاتوودا ئەسەلەمێ نەك ئێمە تاوانبار نین بەڵکو تاوانمان لە دژ کراوە . هەر ئەنجامدانی تاوانەکە بۆ خۆی ئەوە دەسەڵمێنێ کە ئێمە جیاوازین لە ئەوان. بەڵکو زیاتر نەتەوە بوونی ئێمە دەسەڵمێنێ. بەوە دەتوانین دۆزەکەمان بەرەو پێش ببەین کە گەرمیان و سلێمانی جیاوازی نەبێت بادینان و هەڵەبجە و کەلار جیاواز نەبن بەو ڕووحە مامەڵە لەگەڵ ئەنفال بکرێت وەکو مامەڵە لەگەڵ خۆکردن نەك لەگەڵ شتێکی تر .

**سامان: چی بکرێت بۆ ئەوەی فۆرمی ئەنفال لەقسەکردن و نوسینەوە بگۆڕێن بۆ فۆرمێکی تر ؟**

تەحسین حەمە غەریب: لێم ببورن کە دەڵێم تا ئێستا فۆرمی قسەکردنیشمان بەکار نەهێناوە تاوەکو ئێستا وەکو فۆرمێکی گوناه مامەڵەی لەگەڵدا کراوە بۆیە بە بۆچوونی من تا ئێستا قسە لەسەر ئەنفال نەکراوە، لەیادی ئەنفالدا دایکێك دەهێنن ئەگری دەڵێن گوناهە. ئەمە فۆرمێکە لەخوار قسەکردنیشەوەیە. کاتێك کە من تۆ بێ دەنگ دەکەم واتە مرۆڤ بوونم لە تۆ

سەندووەتەوە ئەوانەی ئەنفالیان بەرامبەر کراوە تا ئێستاش قسەیان نەکردووە چونکە ئەمڕۆ حەقی ئەوەیە کە قسەی لەسەر بکرێت یەکێك لە فەیلەسوفەکان (هابرمانس) عەدالەت یەکسان دەگات لەگەڵ قسەکردن. بەڵام ئایە گفتوگۆمان لەگەڵ بەجێماوانی ئەنفال کراوە تەنانەت ئەو فەزایەشمان نەخوڵقاندووە کە قسەی لەسەر بکەین دەکرێت وەکو شارێك مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. هەموو کەسێك لەو شارە وەکو یەك مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێت چونکە خەڵکی جیاواز لە یەکتری تێدایە واتە پێویستمان بە گواستنەوەیە لە ڕووداوێکی مێژوویەوە بۆ جیهانێك کە ئێمەی تیادا دەژین، بەڵام ئێمە خەوتووین پێویستە بێداربینەوە بزانین ئەو جیهانە چۆنە. بە دڵنیاییەوە لە ڕووی نێونەتەوەییەوە جێگەی خۆی دەبێت هەروەها لە ڕووی ناوخۆییەوە جێگەی خۆی دەبێت. ئەوەی بەسەر کوردا هاتووە بەسەر هیچ نەتەوەیەکی تردا نەهاتووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چالاکترین و شادترین نەتەوەی سەر ئەم زەمینە ئێمە نەتەوەیەکی دەستەوەستان نین بەڵکو شتیشمان لە دەست دێت. ئەگەر تەماشای کوردستان بکەین بە پشت بەستن بە شتە مەعنەوییەکان خۆی گەشتۆتە ئەم ئاستە.

# ساتێك لەگەڵ بریندارانی هەڵەبجەدا



ئا: گۆران هەڵەبجەیی

ئەوکارەساتەنەی بەسەر مرۆڤەکاندادێن ،چ سروشتی چ کردەی خودی مرۆڤ ،بەڕووداونی کارەساتەکە کۆتایی نایەن بەڵکو تاماوەیەکی درێژ ئاسەواری خۆیان بەسەر دەڤەروخەڵکەکانەوە جێدەهێڵن.

کیمیابارانی هەڵەبجەش یەکێکە لەو کارەساتە خەتەرناکانەی کە لەدوای خۆی چەندین کاریگەری و ئاسەواری خراپی بە سەر ژینگەو خەڵکانی باژێڕەکەوە بەجی هێشتووە. تاڕۆژی ئەمڕۆش خەڵکانێکی زۆر گیرۆدەی کاریگەری ئەو کارەساتەن بەتایبەتی بریندارەکان کەبەهۆی نەبوونی چارەسەرەوە بەردەوام ماڵئاواییمان لێدەکەن وە تائێستا ژمارەیان گەستوەتە 56 کەس، هەندێك لەو بریندارانە بەخت یاوەریان بووەو گەشتوونەتەهەندەران و بەهۆی گرنگی پیدان و چارەسەری بەردەوامەوە باری تەندرووستیان بە بەرراوورد لەتەك بریندارانی کوردستاندا زۆر باشترە، لێ ئەوکەسانە مەعاناتی تایبەتی خۆیان هەیە کەبەشیکی گەورەی بیرکردنەوەیە لە کارەساتەکە،کە بەردەوام لە ناخیان دەدات و بووەتە بەشیك لە ژیانیان .

بۆپتر ئاشنا بوون بە باری جەستەیی و دەروونی ئەو بریندارانەو تێڕوانینیان بۆ ئەو مەسەلانەی پەیەندیدارن بە هەڵەبجەو کارەساتەکەوە چەند پرسیاریکم ئاراستەی سێ بریندارى چەکی کیمیاوی کرد کە لە دانیمارك نیشتەجێن.

پرسیارەکان:

1.ئێوە وەك بریندارانی چەکی کیمیاوی پاش تێپەڕبوونی 21 ساڵ بەسەر کارەساتەکەدا،گەر ئەو چرکە ساتانە بهێننەوە یادی خۆتان چ هەستێکتان لا درووست دەبیت؟

2. کارەساتەکە چ جۆرە ئاسەوار و کاریگەریەکی تەندرووستی و دەروونی لەسەرتان جێهێشتووە؟

3. بەپێی ئەو زانیاریانەی هەن بەردەوام بریندارانی چەکی کیمیاوی ژیان لەدەست دەدەن، ئەویش بەهۆی خەمساردی دەسەڵاتداران لە تەندروستیان بۆ ماوەیەکی زۆر.گەر ئێوەش لە هەندەران نەبوونایە ئایا باری تەندرووستیتان لە ئێستا خراپتر نەدەبوو؟

4. پەیامتان چیە بۆ بەرپرسانی هەڵەبجە سەبارەت بە ئاوڕدانەوە لە بریندااران و دانیشتوان وهاوکات باژێڕەکە؟

5. ماوەیەك لەمەوبەر هەواڵێك بڵاو بووەوە کە گوایە فڕۆکەوان تاریق ڕەمەزان هەڵاتووە کە یەکێك بووە لە بەشداربوونی کیمیابارانی هەلەبجە . بەڵام پاشان دەرکەوت هەوالەکە ڕاست نیەو ئازادکراوە. ئێوە کە بریندارى دەستی ئەو فڕۆکەوانەن و هەزارەهای لە باژێڕوانانی هەلەبجە شەهیدکردووە،چۆن گوزارشت لەوکارەدەکەن ؟

**لەمیعە عەبولە عومەر**

کارەساتی هەڵەبجە لەتراژیدیا گەورەکانی مێژووی مرۆڤایەتیە، هەرمرۆڤێك لەو کارەساتەدا بوونی بووبێت کە بەیەکێك لە یراژیدیا گەورەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دەژمێردریت، بۆ چرکەستایکیش بێت لەبیری ناچێتەوە، بەش بەحاڵی خۆم بەردەوام لەگەل ئەوکارەساتەدا دەژیم، بەڵام لەو ڕۆژەدا پتر ئازارم دەدات،مردنی شارەکەم هاوشاریەکانم کەسوکارم وەبیردەهێنێتەوەو هەستیکی وام لادرووست دەبیت کە نەفرەت لە هەمووشتێك بکەم.

ئەوانەی بریندارى ئەو چەکەن هەرگیز چاك نابنەوەو ئاسەوارەکانی هەر دەمێنیت.لەڕووی چەستەییەوە برینەکانی لەشم هەرگیز ساڕێژ نابن.گەر بەردەوام عیلاج وەرنەگرم برینەکانم سەرلەنوێ هەڵدەدەنەوە. لەماوەی بریندارىمەوە تا ئەم دەقیقەش هەر سێ مانگ جاریك دەبێ هەموو ئەو جۆرە پشکنینانەی کە پەیوەندیان بەبرینەکانمەوە هەیە بۆم ئەنجام بدریت .یانی ئەم نەخۆشیە تامردن لەگەڵ ژیانمدایە و دەبی لەگەڵیا بژیم.دکتۆرەکەم پێی گووتم (ئەو چەکەی بەکار هێراوە لە شارەکەتاندا بۆ ئەوەبووە کە بتانکوژێت نەك بژین،جا کە تۆ ماویت و دەژیت ئەوە موعجزەیە)

لەڕووی دەروونیشەوە گەورەترین کاریگەری لەسەرم داناوە ، تا مردن پێوەی دەناڵێنم لە یادەوەریە تاڵەکانی ژیانمە .

من بۆ چارەسەری برینەکانم باشترین یارمەتیم لە پزیشکەکانی دانیمارك وەرگرتووە، بۆیە دەتوانم بڵێم گەر لە ئەوروپا نەبومایە دڵنیام ئێستا ئاسەوارم نەمابوو، ڕاستە ئێمە بریندارانی ئەو چەکە هەرگیز چاك نابینەوە بەڵام چارەسەری بەردەوام درێژە بە ژیانماندەدات ،زۆر جاریش لەمردن ڕزگارمان دەکات.

هیوادارم بەرپرسانی حکومەتی هەرێم بتوانن بەشێك لە میزانیەی کوردستان تەرخان بکەن بۆ چارەسەرکردنی بریندارانی کیماوی، ئەویش بە ناردنیان بۆدەرەوەی وڵات بۆ چارەسەر، چونکە ئەم شارە بە برینداروخاك و ئاوەوە زەحییەی دەستی شۆڕشە، هیوادارم گەورەترین گرنگی بەشاری هەڵەبجەودانیشتوانی بدرێت و بکرێت بەشارێکی نمونەیی، هەرچەندە من باوەڕم وابوو کە دەسەڵاتدارانی کورد لە تەنیشت هەڵەبجەوە هەڵەبجەیەکی تریان درووست دەکرد، ئەم هەڵەبجەشیان وەك مۆزەخانەیەك بهێڵایەتەوە بۆ ئەوەی جیهان بهاتایە بۆ سەردانی و ببوایەتە خاڵێکی ڕەش بۆ دوژمنانی گەلەکەمان.

بەڕاستی بەو هەواڵە توشی سەرسامی بووم، هەرگیز بەخەیاڵمدا نەدەهات کە یەکێك لە تاوانبارەگەورەکان بەو شیوەیە ئازادبکرێت.

ئەمە سوکایەتیە بەشەهیدان و بەئێمەو بە هەموو گەلی کورد. ئێمە هەرگیز ئەمە قەبول ناکەین، وەداواکارین یەکیەتی ئەو مەسەلەیە ئاشکرا بکات ئەو کەسانە سزا بدرین کە بەو کارە هەستاون، ناکرێت وا بە ئاسانی ئەو مەسەلەیە لەبیر بکریت.

**شیلان حامید**

زۆر هەست بە بێدەسەڵاتی خۆم دەکەم کە چەند بیدەسەڵات بووین لە ئاست ئەو تاوانەدا، ئەو ساتانەی بیر دەکەمەوە هەست بە دونیایەکی تردەکەمو دەڵیم ئەوە منم ماوم، چونکە قیامەتمان بە چاوی خۆمان دی. هەندێك جار هەستی وام لادرووست دەبێت گەر تاوانبارانی ئەو کارەساتە لەبەردەستم بن حەزدەکەم لەتوپەتیان بکەم. هەست بەدنیایەك زوڵمو ناهەقی دەکەم کە لە شاریکی بێزیان و خەڵکێکی بێتاوان کرا.

ئەوکارەساتە کاریگەری زۆری لەسەرم هەیە ج لە ڕووی تەندرووستیەوە چ لە ڕووی دەروونیەوە، وەك جەستە زیاتر لە 35٪ ی لەشم سووتاوە، ناتوانم وەك کەسێکی ئاسایی هەڵسوکەوت بکەم، ئەوکارەساتە بەردەوام لەبەر چاومە ڕێگەنادات دەروونم بۆماوەیەکیش بێت ئاسوودەبیت.

بەدڵنیایەوە دەڵێم لێرە لەروی تەندرووستیەوەگرنگی زیاترمان پێدەدریت، هەر بەو هۆیەشەوەیە کە لە ژیاندا ماوین، من بە بەردەوامی لەژێر چاودیری پزیشکی تایبەتیدام و عیلاج وەردەگرم، گەر لە ئەوروپا نەبوومایە هەرگیز ئەم عیلاجانەم بۆ نەدەکراکە لێرە بۆم دەکرێت و

بەم چەشنەش گرنگیمان پێنەدەدرا. دیارە گەر لە کوردستان بوومایە باری تەندروستیم زۆر لە ئێستا خراپتر دەبوو، بەهۆی کارەساتەکەوە زۆر ژن منداڵی نائاساییان دەبێت.

پەیامم بۆدەسەڵاتداران ئەوەیەکە:

-گرنگی بە باری تەندرووستی خەڵکی هەڵەبجە بدەن.

-گرنگی دان بە خوێندنگاو باخچەی ساوایان و خانەی گەنجان.

-گرنگی دان بە بواری ژینگەی هەڵەبجە ،چونکە هەڵەبجە زۆر پیویستی بەسەوزایی و شوێنی حەوانەوەو ئاودانکردنەوەو زۆر شتی تر هەیە.

– گرنگی دان بە بواری ڕۆشنبیری و هونەری

-سەردانی قوتابخانەو دایەنگەو باخچەی ساوایان لە لایەن تیمی تایبەتی پزیشکیەوە.

– چاودێری ژنان وکچان بە تیبەتی ژنانی دووگیان، چونکە زۆر ژن بەهۆی کاریگەری ماددەکیمیاویەکانەوە منداڵی نائاساییان دەبیت.

دەبوایە دەسەڵاتدارانی کورد هەمووکارێکیان بکردایە بۆ دۆزینەوەو دەستگیرکردنی هەرچی تاوانبارە، کەتاوانیان دژ میللەتەکەمان کردووە، بەڵام بەداخەوە تاوانباریکی وەك ئەو فرۆکەوانە{تارق رەمەزان} لە بەردەستیاندابووە دەچن بەریدەدەن، زۆر لام سەیرە لەجیاتی گەڕان بەدوای تاونبارانـدا دێن ئازادیان دەکەن، باشە ئەوانەی بەوکارەهەستان بیریان لە شەهیدان لە ئێمەی بریندار لە خەڵکی بێ دەسەڵاتی هەڵەبجە نەکردەوە؟ گەر ئەمە بێ ڕێزی و بەکەم زانینی خەڵکی هەڵەبجەو شەهیدانی نەبیت هیچی کە نیە، من زۆرتووڕەو بێزارم و ناتوانم هەرگیز لەوکەسانە خۆشبم کە ئەو کارە ناشیرینەیان ئەنجام داوە.

**نیازی مستەفا**

بۆمن ئەو رۆژە تەنها یادێکی کارەساتەکە نیە بەڵکو هەڵدانەوەی لاپەرەکانی تراژیدیای باژێرێکە کە ئەو ڕۆژە ترۆپکی ئەو تراژیدیایەبوو، بەڵی بۆ ئێمەی برینداروستەمدیدەکانی شارەکە سەرهەڵدانەوەی برینەکانمانە، بۆهەندیك کەسیش ئەو یادە بووەتە مشەخۆری {مشەخۆرانی یادی هەڵەبجە}، بەناوی هەڵبجەوە سواڵدەکەن و هەڵەبجەش ڕۆژە ناخۆشەکانی خۆی بەڕێدەکات، بۆمن نەك هەر لە رۆژەی ڕووداوەکەدا چرکەساتەکانی یەخەم پێدەگرێت بەڵکو هەرساتیك لە ئاوینەدا ئاسەواری کیمیاوی بە لەشی خۆمەوەدەبینم کارەساتەم دەهێنێتەوە بیر.

لە ڕاپۆرتی پرۆفیسۆر (هاگ زاچاریا)دا هاتووە دەڵیت (تۆ تازە لەدایك بوویتەوە، چونکە گەر نەگەشتیتایەتە ئەوروپا توشی جۆرە نەخۆشیەك دەبوویت کە پزیشکی ئەوی لیی بێئاگان)

هەرخۆم نیم کە بەو دەردەوە دەناڵینم، ئەوتە نیانی خوشکیشم گیرۆدەی ئاسەواری کیمیاییە. ئەو ماددانەی لە هەڵەبجە بەکار هێنران کاریگەری جۆراوجۆریان هەیە، هەندێکیان کار لە کرۆمۆسۆمات دەکەن، ئەبنە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ نەتوانێت فێری شتی نوی ببێت، یا دەبنە هۆی لەیادچوون و لەبیرچوونەوەی شت. من زۆر بەداخم بۆ ئەو کەسانەی لە هەڵەبجە دەژین چونکە

پرۆفیسۆری ئەمریکی خاتوو﴿کۆر﴾ ساڵی 1993 گووتی(دەبێ کەس لە شاری هەڵەبجەدا نەژی، هیچ شتێکی نەخوریت).

ئەودەمە من ماوەی هەفتەیەك وەك وەرگێڕ لەگەل ئەو خانمەدابووم زۆر نیگەران بوو لە باری تەندروستی هەڵەبجەییەکان لە ئایندەدا.

من بۆ دواکەوتوویی نەتەوەکەم گریانم دێت، کەی بەکەلوپەلی کۆنە دەتوانرێت خزمەت بکرێت.

هەرکات کارمان بۆ نەتەوەکەمان ئەنجامدا و گیرفان پرکردنی لەپشتەوە نەبوو ئەوە دڵسۆزیە.

بەسە خۆ گرێدان بە برینی هەڵەبجەوە، کەس نایەوێت هیچ بۆهەڵەبجە بکات (مەبەستم ئەوانەیە بریارو پارەیان لایە). هەڵەبجە بێکەسەو هەر بێکەسیش دەمێنێتەوە، هەڵەبجە خۆی پرسەی خۆی دەگێڕێت، تویەزدان بەسە ئیدی توورەکەی سووری هەڵەبجە پرکەن لە پارەی خەم،

کەی دەسەڵاتی کوردی بەپێی خواستی جەماوەر کاری کردو حسابی بۆ نیگەرانیان کرد ئەو دەمە ئازادکردنی تاریق رەمەوزان دەبێتە جێی سەرسوورمان، هاوشیوەی تاریق لە تاوانباریادا زۆرن بەڵام هیچیان دەرهەق نەکراوە یا داوی بەردانیان دەکریت.

بۆ دەسەڵاتی کوردی ناچێت حەجاجی نووگرەسەلمان بدۆزیتەوە، مساوەمەکردن بە خوێنی شەهیدان خەریکە دەبێتە کەلتوور، بۆیە لاتان سەیر نەبێت گەر سبەی بڵێن داوای ئازادکردنی عەلی کیمیاوی کراوە یاخود سەرۆك کۆمار واژۆی لەسیدارەدانی ناکات، وەك بۆ لەسێدارەدانی سەددامی نەکرد بە بیانوی ئەوەی دژی لەسێدارەدانە.

# "حیکایەتە تاڵەکانی زیندانیانی دبس"



ئا: ئەرکان سامان

حیکایەتەکانی نێو زیندانی(دبس) گێرانەوەی روداوێکی ساناو ئاسایی، یا گێرانەوەی حیکایەتی دوو ئەوین نییە، بەڵکو گێرانەوەی مەملەکەتێکە لەغەدرو تاوان، گێرانەوەی پۆلێك باڵندەیە کە بە بێ تاوان باڵەکانیان بەستران و سوکایەتیان پێ کراو دیل کران لە لایەن گەلە گورگ و دڕندەکانی بەعسەوە.لەدەستپێکی گێرانەوەی ئەو مەرگەساتەدا شنۆ سەعید بە دلێکی پرخەم و بەچاوێکی فرمێسکاییەوە بەسەرهاتە تاڵەکانی خۆی بەم شێوەیە بۆگێراینەوەو وتی سەرەتا کە ئێمەیان برد بۆ دبس شەو بوو کارەبایی قاعەکەیان لێ کوژاندینەوە کچێکمان لەگەڵدا بوو لە ترساندا شێت بوو،لەو شەوە بەدواوە بەردەوام خەڵکمان لێ ئەمردو تاکۆتای مانەوەمان لەو قاعەیەی ئێمە نزیکەی (45) کەس لە برسانا مردن زۆربەیان منداڵ بوون،ئەمە جگە لەوەی ڕۆژانە ترێلەیان ئەهێناو ژن و منداڵیان بار ئەکرد کەس نەیئەزانی بۆ کوێیان ئەبەن،ئێمەش بەردەوام دوعامان ئەکرد کە نۆرەی ئێمەش نەیەت،چونکە ئەیان ووت ئەوانە هەمویان زیندەبەچاڵ ئەکرێن، سەرەڕای ئەم هەموو ترسە جێگایەکی واشمان نەبوو تیایا بخەوین و وە تابەیانی لەترسی عەسکەرەکانیش نەمان ئەوێرا چاو لێکبنێن، چونکە زۆر بێ ئەخلاق بوون. دبس یەعنی ترس یەعنی مردن، ئەمە وتەی چیمەن مەجیدی تەمەن (33)ساڵە ئەو کات لە زیندانی دبسدا تەمەنی (12) ساڵان ئەبێت هەرلەو ڕۆژە تاڵەدا لە خێزانەکەی جیادەکرێتەوەو لەگەڵ باوکیدا دەبرێن بۆ تۆبزاوەو دواتر بەبەرچاوی خۆیەوە دڕندەکانی بەعس باوکی لێ جیادەکەنەوەو لەوکاتەوە چیمەن چاوی بەچاوی باوکی نەکەوتۆتەوە،دواتر چیمەن بەتەنیا لە زیندانی دبس لەنێو ئەو خەڵکەدا ئەمێنێتەوەو نازانێ ڕوو لەکوێ بکات، چیمەن دەڵێت زۆرگریام کەس نەهات بەهاوارمەوە،پاش ماوەیەك ژنێك زۆر بەزەیی پێمدا هاتەوەو بردمیە لای خۆی و ماڵی ئاوا بێت زۆر باشبوو لەگەڵم، ئینجا باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئێمە سجن کراوین تا

ئەو کاتە نەمئەزانی سجن جییەو بۆچی ئێمەیان هێناوە بۆ ئەوەیْ، چیمەن باسی ژیانو گوزەرانی خۆی بۆ کردین کە چۆن ژیانی بەسەربردوە لەو زیندانەدا، وتی زۆر برسیمان ئەبوو لەسەرەتادا ڕۆژی سەمونێکیان ئەدا پێمان تاوای لێهات چەند منداڵێك لەبرساندا مردن ،ئەمە جگە لەوەی جێگامان نەبوو پێی بخەوینو وەترسی زۆریشمان لە عەسکەرەکان هەبوو هەرکچێك جوان بوایە بە ئارەزووی خۆیان بەزۆر ئەیان بردو تەعدایان لێئەکرد،وتیشی لە خودا بەزیاد بێت من ئەوکات زۆر گەورە نەبووم ئەگینا ئەو دڕندانە تەعدایان لەمنیش ئەکرد، هەر لەو کاتەدا فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوەو بەدلێکی پڕ لە پەژارەو خەمەوە ئاهێکی قوڵی هەڵکێشاو وتی ئەو خوانەناسانە هەربەزۆر تەعدایان لەکچێکی هاوڕێم کرد کە چوار ساڵ لەخۆم گەورەتربوو دواتر ئەو زۆڵ باوکانە گاڵتەیان پێئەکرد تائەمرم فرمێسکەکانی ئەو هاوڕێیەم و ئەو خیانەتەم بیر ناچێت.یەکێکی تر لەو ژنانەی کە بەر شالاْوی ئەنفال کەوتبوو رەزیْ صالح بوو کە بۆ ماوەی (6) مانگ لەزیندانی دبسدا زیندان کرا بوو خاتوو ڕەزیْ بەم شێوەیە چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ گێراینەوە ( سەرەتا کە ئێمەیان لە تۆبزاوەوە برد بۆ دبس نەمان ئەزانی بۆچی ئێمەیان بۆ ئەویْ هێناوە، وەلاْ هەرنەمان ئەزانی ئەویْ مەبەستم (دبس)ی نەحلەتی یە چ شوێنێکیشە، سەرەتای دەستپێکردنی ژیانمان زۆر سەختو ناخۆش بوو ئەگەرچی تاکۆتای هەرناخۆشیو دەردەسەریو برسێتی بوو، بەلاْم پاش ماوەیەك تاڕادەیەك باشتر بوو، چونکە هەندێك پەڕۆ کۆنمان کۆکردبووە تا پێی بخەوین،ئەمە ناکا بەوەی ژیانمان خۆش بوبێت، ئێمە هەموو ڕەشو روت بووین نانو چامان لە قوتوی فرێدراوی عەسکەرەکاندا ئەخواردو پێمان پەتی بوو، هەموو برسی بوینو منداڵێکیشم بەناوی گوڵاڵە تەمەنی یەك ساڵان بوو مردو چەندین منداڵی تریش توشی نەخۆشی بوونو گیانیان بەخشی). خۆم و شەش منداڵم بەتەنها یەك بەتانیمان پێبوو پێی ئەخەوتین ڕاخەری ژێرمان تەنها زەوییەکی ساردو سڕ بوو کافیە علی بەنیمچە تورەییەکەوەو بە ڕوخسارێکی پڕاوپڕ لە خەم پەژارەوە ئەمەی وت، کافیە وتیشی ئێمە کاتێك لە دبس سجن کراین نەمان ئەزانی چیمان لیْ ئەکەن ، ڕۆژێك ئەیانووت ئازاد ئەکرێن ڕۆژێکی تریش ئەیان ووت زیندەبەچاڵ ئەکرێنو یاخود ئەیانووت هەتاهەتایە ڕزگارمان نابێت، بەردەوام ئەم جۆرە قسانە لەنێو ئەو سجنەدا بلاْوئەبووەوە،بەمەش ئێمە توشی ترسو دڵەڕاوکیْ بووبوین،باسی لە جۆری ژیان کرد لەو زیندانەدا وتی ژیانمان زۆر ناخۆش بوو هەر ڕۆژەو منداڵێك ئەمرد لەبرساو یاخود ژنێك شێت ئەبوو، لەو قاعەی کە ئێمەی تیا بوین نزیکەی چوار ژن لە ترساندا شێت بوونو بەزنجیر ئەبەسترانەوە بەدارێکی گەورەوە هەموو گیانیان خەڵتانی خوێن ئەبوون کەسێك نەبوو لێیان بپرسێت یا چارەسەریان بۆ بکەن لە نەخۆشخانە ،کافی یە ئێستا خاوەنی شەش منداڵی چاوگەشەو باوکی منداڵەکانو دوبرای کافییە خان ئەنفال کراوە، خاتوو کافییە خۆشحاڵ بوو بەوەی کە صەدام حسینی گۆڕبەگور لە سێدارەدراو بەوهیوایەوەیە دارو دەستەکەی هەمان مەسیری گۆڕبەگۆڕیان بەسەردا بێت.

# " بۆ ئازاردانی ئێمە هەندی تەنکی ئاویان لەبەرامبەرمان دانابوو کەس بۆی نەبوو ئاوی لێ بخواتەوە"



ئا: هاوڕێ عەلی رەسول

لەهەرشوێنێکی ئوردووگای شۆرشدا بگەرێی کەس و کاری ئەنفالکراوەکان دەبینی کەلەچی وەزعێکی ناهەموارو ناخۆشدان، محەمەد عبدالرحمان محەمەد یەکێکە لەبەجێماوانی ئەنفال، محەمەد جگە لەوەی کەخێزانەکەی لەوەزعێکی ماددیی خراپدان خۆشی توشی ئیفلیجی بووە بەهۆی کارەساتی ئەنفالەوە، کەئێستا هەردووقاچی بەتەواوی لەکارکەوتون و دەستەکانیشی توانای جولانیان کەم بووە لەسەر عارەبانەکەیەوە بەئاهێکی قوڵەوە چۆنێتی روودانی ئەم کارەساتەو ئازارو میحنە تییەکانی ئەم رووداوەی بەم شێوەیە بۆ گێراینەوەو وتی: پێش کارەساتی ئەنفال ژیانمان لەگوندەکەی خۆمان کەگوندی حوسێن ئیسلامەو سەربەناحییەی لەیلان بوو زۆر خۆش بوو هەرچەندە وەزعی مادیمان زۆرباش نەبوو، بەڵام ژیانێکی ئاسودەو خۆشمان دەبردەسەر ڕۆژێك کەسەرەتای مانگی پێنجی1988بوو هەواڵیان هێنا کەپێشمەرگە توشی شەرێکی قورس بووە لەگەڵ هیزەکانی ڕژێمدا سەرئەنجام توانای بەرگریان نەماوەو شکاوە، پاشان وتیان حوکمەتی بەعس کەوتۆتە دێیەکان هەمووکەسێ دەگرێ، ئێمەش لەترسا ڕوومان کردە دەشتیەکەو لەدێیەکە دەرچووین جێش و جاشێکی زۆر لە لەیلانەوە بەرەو گوندەکەی ئێمە دەهات ئێمە دێیەکەمان زۆر لە لەیلانەوە دورنیە، نەمانتوانی زۆر لەدێیەکەی خۆمان دوورکەوینەوە لەبەر مەروماڵاَت و شتەکانمان، جاشەکان دەورەیان گرتین و بردمانیان بۆ لەیلان سەرکردەی جاشەکان ناوی حمە بوخچی بوو، دوای کەمێك جەماعەتی بارق هاتن و تەسلیمی ئەوکراین، بارق پێی وتین دەتان نێرین بۆ لیواکەی چەمچەماڵ، ژمارەی خەڵکەکە زۆر بوو، سواری ئیڤایان کردین و گەیشتینە چەمچەماڵ نزیکەی دووسەعات لەوێ ماینەوە دوای ئەوە رەوانەی سلێمانیان کردین دووشەو لەوێ ماینەوە دوای ئەوەبردمانیان بۆتۆپزاوا ئەو شەوە لەتۆپزاوا ماینەوە بۆ بەیانیەکەی بردمانیان بۆ نوگرەسەلمان مەلابانگدان بوو تاوەکو دوای مەغریب لەسەیارە دابووین، بێ نان و بێ ئاو کە گەیشتینە نوگرەسەلمان لەسەیارەکە دایانگرتین هەموومان گۆج ببوین توانای ڕێکردنمان نەمابوو، هەموو جیاکراینەوە ژن بەجیاو پیاو بەجیا تەنانەت کچەکانیان برد بۆ دووز، پێنج مانگ و نیو لەنوگرەسەلمان

ماینەوە دواتر ئازادکراین کچەکان پانزە ڕۆژ دوای ئێمە ئازادکران، ژیان لەناو قاعەکانی نوگرەسەلماندا زۆر ناخۆش بوو ئەم بەیانی بۆ ئەو بەیانی سەمونێکان دەداینێ، خەڵکم دەبینی بە بەرچاوی خۆمەوە گیانی دەردەچوو، دەیان برد کەمێك خۆڵیان دەکرد بەسەر لاشەکەیدا دوای ئەوە سەگەڕەشەکەمان دەبینی بە بەرچاوی خۆمانەوە دەری دەهێنا دەیخوارد، دواتر محەمەد چاو بەفرمێسکەوە دەیوت هۆکاری ئیفلیج بوونی من بەهۆی لێدانەوە بوو لەلایەن زابتێکەوە کەجارێکان هەموومان دەرکرابووینە ناو حەوشەی سجنەکە خەڵکەکە هەمووی تینو بوو، بۆ ئازاردانی ئێمە هەندی بەرمیلە ئاویان لەبەرامبەرمان دانابوو کەس بۆی نەبوو ئاوی لێ بخواتەوە، من خۆم پێ ڕانەگیراو ڕویشتم بۆ ئاو خواردن، بەڵام زابتەکە گرتمی زۆری لێدام بە جۆرێك توانای هەڵسانەوەم نەمابوو، پیاوێك کەناوی جەبار حاجی ئەحمەد بوو هات هەڵیگرتم و بردمێوە بۆ ناو خەڵکەکە زۆرجار دەڵێم خۆزگە لەتیونا بخنکاما بەس نەچووومایە بۆئاوخواردن، جارێکی تریش ئەوکاتە کەسەدامی گۆڕ بەگۆڕ لێبوردنی گشتی دەرکرد لەخۆشیا ئەوەندە بەپەلە دەرچووین لەسجنەکە بەجۆرێك هەموو شتەکانمان بیرچوو، من گەڕامەوە بۆشتەکانمان بەڵام دیسانەوە زابتێك گرتمی لەجاری پێشوو زیاتری لێدام لەدوای دەرچوونمان لەسجن تووشی نەخۆشیەکی قورس بووم چەندین دکتۆر گەڕام بۆ چارەسەرکردن، بەڵام دکتۆر وتی چارەسەرت لێرە نیە پێویستە بنێردرێیتە دەرەوەی وڵات، ئێمەش نەمان دەتوانی بچینە دەرە بۆچارەسەر، لایەنی مادیمان زۆرخراپ بوو، کەسیش نەبوو یارمەتیمان بدات تاوەکو ئێستایش کە پێنچ سەد هەزار موچەکەمە بەشی ژیانی ڕۆژانەمان ناکات چ جای ئەوەی من چارەسەری خۆمی پێبکەم، زۆرجار بیر لەو ساتانە دەکەمەوە، مەبەستم پێش ئەوەی بگیرێین، بەزەیم بەخۆمدا دێتەوە، بەڵام سودی چیە کەمن لەئێستادا ناتوانم خزمەتی خۆم بکەم بەردەوام دەبێت یەکێکی تر لەگەڵمدابێت.

ئەو وتیشی لەگوندەکەی ئێمە خەڵکیکی زۆر ئەنفالە لەبنەماڵەکەی ئێمە نزیکەی دوانزە کەس ئەنفالە کەس و کاریان لەچاوەڕوانی ئەوەدا بوون کە کوڕو کچ و خۆشەویستانیان بگەڕێنەوە، بەڵام بینیمان کە ئێسك و پروسکیانیان لەبیابانە چۆڵەکان دەدۆزرایەوە کە بەکۆمەڵ خرابوونە ژێر خاکەوە.

خۆش بەختانە حوکمەتی هەرێم لەهەوڵی ئەوەدایە کەبرینی کەس و کاری ئەنفالکراوەکان ساڕێژبکات، بەڵام من واهەست دەکەم کەبرینی من تاوەکو مردن ساڕێژنابێت، وەك خۆی دەیوت هەموو ڕۆژێك ئازارم دەدات بەردەوام ئاوات بەوە دەخوازم کەجارێکی تر بەپێیەکانی خۆم هەنگاو بنێم نەك بەم عارەبانەیەی کەنیوەی ژیانی تەواوکردووم.

# جینۆسایدی کورد لەعێراق

وەرگێڕانی لە ئنگلیزیەوە: کاروان محەمەد تەیب

لە نووسراوێکی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ (Human Rights Watch)، بەم شێوەیەی لای خوارەوە باس لە جینۆسایدی کورد ئەکات لە هەڵمەتەکانی ئەنفالدا:

1- **ئەنفال چییە؟**

ئەنفال زاراوەیەکی عەرەبییە بەمانای (غەنییمە، تالآنی کردن، رووت کردنەوە..... هتد)(*) بەهەشت قۆناغی هەڵمەتی سەربازیو هێزی عیراق لە ساڵی 1988 ئەنجامدراو تێیدا بەئەنقەستو بەشێوەیەکی پلان بۆ دارێژراو (50) هەزار بۆ (100)(**) هەزار کەس کوژران، لە کاتی شاڵاوەکانی ئەنفالدا سوپای عیراق، بەبەردەوامی چەکی کیمیای بەکارئەهێنا، لەدژی کوردەکان. قوربانیانی ئەنفال بریتیبوون لە ژن، منالْ، پیر، گەنج، ئەمانە بۆ ئەوە ئەنفال کران چونکە کورد بوونو لەسەر ماڵوو حاڵی خۆیان ئەژیان، پاش لێکۆڵینەوەکانی، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ لە ساڵانی 1992–1993 ئەنفالی وەك جینۆساید هەژمارکرد.

2- **ئە نجامدەرانی ئەنفال کێن؟**

ئەنجامدەرانی شاڵاوەکانی ئەنفال ئەوانەن کەلە دادگای تاوانەکانی عیراق داواکراون و بەشێوەیەکی سەرەکی بریتین لەمانە: سەدام حوسێن، سەرۆك کۆماری ئەوکاتەی عیراق، عەلی حەسەن ئەلمەجید، بەرپرسی گشتی ئۆفیسی باکوری عیراقی حزبی بەعس، کەدەسەڵاتی تایبەتو تەواوی پێدرا بوو بۆ ئەوەی هەموو کردەوەیەك ئەنجامبدات. سوڵتان هاشم، فەرماندەی

---

(*) ئەنفال هەڵقوڵاوی کەلتوری، دانشتوانی بیابان نشینیی، نیمچە دورگەی عەرەبە، کە رەگو ریشەی خۆی لە ناخی هەموو تاکێکیاندا داکوتاوە. دانشتوانی ئەو نیمچە دورگەیە لە پێش ئیسلامو دوای ئیسلامیش پەیڕەویان کرد. تەنانەت لە دوای سەرهەڵدانی ئیسلامیش بەتەواوی شەرعییەت بە ئەنجامدانی ئەنفال درا..... (وەرگێڕ).

(**) هەرچەندە کورد ژمارەی قوربانیانی ئەنفال کراوەکانی بە (182) هەزار داناوە، بەڵام رێکخراوە بیانییەکانی مافی مرۆڤ ژمارەی ئەنفال کراوەکان بە (50) هەزار بۆ (100) هەزار داناوە. ئەمەیش مانای ئەوەیە کە "حکومەتی هەرێمی کوردستانو دەسەڵاتدارانی کورد" ژمارەی ئەنفال کراوەکانیان بە دۆکیومەنتەوە نەخستووەتە بەردەستی رێکخراوە نێودەوڵەتیو بیانییەکانی مافی مرۆڤ، لە نێویشیاندا رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ...... (وەرگێڕ).

هەڵمەتەکانی ئەنفال. سابر عەبدولعەزیز ئەلدوری، بەڕێوەبەری ئیستخباراتی سەربازی. حوسێن ڕەشید ئەلتکریتی، جێگری لێپرسراوی هەڵمەتەکانی ئەنفال. تاهیر تۆفیق ئەلعانی، پارێزگاری موسڵ. فەرحان موتڵەگ ئەلجبوری، بەڕێوەبەری ئیستخباراتی سەربازی لە باکوری عیراق.

هەریەکە لە سەدام حوسێنو عەلی حەسەن ئەلمەجیدیش بەرپرسی یەکەمی هەڵمەتە سەربازییەکانی ئەنفالن، کە ئامانج لەو هەڵمەتانە جینۆساید کردنی کوردەکان بوو.

**3- گرنگی دادگاییکردنی ئەنجامدەرانی شاڵاوەکانی ئەنفال لە چیدایە؟**

جیاواز لەدادگایی کردنی تایبەت بە کەیسی (دوجەیل)، کەتایبەت بوو بە کوشتنی دڕندانەی چەند کەسێك لەدانیشتوانی ئەو گوندە، تاوانی ئەنفال زۆر گەورە ترو گەورەترە لەکەیسی (دوجەیل)، هەروەك لەپێشدا ئاماژەی پێدرا لەئۆپراسیۆنەکانی ئەنفالدا دەیان هەزار کورد بێسەرو شوێن کرانو بەکۆمەڵ کوژران ئەمە سەرەڕای بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە دژیان، نزیکەی (2)(***) هەزار گوندیش روخێنراو سەدان هەزار خەڵکانی دانیشتوی لادێکان، ئەوانەی کەلە هەڵمەتەکانی ئەنفالدا دەربازیان بوو، بێ ماڵو حاڵ بوون لەئاکامی هەڵمەتەکانی ئەنفالدا.

سەلماندی ئەوەی سەدام حوسێن بەتایبەتیو دارو دەستەکەی بەگشتی بەرپرسن لەجینۆسایدکردنی کوردەکان لەدادگا پێویستی بە بەڵگەی بەهێز هەیە کە سەدام بۆ ئەوە ئەو کوردانەی ئەنفال کردووە کە کورد بوون لەڕوی ئەتنیکییەوە، کە هەر ئەمیش سەدامو دارو دەستەکەی ئەخاتە ئەو خانەیەوە کە جینۆسایدی نەتەوەیەکیان کردووەو هەر ئەمیش ئەبێتە مایەی ئەوەی کە دادگای تایبەت بە بەرپرسانی ئەنجامدەرانی ئەنفال گرنگ بێت.

**4-چی جۆرە شتێك ئەوە نیشان ئەدات کە ئەنفال جینۆسایدە؟**

ئامانجی دیاری کراوی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی عیراق بۆ لەناوبردنی کوردەکان لەسەر بنەمای ئەتنیکی, جائەوەش بە شێوەیەکی گشتی بێت یان جوزئی، ئەوە نیشان ئەدا مەبەست لەئەنجامدانی ئەنفال جینۆساید کردنی کوردەکان بووە، بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنرێ کەجینۆساید رویداوە، دادگای باڵای تاوانەکانی عیراق پێویستە ئەوە بسەلمێنێ کە هەڵمەتەکانی ئەنفالدا بەمەبەستێکی دیاری کراوە ئەنجام دراون لە بەرامبەر کورد بۆ جینۆساید کردنی ئەو ئەتنیکە.

---

(***) لێرەیشدا دیسانەوە هەرچەندە کوردەکان ژمارەی گوندە روخاوەکانی کوردستان بە چوار هەزارو پێنج سەد گوند داناوە، بەڵام ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان وایان داناوە کە ژمارەی گوندە روخاوەکانی کوردستان بە دوو هەزار داناوە، ئەمەیش وادیارە "حکومەتی هەرێمی کوردستانو کاربەدەستانی کورد" کەمتەرخەم بوونە لەوەی کە ژمارەی گوندە روخاوەکان بەدوکیومەنتەوە بخەنە بەردەستی ئەو ڕێکخراوانە...... (وەرگێڕ).

**5- ئەو ژمارە کەسە کوژراوە چەندە کە پێویستە هەبن لەکۆمەڵ کوژییەکدا بۆ ئەوەی وەك جینۆساید هەژمار بکرێ ؟**

لەجینۆسایدەکانی پێشودا وەك (هۆلۆکوست، جینۆسایدی ئەرمەنەکان لەلایەن تورکە عوسمانییەکانەوە، جینۆساید لە رواندا) ژمارەی کوژراوەکان زۆر بوون، ئەو ژمارە زۆرە بۆ خۆی یارمەتی دەربوو بۆ ئەوەی ئەوە نیشان بدات کە کوشتو بڕ لەسەر بنەمای ئاینی یان ئەتنیکی بووە، بەڵام هەرچۆنێك بێت کوردەکان لەئۆپراسیۆنی ئەنفالدا زۆریان لێ کوژراو جینۆسایدیش بە ژمارە دیاری ناکرێ ونائاسرێت، بەڵکو مەبەست لە جینۆساید لەناوبردنی گرپێك بە تەواوی یان بەشێکێتی هەرچۆنێك بێت ئەو ژمارەیەی کە لەئەنفالدا لەناوبران بە پێی بەڵگەکان ئەوە نیشان ئەدات کە کوردەکان کراون بەئامانج ئەویش بەهۆی ئەوەی لەرووی ئەتنیکی یەوە کوردبوون.

**6- چۆن بزانین ئەو کوشتارەی کە لەبەرامبەر کوردەکاندا ئە نجامدرا لەبەر ئەوە بووە کە کوردن؟**

کوردەکان هەرلەسەرەتای 1970 کانەوە لەلایەن حکومەتی عیراقەوە لە ژێر هەڕەشەو هێرشی راستەقینەدا بوون، پرۆسەی ئەنفالیش چڵەپۆپەی ئەو هێرش و هەڕەشەیە بوو، حکومەتی عیراق هەمیشە ئەوەی دووبارە ئەکردەوە کەکوردەکان هەڕەشەن بۆسەر عیراق، هاوکات حکومەتی عیراق بەمەبەستی تەعریب کردنی ناوچە کوردییەکان کوردەکانی لەجێی باو باپیرانی خۆیان دەر ئەکردوو عەرەبی لەناوچەکانی تری عیراقەوە ئەهێنا بەمەبەستی تەعریبکردنی ئەو ناوچانە. هەروەك کردەوەیەکی تری حکومەتی عیراق لەدژی کوردەکان چۆڵ کردنی ئەو ناوچە کوردییانە بوو کە هاوسنوورن لەگەڵ ئێرانداو توند کردنیان لە کۆمەڵگا زۆرەملێکاندا.

**7- چی بەڵگەیەك لەبەردەستدایە ئەوە نیشان بدا کە ئەو تاوانانەی حکومەتی عیراق لەبەرامبەر کوردەکان ئە نجامی داون مەبەست لێیان کۆمەڵکوژی کوردەکان بووە؟**

حکومەتی عیراق ناوچەی قەدەغەکراوی دروست کردو دواتر هەرکەسێکی لەو ناوچان بەدی بکردایە ئەیکوشت.

هەرچەندە حکومەتی عیراق ئیدیعای ئەوەی ئەکرد کەئەو کەسانەی کە لەناوچەی قەدەغەکراودا کوژراون تەنها برتین لە "پێشمەرگە" یان ئەوانەی کە هەوادارو لایەنگری پێشمەرگن، بەڵام ئەو شتێکی راست نییە, چونکە دەیان هەزار مناڵ لەنێو قوربانیانی ئەنفالدان، جگە لەوەیش حکومەتی عیراق هیچ جیاوازی نەکرد لەنێوان ئەو کوردانەی کەهاوکاری ئەکرد لە کردەوەکانی لەگەڵ ئەو کوردانەی کە دژی کردەوەکانی بوون، هەربۆیە هەردوولای هەروەك یەك سەیر ئەکرد، واتە کوردەکانی بەگشتی بەهەڕەشە ئەزانی بۆسەر دەسەڵاتی حیزبی بەعس لە عیراقدا.

حکومەتی عیراق لە ئەنفالکردنی کوردەکاندا ئەوەی کردە بیانوو گوایە یارمەتیدەروو هاوکاری حکومەتی عیراق بوون لەشەڕی هەشت ساڵەی ئێران- عیراق دا، تەنانەت ئەگەر ئەم بیانووەی حکومەتی عیراق راستیش بێت، ئەوا هەرگیز پاساوی ئەو کوشتو بڕە گەورەیەی کوردەکان

نادات لەباکوری عیراق، بەتایبەتی کوشتنی ژن و منالو ئەوانەی کەهەرگیز بەشدارییان نەکردبوو لە ململانێکانداو پەیوەندیان بە هیچ کەس و لایەنێکەوە نەبوو، لەڕاستیدا هەر هەموو ئەمانە ئەوە روون ئەکەنەوە ئەوانەی لەئۆپەراسۆنی ئەنفالدا خرانە ناو گوڕە بەکۆمەڵەکانەوە لەلایەن حکومەتی عیراقەوە لەبەر ئەوە بوو کەئەوانە لەرووی ئەتنیکییەوە کورد بوون.

**8- رۆڵی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ چییە لە بە دۆکیومەنتکردنی ئەنفالدا؟**

لە ساڵی 1992 دوای شەری کەنداو، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، تیمێکی نارد بۆ باکوری عیراق کە پێکهاتبوون لەچەند لێکۆڵەرێك، بۆماوەی چەند مانگێك بەردەوام بوون لەسەر لێکۆڵینەوەی قووڵو فراوان، ئەندامانی ئەو تیمە لەگەڵ نزیکەی 350 رزگاربوو و شایەتحاڵی ئەنفالدا چاوپێکەوتنیان ئەنجامداو هەروەها شیکارییان کرد بۆ ئەو ناوچانەی کە کیمیا باران کرا بوون لە لایەن حکومەتی عیراقەوە، دواتر بە مەبەستی پاراستن و لێکۆڵینەوە، کوردەکان، 18 تەن دۆکیومەنتی پاشماوەی دەزگا ئەمنییەکانی عیراقیان خستە بەردەستی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، کە کوردەکان لەکاتێدا کەحکومەتی عێراق باکوری عیراقی بەجێهێشت کەوتبووە بەردەستیان، لەسەر ئەساسی ئەو لێکۆڵنەوەو شیکردنەوانەیش، رێکخراوی مافی مرۆڤ بۆی دەرکەوت کەمەبەست لەئەنفال کردنی کوردەکان جینۆساید کردنیان بووە لەلایەن دەسەلاًتدارانی ئەو سەردەمەی عیراقەوە، لە نێوان 1994- 1995 دا رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ هەوڵیدا کە ئەو حکومەتانەی کە بایەخ ئەدەن بەمافی مرۆڤ قایل بکات تاکو لە دادگای دادی نێودەوڵەتی کەیسێك دروست بکەن دژی حکومەتی عیراق، بەلاًم بەداخەوە ئەم دەست پێشخەرییە هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتەوە.

**هێزەکانی سەدام گۆڕە بەکۆمەڵەکانیان پڕ کرد لە منالاًن**

ئەمە ناونیشانی بابەتێکە کە(پاوڵ شیم) بە زمانی ئینگلیزی لەئاژانسی فرانس پرێسی فەرەنسایی بلاًوکردووەتەوە، کە ئەویش لە (میشێل تریپڵ)ەوە وەریگرتووە، لە بەر گرنگی و پەیوەست بەم بابەتەوە وەریئەگێرمە سەر زمانی کوردی.

میشێل تریپڵ سەرۆکی یەکەی لێکۆڵینەوە لەگۆڕە بەکۆمەڵەکان لەدادگای بالاًی تاوانەکانی عیراق ئەوەی ئاشکرا کرد کەهێزەکانی عیراق ژنەکانیان گولە باران ئەکرد بەمناڵەکانیانەوە کە لەباوەشیاندا بوون، جگە لەوەیش بە دڕندانەترین شێوە منالڵ کوردەکانیان قەتلوعام ئەکرد، پێش ئەوەی بە بلدۆزەرەکان لە نێو گۆڕە بەکۆمەڵەکان تونیان بکەن.

هەروەك میشێل لەشایەتیدانێکدا ئەوەی ئاشکرا کرد لەسێ گۆڕی بەکۆمەڵدا کەهەڵدراونەتەوە دوای داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە، هەریەکە لەو گۆڕانە پڕبوونە لە ئێسك و پروسکی ژمارەیەکی زۆر لە منالاًن کە بەکۆمەڵ کوژرا بوون.

میشێل وتیشی لە کۆی 301 ئێسك و پروسکی گۆڕە بەکۆمەڵەکان 183یان منالڵی کورد بوون کە لە هەڵمەتەکانی ئەنفالداو لە ساڵی 1988 دا بە کۆمەڵ گیرابوون و خرابوونە نێو گۆڕە

بەکۆمەڵەکانەوە، ئەوانەی لە هەڵمەتەکانی ئەنفالدا گیرابوون چاوو دەستیان بەسترابووەو دواتر ڕەوانەی گۆڕە بەکۆمەڵەکان کرابوون‌و هەرلەوێ گولە باران کرابوون‌و خرابوونە ژێر خۆڵەوە، لە نێو ئەو گۆڕە بەکۆمەلانەی کە هەڵدراونتەوە 90٪ ی منالآنی نێو ئەو گۆڕ بەکۆمەلانە تەمەنیان لە خوار 13 ساڵییەوەن‌و لە نێویشیاندا منالێك هەیە کەتەمەنی لە نێوان 6 بۆ 12 مانگە کە لەدواوە فیشەکێك نراوە بە سەرێوە.

بەپێی ئەو بەڵگانەی کە لەگۆڕە بەکۆمەڵەکان بەردەس کەوتوون، لە موسەنا، لە خواروی عیراق، ئەوە دەرئەکەوێت کە بەشێوەیەکی فراوان‌و سیستەماتیك پلان دارێژراوە بۆ کوشتنی کوردەکان.

میشێل وێنەی منالێکی پێنج شەش سالآنی پێشانداوە کە قاچی کرابووە دوو کەرتەوە بە فیشەك، هەروەها وێنەی کچێکی تر کە پووتێکی سەوزی لەپێدا بوو وێنەی پشیلەیەکی بچوکی لەسەر بوو، هەروەها لەوێنەیەکی تردا کە میشێل خستیٚ روو وێنەی منالێك بوو تەمەنی 8 بۆ 10 سالآن ئەبوو کە گولەباران کرابوو، هەروەها لەوێنەیەکی تردا کچێك تەمەنی لە نێوان 9 بۆ 16 ساڵیدا بوو دیسانەوە گوولە باران کرابوو.

هەروەك ئەو پسپۆڕە باسی لە ژنێك کرد کە دووگیان بووەو تەمەنی لە نێوان 35 بۆ 40 ساڵیدا بووە کە فیشەکێك نراوەتە ناو سکێوەو جگە لە خۆی منالەکەیشی هەرلە ناوسکی دایکیدا گیانی لەدەسدابوو.

میشێل تەواوی ئەم شتانە لەدادگای بالآی تاوانەکان‌و لەبەردەم دادگادا خستەروو، کە لەوکاتەدا سەدام حوسێن‌و ئەنجامدەرانی ئەنفال ئامادەی بوون.

# تاوانی ئەنفال

## تێڕوانینێکی یاسایی بۆ سڕینەوەی دەرئە نجامە کارەساتبارەکانیو ڕێگرتن لەدووبارەبوونەوەی

د.تەیسیر عەبدولجەبار ئالوسی

وەرگێڕانی/ هەژار عەلی واحد

سەرچاوە/ ماڵپەڕی ئەلئەخبار

پێویستە لەسەرەتادا خەجت لە بەدۆکیومێنت کردنی ئەو لێکۆڵینەوانە بکەینەوە کەتایبەتن بەو کەیسە، جا چ لێکۆڵینەوەکانی پێشووتر بن یاخود نویو پیشتیوانی کردنیشی بەگیانێکی زانستیو مرۆیی، ئەمەش بۆ گرنگی باسکردنێکی ورد بۆ ئەو تاوانو کارە نامرۆڤانەیە تا لەبیرمان نەچێتەوە کەدەرحەق بەدەیان هەزار بێتاوان لەزنجیرەیەك تاوانی کارەساتباردا ئەنجامدراو تا ئێستاش بەدەست کاریگەریو دەرەنجامەکانییەوە دەناڵێنن، چاوی مرۆڤایەتیش لەفراوانبووندایە بۆ باسکردنێکی ڕاستەقینەی ئەو تاوانەو پێشخستنی لەچوارچێوەی دادگایی کردنێکی یەکسان لەبەردەم گەلاندا کە بەکۆمەڵێك حوکم کۆتایی پێبێتو گوزارشت بێت لەو قوربانیانەی کە کەس ناتوانێت بیانگێڕێتەوە بۆ ژیان، ئەمەش لەپێناو کەسوکاری قوربانیانو دووبارەنەبوونەوەی ئەو تاوانەو گەیشتنی دادگا بەبڕیاری کۆتاییو گێڕانەوەی ماف بۆ خاوەن مافەکان.

جارێکی دیکە گەڕانەوە بۆ ئەو تاوانە بەتایبەت لەسایەی ئەو بارودۆخەی لەئێستادا لەئارادایە، وامان لێ دەکات لەسەر قەبارەی ئەو تاوانە کارەساتبارە هەڵوەستە بکەین کە کولاندنەوەی بەپێشکەوتنی ڕۆژگارو ڕووداوەکان سارێژ نابێت، بەڵکو بەچارەسەرکردنێکی دروستو هەڵوێستی چاونەترسانەو بەرپرسانە سارێژ دەبێت، منیش لەئێستادا هەندێ دەنگ دەبیستم کەباس لەتاوانەکانی ڕابردوو ئەکەن، ئەویش بەهۆی سروشتی بارودۆخی ئێستاو ئەوەی بەشێوەیەکی مەیدانی ڕوودەدات، هەروەها جەختکردنەوەی ئەو دەنگانە لەسەر واقعێکی بەهیلاك چوو لەکەشێکی خویناویدا کەڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەناودەباتو جارێکی دیکەش ڕۆڵەکانی نیشتمان دەکاتەوە قوربانی، لەوەلامی ئەمەشدا دەڵێین: پشتگوێخستنی ئەو تاوانانەی کەتا حاڵی حازر کاریگەریەکانی بەردەوامە، دەرەنجامی کارەساتباری لێدەکەوێتەوەو دەبێتە بەربەست لەبەردەم یەکبوونی چارەنووسی گەلی عیراق بەهەموو نەتەوە جیاوازەکانیەوە، دەکرێت بڵێین کە هەموو هەوڵەکان بۆ چاوپۆشینو پشتگوێخستنی ئەو تاوانانە یاخود دواخستنی چارەسەرکردنیان، دەبێتە هۆی بەردەوامیی قووڵکردنەوەی زامی کەس‌وکاری قوربانیانو نەوەی

ئەو قوربانیانە كەتائێستا بەدەست ئەنجامی نەخۆشیە ترسناكەكان (دەروونی)یەكانیانەوە دەناڵێنن.

پێویستە لەم دۆخە ئاڵۆزەدا ڕێگە بەتاوانباران نەدەین فشارمان بخەنەسەرو ئەركەكانمان بیر ببەنەوە لەدەستنیشانكردنی هەموو تاوانەكانیان‌و دانانی سزایەكی توند بۆیان كەببێتە هۆی كەمكردنەوەی زامی كەس‌وكاری قوربانیان، بێ ئەمەش ناتوانین ژیانێكی خۆش‌و مرۆڤانە بگوزەرێنین‌و خۆشمان بپارێزین لەوەی كە لەگەڵ تاوانباران بەشداری نەكەین لەئەنجامدانی تاوان دەرحەق بەخودی خۆمان‌و هاونیشتمانیەكانمان.

دڵنیاییەوە هۆكاری بەردەوام بوونی تاوانەكان لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا بۆ كۆتایی نەهاتنی بەدواداچوونەكانمان دەگەڕێتەوە سەبارەت بەزەمەنی ئەنجامدانی تاوانەكان‌و یەكلایی نەكردنەوەی چارەسەرێكی گونجاو بۆیان، لەچركە ساتی چارەسەركردنی ئەو تاوانانەو گەیشتن بەئەنجام‌و دەركردنی بڕیاری دروست، هەموو تاوانانەكان كۆتاییان دێت، لەو كاتەشدا باڵادەستی دەسەڵاتی دادوەری‌و مافی مرۆڤ شكۆمەند دەكەین.

پاش ئەم ڕوونكردنەوەیەش دەمانەوێت باسێكی كورتكراوە لەسەر تاوانی ئەنفال پێشكەش بكەین تا خوێنەران ئاشنا بكەین بەدەرەنجامەكانی فەرامۆش كردنی ئەو تاوانەو گەیشتن بەچارەسەرێكی گونجاو.

لەكۆتایی سەدەی ڕابردوودا گۆڕانكاری گرنگ لەمێژووی مرۆڤایەتی ڕوویدا، لەكاتێكدا مرۆڤایەتی بەرەو بەرزكردنەوەی بەهای ئازادی‌و دیموكراتی‌و ئاشتی‌و رزگاربوون لەكۆیلایەتی‌و رژێمە فاشیستەكان بەهەموو شێوەكانیەوە هەنگاوی دەنا، لەهەمان كاتدا ساڵانی تەنگژەی دەروونی خەڵكیش لەهەڵچووندا بوو لەپێناو بەرزكردنەوەی دروشمەكانی ئازادی‌و مافی مرۆڤ‌و مافی گەل‌و نەتەوەو گەیشتن بەسەربەخۆیی، لەگەڵ رزگاربوون لەسەردەمی دیكتاتۆریەت‌و كۆتایی هێنان بەدیاردەكانی سڕینەوەی ناسنامەو كەسایەتی میللەتان، چونكە مومارەسەكردن‌و قسەكردن بەزمانی نەتەوەو دایك‌و سەردانیكردنی زێدی باوباپیرانیشیان لێ قەدەغەكرابوو، لەو كاتەدا هێزی تاوانكاری‌و پیاوانی دیكتاتۆریەت سنوورو دەوروبەری زۆربەی ناوچەكانیان تەنی بوو، هێڵی سووریان لەو ناوچانە كێشابوو كەچوونەناویان لەهزرو جوگرافیادا قەدەغەكردبوو، لەهەموو شتێكیش كەپەیوەندی بەژیانی مرۆڤەوە هەبێت بەدووربوون، لێرەدا مەبەستی تایبەتیم هەرێمی كوردستانی عیراقە.

كاتێك رژێمی دیكتاتۆر لەماوەیەكی كەمدا دوایین كارتی فشاری خۆی ئاشكراكرد، جەنگێكی درێژخایەنی ڕاگەیاند دژی ڕۆڵەكانی گەلی كوردمان، ئەو جەنگەشی پێشوەخت‌و بە بەرچاوی هەموو هاوڵاتیانی عیراقەوە ئەنجامدا، كە بەهۆیەوە سەدان هەزار خێزانی كورد گوندەكانیان چۆڵكرد، ئەو تاوانەش دژی گەلێك ئەنجامدرا كە هەڵگری ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بوون، لە ساڵی (1975)و بەگوێرەی سەرچاوەیەكی ڕەسمی (50) هەزار كورد بۆ شارەكانی دیوانیەو

ناسریە ڕاگوێزران کەئەم ژمارەیە زۆر کەمترە لەڕاستی مەسەلەکە، هەروەها ئەو پشتێنەیەش فراوانتر کرا کەپێیان دەوت لە (5) کیلۆمەترەوە بۆ (3)، لەگەڵ (15) بۆ (30) کیلۆمەتر، ئەمەش بەمانای زیاتر وێرانکردنی گوندەکانو سڕینەوەیان دێت لەسەر نەخشە، لەهەمان کاتدا بەمانای ڕاگواستنی زیاترو کۆمەڵکوژیو لەڕەگو ریشە دەرهێنانی ناوچەکانی کوردستان دێت کە لەنێوان وولاتانی ناوچەکەدا دابەشکراوە.

لێرەدا ئەمەوێ ئەو (500) گوندەش وەبیر بهێنمەوە کەبەردەوام هەڵمەتی پاکتاوی ڕەگەزی دەیگرتنەوە،ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر سلێمانی، چونکە دانیشتوانی ئەو گوندانە ڕوویان دەکردە ئەو شارە، هەر سەبارەت بەدەست بەسەرداگرتنی مافە مرۆییو نەتەوەییەکانی گەلی کوردو بەپێی رۆژنامەی (الجمهوریە)ی عیراق، لەساڵی (1978)و تەنها لەماوەی دوو مانگدا (28) هەزار خێزانی دانیشتووی گوندەکانی سەر سنوور کەنزیکەی (200) هەزار کەس دەبوون دوورخرانەوە بۆ ناوچەکانی قوشتەپەو بەحرکەو دیاناو حەریر کەسەر بەپارێزگای هەولێرن، ئەمەش لەلایەن لیژنەیەکەوە ئەنجامدرا کەپێیان دەوت (لیژنەی باڵا بۆ کاروباری باکوور)و ڕاستەوخۆ (سەدام حسێن)ی دیکتاتۆر سەرۆکایەتی دەکرد، مەرگەسات دوای ئەمە دەستی پێکرد، کاتێك هەزاران کەس لەپیاو و ژنو پیرو لاوی ئەو ناوچانە دەستگیرکرانو بۆ شوێنێکی نادیار گوێزرانەوە کە تا ئەمڕۆ بێسەروشوێنن، لەکاتێکدا ڕاپۆرتو بەڵگەنامەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە بەکۆمەڵ گوللەباران کراون، لەهەمان کاتدا خودی سەدامی دیکتاتۆر لەوتەکانیدا ئاماژەی بەکوشتنی بارزانییەکانو کوردانی دیکە کردووە کە دکتۆر (عەبدولستار شەریف)یش لەزاری سەبعاوی زڕبرای سەدامەوە دیگێڕێتەوە کە ئەو کوردانە لەناوچەی (عەرعەر) لەگۆڕ نراون، بەدڵنیایشەوە دۆزینەوەی ئەو گۆڕە بەکۆمەڵو بەڵگەنامانە ئاماژە بۆ تاوانی لەناوبردنی دەیان هەزار مرۆڤی کورد دەکەن لەژنو منداڵو پیر بەبیانووی شەڕی نێوان عیراقو ئێران کەئەمەش نابێتە پاساوێك بۆ لەناوبردنیانو تێوەگلانیان لەو جەنگەدا.

*بەڵگەنامەکانی حکومەت بەژمارەکانی (998 - 1037) ئاماژە بۆ لەناوبردنی ئەو کوردانە دەکەن.

لەئازاری (1987)و بەپێی بڕیاری ژمارە (160)ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی حزبی بەعس، عەلی کیمیاوی لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ئەم تاوانانەی ئەنجامدا:

1- سوتاندنی ئەو گوندانەی بەدرێژایی دەیان ساڵ بەهەوڵی دانیشتوانەکەی ئاوەدان کرابوونەوە، لەقۆناغی یەکەمی ئەو هەڵمەتە فراوانەشدا بە بەکارهێنانی شۆفڵو ژمارەیەکی زۆر فرۆکە نزیکەی (703) گوند وێران کران، کە (219) گوندیان لەدەوروبەری هەولێرو (122) لەگەرمیانو (320) گوندی دیکەش لەدەوروبەری سلێمانیو بادینان، لەحوزەیرانی (1987)یش بەفەرمانی عەلی کیمیاوی (1000) گوندی دیکە بەبیانووی ئەوەی لەناوچەی قەدەغەکراو دان وێران کران.

2- ئاوارەكانی قەرەتەپە دابەشكران بەسەر ناوچەكانی دەوروبەری شاری رومادی، لەئەیلولی (1987)یش عەلی كیمیاوی بڕیاری دەستگیركردنی رەگەزی نێرینەی دەركرد كەتەمەنیان لەنێوان (12 – 50) ساڵدا بێت، واتە دەستگیركردنی هەزاران منداڵو پیر.

لێرەدا ئاماژە بەلیستێك دەكەین، تیایدا ئەو گورزە كیمییانە دەخاتەڕوو كە لەچوارچێوەی پرۆسەی ئەنفالدا دەرحەق بەڕۆڵەكانی گەلی كورد وەشێنراون:

- 1987/4/15 بۆردومانی ژمارەیەك گوندی سەر بەپارێزگای سلێمانی.
- 1987/4/16 هێرشی ئاسمانی بۆ سەر دۆڵی بالیسانو شێخ وەسان، سەر بەپارێزگای هەولێرو بووە هۆی شەهیدبوونی تەواوی دانیشتوانەكانیان،كەژمارەیان (400) كەس بوو.
- 1987/4/17 هێرشی ئاسمانی بۆ سەر قزلەرو هەندێ ناوچەی دیكەی سەر بەپارێزگای سلێمانی.
- 18 – 1987/4/20 هەزاران بۆمب ئاراستەی بەرزاییەكانی خەجە لەرزۆكو كوێرینگو دوبراو ماوەتو شاخە سوورو شاخەكانی پیرەمەگرون، سەر بەپارێزگای سلێمانی كرا.
- 1987/4/20 هێرشی ئاسمانیو تۆپبارانی گوندەكانی ناوچەی بالیسان.
- 1987/4/21 بۆردومانی شارۆچكەی قەرەداغی سەر بەپارێزگای سلێمانی.
- 1987/4/23 بۆردومانی چەند گوندێكی دەوروبەری هەولێر.
- 1987/5/1 هێرشی ئاسمانی بۆ سەر چەند ناوچەیەكی دەوروبەری دهۆك.
- 1987/5/5 هێرشی ئاسمانیو تۆپبارانی ناوچەكانی سماقولیو نازەنین.
- 1987/5/25 بۆردومانی گوندەكانی ناوچەی بالیسان.
- 1987/6/6 بۆردومانی كێوەڕەشی سەر بەپارێزگای سلێمانی
- 7 – 1987/6/8 بۆردومانی ناوچەكانی سماقولیو بالیسان.
- 1987/6/9 بۆردومانی گوندەكانی ناوچەی بالیسان.
- 1987/6/27 بۆردومانی گوندی زێویێ.
- 1987/9/3 خەربەنەلو.
- 1988/2/25 تا ناوەڕاستی مانگی ئازار هێزەكانی رژێم بۆردومانێكی سەختی چەند ناوچەیەكی هەردوو پارێزگای سلێمانیو هەولێریان كرد.
- 20 – 1988/3/21 بۆردومانی ناوچەكانی سەر سنوور.
- 1988/10/14 بۆردومانی چەمی رەزان لەسلێمانیو شێخ بزێن لەكەركوك.

تاوانی ئەنفال لەسنووری کوشتن‌و لەناوبردن‌و شاردنەوە ناوەستێت، یاخود وەك ئەوەی بەیاسایی پێی دەڵێن تاوانی کۆمەڵکوژی، بەڵکو لەسەرووی ئەم تاوانانەوە واتە کۆمەڵکوژی، کەهەندێ کەسی نەگرتەوە، تاوانی دژ بەمرۆڤایەتیان دەرحەق ئەنجامدرا، وەك دەست بەسەراگرتنی زۆرە ملێ‌و ستەمکاری‌و جیاوازی ڕەگەز پەرستی، سەرباری ئەمانەش جاشایەتی‌و پیاوانی ڕژێم، سەرچاوەی ترس‌و تۆقاندن‌و دڵەڕاوکێ‌و سیخوڕی‌و نەمانی متمانە بوون لەنێوان خەڵکیدا، تەعدای دەروونیش بەشێکی ترسناك بوو لەو تاوانانە کەڕێکەوتننامەی دژە تاوانی نێودەوڵەتی لەمادەکانی (10)و (13)دا ئاماژەی بۆ کردوون کەتایبەتن بەسزادانی هاوڵاتی ئاسایی.

لێردا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەترس‌و تۆقاندنی خەڵکی کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر ئفلیج کردنی توانای عەقڵی کەدەبێتە هۆی وون بوونی ناسنامەی کەسایەتییەکان‌و ملکەچ کردنیان لەبەرامبەر ئیرادەی ڕژێمێکی ستمکار، ڕاستیەکەش لێرەدا خۆی لەمەترسییەکانی لایەنگری هەندێك لەنوخبەکان دەبینێتەوە کەئەو ڕژێمە بەدادپەروەرو ستەمکاریش ناودەبن، کەهەندێ سەرچاوەی ئەم تێڕوانینەش لەبیری هێزە توندڕەوەکان دەبینرێتەوە،وەکو قۆرخکردنی دەقی ئایەتی ئەنفال لەقورئانی پیرۆز، ئەویش بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی دوور لەبەها پیرۆزەکانی ئیسلام.

ئەو بەڵگە حاشاهەڵنەگرانەش بانگەشەن بۆ بەردەوامی هەڵمەتێکی نیشتمانی‌و نێودەوڵەتی لەپێناو ئاشکراکردنی ئەو تاوانە کارەساتبارەی بەپرۆسەی ئەنفال ناسراوە، لەگەڵ بەڕێوەچوونی ڕێوشوێنی گونجاو بۆ سزادانی ئەو کەسانەی بەرپرسیارن لەئەنجامدانی ئەو تاوانە، ئەمەش پێویستی بەدادگایەکی تایبەت هەیە بۆ ئەوەی هەموو ئەو نەتەوانە تیایدا بەشداربن کەئەو تاوانەیان دەحەق ئەنجامدراوە.

ئەگەر کۆتایی بەباسی ئەو تاوانە سەختە بهێنین، ئەوا پێویستە ڕێگەیەکی فراوانتر بگرینەبەر بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی تایبەت‌و گونجاو بۆ دەرەنجامەکانی لەبیرکردن‌و فەرامۆش کردنی ئەو تاوانە.

لێرەدا ئێمە باس لەتاوانێکی قێزەون دەکەین... ئایا ئەنجامی پشتگوێخستنی دەرەنجامەکانی چی دەبێت؟ ئایا ئەو شتانە چین کەدێنە کایەوە لەکاتی کەمتەرخەمی نواندن لەریسواکردنی تاوانەکە لەلایەکەوەو کارکردن بۆ دانانی کۆتاییەك بۆی؟ ئایا ئەم تاوانە بەنەمانی ئەنجامدەرە ڕاستەقینەکەی کۆتایی هاتووە؟ یاخود بەپانکردنەوەی مارەکە؟

پێویستە بڵێین مانەوەی ئەنجامدەرانی سەرەکی ئەو تاوانە دوور لەسزایەکی توندو مانەوە بەبێ سەلماندنی ڕاستی ڕوداوەکەو پێناسەیەکی وردو ڕاستەقینەی ئەو تاوانەو وەڵام نەدانەوەی پرسیارەکانی کەسوکاری قوربانیان کەدوای مافەکانیان دەکەن، واتە بەردەوام بوون لە کەمتەرخەمی لەسزادانی تاوانباران لەلایەك‌و گێڕانەوەی ماف بۆ کەسوکاری قوربانیانی گەلی

کورد بەتایبەتی و عیراق بەگشتی کەتائێستا بەچاوی کەسوکاری نزیکی قوربانیان و هەتیو و بێوەژنەوە لەو مەسەلەیە دەڕوانن.

پێویستە دەرەنجامەکانی ئەو تاوانە قێزەونە پۆلێن بکەین، بەتایبەت ئەو دەرەنجامانەی کە بەهۆی فەرامۆشکردنی کەیسی ئەو تاوانەو گێڕانەوەی ماف بۆ کەسوکاری قوربانیان دروست دەبێت:

1-درەنجامەکانی رەفتاری پەروەردەیی: تاوانی ئەنفال کاریگەریەکی زۆری لەدەروونی کەس وکاری قوربانیان جێی هێشتووەو زامێکی قوڵی لەناخیاندا دروست کردووە، بەشێوەیەك لەگەڵ مافەکانی ڕۆڵەو خێزان و کۆمەڵانی گەلی کورد یەکناگرێتەوە، ئەگەر بێتوو کەس وکاری قوربانیان هەست بەگوێنەدان و سووك تەماشاکردنی ئەو کارەساتە مرۆییە بکەن، ئەوا کاریگەریەکی سلبی و برینێکی بەسویێ و قوڵتری بەدواوە دەبێت، بۆیە پێویستە هەردوو کۆمەڵگەی عیراقی و نێودەوڵەتی ڕێوشوێنی جدی بگرنەبەر بۆ گێرانەوەی متمانەو سڕینەوەی شوێنەوارەکانی ئەو کارەساتە.

2-دەرەنجامی یاسایی دەستووری: ئەنفال چەند جۆرە تاوانێك لەخۆدەگرێت، وەك تاوانەکانی کۆمەڵکوژی و دژ بەمرۆڤایەتی و ئەشکەنجەدان، ئەنفال تاوانێکی سادەو ئاسایی نییەو بەپێشکەوتنی ڕۆژگارو کاتیش کۆتایی نایەت و لەبیر ناکرێت، کاریگەرییە سلبیەکانیشی هەر دەمێنێ ئەگەر چارەسەرێکی بۆ نەدۆزرێتەوە کە بەقەد ئاستی مەترسی و قەبارەی ڕاستەقینەی تاوانەکە بێت، بەتایبەت لەکاتێکدا کەهەندێك لەئەنجامدەرە سەرەکییەکانی ئەو تاوانە تائێستا لەژیاندان و هەندێکی دیکەشیان بەئاشکرا چەند لایەنێکی هەرێمی و عەرەبی ناسراو دەیانپارێزێت.

لێرەدا تەرکیز لەسەر ئەوە دەکەین کەدەرەنجامە دەستوورییەکان خۆیان لەواتای فەرامۆش کردنی تاوانەکە دەبیننەوە، لەهەمان کاتدا بەواتای ئاوێتەبوون دێت لەگەڵ حکومەتی ناوەندا بەو پێیەی حکومەتی ناوەند لایەنی یاساییەو هەندێ سیاسەتمەداری ئەو حکومەتەش لەکاتێکدا کەبانگەشەی یەکێتی نیشتمانی دەکەن، ئەگەر لەقەبارەی تاوانی ئەنفال کەمبکەنەوەو بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و دادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا نەکەن و پشتگوێی بخەن، ئەوا مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردو نەتەوەکانی دیکەش زەوت دەکەن.

3-دەرەنجامە سیاسییەکان: تا ئەو کاتەی گەورەیی و قێزەونی ئەم تاوانە نەسەلمێنرێت، رتکردنەوەی فیدراڵی و مافەکانی کورد ئەبێتە واقعێك، بۆیە پێویستە لەسایەی دەسەڵاتێکی دیموکرات و یەکسانخوازدا ناکۆکی نێوان سەرجەم لایەنەکان بەگشتی و ناکۆکییەکانی کوردو عەرەب بەتایبەتی چارەسەر بکرێن کەبەرپرسیاری یەکەم لەم مەسەلەیەدا لایەنی عەرەبیە، هەموو ئەمانەش بۆ بەرجەستەکردنی مافە رەواکانی گەلی کوردو دەبڕینی هەڵوێستێکی گشتی بەرپرسیارانەیە لەسەر تاوانی ئەنفال.

4–دەرەنجامی مرۆیی: زۆر کات قوربانی تاونێکی بچوك و ئاسایی قەرەبووی مادیو مەعنەوی دەکرێتەوە، بەلاَم ئێمە باس لەتاوانێکی گەورەی وەك ئەنفال دەکەین کەدەرحەق بەسەدان هەزار کەسو تەواوی گەلێك ئەنجامدراوە، کامەیە قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری قوربانیانی ئەو تاوانە کەهەندێ پێویستی ژیانیان پڕبکاتەوە؟ لەکاتێکدا ئەو قەرەبووکردنەوەیە قوربانیان ناگێڕێتەوە بۆ ژیان، بەلاَم لایەنە مرۆییەکەی دەبێتە هۆی گێڕانەوەی مافی قوربانیانو لایەنی مادیش بۆ گەلێکی ستەملێکراوە، کەچاوەڕوانی قەرەبووکردنەوەیەکی بەرپرسیارانە دەکەن، بۆ ئەوەی ژیانێکی بەختەوەر بەسەربەرنو خزمەتگوزاری مرۆیی زیاتریان پێشکەش بکرێت.

5–دەرەنجامی نەتەوایەتی: پشتگوێخستنی تاوانی ئەنفال، ئازاردانی هەستی نەتەوایەتی گەلی کوردی لێدەکەوێتەوە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ دروست بوونی هەستی دەمارگیری نەتەوایەتی لای سەرجەم تاكو هێزە نەتەوەییەکانی کورد، لەهەمان کاتدا لەبیرکردنو فەرامۆشکردنی ئەو تاوانە بەتەنها نابێتە هۆی دروست بوونی ویستی جیابوونەوەی کورد لەنەتەوەکانی دیکەی عیراق، بەڵکو ئارەزووی دابەش بوونو جیابوونەوە لەعێراقیش لەناو گەلی کورددا سەرهەڵدەدات، ئەمەش لەکاتێکدایە کەرۆژگارو بارودۆخی ئێستای عێراق پێویستی بەیەکڕیزیو یەکێتی سەرجەم گەلانی عیراقە، بۆیە وەك پێشتریش باسمانکرد، پێویستە گرنگی تەواو بەو تاوانە بدرێتو نابێت حکومەتی عیراقیش بەتەنها هەوڵی سزادانی تاوانبارانی ئەنفال بدات، بەڵکو پێویستە کاری جدیش بکات بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ گێڕانەوەی تەواوی مافەکانی قوربانیانی تاوانی ئەنفال، لێرەدا ڕۆڵی پەرلەمانو هیزە سیاسیەکانی کوردستانیش دێنە کایەوە کەهەوڵ بدەن بۆ نەهێشتنی تێڕوانینە هەڵەو سلبییەکانی کەسانی دیکە.

پێویستە سەرجەم بزوتنەوەو ڕەوتە سیاسیو کۆمەلاَیەتیەکان بەخودی خۆیانو بەبەرنامەی کاریاندا بچنەوەو بەشێوەیەك دایبڕێژنەوە کەببێتە ئەلتەرناتیڤێك بۆ ژیانی ئێستا، ئەویش لەڕێگەی داڕشتنی بەرنامەی ژیانێکی دیموکراتی راستو دروست، دەبێت ئەو کارەش بەڕوونی دەربکەوێتو ببێتە ئاماژەیەك بۆ ئیدانەکردنی سیاسەتە هەڵەکانی ڕابردوو و ئەو تاوانانەی پێشووتر ئەنجام دراون، لەبارودۆخی ئێستاشماندا بەپشت بەستن بەپلانێکی بابەتیانە، دەبێت هەوڵ بدەین بۆ گێڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکانیانو ڕێگرتن لەشاردنەوەو موزایەدەکردن بەتاوانی ئەنفال، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێویستە لەسەر بنەمای یەکێتی نیشتمانی دەسەلاَتەکانی یاسادانانو دادوەریو جێبەجێکردن بەشێوەیەك بەرەوپێش ببرێن کەهەوڵی دابەش بوونو جیابوونەوە نەدەن، ئەمەش وامان لێدەکات هەموو تواناکان یەکبخەینو بەهاوکاری هێزە نێودەوڵەتییەکان کاری جدی بکەین بۆ ئەوەی لەکۆمەڵگەدا فشار بخەینە سەر هەوڵە نەزۆکەکانو ڕێگرتن لەڕۆڵی ئاژاوەگێڕیان، ئەویش لەڕێگەی:

1- ئاساییکردنەوەی ژیانی گشتیو هێنانەکایەی دیموکراتییەکی فراوانو دروست، کەتیایدا سەرجەم نەتەوەکانی عیراق لەو پەڕی ئازادایو ئاسایشو ئارامیدا مومارەسەی سروتو ژیانی ئاساییو دروشمە تایبەتییەکانی خۆیان بکەن.

2- بەخشینی چانس بەکلتورو ڕۆشنبیری کوردو ناسنامە سەربەخۆکەی، ئەمەش لەڕێگەی چاپکردنی کتێبو بەرهەمی نووسەران بەبێ هیچ کۆتو بەندو دەست بەسەرداگرتنێك، کەئەوەش دەبێتەی هۆی هاندانی چالاکییەکانی ڕاگەیاندنو ڕۆشنبیری.

3- پەرەدان بەزمانو فێرکردن لەسەر بنچینەیەك کەناسنامەی گەلی کورد بپارێزێت.

4- سوود وەرگرتن لەو کۆنگرە نیشتمانیو نێودەوڵەتیانەی کەتایبەت بەو مەسەلەیە دەبەسترێت.

5- چالاککردنی ئەزمونی ژمارەیەك لەبزوتنەوە سیاسیو کلتوریو کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیو کارکردن بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ناکۆکیە نەتەوەییەکان لەسەر ئاستی نیشتمانی.

6- سڕینەوەی زاراوەی کەمینە پەراوێز خراوەکانو بەکارهێنانی زاراوەی کۆمەڵە نەتەوەییو ئاینییەکان بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا.

7- قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری سەرجەم قوربانیان، بەتایبەت کەسوکاری قوربانیانی ئەو تاوانە کۆمەڵکوژیو دژ بەمرۆڤایەتیانەی کەدەرحەق بەگەلی کورد ئەنجامدراوە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەتوانین بڵێین تاوانی ئەنفال زامێکە هەرگیز سارێژ نابێت بەبێ چارەسەرێکی یەکسانو بێلایەنانە، کەهەموو دەرەنجامە سلبییەکانی لەبیری نیشتمانیو نەتەوەیی گەلی کوردو سەرجەم مرۆڤایەتی بسڕێتەوە.

# تاوانی کۆمەڵکوژی دژ بە کوردە فەیلییەکان و یاسای نێودەوڵەتی

ن: د. ئالان قادر
و: جیهاد محەمەد حەمەکەریم

هەرکەس بە پەروەندەکانی مێژوودا بچێتەوە، بە مەبەستی دووبارە خوێندنەوەی، یان وەستان لەسەر هەندێك لە ڕووداوە تۆزلێنیشتوەکانی و گەڕان بە کونووقوژبنیدا، وەك هەوڵێك بۆ هەڵسەنگاندو ڕاڤەکردن یان سەرنجدانێکی پیاچونەوە بەڕابوردوودا Retrospective ، لەڕاستیدا توشی شۆکێکی بەهێز دەبێت: لەهەوڵی ڕەشی مێژوونوس و کاتب و ڕۆشنبیرە گەورەکانی عەرەب و نموونەکانیان، بۆ ئەوەی کە حیزبی بەعس بە هەردوو بەشی عێراق و سوریاوە لەتاوانی نازیەتی و شۆڤێنێتی پاکبکەنەوە، لە ژێر پاساوێکی پوچی ململانێی دژ بەداگیرکەراندا(کۆلۆنیالیزم). ئەمانە ئەگەر بەئاگایی بێت یان نا ئاگایی گۆڕی خۆیان بەدەستی خۆیان هەڵدەکەنن و کۆدوپێوەند دەکەنە دەست و قاچی خۆیان و گەلەکەیان، وە کاردەکەن لەسەر درێژە پێدانی کۆیلەیەتی و تێکشکانی ئەو گەلانە لەڕێگەی شاردنەوەی ڕاستیە تاڵەکان و ئاراستەکردنی سەرنجدانیان بۆ دوژمنێکی خەیاڵی کەتەنها لەمێشکیاندا بوونی هەیە، ململانێی پاڵەوانی (سیرفانتس دون کیشوت) دژ بە ئاشە هەوایەکان دەهێنێتەو یاد، پرسیار لەسەر پەیوەندی هەموو ئەو قەسابخانە وەحشگەرییەی دژ بەبرا کوردەفەیلیەکان کرا بەدڕندەیی بەعسیەکانەوە، نامەوێت هیچ بڵێم تەنها ئەوەندە نەبێت کە پەیوەندیەکی پتەوی جددی هەبوو، وەك پەیوەندی نینۆك بەگۆشتەوە، لەدوا ساڵەکانی هەشتاکاندا لەکاتێکدا کەسەرقاڵی لەچاپدانی پەرتوکی (جەنگی کۆمەڵکوژی دژ بە گەلی کوردستان و یاسای نێودەوڵەتی سەردەم) بووم کە بەنوکە قەڵەمێك لەلایەن بەعسیە نازیەکانەوە گۆڕدرا بۆ دژ بە گەلی عێراق، لەچاوپێکەوتنێکمدا بەیەکێك لەدۆستە چەپەکانی عەرەبی عێراقی و گفتوگۆکردنمان لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن دەسەڵاتی سەدامی فاشیەوە دژ بەکوردەکان بەمەبەستی پاکتاوکردنیان، هیچی پێنەبوو تەنها بەهەڵچونەوە ئەمەی ڕەتکردەوە بەو پاساوە لاوازەوە کە ئەمە ئیدعای داگیرکەرانە بۆ لەناوبردنی سیستەمی نیشتیمان پەروەری عێراق!، بەم شێوەیە ئەبینین تاوانە بەربەریەکانی نازیەکان و فاشیەکانی عەرەب کە لەحیزبی بەعسی عێراقی وسوریدا تەواو جێگیربووبوو جیاوازی نەبوو لەهۆلۆکۆستو ئەو قەسابخانە بێوێنەیەی کەنازیەکانی ئەڵمانیا بەرپایان کرد، دژ بە گەلانی سلاڤ و جولەکەکان لە جەنگی جیهانی دووهەمدا کەگەیشتە ئاستی دەرەوەی سنوری خەیاڵی مرۆڤ وبیرکردنەوەی!،

**پاشخانی ئایدۆلۆژی نازیەکان و بەعسیەکان**

بەسمانە لێرەدا ئاماژە بەچەمکە بنەڕەتی وڕێنماییە ئایدۆلۆژیەکانی ئەڵەمانیا بدەین کەبەعسیەکان وەریانگرتو لەژێر داروپەردوی داروخاوی بەرلینو درسدان وڤیینا و شارەکانی تری ئەڵمانیاو نەمساوە دەریانهێناو پاش پۆشین و ڕووکەشکردنی بە چەفیەو عەگالی عەرەبی کردیان بەبەرنامەیەکی پرکتیکەکراوی خۆیان لە کاری سیاسیاندا وەك:

1ـ تیوری دەرفەتی زیندوییLebensraum یان بەرفراوانبوونی قەڵەمڕەوی داگیرکەریو دوژمنکاری بەڕوخساری جێنشینکردنەوەکانەوە لەسەر حسابی گەلانی تر و خاكو دەڤەرە کوردیەکانی باشورو ڕۆژئاوای کوردستان کە لە لایەن بەعسیە فاشیەکانەوە قوتدراو ئاوێتەکران کە لە باسکردن نایەن!.

2 . وتەی خۆ بە زلزانین و باڵایی توخمی ئاری ئەڵەمانیو عەربی بەسەر گەلەکانی تردا، وەك توخمی جەرمانی پاكژو ڕەسەن و باڵا بەسەر ئەوانی تردا، یان وەك وتەی (ئێوە چاکترین نەتەوەی دەرکەوتوون لە ناو خەڵکدا) " وکنتم خیر أمه أخرجت للناس"

3. تیوری پێشەوا و تاکە سەرکردەی متمانە پێدراوی هەتاهەتایی.

4 . ڕەتکردنەوەی دیموکراتیەت و لیبراڵیەتو سندوقی دەنگدانو دامەزراندنی سیستەمێکی سەرکوتکەری دیکتاتۆر کە هیچ ڕایەکی تر قبولْ ناکات و بەڵام هەژموونێکی ڕەها بۆ عەسابات و هەواڵگری بە هەموو لقەکانیەوە لە ئارادا دەبێت.

5. ڕێکخستنە حیزبی و سیاسیەکانی ئەڵەمانیای نازی کە پڕ بوو لەبیری توندڕەوی نەتەوەیی لەژێر دروشمی ڕستەی چەپێتیدا . دیماگۆگیەتێکی توندڕەو زیاتر هیچی تر نەبوو، نازیەکان ( حیزبی نەتەوەیی . سۆشیالیستی کرێکاری ئەڵمانیایان ) هەبوو، بەعسیە فاشیەکان( حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالستیان) هەبوو. ئەڵەمانیە نازیەکان( ڕێکخراوی لاوانی هتلەریان )دامەزراند، بەعسیەکان( لاوانی شۆڕشیان دامەزراند)!.

6ـ نازیەکان بۆ ڕازیکردنی کەنیسە بەیاسا باجیان بەسەر موسڵمانەکاندا سەپاند، بەڵام بەعسیەکانیش تەنها بەوەوە نەوەستان کەخوتبەخوێنی ڕۆژی هەینیو فەرمانبەرەکانی ئەوقاف بکەنە بەکرێگیراو و نوسەرانی ڕاپۆرت، بەڵکو دەستیانوەردایە کاروباری خواو فەرمانیان بۆ دەرکرد کە دەبوایە کێی دروست بکردایەو کێی دروست نەکردایە، ئەوە خاڵی سەدام حسەینی گۆڕ بە گۆڕ بوو خیر اللە تلفاح، یەکێك لە عاشقانی ئەڵەمانیە نازیەکان، فەرمانی ئەدا بەدروستکەری گەردونو ئادەمیزاد بەم جۆرە: دەبوایە خوا سێ جۆر زیندەوەری دروستنەکردایە: جولەکە، فارس و میشومەگەز! هتلەریش هەمیشە دووپاتی دەکردەوە: خەباتم دژی جولەکە پەیامێکی خواییە. بەڵام عەرەبە نازیە بەعسیەکانو ئەوانەی هەوادارانیان بوون هەمیشە سێ شتیان بەقێزەون دادەنا لە جیهاندا، کورد و جرج و کولە!.

7. نازیە ئەلەمانیەکان جولەکەو قەرەج و کەمئەندامان و پاڵەوانانی مقاوەمەو زۆرێك لە دیلەکانی روس و گەلی سلافیەکانیان لەتەنوری غازدا سوتاند، بەڵام بەعسیە نازیە عێراقیەکان و سوریەکان کوردیان لە عامودا و بەندیخانەی حەسەکەی رۆژئاوای کوردستاندا سوتاندو لە پەلاماری ئەنفالی بەدناودا کوردیان لەخواروی عێراق و بیابانەکاندا زیندەبەچاڵکردو بەگازی کیمیایی پاکتاویانکردن و بەدەیان هەزار کوردی فەیلیان پاکتاوکرد.(جگە لە بێسەروشوێنکردنی هەشت هەزار بارزانی و کوشتنی 11 هەزار کوڕو و کچی گەنجی کوردە فەیلیەکان و کاولکردن 4500 گوندو شارۆچکەی باشووری کوردستان و دەربەدەرکردنی دەیان هەزار ماڵی کوردی فەیلی بۆ ئێران و گۆڕینی دیموگرافیاو بە عەرەبکردنی چەندین شارو شارۆچکەی وەك کەرکوك و خانەقین و دووزو دووزخورماتو و شەنگار)

8- کۆمارو دەوڵەتی ترسو تۆقاندن وا دامەزرابوو، کەدەسەڵاتی یاسادانان راستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی جێبەجێکردندا بووا، سەربەخۆیی داد و دادوەری تەنها بە نوسینی سەر کاغەز بوو.

مەبەست لەم پێشەکی وبەراوردکردنە، تا روونکردنەوەیەك پێشکەشکەم بە خوێنەر کەبەعسیەکان تا چ ئاستێك توانیبویان بەبیری رەگەزپەرستی و نازی و شۆڤێنی عەقڵی نەوەکانی دواتر لەکۆمەڵگای عەرەبیدا ژەهراوی بکەن بەبڵاوکردنەوەی رق و قین و دڵپیسی بەرامبەر بەگەلی کوردستان بۆ ئەوەی دەسەڵاتی تاوانی خۆیان بە رشتنی روبارێك لەخوێنی عەرب و کورد بسەپێنن و درێژەی پێبدەن. پەنابردنی بەعسیە سوریەکان بۆ نمایشکردنی فیلمی ئەبوجەعفەری مەنسور لەم ماوەیەدا بەتایبەت، کەپاڵەوانی کوردی جوامێر ئەبو موسلم ی خۆراسانی ئەدوێنێت بەوتەی: خیانەت لە باوباپیرانی کوردتەوە بۆت ماوەتەوە!، هیچی تر نیە جگە لەبیرێکی رەگەزپەرستی وەرگیراو لە بارخانەی بیری ئەڵەمانی نازیەوە بەئامانجی خۆشکردنی دژایەتی عەرب بەرامبەر بەکورد بۆ زیاتر پارێزگاری لەدەسەڵاتی بەربەری خۆی.

دەسەڵاتی یاسایی نێودەوڵەتی بەرامبەر بەتاوانەکانی بەعسی فاشی عێراقی دژ بە کوردە فەیلیەکان بەو گوێرەیەی کەلەسەرەوە هاتوە و بەتێروانینی نەخشی گەورەو بەرزی برا کوردە فەیلیەکان لە هەردوو کۆمەڵگای عێراقی و کوردستانیدا لە ئەفراندنی سیاسەت و زانست و بازرگانی و رۆژنامەگەری و لقەکانی بزوتنەوەی سیاسی پێشکەوتوخوازی عێراقی بەهیمەتی کادرو عەقڵە بەرزەکان وسەرکردە لێهاتوەکانی، کە بە هەزارەهایان چونە ریزی پێشمەرگەی پاڵەوان و قوربانیاندا بەرۆحی پاکیان لەرێگەی رزگارکردنی کوردستان لەدەست لەشکری سەدامی فاشی و جاشەکانی، تا دەسەڵات کەوتە تۆڵە سەندنەوەو پاکتاوکردنیان.

گەورەترین تاوانێك کەدەسەڵاتی سەدامی بەربەری و نازی کردیان بەندکردن و بارمتەکردنی کچان و کورانی تازە هەڵچوی تەمەن خونچەیی 13 تا 28 ساڵان بوون کە بەشێوازێکی وەحشیگەرانەی بێ نموونە لەناویانبردن، بەبێ ئەوەی تاوان و گوناهێکیان کردبێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی کورد بوون، چەکی کیمیایی و میکرۆبییان بەسەردا تاقیکردنەوە کە ژمارەیان نزیکەی 11

هەزار کەس بوون. وەك زانراویشە لە جەنگی عێراق ئێراندا بەدەیان هەزار لەکوردە فەیلیەکان دوورخرانەوە بۆ ئێران بە بیانوی تەبەعیەتی ئێرانی بوونیان، پاش دەستبەسەراگرتنی ماڵ و موڵکی گوازراوە و نەگوازراوەیان و تەنانەت پێناسەی کەسێتیشیان لێسەندرایەوە. بێگومان ئەم تاوانە هەمەجیانەی سەدامی عوجەو تاقمە فاشیەکەی کەبەرپاکرا بەرامبەر بەکوردە فەیلیەکان پێشێلکاری و دژایەتیەکی تەواوی هەموو بنەماو پایەکانی یاسای نێودەوڵەتی سەردەمە، تیاشیاندا یاسا مرۆییە نێودەوڵەتیەکان.

ئەگەر هەوڵبدەین بۆ ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی تاوانە کۆمەڵکوژەیەکان و تاوانەکانی دژ بەمرۆڤایەتی کەبەرپاکرا لەلایەن دەسەڵاتی سەدامی دیکتاتۆرەوە دژ بە کوردی فەیلیەکان لەسەر بنچینەی مادەی شەشەم کەدادگای تاوانەکانی نێودەوڵەتی وا تێیدەڕوانێت ترسناکترین پێشێلکاری ماڤ مرۆڤی نێونەتەوەییە بەمانایەکی تر تاوانی جینۆسایدە یان پاکتاوکردنی ڕەگەزیە، کە پێناسەی لەتاوانی کۆمەڵکوژی ڕێکەوتننامەی قەدەغەکردنی کۆمەڵکوژی 1948 وە وەرگیراوە. چەمکی کۆمەڵکوژی یەکێکە لەم کردەوانەی خوارەوە کە دەکرێت بەمەبەستی لەناوبردنی کۆمەڵێکی نەتەوەیی، ڕەگەزی، دینی، لە ناوبردنێکی گشتی یان بەشێکی:

- کوشتنی تاکەکانی کۆمەڵێکی نەتەوەیی، وەك پێگەیاندنی زەرەری بەدەنی و عەقڵی بە تاکەکانی کۆمەڵ.
- ژێردەستەکردنی حاڵەتی بژێویان بە مەبەستی توانەوەیەکی گشتی یان بەشێکیان.
- قەدەغەکردنی بوونی منداڵ و زاوزێکردن.
- بەخشینی منداڵەکانیان بەکۆمەڵێکی تر.

بەم پێیە پێویستە سزای تاوانبارانی تاقمی سەدام و ئەو تاوانبارانەی کەئێستا لە ژێردەستی دادی عێراقیدان بدرێت بە هۆی ئەو تاوانانەی کە دەرهەق بەکوردی فەیلی ئەنجامیانداوە بەپێی بەندەکانی پەیمانی نێودەوڵەتی کەلەسەرەوە نیشاندراوە چونکە بنچینەی تاوانەکە کوشتن و لەناوبردنی بەمەبەستو بە ئاگایی پێشوەخت بۆ پاکتاوکردنی کوردە فەیلیەکان بووە بە تەواوەتی و بەجۆرێك کەدەکەوێتە دەرەوەی بازنەی چەندوچونو ئەملاو ئەولاوە. من دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی هاوڕێ ماف ناسو نوسەرەکانم بۆ سزادانێکی بەهێزی بکوژان و تاوانباران، تا ببێت بەپەندو ڕەتدانەوەیەك بۆیان، وە داواکارم لەحکومەتی عێراقی بۆ قەربووکردنەوەی کوردە فەیلیەکان لەزەرەرمەندبوونیان لەڕوی گیانی و مادی ئەم توێژە گرنگەو کارایە لەکۆمەڵگای عێراقی و کوردستاندا. کە ئەم هەنگاوەش دەبێت بەپشتیوانیەکی بەهێزو قوڵی پرۆسەی دیموکراتیەت لەعێراق و بەرنامەڕێژیەکی گرنگە بۆ نەگەڕانەوەی دیکتاتۆریەت و دەسەڵاتی تاکرەوی فاشستی دینی بۆ دەسەڵات لەعێراقدا.

# ئەنفال... تاوانا بێ وێنە

ئەیوب رەشید نسری

پشتی هەمی پیلانێن رژێما بەعس هاتینە هەلوەشاندن و شورەشێن کوردی ئێك لدیف ئێكێ بەردەوامی پێ هاتیە دان و هەر شورەشەکێ سود و ئەزمون بوخو ژ شورەشێن بەری خو وەردگرت وروژ بو روژێ هشیاریا نەتەوەیی بەلاڤ دبوو ئەڤێ چەندێ دوژمن پالدا کو هزر ل قرکرنا گەلێ کورد بکەت ل دیف گوتنا رێبەرێ خو میشێل عەفلەق کو دگوتنەکا خودا گوتیە (پێدڤی یە ئەو کێمە نەتەوێن کو ل سەر ڤێ ئاخێ دژین، ب دوو رێکا بێنە حەلاندن، رێکا ئێکێ دڤێت ب بێهن فرەهی و هێدی هێدی بێتە پەیرەوکرن بەلێ درێژی پێ بێتەدان رێکا دووێ ئەگەر بو حەلاندنێ بەرگری ژ خو کر دڤێت توند و تیژی بێتە بکار ئینان) و ب هزرا وان مادەم ئەم رازی نینین دبن دەستێ واندا بین یان ببینە پشکەك ژوان دڤێت نەمینین، ئەوبو چەکێ کیمیاوی ل حەلەبچە و بادینان و گەلەك دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ بکار ئینا لێ ئیرادا جەماوەرێ ل دەڤەرێن رزگار کری ژ ڤێ چەندێ مەزنتر بو کو خو بو وان ب چەمینیت، خوارن ب ئیکجاری ژ هەمی دەڤەرێ بری و برنا کەفچکەکێ شەکرێ یان چەند دنکەکێن برنجی و هەر خوارنەکا دی ب مەزنترین تاوان دهاتە هژمارتن ژخو حەواندنا کەسەکێ ژ ڤێ دەڤەرێ هاتی خیانەتەك بوو کو سەرێ خودانی تێدچوو بەلێ ب ڤان هەمی پیلانا نەشیا ئیرادا گەلێ مە لاواز بکەت، ئەڤجار دەست دا دارشتنا پیلانا مەزنا بناڤێ (ئەنفال) کو ب هەشت قوناغێن ئێك لدیف ئێك هاتەکرن دژی خەلکێ بێ گونەھ و وەلاتییێن سڤیل و تێدا (182) هزار کەسێن بێ تاوان هاتنە بێ سەروشوین کرن و نێزیکی (5000) گوندێن کوردستانێ دگەل عەردی هاتنە راست کرن و ژیان ب ئێکجاری ل دەڤەرێ نەهێلا0

هەر ژ دروست بونا جیهانێ و هەبونا مروڤا هەڤرکی و شەروشورانێ هەبویە بەلێ شەران ژی یاسایێن خو هەنە، بەعسییێن خوینمێژ نە چ یاسایێن عەردی و نە یێن ئاسمانی بەرچاڤ وەرنەگرتن.

کریارێن بناڤێ ئەنفال گەلەك جوداهی هەیە دگەل هەمی شەرو هەڤرکیێن هاتینە کرن دمێژووا جیهانێدا، دشێین دچەند خالەکادا کورت بکەین :-

1- شەر دژی شەرکەرا تێنە کرن لێ کریارێن وان دژی خەلکێ سڤیل ژ ژن و زاروك و پەککەفتیا هاتنە کرن و جوداهی دناڤبەرا زاروکەکێ چەند روژی و شەرکەرەکیدا نەبوو0

2- شەر دژی مروڤان دهێنە کرن ئەوێن شەری دکەن بەلێ ئەنفال دژی سروشتی هاتنە کرن و دڤیان ژیانێ ل ڤێ دەڤەرێ نەهێلن تەنانەت دارستان و گیانەوەر ژی هەمی کەفتنە بەر چەکێ وان لدەف وان ئەوژی دوژمن بوون.

3- هەمی شەر دناڤبەرا دوو هێزا یان پتردا دهێنە کرن و هەر هێزەك هەول ددەت خو نێزیکی جەماوەر و لایەنگیرێن هێزا بەرانبەر بکەت، بەلکو بشێن بو لایێ خو بکێشن بەلێ کریارێن ئەنفالێ کوشتنا هەمی کەسا ب رەوا و ئەرك دزانی تەنانەت هەول نەددا تابوریێ پێنجێ بو بەرژەوەندیا وان کار بکەت.

4- ئاموژگاری دابونە هەمی چەکدارا کو هەر کەسەکێ دلێ خو ب ئێکی ب سوژیت مەزنترین تاوان و خیانەتە، و هەر چەکدارەك یێ ئازادە هەر خرابیا وی بڤێت بکەت بەلکو ئەرکێ وی‌یە شیانێن خو هەمیا ب مەزێخیت بو خرابکارییێ0

5- ئەگەر جارەکێ دکتاتورەکێ خوینمێژ ئێخسیر کوشت بن ژی پشتی هنگی کەس و کارێن وان ب چارەنڤێسێ وان ئاگادار کرینە بەلێ ڤان خوینمێژا (182) هزار کەس بێ سەروشوین کرن و چارەنڤێسێ وان هێلا نەدیار داکو گونەها خو پێ ڤەشێرن و هەروەسا وەکی شەرەکێ دەرونی دگەل هەڤ نەتەوێن وان کەس و کارێن دکر0

6- جارا ئێکێ‌یە کەسەك خو ب سەروکێ دەولەتەکێ بزانیت و هەولا قرکرنا نەتەوەکی دناڤ چورچوڤێ دەولەتا خودا بدەت0

7- ئەو دەڤەرا وان کەرب ژێڤە دبون ئابوریا وێ هەمی تێکدا و نەهێلا کەس چ سودێ ژێ وەرگریت هەر چەندە چەندین گوندێن پر بەرهەم ب بەرکەفتن، لێ کاڤل کرنا گوندان ب ئارمانجا هندێ بوو کو جارەکا دی ژیان ل ڤێ دەڤەرا جوگرافی نەبیت نە یا مروڤان و نەیا گیانەوەران0

8- ئەڤ تاوانە ب ناڤێ ئایینەکێ ئاسمانی هاتە کرن و وەسا ددا پێش چاڤ کو ئەڤە فەرمانەکا خودایی‌یە و دڤێت هەمی بوسلمان دهاریکاربن بو سەرئێخستنا ڤێ کریارێ.

ئەڤە و چەندین خالێن دی هەنە کو کریارێن ئەنفالان ل سالا 1988 جودا دکەن ژ هەمی تاوانێن ددیروکا جیهانێ‌دا هاتینە کرن هەر چەندە تاوان هەر تاوانە بەلێ ب هزرا من ئەڤ هوڤاتیە ب مەزنترین گونەه تێتە هژمارتن ب تایبەتی کو جیهانێ هەمیێ یان هاریکاربوون دگەل بکەری یان ژی گوهێن خودگرتن دا دەنگ نەچیتێ و چاڤێن خو دنقاندن داکو روژەکا وەکی ئەڤرو بێژن مە نەدزانی، دەولەتێن بوسلمانان یان ئەوێن خو ب بوسلمان دزانن دەست خوشی لێ دکر و خو بەرگری ژ ئایینێ خو و مزگەفت و قورئانان ژی نەکر، هەروەسا دەولەتێن خو ب مەسیحی دزانن ل پێش چاڤێن وان دێرێن کەڤن و دیروکی دهاتنە کاڤل کرن و پەرتوکێن پیروز دهاتنە سوتن لێ دیسان نەڤیا بزانن و خو تێنەدگەهاند0

# دیواری ئەو نیشتیمانەی کە هەرسپی نەبۆوە........!!

عەبدول محەمەد ئەحمەد

(شکور بۆ خوا ئەمسالْ بەهارەکەی خۆشە،با ئەهلو خاکی ئەو گەرمیانە ئاهێکیان بەبەردا بێتەوە) ئەمە وتەی یەکێك لەو نەفەرانە بوو کە لە گەراجی تاکسیەکی هێڵی چەمچەماڵ – سلێمانی پێش ئەوەی بەرەو سلێمانی بەڕێ بکەوێ ، بەلاّم شۆفێرەکە نەهیشت نەفەرەکە هەناسەی تەواوی قسەکەی تەوا بێت، بەسەرسوڕمانەوە سەیرێکی نەفەرەکەی کردو بە خێرایی تەزبیحە قەزوانەکەی لە هەردوو پەنجە گەوەرو پەنجەی شایەتمانی ئالاندو دوسێ ڕاستوچەپی بە لۆکانی کردو، بە هەناسەیەکی قوڵەوە،وتی: گەرمیانی چیوبەهاری تەڕی چی، برا بۆ بە ناشکوری نەبێ دێ ماوە تا بەهارەکەی خۆش بێت یان نا، سەیری دانیشتوانی مەدینە شۆڕش کە، هەموو ئەڵێی خۆڵو دۆی بەسەردا کراوە.

ئیتر ئەو دوو قسەیە بەس بوو بۆ ئەوەی بە ناخی خۆمدا ڕۆچمو سەفەرێکی گەرمیانی بێ نازی ئەنفال کراو بکەم، ئای بۆچی ئەبی هەموو شتێکی ئەم دنیایەی ئێمە هەر ئەبێ خەون بێت نەبێتە واقیع ، ئەو گەرمیانەی کە هەر نوسەرو شاعیرە کان دەتوانن پیا هەڵدەنو لەبارەیەوە بنوسنو چامەی بۆ ڕێك بخەن، ئەو گەرمیانەی پێشتر لەبەهاردا تا چاو بڕکات سەوزایی بوو، هێندە تەختیڕپیتو بەرەکەت بوو ، لەو دوراییەوە هێندە ئاسمان لەزەویەوە نزیك دەبۆوە واهەستت دەکرد کەلەگەڵ زەویدا یەکتری ماچ دەکەنو دەتوانی دەستی لێبدەیت.

توشی هەر ڕێبوارو کەواو سەڵتە لەبەرێکی گەرمیانی دەبووی لەو دەشتە کاکی بە کاکیەدا، هەستی ئەوەی لا دروست دەبوو، کە خەڵکەکەی زۆر باوەڕیان بە خۆیان هەیەو هەر لەدەموچاوو سەرو سیمایاندا دەخوێنرایەوە، کە چەندە نەجیب زادەو چاو نەترسوقارەمانن، ئەگەر ماشێنی سەربازی دکتاتۆرێکی وەك بەعس نەبوایە کێ دەیتوانی چاولەو پڵگە بە هەڵمەتانەی گەرمیان سورکاتەوە، ئەو هەموو کەرەمو میوانداریو ڕێزە سەرتاپای لە تونی ئەنفالدا سوتاو بوو بە قەقنەس، ئێستا ناوچەکەیان هەر ئەڵێی هەرگیز ئاوەدانیو ژیانی تێدا نەبووەو بەر لەچەند سەدەیەك لەمەوبەر خەڵکی تیا ژیاوە.

پاشماوەی ئەنفالەکان هەر لە شەقامو جلو بەرگو تەنانەت شێوازی بنیات نانی خانووەکانی ئێستایان سەرتاپا ئەوەیان لێ دەخوێنرێتەوە، کە هەرگیز دڵیان بەشوێنەکانیانەوە نییە،لەوەتەی کەسوکاریان براوە بۆ ئەنفال لەبیابانی عەرعەر چاوەڕوانی وایلێکردن هەموو سیستمی ژیانی ڕۆژانەیان خەوتنو هەستانیان سەردانو سەرەگرتنیان شێوە ژیانێکی کاتیەو هێشتا هەر بەتەمای خۆڕێکخستنەوەن، هێشتا بە خەیاڵی ئەوەوە ئەژین کە ڕۆژێك کەسوکاریان بەسەروپۆتەڵاکی خۆڵاوییەوەبگەڕێنەوە لایان .

ئێستا کەسەیری مەدینە شۆرش دەکەیت قەرەباڵغی کۆڵانەکانی و بێکاروکاسپی خەڵکەکەو گوزەرانی نارەحەتی ڕۆژانەی دانیشتوانەکەی بیّ ئەوەی پرسیار لە کەس بکەیت،کاکە بەدوایدا چیدا ویڵێت و سەری خۆت دەیەشێنی، ئەوەهەمووی بەرهەمی پرۆسەی ئەنفالە.
لەگەڵ یەکێك لە ڕۆشنبیرەکانی گەرمیان باسمان لەنەهامەتیەکانی ئەنفال دەکرد، وتی ئەزانی بۆچی ئەم خەڵکە بۆچی وایەتەنانەت دەوڵەمەندەکەشی لەسەر خۆی نییەو گەر لێی نزیك بیتەوەلەناخەوەوێران و ڕوخاوە، چاوەڕوانی دانبەخۆدا گرتن بۆ هەموو ئەو بەڵێنانەی کە پێیان دراوە خەڵکی بەیەکجاری بیّ ئومید کردووە.
ناوچەکانی پاشماوەی ئەنفال لە هەموو ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بەگشتی و گەرمیان بەتایبەتی خەریکە بە تەواوی خاڵی دەبنەوە لە حەقیقەتی ژیان، مرۆڤێکن تەنها بەلاشە زیندون، ئەگەرنا ڕۆحەکانیان هێشتا لەژێر لمی بیابانەکاندا زیندەبەچاڵکراوە، خەڵی ئەو ناوچانە رووبکەنە هەرشوێنێك بەسەرو هەیئەتیاندا دەناسرێنەوە،یەکپارچە ڕەش پۆشن نیشانەی زوڵم و بیّ دەسەلاتی بە تەوێڵیانەوە دیارە،سەرچاوەی ژیان و گوزەران لەناوچەکانیاند کەمە یان هەر نییە، ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەو یادو کەرنەڤالانەی کە ئەنفال و پاشماوەکانی ئەنفال ڕێك دەخریّ،سەرەڕای ئەوەی نەیتوانیووە ئەو واقیعە بەرجەستە بکات، تەنها بۆ ئەوەش بووە کە خەڵکەکە لە دڵتەنگی و بێزاری و خەفەتەکانی دور بخرێتەوە.
بۆقسەکردنیش لەسەر ئەنفال ناچارین هەموو جارێك بۆ بیرخستنەوەو بەرچاو ڕۆشنی چەند سەرە قەڵەمێك لەبارەیەوە بنوسرێت.

هەرچەندە ناوی ئەنفال ئاماژەیە بۆ سورەتێکی تایەتی لە قورئانی پیرۆز کە بەمانای دەستکەوت و غەنیمەتی جەنگ دێت، بەلام لە هەمان کاتدا واتاو مانای تریش لە خۆ دەگریّ، لە هەندیّ شوێن وەك دیاری لێکدراوەتەوە، یاخود لەلای دانیشتوانی نەجی و حیجازیش وشەی(نەفل) بۆ جۆرە گوڵێکی زەردی بۆن خۆش بەکار دێت کە لە بیابان و دەشتەکانی ئەو ناوچەیەدا هەیەو بۆنێکی خۆشی لیّ دێت. دەرکەوتنی ئەو گوڵە مژدەی هاتنی بەهاری پێیە، لەلای عیراقیەکانیش نەفل بە مانای پیاوی بەخشندەو لەخۆبوردو، دیارەلای زانایانی شەرع زانیش نوێژەکانی (نەوافل) (صلاه النوافل) زۆر ئاشکرایە وەك لەوەی پێناسە بکرێت،
بەلام دوای پرۆسەکانی ئەنفال لە کوردستان و بەتایبەت لە ناوچەکانی گەرمیان ئەو مانایانە سەرجەمیان ئاوەژوو بونەوەو گۆڕان بۆ (لەناوبردن و جینۆساید کردن) ئێستاش لە هەرێمی کوردستان وەزارەتێك هەیە بەناوی (وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوەکان) بەعسیەکان کە پرۆسەکانی ئەنفالیان دەسپێکرد تەنها نەخشەیەك نەبوو بۆ لەناوبردنی مرۆڤی کورد، بەڵکو سەرجەم ماڵ و حاڵ و چیاو دۆڵ و دەشتە کاکی بەکاکیەکانی کوردستانیان وەك بیابان لێکردو ئەو شوێنانەی کە سەدان ساڵ بوو خوا کانیو ئاوێکی تیا خوڵقاندبوو، ئەوان بەکۆنگرێت

سەریان گرتو تەواوی سیماكانی ژیانیان لەو ناوچانە سڕیەوە، وەك یەكێك بڵێت كە چیتر ئەم ناوچەیە نە بۆ ئاوەدانی دەشێت، نەكەسیش بەتەمای ئەوە بێت جارێكی تر ژیانی لێ دروست بكاتەوە، بەعس لە ئەشكەنجەدانی ئەنفال كراوە زیندووەكانی نوگرە سەلماندا مێژووی حەجاجی كوڕی سەقەف دوپاتكردەوەو لەوێش بە هەمان شێوە مولازم حەجاجێكی كردە حاكمی موتڵەقی سەربازگەو حەجاج ئاسا، كەوتبووە ئەشكەنجەدانی بەدیلگیراوەكانی ئەنفالو هەركەسێك لەو تونی مەرگە ڕزگاری بوبێ ئێستاش لەگەڵ ناو هێنانی حەجاج موچڕكە بە بنی پێیدا دێتو لە تەوقی سەیریەوە دەردەچێت، دەڵێن كەس نییە، دارو شەلاقو كێبلی حەجاج نەكەوتبێ لە پشتی، چونكە لە كاتی خۆشیدا حەجاجی كوڕی یوسف سەقەف كە بە داخ كردن ناوی گوندەكەی خۆی لەسەر دەستی قوربانیەكانی بە داخ كردن دروست دەنەخشاند، بۆیە دەكرێ هەر ڕۆژێك لە ڕۆژەكانی حەجاج لە نگرەو سەلمان بكرێت فیلمێك وەك چۆن لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی مامەڵەی نازیەكان لە تونی هۆلۆكوستدا بە سەدانو هەزاران فیلمی لەسەر دروستكراوە، بەعسیەكان وشەی ئەنفالیان بۆ قێزەونترین پرۆسەی بەدناو بەكار هێنا ،هەر وەك چۆن وشەی (حونەین) كە جەنگێگی سەردەمی ئیسلامە كە بەعسیەكان كردیانە ناونیشان بۆ یەكەم ترسناكترین دەزگای موخابەراتی خۆیان بەكارهێنا، كە هەر كەسێك بكەوتایەتە داویەوە ڕزگاری بونی نەبوو، جێی خۆشیەتی، باس لە وتارەكەی د.ڕەشید خەییون كە پسپۆڕو ئەكادیمیەكی عیراقیەو لە ناوچەی (هۆرالحمار)ی شاری ناسریەی باشوری عیراق لەدایك ببوە، بكەین ) كەلەڕۆژنامەی شەرق ئەوسەت دا لەسەر پرۆسەی ئەنفال نوسیویەتی، گەر ئەو پرۆسەیە پێچەوانە بوایەتەوەو كورد ئەنفالی لەدژی عەرەب بكردایە، بێ سێودوو هەموو عەرەب لەسەر دەهاتنە جوابو پێش هێزی بیانی دەكەوتن بۆ ئەوەی لەسەركردەكانی ئەنفال ڕوگاریان بكات، د. ڕەید خەییون لەوتارەكەیدا دەڵێت ئەوە تەنها وەبیرهێنانەوەیەكە بۆ بیریارو ڕۆشنبیرەكانی عەرەب كە مەخابن لەوكاتەدا بێ دەنگەیان لە كردەوەكانی ئەنفال كردو هیچیان لەبارەوە باس نەكردو ئینكاریان كردو تەنانەت تا ئێستاش هەندێكیان بەكارێكی پاڵەوانانە باسی دەكەنو بەنوسینو وتار بەرگری لە ئەنجامدەرانی دەكەن، كە ئێستا لە دادگا لەسەر ئەو تاوانە ڕاگیراون ، لەدرێژەی وتارەكەیدا خەییون دەڵێت تا ئێستاش فەقیهەكانی عەرەب بەدەمیاندا نایەت، تەنانەت ئیدانەی ئەوە بكەن كە ئەنفال سورەتێكی قورئانی یەو ناشێ بۆ لەناوبردنو جینۆسایدكردنی گەلێكی موسڵمانی وەك كورد بەكار بهێنرێت.

زۆرینەی ئەوانەی كە لەسەر پرۆسەی ئەنفالیان نوسیووە بە تایبەت نوسەرانی غەیری كورد لەوبڕوایەدان كە پرۆسەكانی ئەنفال برینێكی قوڵی لە جەستەی یەكپارچەیی عیراقدا دروست كردووە، بەشێوەیەك هەموو ئەو سنورانەی تێپەڕاندووە كە ویژدانی مرۆڤایەتی بتوانێ وەك بیانو هێنانەوە بەكار بهێنرێت بۆلەناوبردی گەلێك لەژێرناوی پارساتی سەروەریو یەكپارچەیی خاكی ولاتێك گە گوایە هێرشی ئێرانی لەسەر بووە، بە تایبەت كەلەو كاتەدا هیچ سەربازێكی

ئێرانی تیا نەکوژراو بۆنی سێوی گەنیویشی نەکرد، بۆیە ئەنفال پرۆسەیەك بوو بۆ چەسپاندنی هێزو خۆ بەزل زانینی دەسەلاتێك کە لەوبڕوایەدا بوو بە نەمری لەناو عیراقیەکاندا دەمێنێتەوە، ئەو مەرگەساتەی کە بەسەر گەلی کوردستاندا هات هەرچەندە ژمارەکەی کەمترە لە مەرگەساتی هۆلۆکۆستی جولەکەکان، بەلام لە جەوهەرو ئەنجامدا هیچی لەو کەمتر نییە، بۆیە ئێستاش زووە جێی خۆیەتی و لە پێش هەموکەسێکەوە ئەرکی حکومەتی هەرێمو پەرلەمانو دەزگا بەرپرسەکانی کوردستانە کە ئاوڕێکی جدی لەمەسەلەی بە دوکۆمێنت کردنی پرۆسەی ئەنفال بدەنەوە، چونکە ڕوداوی ئەنفال بە دابەشکردنی بڕێك پارە بەسەر خێزانو پاشماوەی قوربانیەکانو دروستکردنی مۆنۆمێنتێکی فەرەنجی بۆ دروشمی ئەنفال یان دروستکردنی چەند خانوویەك بۆ پاشماوەی ئەنفالەکان بەس نییە، بەڵکو پێویستە گرنگی زۆر لەوەزیاتری پێ بدرێتو کار بکرێت بۆ ئەوەی وەك کردەوەیەکی جینۆسیاد لە شێوەی هۆلۆکۆستی نازیەکان گرنگی پێ بدرێتو سەرجەم وێستگەو ڕوداوەکانی ئەو هەڵمەتە جینۆسایدە بە دیکۆمێنت بکرێت، جوڵەکەکان ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەردەوام بەدوای سەرە داوێکدا دەگەرێن کە بە چاك یان خراپ پەیوەندی هەبێت بە ڕووای هۆلۆکۆستەکەیانەوە، لە نوێترین کاری دەوڵەتی ئیسرائیل بۆ زیندوڕاگرتنی ئەو ڕوداوە لە زیهنی سەرجەم مرۆڤایەتیدا، دامەزراوەی (یاد فاشیم) لە ئیسرائیل ، ساڵی ڕابردوو ماڵپەڕێکی تایبەتی بە زمانەکانی عەرەبیوفارسی کردۆتەوە لەسەر کارەساتی هۆلۆکۆست بە ناوی (یاد فاشیم) ، ماڵپەڕەکە پێك هاتووە لە مێژووی هۆلۆکۆست کەبەسەر جولەکەکانی ئەورپادا هات لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا، جگە لە پێناسە کردنی چەمکی کارەساتی هۆلۆکۆستوچەندین وتارو نوسینی نوسەرو ئەکادیمە دیارەکانی جیهان کە لەسەر ڕوداوی هۆلۆکۆست نوسیویانە، جگە لەوەش ماڵپەرە چەندین بەڵگە نامەو ناونیشانو نەخشەی جوگرافی وێنەی فۆتۆگرفی دەگمەنو شایەتحاڵی ڕوداوەکە بە وێنەی فیدیۆیی لەسەر ئەوڕوداوە لەخۆ دەگرێت، کە هەموو ئەو بەڵگەنامانە تەرجەمەکراون بۆ زمانی عەرەبیو لە هەمووی گرنگ چیرۆکی ئەو کەسانە دەگێڕێتەوە کە لە نەتەوەو ئایینە جیاجیاکانی دنیا لەکاتی ڕوداوەکە وەك فریاد ڕەسێك هاووڵاتیانی جولەکەیان لەو کارەساتە ڕزگار کردووەو پەنایان داون، لە هەمووی سەرنج ڕاکێشتر ژمارەیەك لەو کەسانەی کە بونەتە فریاد ڕەسی جووەکان بریتی بوون لە موسڵمانەکانی تورکیاو ئەلبانیا، هەر لەو ماڵپەڕەدا فیلمێکی بەڵگەنامەیی تێدا باس لە سەردانی عەرەبو جەولەکەکان دەکات بۆ سەربازگەی (ئۆشفیتس)ی نازیەکان.

دەربارەی ئەو ماڵپەڕە،(ئافنیر شالیف) لێپرسراوی ماڵپەڕی (یاد فاشیم) دەڵێت بەهۆی بونی ژمارەکی زۆر لە خوێنەرو زمانزانی زمانی عەرەبی بە پێویستمان زانی بەشی عەرەبی لە ماڵپەڕەکەیدا بکەینەوە، ئەو مەسەلەیەشمان بە پێویستیەکی هەنوکەیی زانی بۆئەوەی خوێنەری عەرەب باشتر لە کارەساتی جوڵەکەکان تێبگەنو ئەو گومانانە بڕەوێننەوە کە هەندێجار بۆ کارەساتەکە دروست دەکرێت،دوای کرانەوەی ماڵپەڕەکە، بەگوێرەی ئەو سەرژمێریەی کە ساڵی

ڕابردوو کراوە، ژمارەی ئەوکەسانەی کە سەردانی ماڵپەڕی (یاد فاشیم)یان کردووە، گەیشتۆتە نزکەی (7)ملیۆن کەس کە دانیشتوی (200) وڵانی جیهانن و لەو ژمارەیەش نزیکەی(57)هەزار کەسیان موسڵمان بون و کە زیاتر لە 32 هەزار کەسیان لەوڵاتانی عەرەبیەوە بوون.

ئێستاش هەموو ساڵێك دامەزراوەی یاد فاشم هەموو ساڵێك لە یادی ئەو کارەساتەدا چەندین چالاکی جۆراو جۆر ئەنجام دەدەن، لە نوێترینیان، کە ئەمساڵ بەڕێوەچوو، دامەزراوەکە خەڵاتی ڕێز لێنانی بەخشیە (63) هاووڵاتی موسڵمانی ئەلبانی کەخۆیان یان ئەندامێکی خۆیان یان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەیان بە پارێزەرو پەنادانی گەلی جولەکە دەناسرێن لەسەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیداو توانیویانە بە هەڵوێستی مرۆڤ دۆستانەی خۆیان بە سەدان هاووڵاتی جولەکە لە مردنی حەتمی بپارێزن، بۆیە دەمەزراوەی یاد فاشیم بە ئەرکی خۆی زانی ئەو کەسایەتی و خێزانانە خەلات بکات و ناویان لە مێژووی گەلی جولەکەدا وەك پاڵەوان و ڕزگارکەری گەلی جولەکە بناسێنێت، ڕیکخراوەکە تا ئێستا خەڵاتی ڕێز لێنانی پاراستنی گەلی جولەکەی بە (22)هەزار هاووڵاتی دنیا بەخشیووە کە بە هەڵوێستەکانیان توانیویانە گەلی جولەکەو خێزانەکانیان لەوکارەساتە بپارێزن، کە تا ئێستاش هەندێك لە پەنادەرو پەنادراوەکەش لە ژیاندا ماون وبەوپەڕی چاوی ڕێزەوە سەیری یەکتری دەکەن، لەمیانەی ئەو خەڵاتی ڕێز لێنانەدا کەلە (63)موسڵمان و خێزانی ئەلبانی نرا کە هەوڵیان داوە ژیانی جوڵەکانی ولاتەکەیان لە دەستی نازیەکان ڕزگار بکەن، یەکێك لە نەوەکانی ئەو ژنە ئەلبانیە موسڵمانەی کە لە گوندەکەی خۆیدا سەرەڕای ئاگاداری هێزەکانی سوپای ئەڵمانیا کە هەرکەسێك پەنای خێزانێکی جولەکە بدات وەك ئەوان مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، یەکێك لە نەوەکانی ئەو ژنە کە خەڵاتی دامەزراوەی یاد فاشیمی پێ بەخشراو چیرۆکی ڕزگار کردنەکەی لە ئەرشیفی ئەو دامەزراوەیەدا پارێزراوە، وتی: وەك ئەرکێکی ئایینی و باوەڕبوون بە پاداشتی دواڕۆژ دایە گەورەی من ئەرکی پاراستنی ئەو جولەکانەی خستە ئەستۆی خۆی کە بە هەڵوێستی ژیانی هەموو دانیشتوانی گوندەکەی خۆی خستە بەرچەقۆی نازیەکانەوە.

گێڕانەوەی ئەچیرۆك و ڕاستیانە لەم وتارەدا بۆ ئەوەیە کە لەمەودواو پێویستە لەسەر هەر یەکێك لە خەموخۆرانی دۆسیەی ئەنفال لە پێش هەموانەوە حکومەت و پەرلەمانی کوردستان بە جدی خەمێکی دۆسیەی ئەنفال بخۆن ، لێرەدا جێی خۆیەتی سوپاسی هەموو ئەو دامەزراوەو کەسایەتی و لایەن و ڕێکخراوە (ngo)یان بکرێت کە بە هەوڵی شەخسی خۆیان توانیانە بەوتن و نوسین و کردنەوەی بەشێك لە ماڵپەرێکی بچوك بۆ دۆسیەو کارەساتی ئەنفال بکەنەوەو بنوسن، بەڵام هەمومان لەسەر ئەوە کۆکن کە کارەساتی ئەنفال بەو هەوڵە موتەوازیع و دیاری کراوانە تەواو نابێت بە ئامانج ناگان، جێی خۆیەتی ئێمەش وەك گەلی کورد دەست بکەین بە دیکۆمێنت کردنی کارەساتە لە هەموو بوارەکانەوە، ئێمەش وەك گەل و نەتەوەکانی تر هەقی خۆیەتی هەرچی بەڵگە نامەو وتارو نوسین و وێنەی فۆتۆگرافی و ڤیدیۆی هەیە ئەرشیفی بکەین و

دامەزراوەیەکی گەورەی بەڵگە نامەیی بەناوی ئەنفالەوە بکەینەوە، تا ئێستا کێ وەك گەلی جولەکە بیری لەوە کردۆتەوە کە هەرچی بەڵگە نامەو نوسینو وتارو دیکۆمێنت هەیە لەسەر ئەنفال لە هەموو بوارەکانەوەکۆبکرێتەوەو ئەرشیف بکرێت، جێی خۆیەتی ئێمەش وەك گەلی جولەکە هەموو ساڵێك لە یادی ئەنفالدا ئەو کەسو لایەنو کەسایەتیو دامەزراوانە خەڵات بکەین کە بەوشەیەك وێنەیەك هەڵوێستێکی مرۆڤانە هاوکاری ئەنفال یان پاشماوەکانی ئەنفالیان کردووە، بە تایبەت ئەو خەڵکانەی لە هەندێ ناوچەی باشورناوەڕاستی عیراقو نزیك کەرکوكو لەلایلانو دوز بەدزیەوە توانیان کە هەرچەندە ژمارەیان ڕەنگە لە پەنجەکانی دەست تێپەڕنەکات توانیان منداڵو ژنی کورد ڕزگار بکەن، ئەو کەسانەی چیرۆکەکانی تونی مەرگی ئەنفال دەگێڕنەوەو ڕوداوو کارەساتەکەیان بە چاوی خۆیان بینیووە، ڕەنگە دوای چەند ساڵێکی تر کەسیان لەژیاندا نەمێنن، بەڵام هێشتا جگە لە هەوڵی تاکە کەسی وەك پێویست کارەساتەکە لە دەمی شایەتحاڵەکانەوە بە دیکۆمێنت نەکراوە، کە ڕەنگە لەبواری نوسیندا ئەم هەوڵە بە لەخۆبوردیی هەندێ کەس کارێکی باشی بۆکرابێ، بەڵام پێویستە هەوڵەکان دەوڵەمەند بکرێنو ڕێزیان لێ بگیرێ، نەك لەبەر هەندێ بیرکردنەوەی تەسکی حیزبایەتی پەراوێز بخرێنو هیچ حسابێکیان بۆ نەکرێن بۆیە لێرەدا جێی خۆیەتی پرسیاری ئەوە بکەین، باجارێ هەرباسی ناوخۆی خۆمان بکەین، هەندێ کەسی لێبڕاو بۆ دۆسیەی ئەنفال بە هەوڵی تاکە کەسی خۆیان هەندێ کاری باشیان لەسەر دۆسیەی ئەنفال کردووە، بەڵام تا ئێستا کێ وەك پێویست بە تەنگیانەوە هاتووەو دەستخۆشی لێکردون؟ ئەوانەی کە لێکۆڵینەوەی زانکۆیو ئەکادیمیان لەسەر دۆسەی کارەساتی ئەنفال کردووە، دیارە کێن؟ بەڵام تا ئێستا کێ بانگی کردونو ڕێزی لێ ناون؟ کێ پرۆژەیەکی خستۆتە بەردەستیانو داوای لێکردون کەکاری فراوانتری لەسەر بکەن؟،بۆیە گەر هەموو هەوڵەکان یەك بخرێنو هەموو لێکۆڵینەوەو وتارو بەڵگەنامەکان کۆبکرێتەوە، شتێك کەم نابێت، لەمێژودا تا ئێستا چەندین ڕوداوی جینۆساید ئاسای ئەنفالو هولۆکۆست بونە مایەی دروست بونی دەوڵەتی نەتەوەییو گەلان بە خەونی سەدان ساڵەی خۆیان گەیشتن، جولەکەکان کاریان لەسەر دۆسیەی هۆلۆکۆستی کردو کارو پشتیوانی نێودەوڵەتییان بۆ خڕکردەوەو ڕوداوەکە بووە مایەی دروست بونیو بەهێز بونی دەوڵەتی جولەکە لەناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، کە تا ئێستا دەوڵەتی ئیسرائیل بەرهەمی هۆلۆکۆست دەچنێتەوە، ئەلبان نەژادەکانی کۆسۆڤۆ، دوای ئەو قەتلوعامەی کەسربەکان بەسەریاندا هێنان، بەکاریان هێناو ئیشیان لەسەر کردو هەموو گەلەکە بە هەموو ئاینەکانەوەلەسەری کۆکۆ بوونو دواجار توانیان سەرنجی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بۆخۆیان ڕابکێشنو لەکۆتایدا بونە دەوڵەت، گەلی ئاتچێ لە ئەندۆنیزیان بەهۆی ئەو غەدرو نابەرامبەریان کەلەلایەن ئەندۆنیزیەکانەوە لێیان دەکرا، توانیان بیکەنە دۆسیەی بەرگری لە مانەوەی خۆیان و لەکۆتایدا بونە دەوڵەتی سەر بەخۆو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش پشتگیری لێکردن، کەس هەیە

جینۆسایدی ناوچەی بەڵقانی نێوان موسڵمان‌و سرب‌و کرواتەکانی کۆتایی سەدەی ڕابردوی نەبیستبێ، هەر پرۆسەی سڕینەوەی ناسنامەو بەجینۆساید کردن بوو، بووە هۆی دامەزراندنی سێ دەوڵەت بۆ ئەلبانەکان‌و کرۆات‌و سڕبەکان لەناوچەی بەڵقاندا،

لەکۆتایدا جێی خۆیەتی ئێمەی کوردیش بیرێکی جدی لەدۆسیەی ئەنفال بکەینەوەو بیکەینە هەوێنی سەربەخۆی‌و بەخاوەن بونی خۆمان، بەتایبەت کارەساتی ئەنفال ڕوداوێك نییە، تەنها دەرئەنجام‌و بەرهەمەکەی سودو زیان بەژمارەیەك خەڵکی دیاری کراو بگەیەنێت، بەڵکو کارەساتێکە تائەبەد لە زیهنی کوردا دەمێنێتەوەو بە ئاسانی ساڕێژنابێتەوە.........

# دروست بونەوەی جاشایەتی لای نەتەوەیەکی ئەنفالکراو

هێمن کامیل

ئەگەر جاشایەتی بەکرێگرتەیی وچەك هەڵگرتن بۆ دوژمنانی کوردو کوردستان دابنرێت، ئەوا لە مێژوی کورددا تەمەنێکی دورو درێژی هەیە. لە هەموو سەردەمە جیاوازەکاندا جاشایەتی زیانی گەورەی بە کورد وەك نەتەوە گەیاندوە، هەر چەندە هەر قۆناغێك لە مێژوی گەلەکەمان جاشایەتی تایبەت بە خۆی هەبوە، زۆرجاریش کەسانی نزیك بە یەك لە دژی یەکتری هاوکاری دوژمنانی کوردستانیان کردوە بۆ لە ناو بردنی دەسەلاتێکی کوردی، بەلام لە دوای دروست بونی عێراقی نوێ لە بیستەکانی سەدەی ڕابرد. لەم بەشەی کوردستاندا و بە تایبەتی لە شەستەکان بە دواوە سەرەتایەکی زۆر مەترسیدار دەستی پێکرد بۆ دروست بونی جاشایەتیەکی ڕێکخراو بە بەرنامە کە بو بە دیاردەیەکی بەرچاو لە کۆمەڵگەی کوردیداو بە جۆرێك لە هەشتاکاندا لە کۆی سێ ملیۆن کوردی ئەم پارچەیەی کوردستان نزیکەی چوار سەد هەزار کورد بونە جاشو بە کرێگیراوی دڕندەترین وخراپترین وسەرسەخترین دوژمنی کورد لە مێژودا. پڕ شەرمەزارترین وڕەشترین کارێك کە جاش ئەنجامی دا هاوکاریکردن وچاوساخیکردنێکی شێلگیرانەیان بوو لە بەدناوترین پرۆسەی بە ناو ئەنفالدا بۆ لە ناوبردنی کوردو بزوتنەوەکەی ،چونکە ئەو ڕۆڵە خراپەی جاش لە ئەنفالدا بینی دەبو ناو کورددا بێزراوترین کەس بونایە. بەلام زۆر بە داخەوە سەد هێندەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان حیزب و دەسەلاتی کوردی ڕێزی لێگرتن، نەك هەر باجی ئەو ڕابردوە خراپەیان نەدا ،بەڵکو بە ناوی لێبوردنێکی چەواشەکارییەوە، لە هەژدە ساڵی ڕابردودا تەنانەت ڕێگەش خۆش نەکرا بۆ ئەوەی قوربانیانی دەستی جاش مافەکانی خۆیان وەربگرنەوە.

بۆیە ئەوەی ئەمڕۆ زۆر چاوەڕێکراوە دروست بونەوەی دیاردەی جاشایەتیە، ئەو هەوڵانەی ئەم دواییەی حکومەتی عێراقی وئامادەیی چەندین سەرۆك عەشیرەتی کورد بۆ دوبارە دروست بونەوەی جاشایەتی ڕاستی قسەکانمان،تەنانەت وەك جاران لە تەلەفزیۆنیشەوە دەردەکەون وشانازی پێوە دەکەن. لەوانەشە کەسانێك هەبن بڵێن ناکرێت ئەم حکومەتە وهاوکاریکردنی سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکان بۆی بە دروست بونەوەی جاشایەتیەکەی ڕابردو دابنرێت بەڵێ ڕاستە ئەم حکومەتە بەعس نیە. بەلام ئایندە دەیسەلمێنێت کە ئەم حکومەتە چەند دەیەوێت بە هەمان ڕێچکەی بەعسدا بچێت و هەنگاوەکانی ئەو بۆ لە ناوبردن یان سەرکوتکردنی نەتەوەی کورد دووبارە بکاتەوە بۆ ئەم مەبەستەشی سود لە چەکدارکردنی ئەو عەشیرەتانە وەردەگرێت.

بەلام ئەوەی جێگەی پرسیارە بۆچی دوای ئەو هەموو کارەسات و ماڵوێرانی و دەربەدەرکردن وجینۆسایدکردنەی دەوڵەتی عێراق دژ کە بە گەلەکەمان ئەنجامیدا ،کە چی دوای بچوکترین هەوڵی ئەو دەڵەتە و بەخشینی ئیمتیازاتێکی زۆر کەم چەندین سەرۆك عەشیرەت ئامادەبون

دوباره له ژێر ناوبیانوپاساوی جۆربەجۆردا دەست به جاشایەتی بکەنەوە.چونکه ئەوەمان لە بیر نەچێت جاشایەتی له سەردەمی بەعسدا پێی دەوترا پاڵەوان وبەرگریکارانی نیشتمانی وچەندین ناوی تر ،هەروەك چۆن ئێستا مالیکی چەندین ناوی بۆ دروست بون و دووباره بونیاد نانەوەی ئەو شێوازه چاکدارییە داناوه کە هاوشێوەی جاشایەتیەکەی جارانەو تەنها جیاوازیشی ئەوەیە که کات ڕێگره لەوەی کەجاشی بەعس دەیکرد ئەمانەی ئێستاش بیکەن.بەڵام ئەگەر ئێمه لە دوای ڕاپەرین جاشەکانمان شەرمەزار بکردایە بەهەموو ڕێگەو شێوازێکی یاسایی و دەرونی وکۆمەڵایەتی وڕاگەیاندن .بەمەش ئەم دیاردەیەمان قێزەون دەکرد و ئەو کاته ئەستەم وزاحمەت دەبو وەك ئێستا هەروا به سانایی دروست بێتەوە، بەڵام نەك ئەمه نەکرا بەڵکو ئەو ڕێز و پێگەیەی پێیاندرا بوه هۆی ئەوەی نەك جاشەکان هەستیان به ڕوڕەشی و شەرمەزاری نەکرد به پێچەوانەوه له زۆربەی چاوپێکەوتنەکانیاندا شانازی بەو ڕابردوەوه دەکەن واته ئێستاش پەشیمان نین لەوەی کردویانه،تەنانەت لەم ڕۆژانەدا گەنجێکی باوك ئەنفال دەیوت ئەگەر جاشایەتی دروست بێتەوه پێش هەموو کەس دەبم به جاش، به ڕاستی هەڵویستی ئەم گەنجه خوێندنەوەی زۆری سایکۆلۆژیو سۆسیۆلۆژی هەڵدەگرێت .چونکه دەبێت ئەو پرسیاره بوروژێنین که هۆی چیه دوای بیست و یەك ساڵ له ئەنفال گەنجێك ئەو بوچونەی هەبێت که کەسوکارەکەی قوربانی پله یەکی دەستی جاشه،

ئەو هەڕەشانەی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیش کردی لەوکەسانەی پەنا دەبەوه بۆ دیاردەی جاشایەتی بەڕای من هیچ کاریگەرییەکی وای نابێت شایانی باس بێت، چونکه دەبوایه ئێمه به کردەوه جاشایەتیمان ناشرین بکردایەو کلتوری به کرێگیراویمان بۆ دژومنان له ڕەگەوه نەهێشتایه نەك به تۆپزی وچاوسورکردنەوه چونکه ئەو ڕاستیه باش دەزانین که له ڕابردودا وله سەردەمی دیاردەی جاشایەتیدا خەڵکانێك ئامادەبون جاشایەتی بکەن که هەموو چرکەیەك له ژیانیان ئەگەری کوشتن وله ناوبردنی هەبو یان موڵك و ماڵیان له لایەن هێزی پێشمەرگەوه دەستی به سەردا دەگیرا ،چی جای ئێستا که حکومەتی عێراق ئەتوانێت ڕێگری بکات له زۆر شتی ئەو کاتەو لەوانەیه گەوره ترین کاردانەوەی هەبێت له بەرانبەر هەر شتێك که دژی ئەو سەرۆك عەشیرەتانه بکرێت که بەڵێنی هاوکاریو چەك هەڵگرتنیان داوه بۆ دەوڵەتی عێراق.

له کۆتایدا ئەمەوێت بڵێم ئەوه سەرکرایەتی سیاسی کورده که بەرپرسیاره لەوەی که ئەمڕۆ ئەوەی سروشتی وئاساییه لای خەڵکی دوباره سەرهەڵدانەوەی دیاردەی جاشایەتیه .چونکه تا ئەم چرکه ساته هیچ بەرنامەوپلانێکمان نیه بۆ ڕوبوڕوبونەوەی ئەو دیاردەیه، ئەمەش پرۆسەیەکی نەتەوەیی ونیشتمانی پێویسته نەك هەڕەشه کردن،ئەگەر له دوای ڕاپەڕینەوه ڕێگه خۆش بکرایه بۆ کەسوکاری ئەنفاکراوەکان که به شێوەیەکی قانونی مافەکانی خۆیان له موستەشارەکان وەربگرتایەو یەکە یەکە بدرانایه به دادگاو به هەمو شێوەیەك کار بۆ ناشرین کردنیان بکرایه ئەوا ئەمڕۆ کوردو سەرکردایەتیەکەی ترسی دروست بونەوەی جاشایەتیان نەئەبو.

# ئە نفال، دۆسییەی سەدە

عوسمانی شێخ محێدین

ووشەی ئەنفال زاراوەیەکی قورئانی یەو بنەڕەتێکی عەربی هەیە هەر بۆیە گەڕان بەدوای مانا وڕاڤەکردنی دەبێت لە نێو فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی دا بۆی بگەڕێین کە بە واتای (غەنیمە-دەستکەوت) دێت بەلاّم لەگەڵ بیّ باوەڕاندا (نەیارانی ئیسلام) زۆربەی زانایان رایان وایە ئەنفال بەو ماڵ وسامانەو ئاژەڵ و کەل وپەلانە دەوترێت کە شەڕکەرەکانی موسڵمانان لەشەڕدا لە بیّ باوەران بەدەستی دەهێینن، ئەنفال ناوی سورەتی هەشتەمە لە قورئانی پیرۆز، زەمینەی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی دووەمی کۆچی (623ز) دوای جەنگی بەدری گەورە کە لەنێوان موسڵمانان و بیّ باوەڕاندا رووی داو بە سەرکەوتنی موسڵمانان بە سەریاندا، لە دەقە قورئانیەکەدا ئەنفال مرۆڤ ناگرێتەوە بەڵام لای بەعسیەکان مرۆڤ تاکە ئامانج بوو، رژێمی شۆڤینیزمی بەعس دوای پتر لە 1364 ساڵ جارێکی تر ئەو سورەتەی بە دیدێکی بەعسیزمانە لەسەر میللەتی کورد جێبەجی کرد، ئەوەتا فەیلەسوفی ناسراوی عەرەب ئیبن خەلدون ( 1406-1332) لەو باوەڕەدایە کە عەرەب دەست بەسەر هەر ولاّتێك دا بگرێت وێرانی دەکات، چونکە بەڕای ئەو عەرەب نەتەوەیەکی کێوییە، سروشتەکەیان ئەوەیە کەشتی ناو دەستی خەڵك بڕفێنن ورزقیان لە سایەی شمشێرەکانیان دایە نەك هەر سڵ لەوە ناکەنەوە کە ماڵ و سامانی خەڵك بەرن، بەڵکە هەر کە چاویان بەماڵ و سامانی خەڵك کەوت تاڵانی دەکەن).

کاتێك لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا فتوحات وەك ئەنجامێکی بە دەوڵەتبونی ئیسلام دەستی پێکرد، دەوڵەتی عەربی ئیسلامی پێویستی بە هێزی کار هەبوو تا بتوانێت بەرەنگاری هەردوو ئیمپراتۆریای (بیزنتی ـ مەسیحی) و (ساسانی ـ زەردەشتی ) بێت و ئایینی ئیسلام لەناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی ئەم دوو ئیمپراتۆرایادا بڵاو بکاتەوە، بەدووەکان کە لەنێو خۆیاندا گەورەببون و بە درێژایی مێژووی خۆیان بە هۆی شەڕ وپەلامارو غەزوو بەشی سەرەکی بژێوی خۆیان دابین دەکرد لەبەرامبەرشدا بەشێکی دەستکەوتەکان بە بەدووەکان دەدراو بەپێی قورئان سورەتی ئەنفال . ئایەتی 41 لە نێوانیاندا دابەش دەکرا، چوار لە پێنجیشی بۆ شەڕکەرەکان دوای تەواوبونی شەڕ دابەش دەکرا رژیمێك لەهەناوی ئەو کەلتوورەوە لە دایك بوو بێت ئەوەی لیّ چاوەڕوان دەکرێت بەرامبەرگەلان بە گشتی و گەلی کورد بەتایبەتی بەهەمان عەقڵیەت نەخشەی بەکۆمەل کوشتن و قرکردن ئەنجام بدات بەناوی ئۆپراسیۆنەکانی ئەنفال میشیل عەفلەق بیرمەند و دامەزرێنەری (حزبی بەعسی عەرەبی) پێی وایە دابەزینی قورئان بەزمانی عەرەبی و بۆ کەسێکی عەرەب نەك رێکەوت نیە بەڵکو بە بەڵگەی تیۆرەکەی دەزانێت و لەلایەکی ترەوە رژێمی بەعسی عێراقی هەموو شەڕ و مووشەکەکانی بەناوی (الله اکبر ومحمد رسول اللەو قادسیە والعابد و عەباس وحوسەین و..هتد) ناوی لیّ ئەنا بۆ ئەوەی چاوبەستێك لە ولاتانی

لایەنگری خۆی بکات، وا یان تێبگەینێت کە رژێم خەلافەتی ئیسلامی زندوو دەکاتەوەو ئەو میللەتەش کە بە ناوی کورد دژی دەجەنگیٚ میللەتێکی یاخی ودوور لەدین، لە ناو دانیان غەزایەو خۆیان و سەروماڵیان ئەنفالە (غەنیمەیە). ئۆپراسیۆنەکانی ئەنفال بۆ سەر باشووری کوردستان لە لایەن رژێمی لە ناوچوی بەعسەوە لە 8 قۆناغی زنجیرەیی یەك لە دوای یەك ئەنجام درا کە سوپای عێراقی بە هەموو توانا و قورسایەکی سەربازی وئیستخباراتیەوە کە پێك هاتبوو لە 8 فەیلەقی نیزامی وهەر فەیلەقێك لە 3ـ5 فیرقە وهەر فیرقەیەکیش لە 3ـ5 لیوا وهەر لیوایەکیش لە 5.3 فەوج وهەرفەوجێك لە 5ـ3 سریە پێك دەهاتن وژمارەی سەربازەکانی هەر سریەیکش لە50سەرباز پێك دەهات، ئەمە جگە لە فەیلەقێکی (الحرس الوتنی . پاسەوانی کۆماری) و بەپاڵپشتی هێزی ئاسمانی کە زیاتر لە 600 فڕۆکەی جەنگی و1500 هەلیکۆپتەری شەڕکەر و بارهەڵگر کە بەشداری کردوەو دەیان مەفرەزەی تایبەت ونهێنی و جۆراوجۆر بەشداربوون تەنها لەشاری هەولێر 24 مەفرەزەی تایبەت کە 1154 (سوپەر جاش)ی لە خۆ گرتبوو لە شاری دهوك(5 )مەفرەزە کە177 (جاشی تایبەت)لە خۆگرتبوو لە شاری سلێمانیش 26 مەفرەزە کە496 (جاشی تایبەت)ی لە خۆگرتبوو لەسەرخستنی ئۆپراسیۆنەکان بەشیکی زۆری چەکدارانی کورد بەناوی (جاش ) بەشداری ئەم کارەساتە بوون و چاوساغی رژیمیان کرد کەزیاتر لە(300ـ362 ) فەوجی جاشی بەناو (دیفاع وەتەنی ) کە لە (250000) جاش پێك هاتبوون، لێرەدا ناکرێت ئاوڕ لە قسەیەکی توانج ئامێزی نووسەری ناوداری عێراقی (کەنعان مەکیە) نەدەینەوە کەلەکتێبی دڵڕەقی وبێدەنگیدا دەڵێت (کوشتنی کوردەکان لەپرۆسەی ئەنفالدا تەنها رژێمی بەعس لە بەغداد لێی بەرپرسیار نیە، ئایا هەموو عەرەبێکی عێراقی لێی بەرپرسیارە؟ لەلایەکی تر ئەگەر کورد بە دەستی کوردلە گوندەکانی خۆیانەوە بەرەو مردن پەلکێش نەکرانایە ئەوە زۆرێکیان رزگاریان دەبوو ئایا ئەمەش مانای ئەوەناگەیەنێت کە کورد یش لە ئەنفال بەرپرسیارە).

بەرواری 23 شوباتی 1988دەسپێکردنی ئۆپراسیۆنەکەیە کە لە 8 قۆناغی جیاداولە 6 ناوچەی جیاوازدا کوردستانی باشووری گرتەوە: قۆناغی یەکەم لەبەرواری 2/23 تا1988/3/18 بۆسەر ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی، قۆناغی دووەم لە بەرواری 3/22 تا 1988/4/1 بۆ سەر ناوچەی قەرەداغ، قۆناغی سێهەم لە بەرواری 4/7 تا 1988/4/20 بۆسەر ناوچەی گەرمیان ( کە بەجیا قسەی لەسەر دەکەم)، قۆناغی چوارەم لەبەرواری 5/3 تا1988/5/15 بۆ سەر ناوچەی قەلاٚسێوکە ودۆڵی زێیی بچوك، قۆناغی 5و6و7 لە بەرواری 5/15 تا1988/8/26 بۆ سەر ناوچەکانی شەقلاٚوە ورەواندوز، قۆناغی هەشتەم و کۆتایی لەبەرواری 8/26 تا 1988/9/6 بۆ سەر ناوچەی بادینان و سەرجەم ئەم قۆناغانەش پاش روخانی هەموو گوندەکانی کوردستان لەبەرواری 6 ی ئەیلولی 1988 بەفەرمی کۆتایی پیٚ هات.

ئەنفال زیانی مادی و مەعنەوی گەورەی لەدوای خۆی جێهێشت بە جۆرێ هێندەی نەمابوو کورد تێدا لەناو بچێت چون رژێم بەرنامەو پلانی قڕکردنی داڕشتبوو بەو ئاقارەش دەڕۆیشت، لە هەڵسەنگاندنی زیانەکانی ئەنفالدا (میدڵ ئێست ووچ) دەنووسێت (پرۆسەی ئەنفال لە 23 ی شوباتەوە تا 6ی ئەیلولی سالی 1988 ی خایاند لەوماوەیەدا فراوانترین ناوچەی کوردستان بەر شالاوی تێکدان و راپێچان کەوت، لە هەلمەتێکی وادا پتر لە (200) هەزار مرۆڤی کورد لەناوبران، بووە هۆی وێرانکردنی نزیکەی (4000) گوندو (4) قەزاو (30) ناحیەو (3100) مزگەوت و (100) کلێسا، وە لە روی گیانداریيەوە بووە هۆی بە تالان بردنی (2) ملیون سەر مەڕومالات و ئاژەڵ وە کاریگەری لە سەر ژینگەی کوردستان بووە هۆی لەناو بردنی رۆبەرێکی فراوان لە باخ ورەز وچەم.

(د0کەندال نزان ) دەربارەی شالاوەکانی ئەنفال دەنووسێت (لەشالاوەکانی ئەنفالدابنەماکانی ژیان لەکوردستان هەڵتەکێنران، دوای ئەوەی ئەو هیستریا شێتانەی جینۆسایدی کورد کۆتایی هات (لە90٪)ی گوندەکانی کوردستان وزیاتر لە (20) شارو شارۆچکە لەسەر نەخشە سڕانەوە، ناوچە گوندنیشینەکان بە (15) ملیون مین مینرێژ کران، نزیکەی (1،5) ملیۆن کوردی گوندەکان بۆ ئوردگا زۆرە ملێکان گوێزرانەوە، نزیکەی (10٪) کوردی باشور لە نێو بران، بەمەش نزیکەی (7729)کم دووجار لەروبەری هەرێمی کوردستانی عێراق تووشی شالاوەکانی ئەنفال بووەوە)0 هەروەها (یوست هڵتەرمان) دەڵێت (پاش ئەوەی ئەو خەڵکە لەگوندەکانی خۆیان دەستگیر کران بەرەو مەرکەزەکانی (جەیشی شەعبی) لەکەرکوك پەلکێش دەکران، لەوێشەوە لەلایەن کەرتی تایبەتی ترەوە لەناو ماشین وپاسی کیلۆنکراو وپەنچەرە رەش کراودا بەرەو رۆژ ئاوای عێراق لە باکوورەوە بۆ باشووری بیابان دەگوێزرانەوە لەوێشدا پیاوان لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا ژنان و منالەکانیش گولەباران دەکرێن ودەکوژرێن بەبلدۆزەر مردوو چاڵیان دەکەن، بە تەقدیری ئێمە نزیکەی (100) هەزار کەس لە پیاوان ومنالْ کە زۆربەیان مەدەنی بوون بە شێوەیەکی سیستەماتیکی کوژران)، بەپێی زۆرێك لە بەڵگەنامەکان ژماری قوربانیان لە سەد هەزار کەس کەمتر نییە وبەپێی قسەی دەسەلاتدارانی پێشووی رژێم خۆشیان ئیعترافیان لەسەر (100) هەزار کەس کردوە لەسەرزاری (عەلی حەسەن مەجید)وە لە دانوستانی وەفدی کوردی ورژێم سالی 1991.

یەکێك لە قێزەونترین کردەوە نائاکارییەکانی ئەنفال ئەوە بوو کە رژێمی بەدەوی بەعس هەروەك چەرخەکانی ناوەڕاست هەڵسا بە کڕین وفرۆشتنی بەشێك لە کچ وئافرەتە ئەنفالکراوەکان کەزۆر جار بە کۆمەڵ عەرەب چونەتە ناو زیندانیەکانیان وئافرەتە جوانەکانیان هەڵبژاردوە، هەروەکو (رەحمە عەبدول کەریم) دەڵێت (دوو هەفتە بوو برابووینە دووبز، رۆژێك کۆمەڵێك سەیارەی جام رەش هاتن، هەمووی عەرەبی دشداشە لەبەر بوون بەناو قاعەکەدا ئەگەڕان، ئەفسەری قاعەکەی ئێمە پیاوێکی باش بوو پێی ووتین هەرچی ژنی جوان وگەنج هەیە لە چکەکانتان بەدەم و

چاوتانەوە بئاڵێنن، ئەمانە هاتوون هەرچی جوان بێت وعەقڵیان بیبڕێت ئەیبەن بۆ خۆیان، کۆمەڵێکیان جیاکردەوەو بردیانن).

رژێم سەرەرای فرۆشتنی ئەم ئافرەتانە لەناوخۆی عەشیرەتە عەرەبەکاندا کەوتە دابەش کردنیان وفرۆشتنیان بەسەر یانەکانی شەوانی ولاَتانی عەرەبی دەوروبەردا، بە پێی بەڵگەنامەی ژمارە (1601)ی ساڵی 1989 کە نهێنی وزۆر پەلەی لەسەر نووسراوە لەلایەن بەریوبەرایەتی هەواڵگری پارێزگای کەرکوك لەبەرواری 1989/12/10 بۆ بەڕێوبەرایەتی موخابەراتی گشتی کە لەسەر داوای ولاَتی میسر (18) کچی ئەنفالکراوی کورد رەوانەی ئەو ولاَتە دەکات، کە لەخوارەوە ناوەکانیان بەئیمزای بەڕێوبەری موخابەراتی پارێزگای کەرکوك لە بەرواری 1989/12/20 بەرزی کردۆتەوە0 ئەمەش ناو وتەمەنی کچەکانە: گەلاوێژ عادل رەحیم 17 ساڵ، چیمەن نازم عەباس 23 ساڵ، لەیلا عەباس جەوهەر 21ساڵ، لەمیعەنازم عەباس 19ساڵ، پەیمان شوکور مستەفا 16ساڵ، خۆراسان عەبدللەتۆفیق 20ساڵ، قەدریە ئەحمەد ئیبراهیم 17 ساڵ، گولیلك ئیبراهیم عەلی 19ساڵ، خەولە ئەحمەد فخرەدین 25 ساڵ، عیسمەت قادر عەزیز 24 ساڵ، نەجیبە حەسەن عەلی 18 ساڵ، حەسیبە ئەمین حەمزە 29 ساڵ، شلێر حەسەن عەلی 20ساڵ، شوکریە رۆستەم محەمەد 27ساڵ، حەسیبە هیدایەت ئیبراهیم 15ساڵ، سروە عوسمان کەریم 17 ساڵ، کوێستان عەباس مەولود 26 ساڵ، سۆزە مەجید بەسیم 29 ساڵ.

ئەمە مشتێك بوو لە خەرواری رووداو وبەسەرهاتەکانی رامالَینی کورد لەدوای 21 ساڵ لە کارەساتی ئەنفال دەسەلاَتی کورد پارتی ویەکێتی) لە بەردەم دنیایەك رەخنەو تێبنی وگلەیی وگازندەی کەسوکاری بەجێماوانی ئەنفال هیچ وەلاَمێکیان نییە؟!! هێشتا ئەمان حزبی پەناو داڵدەدانی ئەو موستەشارو جاشانەن کەدەستیان سوورەبەخوێنی ئەنفالکراوەکان هێشتا زۆربەی ئێسك و پروسکەکان لەنێو گۆڕە بەکۆمەڵەکانی بیابان بێ خاوەن چاوەڕێیی گەڕانەوەی نیشتمان دەکەن، بەڵکوحکومەتی هەرێم دڵی بجوڵێ وبڕیاری هێنانەوەی روفاتی پیرۆزیان بدات لە مەراسیمێکی شایستەو بێ وێنەدا، بەشکو سەرۆك و سەرکردە قوڕینەکانیش لە داهاتی حیسابی بانکی شەخسی خۆیان گۆڕستان ومینومێنتێکی شیاو لەچەمچەماڵ و گەرمیان دروست بکەن بەهێڵی رەنگاو ڕەنگی لە نێرگز ومەمکەمژەو بە هەورییە خوێناوییەکانی کچە پاکیزەکان و ڕەش وسپی جامانی ژێرخۆڵ وپروسکەکان بینەخشێنن، ئیتر سەرۆك جاشەکانیش بۆیان نەبێت لەدووری پێنج کیلۆمەترەوە حەرەمی ئەو مەزارانە بشکێنن0 دەبێت ئەنفال وانەیەك بێت لەزاکیرەمان، دەبێت کەس وکاریان هیچیان کەمتر نەبێت لە ماڵ و منداڵی بەرپرسە خواپێداوەکان، 4/14 ی هەرساڵێك ئەم یادە بەرزو مەزن راگرین وشایی وسەیران لەم رۆژەدا قەدەغە بکرێت.


سەرچاوەکان:

1. ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجیەکان (محەمەد رەئوف عەزیز). 2. ئەنفال ،کورد و دەوڵەتی عێراق (شۆرش حاجی رەسول). 3. ئیمبراتۆریای لم (د. رفیق سابیر). 4. دلرەقی وبێدەنگی (کەنعان مەکیی)

# ڕۆڵی میدیاو ڕۆشنبیران لە دۆزی ئەنفال

هیدایەت جەمال

ڕەنگە زۆر هەبن لەسات و وەخت و ڕۆژانی یادەکانی ئەنفال گلەیی ئەوە بکەن کە لەمانگی چواردا زۆربەی قەڵەم و ڕۆژنامەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن پانتاییەکی فراوانیان بۆ ئەنفال داگیر کردوە بەپێچەوانەشەوە هەندێکی دی بەسەرنج و تێبینیەوە دەڵێن دەزگای ڕاگەیاندنەکان بەقەد قورسایی کارەساتەکە کاریان بۆ ئەنفال نەکردووە، دیارە خەمساردی زۆر دەبینین لە میدیاوە بۆ ئەنفال چونکە میدیا دەتوانێت دەسەڵات زیاتر ڕاکێشێتە پای داخوازی وداواکاریەکانی پاشماوەی ئەنفال.

مەبەستی ئەم باسە تایبەتە بەدەورو نەخشی میدیایی لەبەرامبەر ناساندنی ڕوداوی گەورەی ئەنفال، ڕگەیاندن گەر بیەوێت دەتوانێت دەورو کاریگەری فراوان لەسەر پانتایی ڕوداوەکان ببینێت چ بەپۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ بەدرێژای هەژدە ساڵی ڕابوردوی دەسەڵاتی خۆماڵی میدیای چاپەمەنی بەهەزارەها ووتارو دیکۆمێنت وکتێب وکاری وەرگێڕانی خستۆتە خزمەت خوێندنەوەی ئەنفال، بەلاّم هەر بەقەد بالاّی ئەنفال نیە بەدرێژای هەژدەساڵی ڕابردوو ڕاگەیاندنی بینراو کەمەبەستی تایبەت لێی کەناڵە تەلەفیزیۆنیەکانە بەلۆکاڵی وئاسمانیەکانیەوە بەلەبەر دەستدابوونی دنیایەك ئیمکانیەتی فراوان.

لەبەرامبەر ناساندنی ئەنفال ومەینەتیەکانی وەلاّمێکی بەرهەقی نەبووە، ساڵ ڕۆژو یادەکانی ئەنفال ومەرگەساتەکانی کورد لەشاشەی تەلەفیزیۆنەکانەوە هەمیشە وەك پرسەو تەعزێخانەیەك یاد دەکرێتەوە نەك وەك ڕەشە کوژی نەتەوەیەك ئەمەش دورکەوتنەوەیە لەقولاّیی سیاسی پرۆسەی ئەنفال، ئەمە بەواتای ئەوەنا کەئێمە بێخەم بین لەتاسەو خەمی کەس وکاری ئەنفال و ئەوانەی کەسی یەکەم وئازیزان وخۆشەویستانی خۆیان کردۆتە قوربانی ئەو کارەساتە بەڵکو دەکرێت بەئاستێکی بەرزتر بەدیکۆمێنت تر باس لەو کارەساتە بکرێت لەماوەی هەژدەساڵی ئەزموونی تەلەفیزیۆنیدا کەس وکارو پاشماوەی ئەنفال لەجیاتی خوێندنەوەی وورد تر بۆ ئەو کارەساتەو ڕوپێوی کردنی ئەنفال لەشاشەی تەلەفیزیۆنەکانەوە ببینین، لەجیاتی ئەوەی بەراوردی جیاوازو خاڵی لێکچونی ئەنفال لەگەڵ جینۆسایدەکانی، ئەرمەن وجولەکەو خەمیرە سورەکان وتووتسییەکانی ڕوواندا.

بۆ کەس وکاری ئەنفال وتەواوی کۆمەڵگەی کوردی پیشان بدرێت بەرنامەکان بەگریان ولاوانەوەو نویّ کردنەوەی برینەکانیان یاد دەکرێتەوە چیتر پێویستە لەساڵڕۆژی ئەنفالدا شێوازێکی دی لەیادی ئەنفال نیشان بدرێت، کاتی ئەوە هاتووە کەناڵە تەلەفیزیۆنەکان لەو یادەدا چیتر دوور کەوتنەوەیان بێت لەپەیامی سۆزو عاتیفەو لاواندنەوەو گریان، کاتی ئەوە هاتووە لەبەرنامەو یادەکانی ئەنفال کەس وکاری ئەنفال بەکۆمەڵ وگروپ لەسەر شاشەی

تەلەفیزیۆنەکانەوە لەلایەن لێپرسراوانی بالآی حزبی و حکومی میوانداری بکرێ تاگفتوگۆی ڕاشکاوانە بکەن لەسەر خواست وداواکانیان .

ئەنفال سەرمایەیەکی مەعنەوی مەزنە باچیتر پاشماوەکانیان فەرامۆش نەکەین و گوێمانیان بۆڕادێرن، ئەبێ بپرسین ڕۆڵی ڕۆشنبیر یان نووسەرو توێژەرانی کۆمەڵگای ئێمە لە ناسین یان ناساندنی ستراکچەری ئەنفال و کایە جۆراوجۆرەکانی چییە و کامانەن؟ ئایا ئەوەی کراوەو ووتراوەو نووسراوەو بەرهەم هێنراوەو دەتوانن ببنە پارسەنگی ئەو بەرپرسیارێتییەی کەلەم بوارە لەسەر شانیانە؟ سەرەتا دەبێ ئەوە بڵێین کەهەندێ هەوڵ و تەقەلای جۆراوجۆر هەیە و دراوە وەك دەرکردنی (گۆڤار،هەفتەنامە، نامیلکە،کتێب،ووتار،لێکۆڵینەوە) و هتد، بەلآم کاتێك دەکەویتە شەن و کەوکردنی ئەو هەوڵەنەو بەراورد کردنیان لەگەڵ قەبارەو کاریگەرییەکانی ئەنفال و باکگراوندە فیکری و فەلسەفی و سیاسییەکەی ئەنفال تەواو هەست بەوە دەکەی کەئەوەی تایبەت بەم بوارە کراوە، هێندە پڕ لەکەم و کوڕی و ناتەواوییەو دوورە لەمەنهەجییەتەوە قابیلی سەر لەنوێ چاك کردنە.

ووردتر ڕۆشنبیر یان نووسەر و توێژەران نەیان توانیوە شۆڕببنەوە بۆ نێو نەخشەو وێنەو کاریگەرییەکانی ئەنفال، لەرێگای ئەو شۆر بوونەوەوە ئیش بکەن وەبە خراپیش لەقەڵەم نادرێ نووسەر و لێکۆڵیارو ڕۆشنبیرانی دەرەوەی کۆمەڵگای کوردستانی بێن ئیش لەئەنفالدا بکەن، بەلآم لەوە خراپترو نابابەتی تر نییە لەبری ئەوەی ڕۆشنبیرو نووسەرو لێکۆڵیاری کوردی یا کوردستانی ببنە سەرچاوەی دەستگرۆیی و ئەو ئیشانە، کەچی بەپێچەوانەوە ئیشی ئەوانەی دەرەوەی کۆمەڵگای کوردی دەبێتە سەرچاوەی ئەو ئیشە کەمانەی کەلەلایەن خوودی ئێمەوە بۆ ئەنفال کراون.

هیچ خراپتر لەوە نییە نووسەرێك یان توێژەرو لێکۆڵیارێکی کوردستانی دێت و دەییەوێت قسە لەسەر کاریگەرییە ئابوری و کۆمەلآیەتی و دەروونییەکانی ئەنفال بکا کەچی نازانێ لەئۆردووگای شۆرش و سمود لەناو خێزانەکانی پاشماوەی ئەنفال چی دەگوزەرێ.

یاخود دەییەوێ قسە لەسەر نەوەی بەجێماوی پاش ئەنفال بکا، کەچی بێئاگایە لەوەی لەناو نەوەی بەجێماوی ئەنفالدا چی باسە.

یان دەییەوێ قسە لەسەر تێکشکانی ژێرخانی گووند نشینانی پێش ئەنفلال بکا کەچی نازانێ پێکهاتەی گووند چییەو کامانەن کەڵچەری گوندو تایبەتمەندییەکانی یان کەسێك دێت و قسە لەسەر کاریگەری ئەنفال لەسەر ژن دەکا، ناخی ژنی پاشماوەی ئەنفال ناناسێ و نازانێ ئەوەی بەسەر ژناندا هاتووە قەبارەو کاریگەرییە جۆراوجۆرەکانی چین ئەمانەو زۆری تر ناکرێ لەکۆی ئەو ئیشانەی کەلەسەر ئەنفال کراون بەو پێوەرانەی سەرەوە قابیلی تێهەڵچوونەوە نەبن و ڕەخنەی جیدی نەکرێن.

لەمەش کارەساتبارتر هەندێ نووسەر و رۆشنبیرو رۆژنامە نووس هەن پێیان وایە دوای ووتاری چەند نووسەرێك کە قسەیان لەسەر ئەنفال کردووە ئیتر پێویست ناکە قسە لەسەر ئەنفال بکرێ.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەتائێستا ئیشکردن لەناو رۆشتبیران لەسەر ئەنفال لەبوعدی بیرکردنەوەی رۆشنبیرو نووسەر و لێکۆڵیارو کۆمەڵگای ئێمەدا تائەوڕادەیە پەرش و بڵاوە کەناتوانێ گوزارشت لەوێنە و شووناسی خۆیی لەناو تراژیدیای ئەنفالدا بکا و بەپێچەوانەیشەوە خودی خۆی بوەتە بەشێك لەپرۆسەی تێکشکانی کەینوونەی کەسایەتی خۆیی و بەشێوەیەك لەشێوەکان ئەنفالکردنی زاکیرەی خۆی لەبەردەم نەخشەی ئەنفالدا. دەبێ رۆشنبیرو نووسەرو لێکۆڵیارو ...هتد، لەکۆمەڵگای ئێمەدا پێش هەرکەس خۆیان لێپرسینەوە لەگەڵ ئیشەکانی خۆیان بکەن و سەلیقەیەکی نوێ و تەکنیکێکی نوێ بۆ ئیشکردن لەسەر ئەنفال بگرنە بەر، ئیشکردن بۆ ئەنفال بکەنە ئیشی دامەزراوەی و پێویستییە هەرە گرەنگەکانی کۆمەڵگاو تاکەکانی، بەواتای ئەوە دەبێ ئەوان سەر مەشقی بەمیلی کردنی ئەنفال بن و هەر ئەوانیش بوار نەدەن ئەنفال بەشێوەیەکی خوێن ساردانە بەسەر کۆی پێکهاتەی کۆمەڵگادا بگوزەرێ و ببێتە یەکێك لەو یادەوەریانەی کەتەنها وەك رێزلێنان بیر بخرێتتەوە، بەمانایەکی بابەتی تر ئەگەر ئەنفال وەك بیرەوەرییەك لەزاکیرەماندا بمێنێ و نەبێتە ئەجێندای ئیشکردنمان لەتێکڕای کایەکانماندا، دەبێ بڵێین ئەوە بۆ خۆی درێژە دانە بەئەنفال و قوڵبوونەوەی کاریگەرییەکان و لەبیر کردنی ئایندە بەهەموو ماناکانییەوە، رۆشنبیرانیش وەك لەچەند جێگایەکە تر ئیشارەتمان پێی کرد بەرپرسیارێتی بنەرەتی تایبەت بەم بوارە هەڵدەگرن.

لەماوەی ئەم چەند ساڵە دوایدا زۆرێك لەقەڵەمی کورد، وەکو جۆرێك لەراهاتن و بەیەك تەوژمی باو لەنووسین و دەربڕیندا، واراهاتوون کەبەشیچوەو جۆری ئینشائی و نەسیحەت ئامێز ڕەخنە لەهەڵسو کەوت و دەرکەوت و دیارانە بگرن کەلەهەناوی کۆمەڵگە بەگشتی و ناوکاییەکانی دەسەڵاتی کوردییەوە بەتایبەتی سەرچاوەیان گردووە.

ئەگەر رۆژانە رۆژنامە کوردییەکان بەگشتی بخەیتە بەر سەرنج، ئەو ساکە بەدی دەکەیت کەلەبەردەم دیاریدەیەکی بزێودا یان ساتە وەختێکدا کەدەبوو دەسەڵات قەسەی تێدا هەبوایە و نەیبووە نووسەرەکە دێت و ووتارەکەی بەکۆمەڵێك لەدەستە واژەی دەبێ وابکرێ ، دەبێ وابوایە، باشترە بەو جۆرە بێ، ناشبێ وابێ...هتد دەتەنێ و لەچەندین هاوکێشەی تەم و مژاوی و دواجار دەربڕینێکی سازشکارو شەرمنانەی مەبەست وونکردووە، ئەوەی پەیوەندی دەسەڵاتی کوردی لە کوردستانەوە هەیە لەڕاستیدا کەمترین و بچوکترین ئاوڕدانەوە جوڵاندنی ئەو جۆرە نەسیحەت کردن و رێبیشاندانانەیەو کەمترین کاریگەری ئەو سەپکە نووسین و گازندەیانەی لەسەر بووەو دیارە ئەگەر وابوایە دەبوو لەکوردستان کورد فیشەکێکی بەمێشوولەیەکی ناو وولاتەکەی خۆیەوە نەنایە بەڵام نراوە کورد بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێران کرد، بەڵام راستییەك هەیە کەچی دی ئێمە لەبەردەم مەسەلەیەك یان چەند پرسێکی چارەنووس سازی

نەتەوەکەماندا هەرگز ناتوانین لەپەراوێز خستنیدا بێدەنگ بین، ئەگەر لەسەر چەند مەسەلەیەکی ڕاگوزەریدا بێدەنگی نوێنرا ئەوە شتێکی ترەو دەشێت تەبریرو قسەی تر هەڵبگرێ.

بەلاّم لەبەرامبەر پرسێکی وەك پرسی ئەنفالدا کەلەناو سەرلەبەری کایە سیاسی دەسەلاّتی کوردیدا پرۆژەیەك نەك بەقەد گەورەیی پرسەکە بەڵکو لەئاستێکی زۆرزۆر نزمیشدا درك پێناکرێت ئالەمەداو لەم دۆخەدا نووسەری کورد لەبەرامبەر ئەو زەنگە ترسناك و مەترسیدارەدا دەبێت بچێت کاییەی سیاسیی کوردی بخاتە بەردەم پرسیارێکی گەورەو خوێندنەوەی بۆی هەبێ کەئاخۆ هۆکارە بنە ڕەتییەکان لەکام و چ مەنهەجییەت و بیرکردنەوەیەك سەرچاوە دەگرێت؟

بەدیوێکی تردا دەبێت لەخەیاڵ و عەقڵێت و وێنا کردنەکانی سیاسەت لەکۆمەڵگای خۆماندا بروانین دەبێت بچین بنیادی دەسەلاّت لەناو حزبی سیاسی کوردیدا، پەیوەندی نێوان کاریزماو دەسەلاّت، پەیوەندی نێوان خێڵ و خێزان و بنەماڵە دەسەلاّتەوە بخولێننەوەو ڕەگەقووڵەکانی ئەم تێگەیشتنە تایبەتە بۆسیاسەت بدۆزینەوە.

لە کاتێکدا لە بەرامبەر مەسەلەیێکی پڕ ئیش و مەترسیداری ناو واقعی کوردەواری لەبەرنامەی سیاسی حزبدا بەدیناکرێت .

ئەو کاتە دەبێت وەزیفەی حزب بە چ ئاقارێکدا بخوێنیینەوە کە لە مەر مەسەلە گشتی و تراژیدیا گەورەکان بەکارەکی ئیشی لە سەر ناکات.

لە دوای مەرگ

# پرۆژەی پەرەپێدانی کاری دەستی کەس وکاری قوربانیانی ئەنفال

بەڕێز_حکومەتی هەرێمی کوردستان... سلاّو

بەڕێزان بفەرموون لەگەڵ ئەم پرۆژەیەبەمەبەستی پەرەپێدانی تواناکانی کەسوکاری قوربانیانی ئەنفال

شوێنی پرۆژە :

چەمچەماڵ تەنیشت خانووی کەس وکاری قوربانیەکان زەوی پێویست:4 دۆنم بۆ درووستکردنی شوێنی کاری دەستی، پێکهاتەکانی بەڕێوبەرایەتیەکە،باخچە، کافتریا،دووکان

جۆری کار:

درووست کردنی مەدالیا لەدارو تەختە، پەیکەری بچوك، دارتاشی جوانکاری، چنینی پێویستیەکانی وەك، ملپێچ، کلاو، گۆرەوی، دەستکێش، درووستکردنی کاری دەستی بەقوڕ(کارگەی خشتی سور لەناوچەکە هەیە).پەرەپێدانی کاری خۆماڵی هاندانی خەڵك بۆ پشت بەخۆ بەستن.

بەشەکانی شوێنی کار:

1-دروستکردنی تەلاری تایبەت بەو کارە.

2-دیاریکردنی بەشەکان تێیدا،وەك بەشەکانی(بەشی کارکردن لەسەر تەختە، بەشی کارکردن بەقوڕ،بەشی چنین)

3-هۆڵی کۆبونەوە

4-کافیتریا.

5-بەڕێوەبەرایەتی کاری دەستی.

6-دروستکردنی دووکان،بەتەنیش پرۆژەکەوە بۆ نیشاندانی کارەکان و فرۆشتنیان بەهەمان ئەو شێوازەی لە ڤێتنام هەیە.

بایەخی ئەم پرۆژەیە:

جگە لەوەی بەشێك لەکەس و کاری قوربانیەکان دەکرێن بە هێزی کار،شوێنێك هەیە بۆ کۆکردنەوەیان تا هەرکات خەڵکی بیانی و توێژەرانی بواری جینۆ ساید بیانەوێت دەتوانن سەردانیان بکەن،پەرە بەکاری خۆماڵی دەدرێت تێیدا.شوناس بۆ کەس و کاری قوربانیەکان لەڕێگەی کارکردنەوە دەگەڕێتەوە.ئەمە جگە لەوەی لەروی دەرونیەوە ئاسودە دەبن و درك بەبونی خۆیان دەکەن.

ئەم پرۆژەیە دەکرێت بکرێتە دەروازەیەك تا لێیەوە ڕێکخراوە بیانیەکان و کۆمپانیاکان بتوانن لەبەشی وەرشە گەریدا فێرخوازان رابێنن لەسەر دروستکردنی پێویستی دیکەی ئینسانی. بۆنمونە:گۆچان،دارشەق،کورسی کەمئەندامی،کورسی،کاتژمێر،پێنووس،پێویستی دیکەو هتد.